# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز

بەرگی هەشتەم

چاپی دووەم
٢٠١٠
بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی هەشتەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت – لبنان

ئەو بەھرەو چاکە تایبەتی یەی خوا بەسەریانەوە و ئەو پلەو پایە بەرزەی خوا پێ‌ی دان ئەرکی سەرشانی قورس تر کردن، هۆی دوور کەوتنەوە و پارێزگاری یان بوو لە هەموو خراپە و گوناهێك، کەواتە ئەگەر هات و ئەوان بەو هەموو شان و شەرەفەوە گوناهێکی وا بکەن شایان ئەبوون بۆ سزا و تۆڵەی دوو قات، وەکو لەم بارەی تریشەوە بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾ هەرکەس لە ئێوە گوێ رایەڵ و مل کەچ بێت بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و کردەوەی چاك بکات وەکو نوێژ و رۆژوو و ئەوانی تر، ﴿نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ﴾ پاداشتی خۆی پێ ئەدەین دووجار، جارێ لەسەر گوێ رایەڵی و مل کەچی و جارێ لەسەر گەرانیان بە دوای رەزامەندی پێغەمبەر و ژیانیان لەگەڵی بە خۆشی و رازی بوونیان بە کەم و کورِی ژیان، ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾ ئامادەمان کردوە بۆی رۆزی یەکی بەرێز و بەنرخ لە بەهەشت دا کە خۆی شادمان و رازی بێت پێ‌ی، کەواتە حازر و بزر و ئامادە کراوە و چاوەڕوانی بۆ ئەکات. ئەمەش لوتف و منەتێکی جیاوازە لە ژوور و پاداشتە دووبارەکراوەکەی.

ئینجا روونی ئەکاتەوە بۆ دایکی ئیمانداران کە تایبەتین بە هەندێ شتەوە کە بۆ ئافرەتانی تر نی یە، پێویستی سەرشانیان دیاریی ئەکات لە بارەی کردەوە و رەفتاریان بەرامبەر خەڵك، پێویستی سەرشانیان لە عیبادەت و پەرستنی خوادا، پێویستی سەرشانیان لەناو ماڵ و ناوخۆیان دا، باسی چاودێریی تایبەتی خوا ئەکات دەربارەی ئەو ماڵ و خانەوادە بەرز و بەرێزە، هەروەها پاراستنی لە چڵك و چەپەڵی گوناهو تاوان، سەرنجیان رائەکێشێ بۆ بیر کردنەوە لەو ئایەتانەی کە خوا ئەخوێنرێنەوە لەناو ماڵەکانیان دا، لەبەر ئەوە ئەرکی تایبەتی خستووەتە سەرشانیان، جیای کردوونەتەوە لەناو ئافرەتانی هەموو جیهان دا.

کاتێ ئیسلام هات سەرنجی دا گەل و کۆمەڵی عەرەب – وەکو هەموو گەل و کۆمەڵەکانی تری جیهان – سەرنجی ئافرەت ئەدەن بە شێوەیەکی سەیر، وای دائەنێن کە ئافرەت تەنها بۆ ئەوە دروست کراوە ببێتە هۆی رابواردن و تێر کردنی ئارەزووی ژن و مێردی. جا لەبەر ئەوە لەبارەی ئادەمێتی یەوە زۆر بە پەست و بێ نرخی سەیر ئەکرد و دای ئەنا. هەروەها ئیسلام فەوزا و بێ سەر و پێ‌ی بینی لەناو گەل و کۆمەڵ دا لە بارەی پەیوەندی نێرو مێوە، رژێمی ماڵ و خێزان شێوا بوو بە مل یەك دا بەو جۆرەی کە لە چەند شوێنێ لەم تەفسیرەدا

باس کرا. ئینجا ئیسلام دەستی کرد بە چارەسەر کردنی ئەو دەردە کوشندە کە رووخێنەری گەل و خێزانە، بەم رەنگە تێڕوانین و بیر و رای خەڵکی بەرز کردەوە لەبارەی ئافرەتەوە، باری ئادەمێتی بەهێزو پتەو کرد لەبارەی پەیوەندی نێوانی نێرو مێوە، تێی گەیاندن کە ئەو پەیوەندی یە تەنها بریتی نی یە لە تێر کردنی ئەو ئارەزووە و کوژاندنەوەی بڵێسەی. بەڵکو ئەو پەیوەندی یە بریتی یە لە پەیوەستی و یەك گرتنی دوو ئادەمی کە پێك هاتوون لە بنەڕەت دا لە یەك کس، لە نێوان ئەم دووانەدا سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی هەیە، رەحەتی و ئارامی دڵ هەیە لە تێکەڵی و یەکگرتنیان دا، لەو یەکگرتن و پەیوەستی یەدا مەبەست و ئامانجێکی گرنگ هەیە کە بەستراوە بە ویست و خواهیشی خواوە لە دروست کردنی ئەم تیرەی ئادەمی یە و ئاوەدان کردنەوەی ئەم زەوی یە و جێنشینی ئادەمی تیای دا بە پێی باو و رەوشتی خوا. هەروەها ئیسلام دەستی کرد بە دامەزراندنی رژێمی ماڵ و خێزان و بەهێزکردنی پەیوەستی نێوانیان، ئامادەکردن و دانانی بە پەروەردگا بۆ هەموو چین و تاقمەکانی داهاتوو، هۆی پارێزگاری و پاراستنی ئەو پەروەردگایەی دامەزراند، پاك و خاوێن کردنی لە هەر شتێك چەپەڵی بکات، لە هەموو تەم و دووکەڵێك لاسەری بگرێت.

دانانی یاسای ماڵ و خێزان بەشێکی زۆری داگیر کردووە لە ئایینی ئیسلام دا، جێ و شوێنی گرنگی هەیە لە ئایەتەکانی قورئان دا، لەگەڵ دانانی ئەو یاسایانەدا تەمێ و پەند و مۆچیاری هەمیشەیی هەیە بۆ بەهێزکردن و پتەو کردنی ئەو پایە و بنەڕەتە کە کۆشکی گەلی لەسەر راگیر ئەبێ، بە تایبەتی لەبارەی ئەو شتانەی کە پەیوەندی یان هەیە بە رۆح بەرزی و پاك و خاوێنی مامەڵەی ژن و مێردی، پاراستنی لە هەموو بێ ئامووسی و ناڕەوایی یە. لەم سورەتەدا دانانی رژێمی کۆمەڵایەتی و هۆنینەوەی گەل و کاروباری ماڵ و خێزان جێگا و شوێنێکی گەورەی هەیە، لەم ئایەتانەدا کە ئێستا خەریکین پێیانەوە و لەگەڵیان ئەژین قسە و باس لەگەڵ حەرەمەکانی پێغەمبەردایە(ﷺ) تەمێ و ئامۆژگاری هەیە بۆیان لەبارەی پەیوەندی یان بە خەڵکەوە، لەبارەی کاروباری تایبەتی خۆیانەوە، پەیوەندی یان بە خواوە، تەمێ و مۆچیاری یەك کە خوا فەرموی: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾، کەواتە با سەرنج بدەین و گوێ شل کەین بۆ قورئان کە بە چ شێوەیەك ئەو خانەوادانە ئەپارێزێ و بە پاکی راگیری ئەکات لە هەموو خراپە و چڵك و چەپەڵی یەك؟ دانیشتوانی ئەو خانەوادانە کە پاك و خاوێن ترین کۆمەڵ بوون کە زەوی و جیهان بینیبێتیان پێویستیان هەبێ بەو تەمێ و مۆچیاری یە ئەبێ هەموو ئافرەتانی تر پێویست تر بن لەوان کە لە سایە و پەنای پێغەمبەردا ژیاون(ﷺ) لە خانەوادە بەرزەکەی ئەودا پەروەردە کرابن – خوا لێ یان رازی بێت –.

لەیەکەم جارەوە ئاگاداریان ئەکات بە گەورەیی شان و شەرەفیان، بەرزی و پایە و پلەیان لەناو هەموو ئافرەتانی جیهان دا، بە مەرجێك پارێزگاری ئەو پلە و پایەی خۆیان بکەن، هەڵسن بە ماف و پێویستیاتی، ئەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ﴾ ئەی ژنەکانی پێغەمبەر ﴿لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ ئێوە وەکو هیچ کام لە ئافرەتانی تر نین و وێنەی هیچ کۆمەڵە ئافرەتی تر نین، ئێوە لە رادە و پلەیەك دان هیچ کەسی تر هاوتا و هاوبەشتان نی یە و ناگاتە رادەتان ﴿إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ﴾[1] ئەگەر ئێوە خۆتان بپارێزن لە هەرشتێك کە دژ و پێچەوانەی بریارو فەرمانی خوا و رەزامەندی پێغەمبەرەکەیەتی، کەواتە تەنها نزیکی و حەلاڵ و هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بەس نی یە بەڵکو پێویستن بە هەڵسان بە مافی ئەو نزیکی و هاوسەری یە. بێگومان هەر ئەوەش شتێکی حەق و راستە کە ئەم ئایینەی لەسەر دامەزراوە و راگیرە، ئەوە شتێکە کە پێغەمبەر(ﷺ) روونی کردەوە و جاری پێدا لە کاتێك دا کە بانگی کردە خزم و کەس و کارەکەی کە نەخەڵەتێن بە خزمایەتی و نزیکی یەکەیان لە خۆیەوە، چونکە ئەوە هیچی پێ ناکرێ بۆیان لەلای خواوە، ئەفەرموێ: ئەی فاطمەی کچی محمد، ئەی سەفیەی کچی عبدالمطلب، ئەی بەرەی عبدالمطلب، من لەلایەن خواوە خاوەنی هیچ شتێك نیم بۆ ئێوەو هیچم پێ ناکرێ. لەماڵ و دارایییم داوام لێ بکەن چۆن ئارەزوو ئەکەن.[2] لە ریوایەتێکی تردا فەرموی: ئەی تاقمی قورەیش خۆتان رزگار بکەن لە ئاگر. ئەی تاقم و بەرەی هاشم خۆتان رزگار بکەن لە ئاگر. ئەی تاقم و بەرەی عبدالمطلب خۆتان رزگار بکەن لە ئاگر. ئەی فاطمەی کچی محمد خۆت رزگار بکە لە ئاگر، چونکە واللە من خاوەنی هیچ شتێ نیم بۆ ئێوە لە لایەن خواوە، بەس ئەوەیە بۆ ئێوە خزمایەتی هەیە لە منەوە کە بە گوێرەی ئەوە رەفتارتان لەگەڵ ئەکەم[3].

---

[1] ئەم رستەیە بە چەند جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە کە هەموو ئەگونجێن، بەڵام دڵ بەوە بە ئارام ترە کە وتمان لە تەفسیرەکەدا.

[2] ئیمامی موسلیم.

[3] موسلیم و ترمزی.

لەپاش ئەوە روونی کردەوە شان و شەرەف و رادەی بەرزیان کە دەست کەوتیان ئەبێ بە لە خواترسان و خۆپاراستن لە هۆی نارەزایی خوا و پێغەمبەر(ﷺ)، لە پاش ئەوە ئینجا دەست ئەکات بە باسی ئەو شتانەی کە هۆی دوور خستنەوەی چڵك و چەپەڵی یە لەو خانەدانە بەرزە و پاکی و خاوێنی یەتی. ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ﴾ کەواتە قسە و گفتوگۆتان نەرم و ناسك مەکەن بە وێنەی قسە و گفتوگۆی ئەو ئافرەتانەی کە بەد خوو بەد نیهادن، ئێوە بەو جۆرە مەدوون لەگەڵ خەڵك دا، ﴿فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە نیازی خراپ بکات کەسێ کە لە دڵی دا نەخۆشی هەیە. نەخۆشی بەدخویی و نیاز پیسی، یان نەخۆشی و ناپاکی و مونافیقی. خوای گەورە بەرگری کرد کە لەگەڵ پیاوی بێگانەدا بەو جۆرە گفت و گۆ بکەن کە ئەو شێوە گفتوگۆیە شێوەی خەمزە و ناز و هۆی پەیدا بوونی و هەڵگرانی ئارەزووی پیاوانە. ئەوانەی کە خوا ئەو بەرگری یەی لێ کردن حەرەمەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و دایکی ئیمانداران بوون کە جێگای نیازی خراپ نین بۆ خەڵکی و نیازی بەد و خراپی خەڵکی بۆیان. ئەو بەرگری یەش لە چەرخی پێغەمبەردا بوو(ص)، چەرخی ئەو کۆمەڵە پاك و خاوێنە کە هەڵبژێرراوی ئادەمی بوون لە هەموو چەرخەکانی دا. بەڵام خوای پەروەردگار کە پیاو و ئافرەتی دروست کردووە خۆی چاك ئەیانناسێ، ئەزانێ کە دەنگی ئافرەت بەو شێوە نەرم و ناسکی یە لەوانەیە ئارەزوو هەڵگیرسێنێ و نیاز و خەتەرەی خراپ لە دەروون دا فەراهەم بێنێ، لە هەموو چەرخێك دا دڵ نەخۆش هەر بووە بەرامبەر هەموو ئافرەتێ با ئەو ئافرەتە یەکێ بێت لەوانە کە دایکی ئیمانداران. بێگومان پاکی و خاوێنی لەو چڵك و چەپەڵی یە، رزگار بوون نابێ لەو پیسی یە، هەتا دوورکەوتنەوە و دوورە پەرێزی نەکرێ لەو شتانەی کە هۆی هەڵگیرسێنەر و فەراهەم هێنەری ئەو چڵك و چەپەڵی یەن.

ئینجا ئایا ئەوە چۆنە لەگەڵ ئەم گەل و کۆمەڵەی کە ئەمڕۆ ئێمەی تیا ئەژین. لەم چەرخە نەخۆشە چەپەڵە پەستەی ئێمەدا، کە بە هەموو جۆر ئارەزوو و نیازی خراپی تیا ئەخرێتە سۆز و پەرۆش و جامبازە؟ هەموو هۆی بێ نامووسی و داوێن پیسی تیا خراوەتە کار، دەشت و دەر و ناوماڵ پڕ کراوە لەو پیسی و چڵك و چەپەڵی یەی کە خوا ئەیەوێ دووری خاتەوە لە بەندە هەڵبژێراوەکانی؟!

لەپێشەوە بەرگری کردن لە وتە و دەنگی نەرم و ناسك، ئینجا فەرمان ئەدات کە قسە و باسیان لەبارەی شتی ڕێك و ڕەواوە بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾ قسە و باسێ بکەن کە ڕێك و ڕەوا بێت و دوور بێت لە باوی ناپاکان کە لەگەڵ پیاوی بێگانەدا لەبار و بابەتێکەوە ئەدوێن هۆی خەتەرە و نیازی خراپە لێ یان، چونکە هەرچۆنێ دەنگی نەرم و ناسك و ناز و نوك و ناڕەوایە و قاپی خەتەرە و نیازی بەد ترە. کەواتە نابێ لە نێوان ئافرەت و پیاوی بێگانەدا گەمە و گاڵتە و قسەی پڕوو پووچ روو بدات و ببێ. خوای گەورە ئاگادارە بە دروست کراوەکانی و زانایە بە سروشتیان. ئەو خوایە ئەم فەرمانە ئەدات بە دایکی ئیمانداران، بۆ ئەمەی ڕەفتاری پێ بکەن دەربارەی پیاوانی چەرخی خۆیان کە چاکترین گەل و کۆمەڵ بوون لە چاك ترین چەرخ دا. ﴿وَقَرۡنَ﴾ سەنگین و سەلارە و نیشتەجێ و دامەزراو بن ﴿فِي بُيُوتِكُنَّ﴾ لەماڵ و جێی نیشتەجێکانی خۆتان دا. مەبەست ئەوە نی یە سەر لە ماڵ نەهێننە دەرو هەمیشە لە ماڵ دا بن، بەڵکو ئەمە دەست نیشانە بەوە کە ماڵ سەرەکی یە لە ژیان دا، ماڵ نیشتەجێ یە و بێجگە لە ماڵ شوێنی ئەوان نی یە لەبەر ناچاری و پێویستی نەبێت. بەڵێ بەڕاستی ماڵ شوێنی ڕاستەقینەی ئافرەتە، بە ئارام و خۆشی یەوە دانیشێ تیای دا، چاودێریی و سەرپەرشتی بکات و کاروباری ناوخۆ ببات بەڕێوە تاخۆی و دانیشتوانی تر بە کامەرانی بژین و بحەوێنەوە تیای دا، بەهۆی ئەو مەبەستە گرنگە ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر پیاو نان و نەفەقە و ئەرکی ژیاندنی ژن و خێزان، بۆ ئەمەی ئافرەتەکە دەستی بکات و بتوانێ چاودێریی بەخێو کردنی ماڵ و بێچووەکانی بکات. پێك هێنانی نان و ئاو، ڕازاندنەوەی جێگا و بان و ڕاگیر کردنی ماڵەکە بە پاك و خاوێنی، بێگومان ئەو دایکەی کە ماندوو مردوو بێت بەهۆی ئیش و کاری دەرەوە و بەسترابێتەوە بە کاتی دیاریی کراو بۆ ئیش و کاری کارگە و پیشە سازی و هەرکارێکی تری دەرەوە، ئەو دایکە پەرۆشی نابێ بۆ چاودێریی و بەخێو کردنی بەچکەکانی و کاروباری ناوخۆی ماڵەکەی، کەواتە ژیانی خۆشی و کامەرانی لەو جۆرە ماڵانەدا ناگونجێ بە هیچ کلۆج. ماڵی ئافرەتە مووچە خۆرەکان و کرێکارەکان وەکو ئوتێل و خان وان و لەوە زیاتر نین، هەرگیز تام و بۆنی ماڵیان نی یە، ماڵی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئافرەت پێکی بێنێ. بۆن و هەناسەی

خۆشی ماڵ پێك نایەت بە بێ ژن و ئافرەتێ کە بەڕێوەبەر و سەرپەرشتی کەری بێت، سۆز و خۆشەویستی ماڵ دەست کەوت نابێ بۆ منداڵ و بێچووەکان مەگەر دایکی کاربەدەست بێت، ئافرەت یان ژن یان دایك کاتی تێکۆشان و وەخت و توانای خۆی بەخت کرد لە ئیش کاری دەرەوە کە هاتەوە ماڵەکەی پڕە لە ماندوویی و بێ ئارامی و بێزاری و تەنگەتاوی.

دەرچوونی ئافرەت لەماڵ بۆ ئیش و کار نەگبەتی و بەسەرهاتێکی خراپە دووچاری ماڵ ئەبێت و ناچاری نەبێت ڕەوا نی یە، ئەگەر ناچاری نەبێت و بە ئارەزوو بێت، ئەوە بەدبەختی و بێ بەشی یەکە ڕوو ئەکاتە گیان و دەروون و ژیریی، ئەو بەد بەختی یە بەرپا بوو لە چەرخی پەستی و خراپە و گومڕایی دا، هەرگیز لە چەرخی بەرزی و پێشکەوتن و ژیریی و پیاوەتی دا شتی وا ڕوونادات، چونکە ئاشتی و ئارامی و ڕێك و پێك ماڵ خۆشترین شتە لەم جیهانەدا، کە ئەوەش دەست نادات وەکو ڕوون کرایەوە. بەوە ئەبێ کە ئافرەت بەڕێوە بەر و چاودێر بێت بۆ ماڵ.

دەرچوون بۆ ئیش و کار بەو جۆرەیە. دەرچوونی بۆ تێکەڵ و پێکەڵی ناو پیاوان لە تیاترۆخانە و نادی و جێگا کۆڕەکان دا... ئەوە کەوتن و هەڵخلیسکانە بۆ ناوچاڵ و زەلکاوێك کە ئادەمیتی ناهێڵێ و ئەیخاتە ناو پەچە و لەوەڕگای ئاژەڵ و چوارپێ!! بێگومان ئافرەت لە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) لەماڵ دەرئەچوون بۆ نوێژ لە مزگەوت دا بە داپۆشراویی و پێچراوەیی بەجۆرێ کەس نەیئەناسین، لەگەڵ ئەوەدا دایکی ئیمانداران عائشە – خوای لێ ڕازی بێت – پاش لە دنیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی ناخۆش بوو بڕۆن بۆ مزگەوت!

لە سەحیحی بوخاری و موسلیم دا ئەگێڕێتەوە لە عائشەوە – خوای لێ ڕازی بێت – ئەیفەرمو ئافرەتان حازری نوێژی بەیانی ئەبوون لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) لە پاشان ئەگەڕانەوە بە داپۆشراوی و چەتفەکراوی نەئەناسران لەبەر تاریکی. هەروەها لە سەحیحی بوخاری و موسلیم دا لە عائشەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەیفەرمو: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەیزانی کە ئافرەتان چی ئەکەن لەپاش خۆی بەرگری ئەکردن لە هاتوچۆی مزگەوت، هەرچۆنێ ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل کاتی خۆی بەرگری کران! دەی ئەبێ ئافرەتان چی یان کردبێ لە چەرخی عائشەدا؟ ئایا چی هەڵئەگرێ کردبێتیان هەتا عائشە ئەوە بفەرموێ؟! ئەبێ ئەوەی ئەوان چی بوو بێ بە ئەزەر ئەوەی کە ئێمە لەم چەرخ و ڕۆژەدا ئەیبینین؟!

﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾ خۆتان دەرمەخەن لە ئاستی پیاوی بێگانە بە وێنەی خۆ دەرخستنی ئافرەتانی چەرخی نەفامی كۆن و پێش ئیسلام، یان مەگەڕێن بەناو خەڵك دا بە لارە و لەنجەو خۆ بادانەوە، واتە ئەگەر پێویست و ناچار بوون بە دەرچوون لە ماڵەكانتان بە وێنەی ئافرەتانی چەرخی نەفامی دەرمەچن، بێگومان ئافرەت لە چەرخی نەزانی پێش ئیسلام دا دەرئەچوون و ئەگەڕان بەناو پیاوان دا بە شێوەیەكی ناشەرعی و ناڕەوا، بەڵام هەموو شێوەیە كە ئەگێڕنەوە لەوانەوە شێوەیەكی سادە و شەرم و داپۆشراوی یە كاتێ بەراوردیان بكەین لەگەڵ شێوە ناڕەواكانی نەزانی ئەم چەرخە تازەیە!! موجاهید ئەفەرموێ: لە چەرخی نەزانی كۆن دا ئافرەت لەماڵ دەرئەچوو ئەگەڕا بەناو پیاوان دا.(قتادە) ئەفەرموێ: ئافرەت بە لارە و لەنجە و خۆبادانەوە ئەگەڕا.(موقاتیلی كوڕی حییان) ئەفەرموێ: چارشێوەی ئەدا بەسەری دا و نەیئەبەست، بەهۆی ئەوەوە گەردن بەند و گوێ دارە و مل و گەردنی دەرئەكەوتن!(ئیبن و كەثیر) لە تەفسیرەكەی دا ئەفەرموێ: ئافرەت ئەگەڕا بەناو پیاوان دا لە چەرخی نەزانی پێش ئیسلام دا كە قورئان ویستی گەلی لێ پاك و خاوێن بكاتەوە و هۆی بێ ناموسی لێ دوور بخاتەوە و هەست و حەز و ئارەزووی بەرز بكاتەوە لە رادەی چوار پێ و ئاژەڵ بۆ پۆپە و پلەی ئادەمێتی[1].

قورئان دەست نیشانی كرد بۆ بەرەڵایی و باری ناڕەوای چەرخی نەزانی، تێ ی گەیاندین كە ئەوە باوی چەرخی نەزانی یە و هەركەس لەو چەرخە تێپەڕی كردبێ ئەبێ خۆی داڕنێ لە باوە ناڕەواكانی، تێگەیشتن و بیرو بڕوا و هەستی بەرز و بڵند بێت لە رادەی بیرو بڕوا و هەستی ئەو چەرخە. كات و چەرخی نەفامی شتێكی تایبەتی دیاریی كراو نی یە، بەڵكو لە هەر چەرخ و كاتێك دا بەرنامەی ژیان لە خواوە نەهاتبێ، خەڵكی لایان دابێ لە رێگا راستەكەی خوا ئەو كات و چەرخە لای خواو لە ئایینی خوادا چەرخی نەزانی یە و دوا كەوتنە لە ئادەمێتی. ئیتر هەرچەند بە چەرخی پێشكەوتن و زانین و زانیاریی سەرنج بدرێ!

جا بە پێ ی ئەوە ئێمە ئەمڕۆ ئەژین لە چەرخێكی نەزانی زۆر سەخت دا، لە پۆپەی ئادەمێتی یەوە هاتووەتە خوارەوە بۆ رادەی پەستی بێ نرخی گیانلەبەرانی تر. ئەزانین كە

[1] با تەماشای تەفسیری سورەتی نور بكرێ ئەو بە روون تر و درێژ كراوە.

هیچ پاکی و خاوێنی و پیت و فەڕ نی یە لەهەر گەل و کۆمەڵێ کە بەم جۆرە ژیانە بژی، ڕێگای ئادەمێتی نەداتە بەرو خۆی ڕزگار نەکات لە ڕۆیشتن بە ڕێگای نەزانی کۆن دا، دەست نەگرێ بەو شتانەی کە هۆی خۆ پاك کردنەوەن لە چڵك و چەپەڵی، خوای گەورە لە یەکەم جارەوە دانان و نەخشەی کێشان بۆ حەرەمەکان پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لەوان کرد بەو هەموو پاکی و بێ لەکەیی یەی کە بۆ ئەوان بوو. قورئان فەرمان ئەدات و سەرنجی ئەو تاقمە پاك و خاوێنە ڕائەکێشێ بۆ ئەو هۆیانە و ئینجا دڵ و دەروونیان ئەبەستێتەوە بە خواوە، سەرنجیان بەرز ئەکاتەوە بۆ کانگا و بەرچاوی هەموو ڕووناکی و پیت و فەڕێ تا لەبەر ئەو ڕووناکی یە بڕۆن بەو ڕێگا ڕاستەدا. کۆمەکی و یارمەتی داوا بکەن بۆ بەرز بوونەوە و گەیشتنیان بەو پۆپە هەرە بەرزە، ئەفەرموێ: ﴿وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ بە ڕێك و ڕاستی نوێژ بەجێ بێنن، زەکات بدەن و گوێ ڕایەڵ بن بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی. پەرستنی خوا و پەیوەندی و بەسترانەوەی دڵ و دەروون بەخواوە شتێکی کەنار گیر و جیاواز نی یە لە کاروباری کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی لە ژیان دا، بەڵکو ئەو پەرستن و پەیوەندی یە ڕێگا و هۆی بەرز بوونەوەیە بۆ ئەو ڕادە و پۆپە بەرزە، توێشوویەکە ئەو ڕێگایەی پێ ئەبڕێ، کەواتە پێویستی هەیە بەو پەیوەندی و پەیوەستی یە بە خواوە بۆ وەرگرتنی یارمەتی و توێشووی ئەو ڕێگایە. پێویستی هەیە پێی بۆ پاك و خاوێن کردنی دڵ و دەروون، پێویستی هەیە پێی بۆ بەرز بوونەوە و سەرشۆڕ نەکردن بۆ هیچ باو و ڕەوشتی گەل و کۆمەڵ. بۆ هیچ زەخت و زۆرێکی تر، ئەبێ بەندەی خوا پەرستی دڵ بەستراو بە خواوە هەست بکات و بزانێ کە خۆی بەرز و بڵند و ڕێگا ڕاست ترە لە گەل و لە هەموو کەس لە هەموو شتێك کە لەسەر ڕێگای خوا نەبێ و پەیوەندی بە خواوە نەبێت، ئەبێ وا بزانێ کە ئەم شایانە بۆ دەست گرتن و ڕاکێشانی خەڵکی تر بۆ ئەو ڕووناکی یەی کە خۆی ئەیبینێ، نەك ئەوان ئەم ڕاکێشن بۆ تاریکی و نەزانی یە کە ژیانیان تیا ئەخنکێ و نوقم ئەبێت. ئیسلام یەك شتە و یەك پارچەیە و دەست نادات بۆ دەست تێخستن و دابەش کردن. عیبادەت و ئاداب و ڕەوشت و یاسا و ڕژێم و بەرنامەی تێرو تەواوی ژیانی کۆ کردووەتەوە لەناو چوار چێوەی عەقیدە و باوەڕدا، هەرکام لەوانە کارو فرمانی خۆی هەیە لە پێك هێنان و بەرهەم هێنانی عەقیدە و باوەڕەکەدا، هەموو ئەوانە ڕێك و پێکن و گونجاو و داڕێژراون و بەرە و یەك شوێن ئەڕۆن، لەو هەمووە شێوەی ڕاستەقینەی گشتی بەدی دێت بۆ ئەم ئایینە پیرۆزە، بە بێ ئەوە ئەو شێوە بەدی نایەت و ڕاگیر نابێت.

إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا
يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ
وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ

جا لەبەر ئەوە فەرمان بە نوێژ و زەکات و بە گوێ ڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) هێنرا بە دوا بەدوای ئەو تەمێ و مۆچیاری یانەی دایکەکانی ئیمانداران. مۆری ئەوانی پێ کرا. چونکە هیچ کام لەو تەمێ و مۆچیاری پێ کراوانە ڕاگیر نابن و بەدی نایەن بە بێ ئەو عیبادەت و گوێ ڕایەڵی یە، لەسەر ئەو بار و شێوەی خوا. هۆی ئەو تەمێ و فەرمانانەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾ خوا نایەوێ جگە لەوە کە پیسی و چەپەڵی و بەرهەمی گوناهتان لێ دوور بخاتەوە و بیڕەوێنێ لێتان ئەی ئالی بەیتی پێغەمبەر ﴿وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ پاك و خاوێنتان بکاتەوە بە تەواوی. ئەم فەرمودەیە ئێجگار گرنگە و لوتف و بەزەیی و ڕێز و قەدرێکی زۆر گەورە نیشان ئەدات دەربارەی حەرەمەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها هەموو ئەوانەی کە زیاتر تایبەتی بوون پێ یەوە. چ پیاو چ ئافرەت – خوا لێ یان ڕازی بێت – هەرکەس نزیك تر بووبێ لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) شایان ترە بەم لوتف و بەزەیی و چاودێریی یە تایبەتی یە.(ئیبن و عەباس) – خوا لێ یان ڕازی بێت – ئەفەرموێ: بینیمان پێغەمبەر نۆ مانگ لەسەر یەك هەموو ڕۆژێك ئەڕۆیشتە بەر قاپی عەلی کوڕی ئەبو تالیب لە کاتی هاتنی هەموو نوێژێك دا ئەیفەرمو: ﴿السلام عليكم و رحمة الله و بركاته﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾، هەڵسن بۆ نوێژ خوا بەزەییتان دەربارە بکات.

ئینجا ئەو تەمێ و فەرمانانە دوایی پێ ئەهێنێ بە وێنەی ئەوەی کە لە سەرەتاوە پێ ی فەرمون و بیری خستنەوە کە بریتی یە لە شان و شەرەف و پایە و پلەی بەرزیان، جیاوازییان لە ئافرەتانی تر لەم جیهانەدا، بەهۆی نزیکی و تایبەتێتیان بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەهۆی

ئەوەی ماڵەکانیان شوێنی هاتنە خوارەوەی سروشی خوا و ئایەتەکانی خواوەن. ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾ باس بکەن بۆ خەڵکی، یان بیر بکەنەوە و لەبیرتان نەچێ ئەوەی کە ئەخوێنرێتەوە لە ماڵەکانتان دا. ﴿مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِ﴾ لە ئایەتەکانی خواو زانین و ناسینێ کە راست و بەجێ یە، واتە ئەو قورئانەی کە ئایەت و نیشانە روونەکانی خوان لەسەر راستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) و هۆی زانین و ناسینی ئەو شەریعەتە گەورەیەن کە هەمووی رێك و راست و بەجێ یە.

بەڕاستی ئەمە بەشێکی ئێجگار گەورە و گرنگە کە خوا دای بەو خوا پێداوانە، بەسە بۆ بیر خستنەوە، بۆ ئەمەی دەروون هەست بکات بە بەرزی و بڵندی و گەورەیی ئەو بەهرە و لوتفە و چاکەیە، کە هیچ شتێکی تر هاوتایی ناکات و ناگاتە رادەی، هەروەها روون ئەبێتەوە کە ئەو خۆشی و رابواردنی ئەم جیهانەی کە دایکەکانمان دەستیان پێوە ناو خوا و پێغەمبەر و رۆژی دوایی یان هەڵبژارد بەسەری دا،، دەرئەکەوێ کە ئەو خۆشی و رابواردنە هیچ نرخێکی نی یە لەچاو ئەو بەهرە گەورەیەی کە دەست کەوتیان ئەبێ لە سایە و پەنای پێغەمبەر و ماڵەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)،﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە زانا و ئاگادارە بە هەموو شتێك، ورد و درشت و ئەزانێ چی چاك شایانە و کێ بۆچی دەست ئەدات، کەواتە هەموو فەرمان و بەرگری یەکانی رێکە و لە جێگای خۆی دایە.

ئینجا لەکاتی باسی پاك کردنەوەی گەل و کۆمەڵی موسڵمانان دا، دامەزراندن و داڕشتنی لەسەر ئەو بارو بەرنامە گرنگ و گەورەی کە ئیسلام هێنای. لەم کاتەدا باسی چەند سیفەت و رەوشتێك ئەکات کە ئەو ژیانە پاك و بەرزەی پێ بەدی دێت، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ﴾ بەڕاستی پیاوە موسڵمانەکان و ئافرەتە موسڵمانەکان، ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ پیاوە بڕوادارەکان و ئافرەتە بڕوادارەکان ﴿وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ﴾ پیاوە گوێ رایەڵەکان بە هەمیشەیی و بە ئارەزووی دڵ، ئافرەتە گوێ رایەڵەکان بە هەمیشەیی و بە ئارەزووی دڵ ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾ پیاوە راستەکان لە وتار و کرداردا، ئافرەتە راستەکان لە وتار و کرداردا،

وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ
وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا
وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ
وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ

---

**﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ﴾ پیاو و ئافرەتە بە ئارام و خۆگرەکان، ﴿وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ﴾ پیاو و ئافرەتە مل کەچەکان بۆ خوا بە دڵ و بە لەش، لەبەر جێگیر بوونی سام و هەیبەتی خوا لە دەروونیان دا و هەست کردنیان بە گەورەیی خواو ئاگاداری خوا بەسەر هەموو شتێك دا، ﴿وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ﴾ پیاو و ئافرەتە خاوەن خێرو سەدەقەکان، لە فەرز و لە سوننەت ﴿وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾ پیاو و ئافرەتە ڕۆژوو گرەکان، ﴿وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ﴾ پیاو و ئافرەتە داوێن پاکەکان کە پارێزەری عەورەتی خۆیانن لەکاری بێ شەرعی و بێ ناموسی، ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾ پیاو و ئافرەتەکان کە بە زۆری باس و یادی خوا ئەکەن. ئەم دە سیفەتە کە کۆکراوەتەوە لەم ئایەتەدا هەموو پەیوەندی یان پێکەوە هەیە هەموو کۆمەکی ئەکەن لە فەراهەم هاتن و پێك هێنانی نەفسێکی موسڵمان و شەخسی یەتێکی موسڵمان دا، هەرکام لەم دە سیفەتە نرخی تایبەتی خۆی هەیە لە دروست کردن و داڕشتنی ئەو نەفس و شەخسی یەتەدا.**

**ئەوانەی کە ئەو دە سیفەتەیان تیا کۆبووەتەوە ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم﴾ خوا ئامادەی کردووە بۆیان ﴿مَّغْفِرَةً﴾ لێ بوردن و داشاردنی گوناهەکانیان – واتە بچووکەکانیان – وەکو حەدیس ڕوونی ئەکاتەوە ﴿وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاداشتێکی زۆر گەورە بۆ کردەوە چاکەکانیان.**

**ئا بەو جۆرە باسی سیفەت و نیشانەی پیاو و ئافرەتی موسڵمانی کرد، هۆی پێك هاتن و ڕاگیر بوونی شەخسی یەتی موسڵمانی ڕوون کردەوە. بە شێوەی گشتی، لەپاش ئەوەی بە شێوەی تایبەتی باسی حەرەمەکانی پێغەمبەری کرد(ﷺ) لەگەڵ پیاودا و شان بە شانی پیاو باسی ئافرەتی کرد تا بزانرێ ڕادە و نرخی بەرزی ئافرەت لە ئیسلام و لای ئایینی ئیسلام، تا بەو چاوە سەرنجی ئافرەت بدرێ لەناو گەل و کۆمەڵ دا، جێگا و شوێنی خۆی پێ بدرێ**

لەناو گەل و کۆمەڵ دا، جێگا و شوێنی خۆی پێ بدرێ شان بەشانی پیاو لە هەموو کاروبارێکیان دا، ئیتر چ پەیوەندی بە خوا، چ لەبارەی ئەرك و فەرمانی ئەم ئایین و عەقیدەوە کە خراوەتە سەر شان بۆ پێك هێنانی رێگا و باری راست لە ژیان دا.

لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا هەنگاوێکی تازە ئەنێ لە هۆنینەوەی گەل و کۆمەڵی موسڵمانان و نەهێشتنی هەندێ باو و رەوشتی ناڕێك و ناڕەوا. لە یەکەم جارەوە تایبەتی یە بە نەهێشتن و هەڵوەشاندنەوەی رژێمێك کە ناونراوە بە(تبنی) واتە گێڕانی کەسێکی بێگانە بە کوڕ کە لە سەرەتای سورەتەکەوە دەست نیشانی بۆ کرد. خوای گەورە ویستی کە پێغەمبەر(ﷺ) بە کردەوە هەڵسێ بەو تێك دان و هەڵوەشاندنەوە، باوی عەرەب وابوو ئەو ژنی کوڕە دەست کردانە بە بووك دائەنرا بە وێنەی ژنی کوڕی راستەقینە، کەواتە لەپاش تەڵاق دانی قەدەغە بوو باوکە دەسکردەکە مارەی بکات. هیچ کەس نەیئەتوانی لە یەکەم جارەوە ژنی تەلاق دراوی ئەو کوڕە دەسکردەی مارە برکات لە ترسی تانە و تەشەری خەڵکی، لەبەر ئەوە خوای گەورە ویستی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئەرکە قورسە هەڵگرێ کە ئەرکێکە لە ئەرکەکانی پێغەمبەرێتی یەکەی. لەمەو پاش ئەبینین لە هەڵوێستی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەرامبەر ئەم کارە قورسە و ئەم تاقی کردنەوە بەتینە. ئەبینین کە هیچ کەسی تر نەیئەتوانی ئەو ئەرکە قورسە بخاتە سەرشان، بەرەنگاری گەل بکات بەو کارە کە دژ و پێچەوانەی باو و ئولفەتی جێگری دامەزراوی چەند چەرخی دوورو درێژە!! هەروەها ئەبینین کە چەند قورئان دواوە لەو رووداوە و لێ ی کۆڵیوەتەوە بۆ ئاسان کردنی لە دەروونی موسڵمانان دا و دڵ نەرم کردن و دڵخۆشی دانەوەیان بۆ وەرگرتنی ئەو کارو فەرمانە بە رەزامەندی و مل کەچی دڵەوە. لە پێش باس کردنی ئەم رووداوە یاسایە ئەهێنێ لە بارەی مل کەچی و گوێ رایەڵی بۆ هەر کارو فەرمانێ کە لە لایەن خواو پێغەمبەرەوە بێت، بە بێ سەر لێ کردنەوەو بیر لێ کردنەوە، کە ئەوەش وا نیشان ئەدات کە گۆڕینی ئەو باوە زۆر قورس و بەتین بووە لەدڵ و دەروونی خەڵك دا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ ﴾ بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی بڕوادار نی یە ﴿إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا ﴾ کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری کارو فرمانێ بدەن بە هیچ کلۆج نابێ ﴿أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴾ بۆیان نی یە سەر لێ کردنەوە لە کاروبڕیارەکەیان و دەست بژنی تیا بکەن. بەڵکو پێویستە لەسەریان بێ گیرو گرفت گوێ رایەڵ بن و شوێنی فەرانەکەیان بکەون، نابێ سەرپێچی بکەن و یاخی بن،

﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا﴾ هەرکەس سەرپێچی بکات و گوێ رایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی نەبێ بەڕاستی ئەو کەسە گومڕا بووە و لای داوە لە ڕێگای ڕاست بە لادان و گوێ رایەڵی یەکی ڕوون و ئاشکرا.

لەبارەی هۆنینەوەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە چەند را و ڕیوایەتێك هەیە، یەکێ لەوانە ئەمەیە کە هاتە خوارەوە دەرحەق زەیبەنی کچی جەحش – خوای لێ ڕازی بێت – کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ویستی جیاوازی نەهێڵێ لەناو تاقم و چینەکانی گەل دا، ئەو باوی نارەوای ڕەگەزایەتی و چینایەتی یە ژێر پێ بکات کە لە کۆنەوە باو بوو، دەقی پێوە گیرابوو. ویستی ئەو باوە ناڕاستە نەهێڵێ، بەم جۆرە هەموو ئادەمی یەکسان بکات بە وێنەی ددانەکانی شانە، لە جێگەی ئەو باوە نارەوادا ئەم باوەڕە بچەسپێنێ کە هیچ کەس لە هیچ کەس زیاتر نی یە مەگەر بە خواپەرستن و لەخوا ترسی. بەپێی ئەو باوی نەزانی کۆنە تاقمی بەندە ئازاد کراوەکان چینێکی جیاواز بوون لەناو گەل دا رادە و پلەیان پەست تر بوو لە رادە و پلەی ئەوانی تر. یەکێ لەم چین و تاقمە زەیدی کوڕی حاریثە بوو کە ئازاد کراوی پێغەمبەر بوو(ﷺ) بڕیار درا بوو بە کوڕی، ئەوە بوو پێی ئەوترا زەیدی کوڕی محمد، هەتا خوا ئەوەی قەدەغە کرد و فەرمانی دا ئەوانە بە ناوی باوکە ڕاستەقینەکەیانەوە بانگ بکرێن ئەگەر زانراو ناسرا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو یەکسانی یە بە کردەوە بەدی بێنێ بە مارە بڕینی زەینەب – کە پورزای پێغەمبەر بوو(ﷺ) – لە نەوەی هاشم بوو کە لە پۆپەی قورەیشە لە زەیدی کوڕی حاریثە – خوای لێ ڕازی بێت – بۆ ئەمەی جیاوازی چینایەتی یە نەهێڵێ، هەر بە نەفسی خۆی، لەناو کەس و کاری خۆی دا، ئەو باوەڕی جیاوازی یە ئەوەندە جێگیر و دامەزراو بوو هەڵ نەئەکەنرا و لە ڕیشە نەئەهێنرا بە کردەوەیەکی وا نەبوایە لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە شتێکی وا نەبوایە خەڵکی ئەو ڕێگا ڕاستەیان بۆ نەئەدرایە بەر.

جا ئیبن و کەسیر لە تەفسیرەکەی دا ئەگێڕێتەوە لە عەوفی یەوە و ئەویش لە ئیبن و عەباسەوە – خوایان لێ ڕازی بێت – کە پێغەمبەر(ﷺ) خوازبێنی کرد لە زەینەب بۆ زەید، ئەویش وتی شوی پێ ناکەم! پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرمو: بەڵێ شوی پێ بکە. ئینجا زەینەب وتی با پرس و ڕایەکی خۆم بکەم. لەم کاتەدا ئەو وتووێژەیان ئەکرد ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. ئینجا زەینەب وتی: ئایا ڕازی بم شووی پێ بکەم؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی:

بەڵێ! ئەویش وتی: کەواتە سەرپێچی ناکەم لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوا شووم پێ کرد.

لە عیکریمەوە ئەگێڕنەوە و ئەویش لە ئیبن و عەباسەوە – خوا لێ یان رازی بێت – کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) خوازبێنی کرد و ئەویش سەرپێچی کرد و وتی: من لەو چاك ترم لە نەسەب و نەژاددا، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

هەروەها مجاهد و قتادە و موقاتیل ئەفەرمون: کە ئەم ئایەتە لەبارەی زەینەبەوە هاتە خوارکەسەرپێچی کردلەشووکردن بە زەید و لە پاشان بەهۆی ئەم ئایەتەوە گوێ رایەڵ بوو.

ئیبن و کەثیر لە تەفسیرەکەی دا ریوایەتێکی تر ئەهێنێ لە عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە ئوم کەلثومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبو موعیتەوە کە یەکەم ئافرەت بوو کۆچی کرد بۆ مەدینە لە پاش سوڵح و ئاشتی حودەیبیە، ئینجا خۆی بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرموی: ئەوا قبوڵم کرد. ئینجا مارەی کرد لە زەیدی کوڕی حاریثە – خوای لێ رازی بێت – رەنگە پاش تەڵاق دان و جیا بوونەوەی لە زەینەب – ئینجا خۆی و براکەی پێ یان ناخۆش بوو و براکەی وتی: ئێمە مەبەستمان پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بوو کەچی داینی بە بەندەکەی، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

لە ریوایەتێکی سێ یەم دا ئیمامی ئەحمەد حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسەوە – خوای لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) خوازبێنی ئافرەتێکی ئەنساری کرد بۆ باوکی جولەیبیب کە ئەویش لە ئازاد کراوان بوو. – خوای لێ رازی بێت – ئەویش وتی: با پرسێکی دایکی بکەم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: کەواتە چاکە. ئینجا پیاوەکە کە چوو پرسی ژنەکەی کرد و ئەویش وتی: ئەی خوا نەکات! ئایا پێغەمبەر(ﷺ) کەسی دەست نەکەوت جولەیبیب نەبێ و ئێمە ئەم ئافرەتەمان نەداوە بە فلأن و فلأن؟ ئەنەس ئەفەرموێ: ئافرەتەکە لە پەنای پەردەدا گوێی لێ بوو، ئینجا پیاوەکە هەڵسا هەواڵەکە بباتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا کچەکە ئەڵێ: ئایا ئێوە ئەتانەوێ کارو فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بەرپەرچ بدەنەوە؟ ماتوڵ ئەو رازی یە ژنی بدەنێ. ئینجا باوك و دایکی بیریان کردەوە و وتیان: راست ئەکەیت. ئینجا باوکی رۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەگەر تۆ پێی رازیت ئەوا ئێمەیش رازین. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بەڕاستی من پێی رازیم. ئینجا لێ ی مارە کرد...
هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە هەرکام لەوانە یان هەرچی تر بووبێ ئایەتەکە تایبەتی نابێ بە هیچ هۆیەکەوە، چونکە دیمەن و رواڵەتەکەی گشتی یە، بڕیارو یاسایە هەیە لەلایەن

زانایانەوە کە هۆی هاتنە خوارەوەی حوکم و بڕیای ئایەت تایبەتی ناکەن. بەس ئەو رووداو و هۆیە بەری ئەو حوکم و بڕیارە ئەکەون بە بێگومان. کەواتە ئەوەی لە ئایەتەکە وەرئەگیرێ یاسایەکی گشتی یە زۆر زۆر قوڵ و گرنگە لە دەروون و ژیانی موسڵمانان دا، ئەمە یاسایەکە عەقیدە و باوەڕی لەسەر راگیرە و پێی فەراهەم دێت، بەتێرو تەواوی دامەزراو و جێگیر بوو لە دڵی یەکەم چینی ئەم ئوممەتەدا، دەروون و هەستیان رەنگ کران پێی... ئەو یاسایە کە ئەم ئایەتە ئەگەیەنێ ئەمەیە: نە خۆیان و نە هیچ کارو بڕیارێکیان نابێ بە دەست خۆیان بێت. بەڵکو خۆیان و هەرچی خوا خستوویەتیە ژێر دەستیان بە هێنی خوای سەیر ئەکەن و ئەو خاوەنیەتی و چی لێ ئەکات و چۆنی لێ ئەکات خۆی ئەزانێ. خۆی هەرچی ویست ئەوەیان بۆ هەڵئەبژێرێ، ئەمان رێگای سەر لێ کردنەوە و دەست بژنیان نی یە لە هیچ کارو بڕیارێکی دا، ئەمان هیچ نین جگە لەوە کرێکارێکن خوا بە بەزەیی خۆی کرێ و پاداشتی بۆ بڕیار داون لەسەر هەموو کردەوەیەکی چاك کە تەنها لەبەر خوا بیکەن و هەڵسن پێی. هەرکات موسڵمانان بەو جۆرە بوون و لەسەر ئەو یاسایە بوون ئەو کاتە بەڕاستی خۆیان داوە بە خواو خۆیان مل کەچ و گوێ رایەڵ کردووە بۆ خوا، دەروونیان راست ئەبێتەوە رێك و پێك ئەبێ لەگەڵ هەموو سروشتی بوونەوەردا، بزووتنەوە و گەردش و گەڕانیان رێك و پێك و گونجاو ئەبێ لەگەڵ بزووتنەوە و گەردش و گەڕانی بوونەوەردا ئەو کاتە ئەمانیش لە خولگەی خۆیان دا رێك و پێك و دامەزراو ئەبن بە بێ بەر و دوا وەکو ئەو هەموو ئەستێرانە کە بە موو لانادەن لەوەی بۆیان دیاریی کراوە. لەو کاتەدا دڵ و دەروونیان رازی ئەبێت بە هەر شتێك لای خواوە بێت، چونکە بە دڵ هەست ئەکەن کە خواهیش و بڕیاری خوا کار ئەکات لە هەموو شتێك دا، لە هەموو کەسێك دا، لە هەموو رووداو و بەسەرهاتێك دا، ئەچن بە پیری قەزا و قەدەرەوە بە دڵنیایی و ناسین و ئارامەوە، بەرە بەرە وایان لێ دێت سەر ناکەنەوە لە هیچ کار و بارێك، پەلە نانێنەوە بۆ هیچ رووداو و بەسەرهاتێك، بە دوا کەوتووی سەیر ناکەن لە کات و شوێن و رادەی خۆی. پەلە نانێنەوە بۆ هیچ مەبەست و پێویستی یەکیان، با ئەو مەبەستە بریتی بێت لە سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئاینی خوا! بەڵکو لەگەڵ بڕیارو قەزاو قەدەری خوادا ئەڕۆن و رێگای خۆیان ئەدەنە بەر، بۆ کوێ ئەیانبات با بیانبات، ئەمان رازی و دڵئارامن، ئەوەی لە دەستیان دێت بەختی ئەکەن لە رێگای خوادا و بەرز کردنەوەی ئاڵای خوا بە بێ پەلە نانەوە و تەنگەتاو بوون، بە بێ منەت نان و لە خۆگۆڕان، بە بێ داخ و مەراق، چونکە دڵنیان و باوەڕی بەهێزیان هەیە کە شتێ ئەکەن خوا بڕیاری دابێ

بیکەن، هەرچی خوا بیەوێ تەنها ئەوە بێت، هەموو کاری بەسراوە بە کات و شوێنی دیاریی کراو و تایبەتی خۆیەوە، بە کورتی ئەو کەسەی کە بە رێکی بە پێی یاسای ئەم ئایەتە ئەجوڵێتەوە و رەفتار ئەکات بە بێ سنوور و مل کەچ و گوێ رایەڵە بۆ دەستی قودرەتی خوا، دڵ ئارامە بەو دەستە قودرەتەی کە سەرکردایەتی ئەکات، بە سووک و ئاسان و ئارام و باوەڕەوە ئەکەوێت لەبەر دەم ئەو دەستە قودرەتەدا. لە عەینی کات دا چی لە دەستی دێت لە تێکۆشان و کۆشش و کردەوەی هەڵنەسێ پێی، کات و کۆششی خۆی زایە ناکات.

ئینجا خۆی تەنگەتاو ناکات و زۆرە زمایی لەگەڵ خۆی بەکار ناهێنێ، هەوڵی شتێك نادات لە توانای بەدەر بێت، نایەوێ لە ئادەمێتی دەرچێ و سیفەت و نیشانەی ئادەمێتی لە خۆی داڕنێ، ئیدیعای شتێ ناکات کە لە دەستی نەیەت و توانای نەبێ بەسەری دا، پێی خۆش نی یە وەسف و سەنای بکرێ بە کردەوەیەك نەیکردبێ، شتێ ناڵێ کە نەیکات.

ئەم هاوتایی و هاوکێشی یە لە نێوان ئەو مل کەچی یە بێ سنوورە بۆ خواهیش و بڕیاری خوا، کردەوە و تێکۆشان بە پێی دەسەڵات و توانا، بە ئارامەوە وەستان لە سنووری دەسەڵات و تواناد... ئەم هاوتایی و هاوکێشی یە سیفەت و نیشانەی یەکەم کۆمەڵ بوو لەم ئوممەتەدا و بەوە جوێ بوونەوە لەناو هەموو کۆمەڵ و گەلانی جیهان دا، ئەو سیفەت و نیشانە شایانی کردن بۆ هەڵگرتنی سپاردەی قورس و گەورەی ئەم عەقیدە و ئایینە، بەهۆی ئەوە توانیان ئەو گۆڕانە گرنگە گشتی یە بێنن بەسەر ژیان و جیهان دا کە هەموو مێژوو و ژیریی و فەلسەفەیەك تیای دا سەرسام و سەرگەردانە. لە بیرکردنەوە لەم ئایەتەدا بەم جۆرە کە دەست نیشانی بۆ کرا روون ئەبێتەوە کە ئەم ئایەتە گشتی و فراوان ترە لەوەی ببەسترێ بە هەر بەسەرهات و رووداوێکی تایبەتی یەوە کە ئەم ئایەتەی تیادا هاتبێتە خوارەوە. ئەم ئایەتە یاسایەکی گرنگی گشتی بنەڕەتی و سەرەکی یە لە ئایینی پاکی ئیسلام دا!

ئینجا باس دێتە پێشەوە لەبارەی هێنان و مارە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ زەینەبی کچی جەحش - خوای لێ رازی بێت - لەگەڵ تەمێ و بڕیارو حوکمێ کە پەیوەندی هەیە بەو رووداوەوە، ئەمانەش هەموو لەم دوانزە ئایەتانەی داهاتوودا. لە سەرەتای سورەتەکەوە تێپەڕی کرد و باسی هەڵوەشاندنەوەی باوی(تبنی) واتە گێڕانی کەسێکی بێگانە بە کوڕ، وەکو باس کرا، راگیر کردنی پەیوەندی خێزان لەسەر بنەڕەتی سروشتی خۆی، بەڵام ئەو رژێمە دەق پێوە گیراوە بەرهەمی خۆی هەر هەبوو لە ژیانی گەل و کۆمەڵی عەرەب دا، جێگیر و دامەزراو بوو لە دڵ و دەروونیان دا، بە جۆرێ نەهێشتنی ئەو بەرهەم و ئاسارە هەروا بە

سووك و ئاسان پێك نەئەهات، چونكە شتی كۆمەڵایەتی كە بوو بە باو و دامەزرا زۆر بەتین و بەهێز لە دەروون دا، نەهێشتنی پێویست ئەكات بە هەڵسان بە چەند كردەوەیەكی دژ و پێچەوانە و دژانە لە یەكەم جارەوە بێزراون لەناو گەل دا و زۆر بە بێزاری یەوە سەرنج ئەدرێن، زۆر قورسن لە دەروون دا.

لەپێشەوە باس كرا كە پێغەمبەر(ﷺ) زەینەبی كچی جەحشی پورزای خۆی مارە كرد لە زەیدی كوڕی حاریثە كە لە پێشەوە بڕیاری كوڕێتی بەسەردا درا بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە(ص) و بانگ ئەكرا بە زەیدی كوڕی محمد لە پاش دا بەناوی باوكی خۆیەوە بانگ كرا لەسەر فەرمانی خوا. زەینەب – خوای لێ رازی بێت – ئەو شوو كردنەی پێ ناخۆش بوو لە رووی پێغەمبەردا(ﷺ) داما، مەبەستی پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەبوو بەو شووكردنە یەكسانی ئادەمی دامەزرێنێ لەناو گەل دا بە كردەوە و ئەو جیاوازی و رەگەزایەتی یە نارەوای ناو گەل لە ریشە بێنێ.

ئینجا خوا ویستی ئەركی نەهێشتنی بەرهەم و دروشمی رژێمی(تبنی) بخاتە سەرشانی پێغەمبەر(ﷺ) بەم رەنگە لەپاش تەڵاق دانی و بەسەر چونی عیدە زەینەت بخوازێ كە بە گوێرەی باوی ناو عەرەب بوكیەتی و خواستنی رەوا نی یە، خوا ویستی كە پێغەمبەر خۆی بە كردەوە بەرەنگاری ئەو باوە بوەستێ و نەیهێڵێ، كە كەسی تر نەیئەتوانی هەڵسێ بەو كردەوە و بەرەنگاری یە لە ترسی تانە و لۆمەی ناو گەل. خوای گەورە خستی یە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) كە زەینەب تەڵاق ئەدات – خوایان لێ رازی بێت – و ئەم مارەی ئەكات، لەبەر ئەوەی بزانرێ كە خواستنی ئەو جۆرە ئافرەتانە رەوا و دروستە. وەكو لە ئایەتەكەدا دێت. پەیوەندی نێوانی زەید و زەینەب ناڕێكی بوو هەر لە یەكەم جارەوە بە رێكی نەهات، چونكە زەینەب ئەو شوو كردنەی پێ ناخۆش بوو، لە رووی پێغەمبەر(ﷺ) داما ئەگینا نەیئەكرد. زەید جار بەجار ئەهاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دادی بوو لەو ناڕێكی و نەگونجاوی یە، ئەیوت: كە بە هیچ كلۆج نایانكرێ و ئەبێ دەستی لێ هەڵگرێ، پێغەمبەر(ﷺ) هەرچەند لە هەموو كەس نەترس تر و ئازاتر بوو، لە كاروباری ئایینی دا، لە رێگای بەجێ هێنانی فەرمانی خوادا باكی نەبووە لە هیچ شتێك، گوێی نەبووە لە تانە و لۆمەی لۆمە كەران، بەڵام ئەوەی خوا خستبوویە دڵیەوە لەبارەی زەید و زەینەبەوە زۆر قورس و بەتین بوو لە دەروونی دا، لەبەر ئەوە ئەیفەرموو بە زەید لە خوا بترسە و دەست هەڵمەگرە لە ژنەكەت. ئینجا با گوێ بگرین بۆ ئایەتە بەفەرەكان ئەو رووداوەمان بۆ باس بكەن.

﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ﴾

**ئەفەرمویٰ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ﴾ باسی کاتیٰ بکە کە تۆ ئەڵێیت بە کەسیٰ کە خوا بەهرەی رشتووە بەسەری دا بەمەی خستی یە سەر رێگای راست و کردی بە موسڵمان، بە نزیك خستنەوەی لە پێغەمبەرەکەیەوە و خۆشەویست کردنی لە دڵی دا، تا ئەو رادەیە کردی بە کوڕی خۆی و نایە جێگای کوڕ، ﴿وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ﴾ تۆیش چاکە و بەهرەت رشت بەسەری دا ئازاد کردن و پەروەردە و پێگەیاندن و چاودێریی بەخێو کردن بە سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی یەوە، واتە ئەتگوت بە زەیدی کوڕی حاریثە کاتیٰ کە لە دەست ژنەکەی شکانی بۆ هێنای دادی کرد لە دەستی و ویستی تەلاقی بدات: ﴿أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ﴾ ژنەکەت لای خۆی راگیر کە و دەستی لیٰ هەڵمەگرە ﴿وَٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ لە خوا بترسە لە کاری ئەو ئافرەتەدا و تەلاقی مەدە بۆ ئەمەی زیانی پیٰ بکەیەنیٰ، ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ﴾ لە دەروونی خۆت دا شتێك ئەشاریتەوە کە خوا دەرخەریەتی و ئاشکرای ئەکات، ئەترسی لە تانەو لۆمەی خەڵك ﴿وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ﴾ لە کاتێك دا خوا شایانترە بە ترسانت لیٰ ی لە هەموو کارێك دا، کەواتە ئەوەی خوا رەوای داوە بۆت و ئیزنی داوە بیکە... ئەوەش ئەوە بوو کە خوا خستبوویە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) کە زەینەب ئەخوازیٰ لەپاش تەلاق دانی زەید، ئەوەش شتیٰ نەبوو بە روونی خوا فەرمانی پیٰ دابێت ئەگینا بە هیچ رەنگ سەری لیٰ نەئەکردەوە و بیٰ پێچ و پەنا و دوو دڵی دەری ئەبڕی بە گورجی و بیٰ دواخستن هەرچی لیٰ پەیدا ببوایە و رووی بدایە. بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) وەکو پێگیرا بێت لە نێوان دوو شت دا: یەکەم ئەوە خوا خستبوویە دڵی. دووەم: زۆر قورسی ئەو کارە لە دەروونی خەڵك دا بەهۆی ئەوەوە مەترسی دەربڕی لیٰ یان، هەتا خوا هۆی بەدی هاتنی پێك هێنا، بەم رەنگە زەید خێزانی تەلاق دا، نە زەید و نە زەینەب نەیان ئەزانی لەپاش ئەو تەلاق دانە چی روو ئەدات، هەرگیز بە دڵی هیچ کامیان دا نەئەهات ئەوەی خوا خستبوویە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) چونکە بە پیٰی باوی خەڵکی زەینەب بە بووکی پێغەمبەر(ﷺ) دائەنرا و بە هیچ کلۆج تازە خواستنی رەوا نی یە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تەنانەت دوای هەڵوەشاندنەوە و نەهێشتنی**

باوی(تبنی) هێشتا بڕیاری ڕەوادانی ئەو جۆرە ئافرەتانە نەهاتبووە خوارەوە، بەڵکو بەم ڕووداوی خواستنی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەو یاسایە هات و بڕیار درا، لەپاش ئەوە ئەو بڕیارە زۆر بە سەر سامی یەوە وەرگیرا و بە بێزاری یەوە بە پیرەوە چوونی بۆ کرا.

ئینجا با بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم ڕووداوە و تەفسیری ئەم ئایەتانە ڕاست ترین ریوایەت بێنم کە(سوفیانی کوڕی عویینە) ئەیهێنێ لە ئیمام(زین العابدین) ەوە - خوا لێ ی ڕازی بێت - سوفیان ئەفەرموێ: علی کوڕی زیدی کوڕی جدعان فەرموی: ئیمام زین العابدین پرسیاری لێ کردم کە حسن چی ئەڵێ لەم ئایەتەدا: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ منیش وتم: حسن ئەڵێ: کاتێ زەیدی کوڕی حاریثە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەوێ زەینەب تەڵاق بدەم پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی خۆش بوو لە دڵەوە و پێ ی فەرمو: ژنەکەت ڕاگیر بکە و لە خوا بترسە. ئیمام زین العابدین فەرموی: نەخێر بەو جۆرە نی یە، بەڵکو بەم جۆرە بووە: خوا پێغەمبەری ئاگادار کرد کە زەینەب لە پاش دا یەکێ ئەبێ لە هاوسەرانی، زەید تەڵاقی ئەدات، ئینجا کاتێ زەید هات وتی: ئەمەوێ تەڵاقی بدەم، ئەویش پێ ی فەرمو ڕاگیری بکە. بەهۆی ئەوە خوا سەرزەنشتی کرد و فەرموی بۆچی ئەڵێیت بە زەید ژنەکەت لەکاتێك دا من ئاگادارم کردی کە ئەبێ بە حەلاڵ و هاوسەرت، ئەمە شایان و شایستەیە بە حاڵی پێغەمبەران - سەلامی خوایان بێ بێت - هەر ئەمە ڕێك و پێکە لەگەڵ دەقی ئایەتەکەدا، چونکە خوا هەواڵی دا کە ئەوەی لە دڵی پێغەمبەر دایە ئەو دەری خات و ئەوەی کە دەری خست هەر مارە کردنەکەی بوو کە دەری خست بەوەی کە فەرموی: ﴿زوجناکها﴾ ئەگەر بێجگە لەوە لە دڵی دا بوایە ئەبوایە دەری خستایە ئەگینا - نعوذ بالله - هەواڵەکەی خوا ئەبێ ڕاست دەرنەچێ، کەواتە نە خۆش ویستنی زەینەب و نە حەز لە تەڵاق دانی لە دڵی پێغەمبەردا نەبووە. بەڕاستی ئەمە بەڵگە و نیشانەیەکی زۆر ڕوون و ڕەوان و ئاشکرایە هەرکەس تێگەیشتنی ببێ بێجگە لەمەی کە وترا هیچی تر ناڵێ.

بەم شێوە ڕێك و ڕوون و ڕەوانە کە باس کرا و کە هەر ئەمەش ڕێك و گونجاوە لەگەڵ ئایەتەکان دا و لەگەڵ ڕەوشتی پاکی پێغەمبەردا(ﷺ) بەم شێوە ڕوون و ئاشکرایە ئەڕووخێ و لەبەر چاو ون ئەبێ ئەو هەموو ریوایەتانەی کە گێڕراوەتەوە لەبارەی ئەم ڕووداوەوە، دوژمنانی ئیسلام لە کۆن و تازە دەستیان پێوە ئەگرن و فیك و فاك و پڕ و پاگەندە بڵاو ئەکەنەوە و دەم درێژیی ئەکەن و نازانن دەریا لوشی گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) بە دەمی سەگ گلاو نابێت و هیچ لەکە و چڵك و چەپەڵی یە ئەرامەم نایەت و ڕووی تێ ناکات.

﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُ ۚ﴾

---

**کارو ڕووداوەکە بێ لەکە و بێ گەردە بەم جۆرە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا﴾ ئینجا کاتێ زەید پێویستی نەما بەو ئافرەتە و بێزار بوو لێ ی و تەڵاقی دا و عیدەی بەسەر چوو ﴿زَوَّجْنَٰكَهَا﴾ ئێمە ئەو ئافرەتەمان لێ مارە کردی ﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ﴾ بۆ ئەمەی هیچ تەنگی و گوناهو تاوانێ نەمێنێ لەسەر بڕواداران لە خواستن و مارە کردنی ژنانی ئەوانەی کە بە کوڕتان ناو ئەبرین و لەڕاستی دا کوڕی ئەوان نین، ﴿إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا﴾ کاتێ کە ئەوان پێویستی یان نەما پێ یان و تەڵاقیان دان. عیدەیان بەسەرچوو. بەڕاستی ئەم ڕووداوە یەکێ بوو لەو ئەرکە قورس و گرانانەی کە خرابوونە سەرشانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێگای گەیاندنی پەیامەکەی دا، بەرەنگاری ئەو گەلەی پێ کرد کە زۆر بێزار و دژی ئەو کارە بوون، تا ڕادەیەك خەریك بوو دوو دڵ بێت و لە ڕووی نەئەهات هەڵسێ پێ ی کە لە هیچ کارێکی سەخت و گرانتری ئەو ئایین و پەیامەی دا بەو جۆرە نەبوو، بەڵکو بێ سەر لێ کردنەوە و پێچ و پەنا هەڵساوە پێ ی ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾ هەمیشە کارو فرمانی خواکراو وبەجێ هاتووبووە. بەرپەرچ دانەوەی نابێ وخۆلادان و ڕاکردن نی یە لێی.**

**لەپاش تەلاق دان و تێپەڕ کردنی عیدە پێغەمبەر(ﷺ) زەیدی نارد بۆلای زەینەب – خوا لێ یان ڕازی بێت – خوازبێنی لێ بکات وەکو ئەنەسی کوڕی مالیك ئەگێڕێتەوە: ئەفەرموێ: کاتێ کە عیدەی زەینەب دوایی هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی بە زەیدی کوڕی حاریثە: بڕۆ بۆلای و باسی بکە بۆ من. ئەویش ئەڕوا و سەرنج ئەدات هەویر ئەشێلێ. زەید ئەڵێ: کە چووم ئەوەندە لە دڵم دا گەورە بوو نەم توانی ڕوو بەڕووی بوەستم و سفارشەکەی پێ ڕابگەیەنم. ئینجا پاشەڵپاش گەڕامەوە و پشتم تێ کرد و وتم: ئەی زەینەب مژدە بێت، پێغەمبەر(ﷺ) منی نارد ئەو باسەت پێ ڕابگەیەنم. ئەویش وتی: من هیچ ناکەم هەتا نوێژی**

ئیستیخاره نەکەم و هەڵسا بۆ جێگە نوێژەکەی، قورئان هاتە خوارەوە بەو جۆرە کە بیستمان، پێغەمبەر(ﷺ) بە بێ پرس و ئیزن خواستن چوو بۆماڵی زەینەب[1].

بوخاری لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرموێ: زەینەب کەشخە و شانازی ئەکرد بە مل حەرەمەکانی تری پێغەمبەردا(ﷺ) خوا لەوانیش رازی بێت، ئەیگوت: ئێوە کەس و کارتان مارەی بڕیون من خوا مارەی بڕیوم لە ژووروی حەوت ئاسمانەوە. ئەم رووداوە بەو شێوە بەدی هات، بەڵام نەك بە سووك و ئاسان، بەڵکو شتێك بوو کۆمەڵی موسڵمانان بە هیچ رەنگ چاوەڕوانی نەبوون، هەبوو بەهۆی دەم کردنەوە و دەم درێژیی ناپاکەکان، ئەیانگوت: محمد ژنی کوڕەکەی خۆی خواست، ئەو دەم درێژیی ئەوانە مایەوە بۆ هەموو تاقم و چینە ناپاکەکان کە شوێنی ئەوان کەوتن لە پاش خۆیان. ئینجا لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلە و رووداوە هۆی داهێنان و دامەزراندنی یاسا و بیر و بڕوایەکی تازە بوو قورئان لەسەری ئەڕوا و بەمێزی ئەکات، هۆی سەر لێ کردنەوەی تیا ناهێڵێ، ئەیگێڕێتەوە بۆ سەرچاوە و بنەڕەتەکەی خۆی، ئەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ﴾ هیچ گوناهو ئەرەجێك لەسەر پێغەمبەر نی یە، هیچ لەکەو تەشەری نابێ رووی تێ بکات لە هەر بەشێ کە خوا خۆی رەوا و بڕیاری دابێ، واتە خوا بڕیارو رەوای داوە خواستن و هێنانی زەینەب، نەهێشتن و هەڵوەشاندنەوەی باوی عەرەب لە قەدەغە کردنی ئەو جۆرە ئافرەتانەدا، کەواتە هیچ خراپی و ناڕەوایی یەك نی یە لەو کارەدا، پێغەمبەر(ﷺ) نابێ ببێ بە جێگای لۆمە و تانە کە کردنی هەرشتێ بۆی رەوا درا بێ. یەکەم کەس نی یە لەناو پێغەمبەران دا لەو بارەیەوە، بەڵکو ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُۚ﴾ خوا بەو جۆرە باو و رەوشتی خۆی دامەزراند لەناو پێغەمبەرانی کە تێپەڕیان کرد لەمەوپێش، کەواتە ئەم کارە بەدی دێت بە پێی باو و رەوشتی خوا کە ناگۆڕێ و گۆڕان رووی تێ ناکات، ئەو باو و رەوشتەی کە شتی راستەقینە ئەهێنێ و راست دائەهێنێ، نەك بە پێی باو و تێگەیشتنی دەست کردی ئادەمی کە لەسەر بنەڕەتێ دانەمەزراوە و سەرچاوەیەکی راستەقینەی نی یە.

---

[1] ئیمامی ئەحمەد ئەم حەدیسە ئەگێڕێتەوە. موسلیم و نەسائیش ئەیهێنن لە رێگای سولەیمانی کوڕی موغیرەوە.

وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ

وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ

﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ کارو کردەوەیی خوا شتێکی بڕیار دراوە لەلایەن خواوە، کەواتە ئەبێ بەدی بێت، هیچ کەس و هیچ شتێك لە روویان دا ناوەستێ و ناتوانێ بەرگری بکات، هەموو کارێکی بە ئاگاداری زانین و لێزانی یەوە بڕیار دراوە، هەموو شتێ کێشراوە، تێبینی مەبەست و ئامانج و بەرهەمی تیا کراوە، ئەنداز و رادە و کات و شوێنی زانراوە و دیاریی کراوە، بێگومان خوا فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە بە خواستنی زەینەب ئەو باوە ناڕەوای عەرەب تێك بدات و بە کردەوە دروشمی نەهێڵێ، بە نەفسی خۆی ئەوەی رێك و راست و رەوایە بەدی بێنێ، هیچ چارە نی یە ئەبێ خواست و ویستراوی خوا بەدی بێت. ئەو باوە نەگۆڕاوەی خوا تێپەڕی کرد دەربارەی ئەوانە کە هاتن و رۆیشتن کە ﴿ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ﴾[1] کەسانێ بوون پەیامەکانی خوایان راگەیاند، ﴿وَيَخْشَوْنَهُۥ﴾ ئەترسان لەخواو شەرم و بیمی خوا لە دڵیان دا جێگیر بوو، ﴿وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ﴾ نەئەترسان لە هیچ کەسی تر بێجگە لەخوا و شەرمیان لە کەسی تر نەئەکرد. کەواتە لە کاروباری پەیامەکان و راگەیاندنیان گوێ یان لە هیچ کەسی تر نەئەکرد. کەواتە لە کاروباری پەیامەکان و راگەیاندنیان گوێ یان لە هیچ کەسی تر نەبوو جگە لەو خوایەی کە رەوانەی کردن بۆ راگەیاندنی پەیام و سروشەکەی، رەفتار پێ کردن و بەجێ هێنانی فەرمان و بەدی هێنانی داواکەی، ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ بەسە خوا بۆ لێ ترسان، بۆ لێپرسینەوە و موحاسەبە کردنی بەندەکانی، کەواتە هیچ کەسی تر شایان نی یە بۆ شەرم لێ کردن و لێ ترسان. واتە ئەی پێغەمبەر تۆیش بە وێنەی ئەوان باکت لە قسەی کەس نەبێ و شەرم مەککە لە راگەیاندنی هیچ کارو فەرمانێکی خوادا، کە یەکێ لەو کارانە خواستنی زەینەبە کە خوا پێویستی کرد لەبەر نەهێشتنی ئەو باوو قەدەغە ناڕەوایە لەناو عەرەب دا، ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ﴾ محمد باوکی هیچ کەس و هیچ کام لە پیاوەکانتان نی یە، کەواتە زەید کوڕی محمد نی یە بەڵکو کوڕی حاریثەیە، زەینەب بووکی محمد نی یە تا خواستنی رەوا نەبێ، هیچ ئەرەج و خراپی یە نی یە لەم کارەدا کاتێ بە چاوی ژیریی و راستی سەرنج بدرێ.

[1] بێگومان ئەم کردەوە و رووداوانە کە لەم ئایەتەدا هەن رابوردوون، بە شێوەی ئێستا و دڵماتوو وترلون بۆ ئامادە کردنی ئەوانە و خستنیانە بەرچاو، جا لەبەر ئەوە بە رابوردوو تەفسیرم کردنەوە.

وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾

پەیوەندی نێوان محمد و هەموو موسڵمانان – کە زەیدی کوڕی حاریثە یەکێکیانە – پەیوەندی پێغەمبەرە بە گەل و ئوممەتەکەیەوە، نەك پەیوەندی باوك بە کوڕەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ بەڵکو محمد فروستادە و رەوانە کراوی خوایە و دواتر و خاتەمی هەموو پێغەمبەرانە... کەواتە یاسا و رژێمێ کە دەست بدات بۆ مانەوە و هەمیشەیی بێت، بۆ ئەمەی ئادەمی لەسەری بن، بە پێی دواترین پەیامی ئاسمان بۆ زەوی، کە بە هیچ رەنگ گۆڕان و گۆڕاندن و ئاڵ و گۆڕی تیا نەبێت و نەکرێ. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ خوا هەمیشە زانا و ئاگایە بە هەموو شتێك، کەواتە خوا خۆی ئەزانێ چی شایانە بۆ ئەم ئادەمی یە، چی بە کەڵك و بەکارە بۆی و چاکی ئەکات، ئەو خوایە ئەم کاری خواستن و مارە کردنەی پێویست کرد و هەڵیبژارد بە پێی زانین و لێزانی و کاردروستی خۆی، بە پێی ناسین و زانین و ئاگاداری بێ سنووری بە چاك تر و شایانتر و رێك و گونجاو ترین شەریعەت و یاسا کە داینا بۆ بەندەکانی بە رەحم و بەزەیی خۆی.

ئینجا فەرمان ئەدات بە بڕواداران بە پەیوەستی و بەستنەوەی دڵ و دەروونیان بە خواوە بەیاد و باسی خوا، ئەو خوایەی کە بە بەزەیی یە پێ یان و ئەیەوێ لە تاریکی رزگاریان بکات بۆ رووناکی، ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ یاد و باسی خوا بکەن بە یاد و باسێکی زۆر.

باس و زیکری خوا پەیوەستی و بەستنەوەی دڵە پێ یەوە، خەریك بوونی دڵە بە ئاگاداری و چاودێریی خواوە، باس و زیکری خوا تەنها جوڵانەوەی دەم و زمان نی یە، بەجێ هێنانی نوێژ بە رێك و راستی باس و زیکری خوایە، بەڵکو چەند حەدیس و هەواڵێ هەیە لەوانەن زیکر و باسی خوا تایبەت بکەن بە نوێژی راستەقینەوە:

ئەبو داود و نەسائی و ئیبن ماجە حەدیسێ ئەهێنن لە ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرەوە – خوایان لێ رازی بێت – کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: کاتێ پیاو خێزانی خۆی لە خەو هەڵساند و دوو رکات شەو نوێژیان کرد، ئەوانەی لەو شەوەدا لەو پیاو و ئافرەتانە ئەبن کە بە زۆری زیکرو یادی خوا ئەکەن.

ئەگەر چی باس و زیکری خوا زۆرتر و فراوانترە لە نوێژ، بەم رەنگە هەموو شێوەیەك ئەگرێتەوە کە بەندە باس و یادی خوای تیا بکات، دڵی پەیوەست ببێ پیّ یەوە، ئیتر بە ئاشکرا و دەنگی بەرز ئەو باس و یادی خوای تیا بکات، دڵی پەیوەست ببێ پیّ یەوە، ئیتر بە ئاشکرا و دەنگی بەرز ئەو باس و زیکرە بکات یان ئاشکرای نەکات و لەسەرخۆ بیڵێ. مەبەست ئەو پەیوەندی بەستنەوەیە کە کار ئەکات و بەندە ئەخاتە جوڵان و بزووتنەوە. دڵ بۆش و سەرگەردان و بێ هۆش و بێ ئاگایە تا بەڕاستی پەیوەندی ئەکات بە خواوە و یادی ئەکات و ئولفەتی پێوە ئەگرێ، ئینجا کوت و پڕ ئەبێ بە دڵێکی تر، ڕێگای خۆی ئەناسێ و بەرنامەی خۆی ئەناسێ، ئەزانێ لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ ئەڕوات و هەنگاو ئەگوێزێتەوە! چا لەبەرئەوە قورئان و حەدیس بە زۆری هانی بەندە ئەدەن لەسەر باس و یادی خوا، پەیوەستی ئەخەنە نێوان ئەو باس و یادە و ئەو کات و بەسەرهاتانەی کە ئادەمی تێپەڕ ئەکات بەلایاندا، بۆ ئەمەی ئەو کات و بەسەرهاتانە بیر خەرەوە بن بۆ ئەو باس و یادە، ئاگادار کەرەوە بن بۆ پەیوەستی و بەستنەوەی دڵ پیّ یانەوە تا دڵ بێ ئاگا نەبێ و خوای خۆی لەیاد و لەبیر نەچێ. وەکو لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَسَبِّحۡهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا﴾ بە پاکی باس و یادی بکەن لە بەیانی و ئێوارەدا. ئەم دوو کاتە زۆر گرنگن. گۆڕانی شەو بە ڕۆژ و ڕۆژ بە شەویان تیا فەراهەم دێت، کە دوو بەڵگەی روون و ئاشکران لەسەر خوایەتی خوا، کەواتە کاتی هۆش کردنەوەو ئامادەبوونی دڵ و دەروونن بۆ یاد و پەرستنی خوا، کاتی حازر بوونی مەلائیکە و یەك گرتنی تاقمی شەو لەگەڵ تاقمی ڕۆژ و گۆڕانیان لە جێگای یەکتردا. کەواتە ئەو دوو کاتە مافی خۆیانە بە تایبەتی باس بکرێن، هەرچۆنێ مافی خۆیەتی بە تایبەتی فەرمان دان بە(تەسبیح) لەپاش فەرمان دان بە زیکر و باس و یادی خوا بە شێوەی گشتی.

لەپاش فەرمان دان بە باس و یادی خوا ئینجا دڵ بێدار ئەکاتەوە بە بەزەیی خوا دەربارەی بەندەکانی و چاودێریی یان و بە گرنگ گرتن و نیازی خێرو چاکەیان، لە کاتێك دا کە ئەو هیچ جۆرە پێویستی نی یە بە بەندەکانی و بەندەکانی لە هەموو بارو رووبەکەوە پێویستی و ناچارن بەو، بێگومان ئەو بێدار کردنەوە هاندانە لەسەر باس و یادی خوا، پاڵ پێوەنەرێکی بەهێزە بۆ ئەو یاد و باسی پاکی خوا و پەرستنی بە هەموو سۆز و پەرۆشێکەوە،

ئەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيۡكُمۡ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ ﴾ خوا کەسێکە کە ڕەحمەت و بەزەیی ئەڕژێنێ بەسەرتان دا، مەلائیکەتەکانی داوای لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهو تاوانتان بۆ ئەکەن لە خوا، بە گرنگ ئەتانگرن و خێرو چاکەی ئێوەیان ئەوێ.

لە لوتف و بەزەیی خوا بە زیاد بێت ئایا بەندەکانی خوا چی یان ئەوێ؟! ئایا چ رادە و پلەیەك لەوە بەرز و بڵند ترە؟ خوا باسی ئەم بەندە لاوازە بێ دەسەڵاتە بکات، کە هەموو گیان و لەشی پڕە لە ناتەواوی و پێویستی، خوا باسیان بکات، بە گرنگ بیانگرێ. خۆی و مەلائیکەتەکانی سەڵەواتیان لێ بدەن، خوا باسیان بکات لەناو کۆمەڵی هەرە بەرزی مەلائیکەدا بە چاکە، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ لە حەدیسێك دا کە بوخاری هێناى: خوا ئەفەرموێ: هەرکەس لە دەروونی خۆی دا باس و یادم بکات، منیش لای خۆم باسی ئەکەم، هەرکەس لەناو خەڵك و کۆمەڵ دا باس و ناوم ببات بە چاکە منیش باسی ئەکەم بە چاکە لەناو گەل و کۆمەڵێك دا کە چاکترە لە گەل و کۆمەڵەکەی ئەو... بێگومان ئەوە پایە و پلەیەکی ئێجگار گەورە و بەرزە زانین و تێگەیشتنی ئێمە پیای دا ناگات، کاتێ ئێمە ئەزانین ئەم زەوی یە و هەرچی وا بەسەری یەوە هیچ نی یە بێجگە لە بەش و پارچەیەکی بچووکی لاواز لە چاو ئەو هەموو ئاسمان و ئەو هەموو قەبارە گەورە گەورانەدا، کە بۆ ئێمە نایەنە ژمارە، ئەوانەش بە تێکڕایی هیچ نین جگە لەوە هەندێکن لە موڵك و بەرهەمی دەسەڵاتی بێ سنووری خوا، کە هەموو ئەوانە فەراهەم هاتن تەنها بەوە خوا فەرموی: ببە و ئیتر بە بێ وەستان بوون بەو جۆرەی کە خوا ویستی!! خوا و مەلائیکەتەکانی سەڵەواتتان لێ ئەدەن، ﴿لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ﴾ بۆ ئەمەی خوا ئێوە دەربێنێ لە تاریکی یەکانی بێ بڕوایی و تاوان و خوا نەناسی بۆلای رووناکی بڕوا و گوێ رایەڵی و خواناسی. رووناکی یەکەی خوا تاکە رووناکی یەکە و پەیوەستە و گشتی یە، بێجگە لەو تاریکی یەکانە و جۆر بەجۆر و جیاوازن، هەرکەس لە رووناکی خوا دەرچێ لە تاریکی ئەو تاریکی یانەدا ئەژی، یان لە هەموویان دا بە کۆ و بە تێکڕایی، هیچ شتێ خەڵکی رزگار ناکات لە تاریکی جگە لە رووناکی کە شوعلە و بریقە ئەداتەوە لە ناو دڵ دا، گیان و رۆح دائەگرێ، رێنموونی ئەکات بۆ رێگای سروشت، کە رێگای هەموو ئەم بوونەوەرەیە، جا رەحمەتی خواو نزا و تکای مەلائیکە بۆ بەندەکانی خوا، ئەو بەندەیانە دەرئەهێنێ لە تاریکی یەکانەوە بۆ رووناکی کاتێ قاپی دڵەکانیان کرایەوە بۆ ئیمان و باوەڕ،

﴿وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ خوا هەمیشە زۆر بە بەزەیی یە بە بڕواداران. کاری باوەڕ داران لەم جیهانەدا کە جێگای کردەوەیە و بەو جۆرەیە کە باس کرا، لە ڕۆژی دوایی دا کە ڕۆژی پاداشت دانەوەیە بەم جۆرەن کە ئەفەرموێ: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا کە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، بە تەواو ڕوو ئەکەنە خوا بە بێ ئەوەی دڵیان خەریك ببێ بە شتی ترەوە. لەو ڕۆژەدا ڕێز گرتن و بەخێر هاتن و خۆش هاتنیان بە وشەی سەلامە و پێ یان ئەوترێ: سلام علیکم. ئەو وشەیە بەفەڕە وەرئەگرن لە خوای خۆی وەکو لە چەند حەدیسێك دا هاتووە، یان لە مەلائیکەی وەرئەگرن ئیتر لەلایەن خواوە پێ یان ئەگەیەنن وەکو لە حەدیسی تردا هاتووە، یان هەر لەلایەن خۆیانەوە وەکو لەم ئایەتەوە وەرئەگیرێ: ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم﴾ [1] ئەو خوا پێداوانە ئەو وشەیە بەفەڕە وەرئەگرن کە بێجگە لە ڕێز و نرخ پێدان دڵ ئارامیان ئەکات لە هەرشتێ مەترسی لێ بکرێ و دڵ نایەوێ زیاد لەو ڕێز و ئارام پێدانە، ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا﴾ ئامادەی کردووە بۆیان پاداشتێکی بەڕێز و شیرین بە لێشاو، خوا بە بەزەیی خۆی بێبەشمان نەکات.

---

[1] واتە مەلائیکەتەکان لە هەموو قاپی یەکانی بەهەشتەوە ئەچن بۆلایان و ئەڵێن پێ یان سلاوتان لێ بێت. یان مەبەست سەلام لێ کردنیانە بەهەر سێ جۆرەکە.

**ئینجا باسی کارو فرمانی پێغەمبەر ئەکات(ﷺ) مەبەست لە رەوانە کردنەکە روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ ﴾ بێگومان ئێمە تۆمان رەوانە کردووە بە فروستادە بۆ سەر خەڵکی بە جۆرێ ﴿ شَٰهِدٗا ﴾ شایەت بیت بەسەریانەوە ﴿ وَمُبَشِّرٗا ﴾ موژدە دەر بیت، ﴿ وَنَذِيرٗا ﴾ ترسێنەر بیت، ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ ﴾ بانگ کەر بیت بۆلای خوا بە پێی ئیزن و راو بڕیاری خوا، بەهۆی رێك خستن و ئاسان کردنی خوا، ﴿ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴾ چرایەکی رووناکی رووناك کەرەوە بیت. کەواتە کارو فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەیە کە شایەت بێت بەسەر ئەم ئوممەتەوە چاودێریی یان بکات و سەرنجی کردەوەیان بدات و لە رۆژی دوایی دا شایەتی بدات بەوەی کە ئەیزانێ لەبارەی ئەم ئوممەتەوە، هەروەها شایەتە بۆ هەموو پێغەمبەران – دروودی خوایان لێ بێت – کە ئایینی خوایان راگەیاندوە و هەڵساون بە کارو فرمانێ کە خراوەتە سەرشانیان لە لایەن خواوە.**

**شایەتی دانی بۆ یەکەم تاقمی ئوممەتەکەی جێگای قسە و باس نی یە چونکە بە پێش چاوی یەوە بوون و ئەیزانی کێ باوەڕی هێنا و کێ نەیهێنا، بەڵام بۆ تاقم و چینەکانی پاش خۆی جێگای لێکۆڵینەوەیە، کەواتە ئەبێ شایەتی دانەکەی لەسەر ئەوەیە کە کردەوەکانی ئوممەت، چ چاك، چ خراپ لە هەموو هەفتەیەك دا، یان زیاتر یان کەمتر بەهۆی مەلائیکەوە نیشانی ئەدرێن، وەکو لە حەدیس دا هاتووە، ئیتر باعەینی خاوەن کردەوەکان ئەناسێ، یان بەهۆی قورئانەوە ئەو شایەتی یە ئەدات، کە هەواڵی داوە بە نووسینی هەموو کردەوەیەك لەم جیهانەدا، کەواتە هەرکەسێ هەرچی لەسەر نووسراوە راستە، هەروەها شایەتی دانی بۆ پێغەمبەران – دروودی خوایان لێ بێت – بەهۆی قورئانەوە کە هەواڵی دا بە راگەیاندنیان و هەڵسانیان بە کارو فرمانی خۆیان.**

دووەم فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەیە کە موژدە دەر بێت بە چاکان بە بەزەیی و لێ بووردنی خوا بۆیان، بە پاداشت دانەوەیان بە بەهەشت.

سێ یەم: ترسێنەر بێت بە بێ ئاگاکان بە دووچار بوونی سزای سەختی دۆزەخ، خوا پەنامان بدات لێ ی.

چوارەم: بانگ کەری خەڵك بێت بۆلای خوا.. نەك بۆلای دنیا و ئەم جیهانە، نە بۆلای نەتەوایەتی و شانازی پێ ی، نە بۆ رەگەزایەتی چەرخی نەزانی، نە بۆلای دەست کەوتی، بۆلای زاڵ بوون و کاربەدەستی. بەس تەنها بۆلای خوایان بانگ بکات، لە تەنیا رێگایەکەوە کە ئەگات بە خوا بە ئیزن و راو و فەرمانی خوا، کەواتە هیچ شتێ لەلایەن خۆیەوە داناهێنێ بەڵکو هەرچی رائەگەیەنێ بە پێ ی فەرمان و بەرنامەی خوایە و لەوە تێپەری نەکردووە.

پێنجەم: وەکو چرایەکی گەورەی رووناك کەرەوە بێت، کە رەشی و تەم و تاریکی لە دەروون دا نەهێڵێ، رێگە روون بکەیتەوە بە رووناکی یەکی رێك و پێك بە وێنەی چرا لەناو تاریکی دا. پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) خۆی و ئەو رووناکی یەی کە هێنای ئا بەو جۆرە بوون، هەموو شتێکیان روون کردەوە، بیروباوەڕ و زانین و تێگەیشتنێکی روون و رەوانی هێنا لەبارەی ئەم بوون و بوونەوەرەدا، لەبارەی پەیوەندی بە پەروەردگارەوە، لەبارەی رادە و پلەی ئادەمی لەم بوونەوەرەدا، رێگا و رێبازێ کە لەسەری بێت، لە کوێوە هاتووە بۆ کوێ ئەڕوات و بۆچی هاتووە و کارو فەرمانی چی یە؟ لە چ رێگایەکەوە هەوڵ و تێکۆشان بکات؟ بە چ هۆیەك خەریك ببێ؟ ئەمانەش هەموو روون کرانەوە و ئاشکرا کران بە بێ تەم و غوبار، بە جۆر و شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ سروشت و ژیریی دا. لە پێشەوە و بە کورتی سیفەتی موژدەدەری باسکرد. ئینجا ئەوا دووبارەی ئەکاتەوە و بە روون ترو درێژتر.

وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ
وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ
طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا﴾ موژدە بدە بە بڕواداران بەمە کە بۆیان هەیە لەلایەن خواوە بەهرە و بەخششێکی گەورە. یان رادەو پلەیەکی زیاد و گەورە بەسەر گەل و ئوممەتەکانی تردا. لەسەرەتای سورەتەکەوە بەرگری پێغەمبەری کرد(ﷺ) لەوەی بە گوێی کافرو ناپاکان بکات. ئینجا لەپاش ئەم یاسا و تەمێ و رژێمی کۆمەڵایەتی کە داینا و ئاراستەی کردن، لەپاش ئەوانەی ئەوا ئەوەی سەرەتا دووبارە ئەکاتەوە لەگەڵ فەرمان دان بە گوێ نەدانی بە سزا و زەحمەتی دوژمنان دەربارەی. بەڵکو لەسەر کاری خۆی بەردەوام بێت. ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾ گوێ رایەڵی کافرەکان و ناپاکەکان نەبیت لە کاروباری بانگ کردن و راگەیاندنەکەت، واتە ئەوانەی ئەیانەوێ تۆ رێك بکەوی لەگەڵیان و چاوپۆشی بکەیت و شتێ نەڵێیت کە ئەوان پێ یان ناخۆشە. تۆیش هەرگیز شتی وا نەکەیت ﴿وَدَعْ أَذَىٰهُمْ﴾ گوێت نەبێ لە سزاو ئازار دانی ئەوان دەربارەت. بەهۆی ئەوە تەقێیان لێ نەکەیت ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ پشت بەخوا ببەستێ، ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ خوا بەسە بۆ ئەوەی هەموو کاروباری پێ بسپێررێ و حەواڵەی بکرێ.**

**ئینجا لەم چەند ئایەتەی داهاتووەدا چەند بڕیارو یاسایەکی گشتی و تایبەتی ئەهێنێ کە بەشێکن لە هۆنینەوەی ژیانی کۆمەڵ و گەلی موسڵمان لەسەر بنەڕەتی بیرو باوەڕی ئیسلام، لە یەکەم جارەوە حوکمو بڕیارێکی گشتی ئەدات سەبارەت بەو ئافرەتانەی تەلاق درابن پێش ئەمەی مێرد چووبێتە لایان و مامەڵەی ژن و مێردی لەگەڵ کردبن. ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە، ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ کاتێ ئافرەتە بڕوادارەکان مارەکەن ﴿ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾ پاشان تەلاقیان بدەن ﴿مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ لەپێش ئەمەی لێ یان بکەون و بچنە لایان ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ﴾ ئەوە نی یە بۆ ئێوە بەسەریانەوە،**

﴿مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ﴾ هیچ جۆره عیددەیەك كه هەڵیژمێرن بە رۆژ و بە مانگ یان بە تێكەوتن و پاك بوونەوه. ﴿فَمَتِّعُوهُنَّ﴾ كەواته موتعەیان بدەنێ ﴿وَسَرِّحُوهُنَّ﴾ بەرەڵایان بكەن و لە جێ و شوێنی خۆتان بیانكەنە دەرەوه ﴿سَرَاحٗا جَمِيلٗا﴾ بە بەرەڵا كردنێكی شیرین و جوان بە بێ بەرگری و ئازار و زیان، بە بێ ترش و تاڵی، هۆی گەیشتنیان بە جێگا و شوێنی خۆیان بۆ فەراهەم بێت تا ئەوه ببێته هۆی دڵنەوایی و دڵخۆش كردنیان.

ئەو موتعە و بەخششە بریتی یە لە كراس و چارشێو و پۆشاكێكی دەرە دامان كە خۆی تێوه بپێچێ. ئەوەش ئەبێ بە پێی دەسەڵات و شایان بێت، ئینجا ئەم موتعەیە ئەدرێ بە هەر ئافرەتێكی ئاوا تەڵاق دراو ئیتر مارەیی بۆ بڕیار درابێ یان نە ؟ بەلای كۆمەڵێ لە زانایانەوه. تاقمی تر لەسەر ئەوەن ئەگەر مارەیی بۆ بڕیار درابێ بێ موتعەكەی بریتی یە تەنها لە نیو مارەیی یە كە قورئان بڕیاری داوه بۆیان و ئیتر زیاد لەوه مافی هیچی تریان نی یە، بە درێژیی ئەم باسە هەیە لە كتێبە فیقهی یەكاندا. ئەم بڕیارە تایبەتی نی یە بە تەڵاق دراوی ئیماندارەوه، بەڵكو گشتی یە و ئافرەتی جوولەكە و مەسیحیش ئەگرێتەوە كە مارە كردنیان دروستە بۆ ئێمە بەڵام بە تایبەتی باسی تەنها ئیمانداری كرد بۆ ئاگادار كردنەوەی لەسەر ئەوه كە ئێمەی ئیماندار ئەبێ بە شوێنی ئافرەتی ئیمانداردا بگەڕێین تا ئەوانمان دەست كەوێ جوولەكە و مەسیحی مارە نەكەین. ئەمە حوكم و بڕیارێكی گشتی بوو هات لە ریزی ئەو بڕیارە گشتی یانەی كە ژیانی گشتی كۆمەڵی پێ ئەهۆنرێتەوە.

ئینجا دوای ئەو روونی ئەكاتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆی، ئەوەی كە بە تایبەتی رەوای داوه بۆ خۆی و ئال و بەیتی، لەپاش ئەوه ئایەتی سورەتی ﴿النساء﴾ هاتە خوارەوه و چوار ئافرەتی دانا بە ئەوپەڕی سنوور بۆ كۆبوونەوی ئافرەتان لە ژێر ركێفی پیاودا. لەو كاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) نۆ هاوسەری هەبوو: عائشه، حفصه، ام حبیبه، ام سلمه، سوده، زینبی كچی خزیمه، زینبی كچی جحش، جویریەی كچی حارث، صفیەی كچی حیی. هەركام لەمانە مەبەست و هۆیەكی تایبەتی هەبوو لە خواستنیان دا حەز ئەكەم بە كورتی لێرەدا بدوێم لەو هۆیانە و درێژەكەی با بمێنێ بۆ شوێنێكی تر: عائشه و حفصه كچی دوو هاوەڵ و وەزیرە فیداكارەكەی بوون كە بەو ژن لێ خواستنە رێزی لێ گرتن و دڵشادی كردن و پاداشتی ئەو هەموو خزمەت و فیداكاری یەی دانەوه. ام حبیبەی كچی ئەبو سوفیان، ئوم

سەلەمە و سودەی کچی زەمعەد، زەینەبی کچی خزیمە لە ئافرەتە تێکۆشەر و کۆچ کەران بوون و مێرد مردوو و غەمبار بوون، لەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بەو خواستنە دڵنەوایی یان بکات، جگە لە ڕێزگرتنیان و پاداشت دانەوەی خزمەت و راستی یان لە ئیسلام دا هیچ هۆیەکی تر نابینریٚ بۆ ئەو خواستنە. زەینەبی کچی جحش بەسەرهات و هۆی خواستنەکەیمان باس کرد. ئەویش دڵنەوایی و دڵخۆش کردنی تیا بوو کە کاتی خۆی بە روو گیری مارە کرا لە زەید و نەیانکرا پێکەوە تا تەڵاق درا، ئینجا جویریەی کچی حارث لە تیرەی بنی مصطلق و صفیەی کچی حیی کوری اخطب کە بە دیل گیران ئینجاپێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کردن و یەك لەدوای یەك خواستنی، لە بەرامبەر بەهێز کردنی پەیوەندی بە بەرە و تیرەکانەوە، لەبەر ڕێزگرتنیان، کە ئەو دووانە موسڵمان بوون لەپاش ئەوەی کە و کاریان تیا چوون و ئەو رۆژە رەشەیان بەسەر هات کە لە کتێبی مێژوو و سیرەت دا باس کراوە.

ئەوانە لەبەر ئەو هۆیانە گەیشتن بە شەرەفی نزیکیان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) و گەران بە دایکی ئیمانداران. خوا و پێغەمبەر و رۆژی دوایی یان هەڵبژارد بۆ خۆیان کاتیٚ کە ئایەت هاتە خوارەوە لەو بارەیەوە، وەکو بە درێژیی تێپەری کرد لەم سورەتەدا. کەواتە بەرەڵا کردن و دەست لیٚ هەڵگرتنی پێغەمبەر(ﷺ) لەوانەیان لە پێنج کەسیان کە زیاد بوون لە ژمارەی چوار کە کرا بە ئەوپەری سنوور، ئەو بەرەڵا کردن و جیا بوونەوە ئێجگار قورس و گران ئەبوو لە دەروونیان دا و دڵ شکست و دڵ رەنجەڕۆ ئەبوون پیٚی، بەهۆی ئەوەوە بوون بە دایکی ئیمانداران تازە قەدەغە بوون لە هەموو کەسی تر. کەواتە بەرەڵا کردن و جیابوونەوەیان ئەبوو بەهۆی داماوی و سەر لیٚ شێوانیان، لەبەر ئەوە خوا بە بەزەیی خۆی لوتفی لەگەڵ کردن ئەمانی جویٚ کردەوە لەو یاسایە و مانەوەی هەموویانی رەوادا لە خزمەت پێغەمبەر و رکێفی بەفەری ئەودا، هەموویانی حەڵاڵ کرد بۆی پێکەوە، لە پاشان ئایەت هاتە خوارەوە کە لەو ژمارەیە زیاد نەکات و کەسی تریان بەسەر نەهێنیٚ و ئاڵ و گۆڕی هیچ کامیان نەکات بە یەکێکی تر، ئەوەش زیادە پاداشت و لوتفیٚ بوو دەربارەی ئەو کۆمەڵە کە بە هەموو سۆز و پەرۆشێکەوە خواو پێغەمبەر و رۆژی دوایی یان هەڵبژارد بۆ خۆیان وبەهیچ رەنگ گوێیان نەدابەخۆشی ورابواردنی ئەم جیهانە-خوایان لیٚ رازی بێت-[1].

---

[1] بە یارمەتی خوا لەپاش لیٚ بوونەوە لە تەفسیری ئەم سورەتە باسێکی تایبەتی ئەکەم بە شێوەی پاشکۆ بۆ ئەم سورەتە لە بارەی هاوسەرەکانی پێغەمبەری ئازیزەوە(ﷺ) و علیهن، هەروەها لەبارەی رەوادانی ئیسلام بۆ خواستنی زیاد لە یەك ئافرەت تا چوار و کۆبوونەوەیان لە ژێر رکێفی پیاوێك دا.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّـٰتِيٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّـٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَـٰلَـٰتِكَ ٱلَّـٰتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِيٓ أَزْوَٰجِهِمْ﴾

---

**ئینجا با گویٚ بگرین لەم ئایەتانە کە هاتنە خوارەوە لەبارەی ئەو چەند مەبەستەی کە باسمان کرد. خوای گەورە ئەفەرمویٚ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّـٰتِيٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ﴾ بێگومان ئێمە حەڵاڵمان کردووە بۆت ئەو ئافرەتە هاوسەرانەت کە مارەیی یەکانیانت پێداون، ﴿وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ﴾ ئەو ئافرەتانەی کە بویت بە خاوەنی و بوو بە موڵکت لەوەی خوا خستی یە دەستت بە هۆی زاڵ کردنت بەسەر کافران دا، ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ﴾ کچانی مامت ﴿وَبَنَاتِ عَمَّـٰتِكَ﴾ کچانی خوشکەکانی باوت ﴿وَبَنَاتِ خَالِكَ﴾ کچانی خاڵت، ﴿وَبَنَاتِ خَـٰلَـٰتِكَ﴾ کچانی خوشکەکانی دایکت. لەم چوار جۆرە ﴿ٱلَّـٰتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ﴾ ئەوانەیان کە کۆچیان کرد لەگەڵت و هاوبەشیان کردی لە کۆچ کردن دا، ﴿وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ﴾ ئافرەتێکی ئیماندار ئەگەر خۆی ببەخشیٚ بە پێغەمبەر بە بیٚ مارەیی ﴿إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا﴾ ئەگەر پێغەمبەر بیەویٚ و حەز بکات بیخوازیٚ، ئەوەش شتێکە ﴿خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ﴾ تایبەتی بوو بە تۆوە بە بیٚ ئیماندارانی تر و ئەوەی تایبەتی یە بە تۆوە بۆ ئەوان رەوا نەدراوە، جیاکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەو جۆرە شتە تایبەتی یانەدا زۆر بەجیٚ یە و بەرژەوەندی تیایە وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِيٓ أَزْوَٰجِهِمْ﴾ بەڕاستی زانیومانە و ئاگادارین بەوەی پێویستمان کردووە لەسەر ئیمانداران لەبارەی هاوسەرانیانەوە کە پێویستە مارەیی و عەقد و شایەت و نابیٚ پتر لە چوار هاوسەر کۆ ببێتەوە لای پیاوێک،**

وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾ ۞ تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ

---

﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾ لەبارەی ئەو ئافرەتانەی کە موڵکیانن، بەم رەنگە ئەهلی کیتاب بن و لە پێش چوونە لایان بکەونە حەیز و پاك ببنەوە ئیتر بە هەر شێوەیەکی شەرعی دەست کەوت بووبن، بە کڕین یان بە غەیری کڕین، وەکو لە کتێبی فیقهدا باس کراوە، واتە هەر بڕیارێکمان دابێ بەجێ یە و لە زانینەوە هاتووە، کەواتە ئەوەی پێویستمان کردووە لەسەر ئیمانداران شتێکی پێویستە و ئەبێ وابێ و ئەوەی تایبەتی کراوە بە پێغەمبەرەوە بەجێ یە و بەرژەوەندی تیایە و هۆکەیشی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ﴾ ئەوەی حەڵاڵمان کرد بۆت و ئەوەی تایبەتیمان کرد پێتەوە لەبەر ئەوەیە هیچ زەحمەت و تەنگی یە نەبێ بەسەرتەوە، نە لە بارەی دین و نە لە بارەی دنیاتەوە. لەبارەی دینەوە تەنگی و زەحمەت نابێ چونکە چەند جۆرێ لە ئافرەتی بۆ حەڵاڵ کراوە لەسەر چەند بارو بە چەند مەرجێ کە باشترین بارو چاکترین مەرجن، بۆ دنیاش زەحمەت و تەنگی نابێ ئەوەتا رێگان ژن هێنان و خواستنی بۆ فراوان کراوە تەنانەت بە بێ مارەی و هیچ ئەرکێ[1]، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ خوا لێ بوردوو بە بەزەیی یە، کەواتە ئەبوورێ لەوشتەی کە زەحمەتە خۆپارێزیی لێ ی و چاو پۆشی ئەکات لەو کەسانەی کە ئەگەڕێنەوە بۆلای. لەبارەی خواستنی ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ) چەند ریوایەتێك هەیە، بەهێزترین ریوایەت ئەوەیە کە هیچ کام لەوانەی نەویست بۆ خۆی بەڵکو مارەی کردن لە خەڵکی تر. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئازاد و سەربەست ئەکات سەبارەت بەو ئافرەتە

---

[1] چەند رایەك هەیە لە وشەی(خالصە) دا هەروەها لە رسەی(لکیلا... هتد) هەموو نەگونجێن و رێکن بەڵام دڵم بەمەی کە وتراوە لە تەفسیرەکەدا بە ئارام ترە و زانینی تەواو لای خوایە.

خۆبەخشانە کامیان ئەگرێتەوە لای خۆی بیگرێ، کامیان دوا ئەخات بیخات، هەرکامی دواخست و دووری خستەوە رێگای هەیە پەشیمان ببێتەوە لەوەو بیخوازێ.. هەروەها سەربەستی و ئازادی پێدا کام لە هاوسەرانی دوور ئەخاتەوە و جوێ ی ئەکاتەوە لەخۆی، کام ئەگرێتەوە لای خۆی و کام دوور خراوە ئەهێنێتەوە ئەتوانێ و رێگای هەیە، ئەفەرموێ: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ﴾ هەرکام لەو ئافرەتانە کە ئەتەوێ کاری دوا ئەخەیت و دووری ئەخەیتەوە لە خۆت ئەتوانی و رێگات هەیە و کام لەوان ئەتەوێ و ئارەزوو ئەکەیت بیگریتە لای خۆت هەر ئەتوانی و رێگات هەیە، ﴿وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ﴾ هەرکامت ئەوێ و داوای ئەکەیت لەوانەی وازت لێ هێناون و خۆت لێ دوور خستوونەتەوە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ هیچ ئەرەج و گوناهێکت لەسەر نی یە، واتە هەموو کاروباریان خراوەتە ئارەزووی خۆت و پێویست نی یە لەسەرت یەکسانی بەکاربێنی لەنێوانیان دا، ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ﴾ ئەو حەواڵە کردنەیان بۆ لای ویست و خواهیشی تۆ نزیک ترە بۆ دڵخۆش بوونیان و بێ غەم و پەژارەیی یان بۆ رەزا بوونی هەموویان بە هەر بەشێ پێ یان ئەدەیت و هەر کردەوەیەك دەربارەیان ئەیکەیت. چونکە بە بێ جیاوازی هەموو یەکسانن لەو حوکم و بڕیارەدا، ئینجا ئەگەر یەکسان رەفتار ئەکەیت ئەگەڵیان – کە بێگومان هەروایشی کرد – ئەو کاتە ئەوە بە لوتف و چاکە و پیاوەتی سەیر ئەکەین، چونکە ئەزانن رێگا هەیە وا نەکەیت، ئەگەر فەرق و چوون ئەکەیت و هەندێکیان بە گرنگ تر ئەگری ئەزانن ئەوە بە پێ ی بڕیارو حوکمی خوایە و ئەبێ دڵئارام و رازی بن پێ ی، بەڵام ئەگەر حەواڵەی ویست و خواهیشی پێغەمبەر(ﷺ) نەکرایە ئەو کاتە بێگومان رێگای فەرق و جیاوازی نەئەبوو، بەڵکو پێویست ئەبوو لەسەری یەکسانی، کەواتە هیچ کەس بە لوتف و پیاوەتی سەیر نەئەکرد و ئەیانزانی واجبی خۆی بەجێ ئەهێنێ. ئەمە چارەسەر و چاودێریی و زروفێکی تایبەتی بوو بە خودی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەو هەموو سۆز و خۆشەویستی یەی کە بوو لە دەروونی دایکی ئیمانداران دا بووی، زۆر سووری یان لەسەر شەرەفی پەیوەندی و پەیوەستی یان پێ یەوە. کە خوا خۆی باش ئەیزانی و تەگبیر و چارەسەری کرد،

﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ﴾ خوا زانایە بە هەرچی لە دڵتاندایە، کەواتە کۆشش بکەن لە چاك کردنی دا ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمٗا﴾ خوا هەمیشە بە باشی زانا و ئاگادارە کەواتە ئەوەی دەربڕێ و ئەوەی دەرخرێ و ئاشکرا کرێ وەك یەك زانایە پێ یان، زۆر بە حیلمە و پەلە ناکات لە عیتاب و گلەیی و سزادان دا و ئەبووڕێ و چاوپۆشی ئەکات لەو بەسەرهات و حاڵەتانەی کە لە چاردا نین و زۆر ئەسێنن لە دڵ و دەروون...

ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و بەو شێوە پێغەمبەری سەربەست کرد لەبارەی هاوسەرانی یەوە، بەڵام بە بێ خیلاف بە پێی هەموو ریوایەتەکان هیچ کات لە عەدل و یەکسانی لای نەدا و هیچ جیاوازی بەکار نەهێنا لە نێوان ئەو حەرەم و هاوسەرانەدا، ئەوەی بۆی حەڵاڵ کرابوو بەم ئایەتە رەفتاری نەکرد، بەڵکو عەدل و یەکسانی یەکەی بەکارهێنا کە چاکترین رێگایە، ئیمامی ئەحمەد حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران عائیشەوە - خوا لە هەمووان رازی بێت - ئەیفەرمو: پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە عەدل و رەفتاری ئەکرد لە نێوان هاوسەرانی دا، ئینجا ئەیفەرمو: ئەی خوایە ئەمە رەفتار و کردەوەمە لەوەی کە بە من ئەکرێ و دەسەڵاتم هەیە، کەواتە لێم مەگرە لەوەی کە تۆ خاوەنی بۆی و من خاوەنی نیم، واتە دڵی بەفەڕی کە بە ناچاری زیادە خۆشەویستی تیا بووە بۆ هەندێکیان، لەپاش ئەمەی هاوسەران پێغەمبەریان بۆخۆیان هەڵبژارد، لەپاش ئەوەی رازی بوون بە بڕیاری ئەم ئایەتە کە پێغەمبەری سەربەست کرد وەکو باس کرا، لەپاش ئەوە ئینجا خوا پاداشتێکی تایبەتی دانەوە بە تایبەتی کردنی پێغەمبەریش بەوانەوە(ﷺ)، بەم رەنگە خوا قەدەغەی کرد ژنیان بەسەر بێنێ یان هیچ کامیان بگۆڕێ بە یەکێکی تر، واتە نە لەو ژمارەیە زیاتر بکات و نە کەسیان تەڵاق بدات و لەباتی ئەو یەکێکی تر بێنێ،

لَا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾

**ئەفەرموێ: ﴿لَا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ﴾ حەڵاڵ نی یە بۆت ئافرەتانی تر لەپاش ئەمانەی کە ئێستا هاوسەرتن ﴿وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ﴾ حەڵاڵ نی یە بۆت بیان گۆڕی بە هیچ هاوسەرانی تر ﴿وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ﴾ ئیتر لە فەرزێك دا جوانی یان سەرسامت بکات و تا ئەو رادەیە دڵگیرت بن، هیچ ئافەرتێکی ترت بۆ حەڵاڵ نی یە ﴿إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ﴾ مەگەر ئافرەتێ کە موڵکت بێت، واتە ئەوەی کە پێ‌ی ئەوترێ(جاریە) حەڵاڵە چونکە ئەوانە بە ژن و هاوسەر دانانرێن، کەواتە نابنە هۆی دڵ ئازاری هاوسەران. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا﴾ خوا ئاگادار و چاودێرە بەسەر هەموو شتێك دا، واتە وریای خۆیان بن سنووری خوا نەشکێنن و تێپەڕ نەکەن لێ ی. دایکی ئیمانداران عائشە – خوای لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: ئەم قەدەغەیە لابراو سڕایەوە پێش لە دنیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) و سەربەست کرا لە ژن هێنان دا بە ئارەزوی خۆی. بەڵام پاش ئەوەیش هەر کەسی تری نەهێنا.**

**ئینجا لەپاش ئەوە قورئان شێوەی پەیوەندی موسڵمانان دیاریی ئەکات و روونی ئەکاتەوە سەبارەت بە ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوسەرانی یەوە. خوا لەوانیش رازی بێت. لە کاتی ژیانی و لە دوای لە دنیا دەرچوونیشی، بەرەنگاری هەندێ کردەوەی تایبەتی ئەکات لەلایەن ناپاك و دڵ نەخۆشەکانەوە کە پێغەمبەری پێ دڵەمەند و دڵ ئازار ئەبوو. لەبەر ئەوە بە توندی ئەیانترسێنێ، ئەیخاتە بەرچاویان و ئاگاداریان ئەکات بە پێ‌ی گەورەیی تاوانەکەیان بەلای خواوە، هەڕەشەیان لێ ئەکات بە ئاگاداری خوا بەسەر هەموو پیلان و خراپەیەك کە لە دڵیاندایە.**

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ باوەڕتان هێناوە ﴿لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ﴾ نەچنە ماڵەکانی پێغەمبەر لە هیچ کاتێك دا ﴿إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ﴾ مەگەر کاتێ ئیزن درابێ پێتان و بانگ کرابن ﴿إِلَىٰ طَعَامٍ﴾ بۆ سەر زیافەت و نان خواردن، ئەو کاتە بڕۆن ﴿غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ﴾ بە جۆرێ چاوەڕوانی پێگەیشتن نەکەن، واتە کە ئیزن دران و بانگ کران بۆ سەر زیافەت و خۆراکەکە کاتێ بڕۆن کە بزانن خۆراکەکە پێگەیشتووە، چونکە ئەو لە پێشەوە چوون و چاوەڕوانی یە ئەبێتە هۆی سەر لێ شێوانی ماڵ و خێزان و ئازاردانی دڵیان. ﴿وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ﴾ بەلام کاتێ بانگ کران بۆ سەر خۆراك ئەو کاتە بچن ﴿فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ﴾ ئینجا کاتێ خۆراکەکەتان خوارد ئیتر دەرچن و بڵاوەی لێ بکەن ﴿وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ﴾ [1] مەمێننەوە بۆ دەمە تەمێ و رابواردن بە قسە و باس ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ﴾ چونکە بەڕاستی ئەو مانەوەتان ئازاری پێغەمبەر ئەدات، ﴿فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡ﴾ ئەو شەرم ئەکات لێتان کە دەنگ ناکات و ناڵێ: بڕۆن و بەرگریتان ناکات لەو جۆرە شتانە کە ئازاری دڵی ئەدەن. ﴿وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ خوا شەرم ناکات لە وتنی قسەی ناحەق و فەرماندان بە شتی حەق، خوا وازی نەهێنا لەوەی کە راست و حەقە و فەرمانی دا پێتان بە دەرچوون و نەمانەوەتان.

بوخاری حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسەوە – خوا لێ یان رازی بێت – کە ئەفەرموێ: بە بۆنەی گواستنەوەی دایکی ئیمانداران زەینەبی کچی جەحشەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا گۆشتاو و نان و گۆشتێ دروست کرا و من دانرام بەسەریەوە بۆ بانگ کردنی خەڵك بۆی. ئینجا تاقم تاقم ئەهاتن نانیان ئەخواردو دەرئەچوون، ئینجا منیش هەر لەم بەرەوە بانگی

---

[1] ئەم ریستەیە بەچەند جۆرێکی تریش ترکیب کراوە و بە پێی هەمووی تەفسیر کراوەتەوە، هەموو نزیکن لە یەکەوە و وەکو یەك مەبەست بن وان.

خەڵکیم ئەکرد هەتا کەس نەماو کەسم دەست نەئەکەوت بانگی بکەم، ئینجا وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئیتر کەسم دەست ناکەوێ بانگی بکەم، فەرمووی: دەی نان و خۆراکەکەتان هەڵگرن، لەو خەڵکە سێ کەس مابوونەوە پاش نان خواردن لەماڵ دا قسە و دەمە تەقێ یان ئەکرد. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەکە دەرچوو و ڕۆیشت بۆ هۆدەکەی عائشە – خوای لێ ڕازی بێت – فەرمووی: السلام علیکم اهل البیت و رحمة الله و برکاته، ئەویش لە وەڵامیدا وتی: وعلیك السلام و رحمة الله و برکاته. خێزانەکەت چۆن بوو بەلاتەوە؟ خوا بە فەڕ و پیرۆزی بکات لێت، ئینجا هەر بەو جۆرە چوو بۆ هۆدەی هەموو حەرەمەکانی تری، ئەوەی وتی بە عائشە بەوانیشی فەرمو، ئەوانیش خوا لە هەموویان ڕازی بێت بە وێنەی عائشە وەڵامیان دایەوە، ئینجا گەڕایەوە کەچی سێ کەسەکە هێشتا هەر مابونەوە و قسەیان ئەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە شەرم و حەیا بوو لە ڕووی نەهات هیچ بڵێت، ئینجا دەرچوو بەرە و هۆدەکەی عائشە، ئیتر نازانم هەو هەواڵی پێدا یان هەواڵی پێ درا کە ئەو سێ کەسە لەماڵ دەرچوون، ئینجا گەڕایەوە هەتا پێ یەکی نایە ئەو دیوی ژێر دەرگاکە و پێ یەکی لە دەرەوە بوو، پەردەی دادایەوە لە نێوان من و خۆی دا و ئایەتی پەردە هاتە خوارەوە.

ئەم ئایەتە چەند ئوسوڵ و ئادابێکی هێنا لەبارەی هاتوچۆی ماڵانەوە کە چەرخی جاهیلی هەر بە لایشیدا نەچوو بوون، خەڵکی لەوە و پێش ئەچوونە ماڵان بە بێ پرس و ئیزن خواستنی – وەکو لە تەفسیری سورەتی نوردا تێپەڕی کرد. ئەو بێ پرسی و ئیزن نەخواستنە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) باشتر بەکار ئەهێنرا چونکە کانگا و سەرچاوەی هەموو زانین و حیکمەتێ بوو، کەواتە خەڵکی زۆر پێویست بوون بە هاتوچۆی زۆر، هینی وا بوو ئەچووە یەکێ لەو ماڵانە و ئەیبینی خەریکن چێشت و خۆراکێ دروست ئەکەن، ئەو کەسەش دائەنیشت بە بێ دەعوەت و پێ وتن بە دیاری ئەو نان و چێشتەوە پێ بگات و لێ ی بخوات!! هینی وا هەبوو لەپاش نان خواردنەکەش هەر دائەنیشت، ئیتر بانگ کرابێ یان لە خۆیەوە چووبێت، دەستی ئەکرد بە قسە و باس و حیکایەت و هەستی نەئەکرد کە ئەوە هۆی دڵئازاری پێغەمبەر و ماڵ و خێزانیەتی. لە ڕیوایەتێك دا هەیە کە ئەو سێ کەسە مانەوە قسە و دەمە تەقێ یان ئەکرد و دایکی ئیمانداران تازە بووك و گوازراوە بوو دانیشتبوو، ڕووی کردبووە دیوار لە ناچاری دا! پێغەمبەر(ﷺ) شەرمی ئەکرد لەمەی ئاگاداریان بکات بە قورسی و گرانی مانەوەکەیان و لە ڕووی نەئەهات هیچ بفەرموێ تا تەریق نەبنەوە هەتا خوای گەورە خۆی شتەکەی فەرمو. ئای چەند شیرینیان فەرمو ئیبن عەباس و عائشە –

خوایان لیّ رازی بیّت – ﴿حسبك في الثقلاء ان الله عز وجل لم يحتملهم﴾ خراپی و ناڕەوایی ئەو مانەوە زیادە تایبەتی نی یە بە ماڵە پیرۆزەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەڵکو هەرکەس بانگ بکریّ بۆ خواردن لەپاش لیّ بوونەوە مانەوەو دانیشتن قەدەغەیە ئەگەر هۆی ئازاری خاوەن ماڵ بیّت و پیّی ناخۆش بیّت مانەوەی بانگ کراوەکە. هەروەها هەر کردەوەیەکی تر کە هۆی دڵ ئازاری خەڵکی بیّت، بۆ وێنە هینی وا هەیە دەعوەت ئەکریّ لەگەڵ کۆمەڵێك دا لەکاتێکی دیاری کراودا، کەچی ئەو کابرا خۆی دوا ئەخات بە بیّ عوزرێکی شەرعی و ئەزانیّ چاوەڕوانی ئەکریّت و نان ناخوریّ تا ئەم تەشریفی نەبات، جا ئەم خۆی دوا ئەخات هەر لەبەر ئەوە چاوەڕوانی بکریّت و دەرکەویّ بۆ ئەو خەڵکە ڕیّز گەورەیی جەنابی. ئەوەتا خاوەن ماڵ ناتوانیّ نان دانیّ بۆ میوانەکان تا ئەو زاتە تەشریفی نەگاتە بەرەوە و نان دانەنریّ بۆی. ئیتر لەبەر ئەوە پیاوێکی دنیایی یە و مەترسی لیّ ئەکریّ یان بە پیاوێکی تایبەتی سەیر ئەکریّ و ئەبیّ ڕیّز بگیریّ. لەم بابەتانە زۆر هەن خوا پەنامان بدات جڵەومان نەدا بە دەست هەوا و ئارەزووی نەفسمانەوە.

ئیمامی ئەحمەد حەدیسیّ ئەهێنیّ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، ئەفەرمویّ: عومەر – خوا لیّ ی ڕازی بیّت – وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاو چاك و پیاو خراپ دێتە خزمەتت و هاتوچۆ ئەکات، کاشکیّ فەرمانت بدایە بە دایکی ئیمانداران بە دادانەوەی پەردە. ئینجا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە.

ئەم ئایەتە هات تەمیّی خەڵکی کرد کە نەچنە ماڵەکانی پێغەمبەر بە بیّ پرس و ئیزن وەگرتن، ئینجا کاتیّ بانگ کران و دەعوەت کران بچن بۆ خواردن، ئەگەر دەعوەت نەکران لە خۆیانەوە نەچن، یان کە ئەچن بە جۆریّ نەچن پێش پێگەیشتنی خۆراکەکە و دانیشتن و چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن!

ئینجا کاتیّ خۆراکەکەیان خوارد بۆی دەرچن و نەمێننەوە بۆ دەمە تەقیّ و قسە کردن. ئای چەندە موسڵمانانی ئەمڕۆ پێویستن بەم تەمیّ و ئەدەبە شیرینە کە زۆر کەس خۆی لیّ دوور ئەخاتەوە، زۆر کەس هەن کە دەعوەت کراون لە پاش لیّ بوونەوە لە خواردنەکەیان ئەمێننەوە، بەڵکو بەسەر نان خواردنەکەوە زۆر زۆر ئەمێننەوە، بە قسە و حیکایەتی دوور و درێژەوە، خاوەن ماڵ یاس و دڵگرانە بە تایبەت ئەوانەی کە شەرم و حەیایەکی ئیسلامی یان تیا ماوە و بەرەلاّ نین، لە تەمیّ و ئەدەبیّ ئیسلامی دا چارەسەر هەیە بۆ هەموو حاڵەتیّ، ئەگەر ئێمە دەست بگرین پیّ یەوە.

وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾

**ئینجا ئەم ئایەتە بڕیاری حیجاب و پەردەی دا لە نێوان هاوسەرانی پێغەمبەرو پیاوانی بێگانەدا، فەرموی: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا﴾ کاتێ داوای قاپ و قاچاغ و شتێکی واتان کرد لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﴿فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾ داوایان لێ بکەن لە دیوی دەری پەردەوە، هۆکەشی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ ئەو داوا کردنە بەو شێوەیە پاك و خاوێن ترە بۆ دڵی ئێوە و دڵی ئەوانیش.. خوا ئاوا ئەفەرموێ، کەواتە با هیچ کەس شتێ تر نەڵێ جگە لەوەی خوا فەرموی. هیچ کەس نەڵێ تێکەڵی پیاو و ئافرەت و لابردنی پەردە لە بەینا، بەرەڵا کردنی قسە و گەیشتن بە یەك و دانیشتن و هاوبەشی لە نێوان پیاو و ئافرەت دا پاك و خاوێن ترە بۆ دڵ و دەروون، ئەو بەرەڵایی یە باشتر یارمەتی دەر و کۆمەکی کەرە لەسەر خو و رەوشت و رێکی و دەروون پاکی.. هەروەها ئەو هەموو شتی پڕ و پووچە کە چەند کەس لە لەڕ و لاواز و نەزان و نەفامەکان ئەیڵێن. با هیچ کەس هیچ شتێکی وا نەڵێ لە کاتێك دا کە خوا ئەوە ئەفەرموێ. ئەوە ئەفەرموێ لەبارەی هاوسەرە پاك و خاوێنەکان کە خوا کردنی بە دایکی ئیمانداران، لەبارەی پیاوانی یەکەم چین و یەکەم تاقم لەم نەتەوە کە ئەو هاوەڵە هەڵکەوتووانە بوون کە هیچ تاقمە ئافرەت و پیاوی تر لەم جیهانەدا بەوانە ناگات! کاتێ خوا شتێکی وت و خەڵکی شتی تری وت بێگومان قسەی خوا راستە و قسە تەنها قسەی خوایە و هەموو قسە و بڕیارێکی تر درۆیە و چەنەبازی یە، کە هیچ کەس زاتی نی یە بیڵێ مەگەر کەسێ کە لە نەفامی و نەزانی دا بگاتە رادەیەك بەندەکانی خوای بەلاوە زاناتر و لێزانتر بێت لە خوای پەروەردگار!!**

**واقیع و رووداو شایەتە و هاوار ئەکات بە راستی خوا، بە دەلەسە و ناڕاستی ئەوانەی شتێ ئەڵێن کە دژ و پێچەوانەی وتە و بڕیاری خوایە، بەراورد و تاقی کردنەوەیەکە ئەمڕۆ وا**

بە بەرچاومانەوە لە جیهان دا راستی ئەوە دەرئەخات کە وتمان، ئەو تاقی کردنەوە و بەراوردە لەو ولاّتانەدا کە تێکەڵی و بەرەڵایی یان گەیشتووەتە ئەوپەڕی سنوور ئاشکرا ترە و بەڵگەیەکی روون و رەوانترە لە هەموو بەڵگە و نیشانەیەك. ئەمەریکا یەکەمی ئەو ولاّتانەیە کە تێکەڵی و بەرەڵایی تیای دا پیس ترین بەرو بەرهەمی پێك هێناوە.

ئەم ئایەتە فەرموی کە هاتنی خەڵکی و هاتوچۆیان بەو جۆرە ناڕەوایە و ئازاری پێغەمبەر ئەدا. لە کۆتایی ئایەتەکەدا بڕیاری ئەمە ئەدات کە بە هیچ رەنگ رێگا نی یە بۆ موسڵمانان ئازاری دڵی پێغەمبەر بدەن، هەروەها رێگایان نی یە هاوسەرەکانی بخوازن لە پاش خۆی، کە ئەوان لە جێگای دایکیانن، رادە و پلەی تایبەتی ئەوان لای پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی ئەو خواستن و مارە کردنە ئەکات، لەبەر پارێزگاری رێز و قەدری ئەومالّ و خێزانە بەرزو بەفەڕە. ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ﴾ نی یە بۆ ئێوە و بە هیچ کلۆج رێگاتان نی یە ئازاری دڵی پێغەمبەری خوا بدەن بەم رەنگە کردەوەیەك بکەن ئەو پێ ی ناخۆش بێت ﴿وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا﴾ رێگاتان نی یە و نابێ هاوسەرانی لەپاش خۆی مارە بکەن هەرگیز، ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا﴾ بەڕاستی ئەو ئازاردانی دڵ و مارە کردنە بەلای خواوە گوناهێکی زۆر گەورەیە، پەنا ئەگرین بەخوا ئای چ سەخت و سامناکە شتێ بەلای خواوە ئاوا گەورە بێت!!

ئەگێڕنەوە کە یەکێ لە ناپاکان وتی: ئەگەر محمد نەما عائشە مارە ئەکەم! قورئان بەو ترساندن و هەڕەشە سامناکەوە نەوەستا، بەڵکو هەڕەشەیەکی تری کرد، فەرموی: ﴿إِن تُبْدُوا شَيْئًا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ ئەگەر ئێوە هەر شتێ دەربڕن و بە زمان بیڵێن یان بیشارنەوە لە دەروونتاندا ئەوە بێگومان خوا بە باشی زانایە پێ ی. واتە خوا خاوەنی کارەکەیە و ئەیگرێتە ژێر دەست، خۆی زانایە بە دەرخراو و دەر نەخراوەکانتان، زانا و ئاگادارە بەسەر هەموو نیاز و تەگبیرێك دا، کارەکەی بەلاوە زۆر گەورەیە. جا هەرکەس ئەتوانێ و خۆی بۆ ئەگیرێ لەبەر هەڕەشە و ترساندنی خوادا، هەرکەش ئەتوانێ شان بداتە بەر سزا و تۆڵەی خوا دەی خۆی بگرێ و شانی بداتە بەر!!

﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيۡهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخۡوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآءِ إِخۡوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَۚ﴾

لەپاش ئەو ترساندن و هەڕەشەیە ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ دەرکردنی هەندێ لە ئیمانداران لەو بڕیارە گشتی یەی کە دای سەبارەت بە خۆ دەرنەخستنی هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) – خوا لەوانیش رازی بێت – ئەفەرموێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيۡهِنَّ﴾ هیچ گوناهێك نی یە لەسەریان ﴿فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخۡوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآءِ إِخۡوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّۗ﴾ نــــە لـەبارەی بـاوك و كـوڕ و بـرا و بـرازا و خوشـكەزا و ئافرەتـە ئیمانـدارەكان و غـولام و كەنیزەكەكانیانـەوە، واتـە پێویـست نـی یـە لەسـەر هاوسـەرانی بـەڕێز دادانـەوەی پـەردە لـە ئاستی ئەمانەی كە باس كران، رەوا و حەلاڵە بە بێ پـەردە ئەمانـە هاتوچۆی ماڵیان بكـەن و یەكتر ببینن. ئەم تاقمە مەحرەمانە ئەوانـەن كە لـە سورەتی نوردا باسی كرد و بە شێوەی گشتی رەوا درا بۆ ئافرەتـە ئیمانـدارەكان سـەرنج دان و خۆ نەشاردنەوەیان لـە ئاسـتی یـەكتر بەو شێوەی كە لەوێ باسمان كرد بە درێژیی، نازانین كام لەو ئایەتە پێش كەوتووە لـە هاتنـە خوارەوەدا، ئینجا رای بەهێز لەسەر ئەوەیە كە حوكم و بڕیاری ئەم ئایەتـە لـە یەكەم جارەوە تایبـەتی بـوو بـە هاوسـەرانەوە و لەپاشـان شـێوەی گـشتی بەسـەردا هێنـرا. ئینجـا رووی فەرمودە ئەكاتە هاوسەران بە سام و ترس لەخوا و خۆپارێزیی لە هۆی خەشم و ناڕەزایی و هەست كردن بە چاودێریی و ئاگاداری خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ﴾ لـەخوا بترسـن و خۆتـان بپارێزن لە خوا، لە هەر شتێك دا ئەیكەن و هەرشتێ كە وازی لێ ئەهێنن، بە تایبـەتی ئـەوەی فەرمانتان پیا دراوە، ئەوەی قەدەغە و بەرگری كراون لێی،

إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾

**﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە شایەتە و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا. ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر تەمێ و ترساندن لە ئازاردانی دڵی بەفەڕی پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی خۆی یان لەبارەی ئال و بەیتی یەوە، ئەمەش لە دوو ڕێگایەوە، یەکەم لە ڕێگای ڕێز گرتن و بە گەورە گرتنی، روون کردنەوەی پلە و پایەی بەرزی لەناو کۆمەڵی هەرە بەرزدا، دووەم لە ڕێگای ئەوە کە ئازاردانی دڵی پێغەمبەر، خوا بە ئازاردانی خۆی دائەنێ، تۆڵەی بریتی یە لە دەرکردن لە بەزەیی خوا لە هەردوو جیهان دا، سزا دانێ کە شایان و هاوتای ئەو تاوانە گەورە بێت، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ﴾ بەڕاستی خوا و مەلائیکەتەکانی سەڵەوات ئەدەن لەسەر پێغەمبەر ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿صَلُّواْ عَلَيْهِ وَسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ سەڵەوات بدەن لەسەری و سەلامی لێ بکەن بە سەلام لێ کردنێکی گرنگ، سەڵەواتی خوا لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) وەسف و سەنا و باس کردنیەتی بە چاکە لەناو کۆمەڵی هەرەبەرزی مەلائیکەدا، سەڵەواتی مەلائیکە نزا کردنیانە بۆی لای خوا.**

**ئای هاوار لەو رادە و پایە بەرزە، بەڕاستی هیچ چاکە و ڕێزگرتنێ ناگاتە ئەم لوتفە گەورەیە!! سەڵات و سەلامی ئیمانداران ئەمەیە داوا بکەن لە خوا سەڵات و سەلام بڕێژێ بەسەر پێغەمبەردا وەکو باوە ئەڵێن: اللهم صل و سلم علی محمد شێوەی سەڵات و سەلامی ئیمانداران زۆر و بە چەند جۆر وتراوە و ئەوترێ تا رادەیەك بە ئاسانی نایەنە ژمارە، بە هەرکام لەو جۆرانە بوترێ چاکە و فەرمانەکە بەجێ دێت، بەڵام باشتر ئەوەیە کە ناوی(آل) ی تیا ببرێ وەکو لە چەند حەدیسی سەحیح دا هاتووە، ناوبردنی آل تا ئەو رادەیە پێویستە ئەوەتا لە هەموو نوێژێك دا ئەوترێ.**

ئینجا با بزانریٚ مەبەست لە سەلأت و سەلامی ئێمە دەربڕینی خۆشەویستی و ریٚز بە گەورە گرتنی پێغەمبەرە(ﷺ)، خوا کە فەرمانمان پیٚ ئەدات بە سەلأت و سەلام لوتفمان دەربارە ئەکات و ئەیەویٚ نرخ و شەرەف وەربگرین بەو سەلأت و سەلامە ئەوەتا سەلأت و سەلامەکەمان جووت ئەکات لەگەڵ سەلأتەکەی خۆی و مەلائیکە و ئەیانکات بە هاوسەری ئەوان، ئەیەویٚ لەم ریٚگاوە بمان گەیەنیٚ بەو ئاسۆ بەرزە بەرێزە. بێگومان بەم ئایەتە روون بووەوە نرخ و ریٚز و پایەی پێغەمبەر(ﷺ) لای خوا، جا لەمەوە دەرئەکەویٚ کە ئازاردانی دڵی بەفەڕی ئێجگار گوناهو تاوانێکی گەورەیە و مافی خۆیەتی خوا دەربارەی ئازاردانی ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ بەڕاستی کەسانیٚ کە ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی ئەدەن ﴿لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا نەفرینی لیٚ کردوون و دووری خستوونەتەوە لە بەزەیی خۆی ﴿فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ لەم دنیا و لە رۆژی دوایی دا ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ ئامادەی کردووە بۆیان سزایەکی ریسوا کەر و ئابڕوو بەر لەگەڵ ئێش و ئازارەکەی دا. بێگومان هیچ کەس ناگاتە ئەو رادەیە ئازاری خو بدات، خوا ئازار نادریٚ و دەست نادات بۆ ئازار دان، کەواتە مەبەست بە ئازار دانی کردەوەیەکە کە خوا قەدەغەی کردووە و دژ و پێچەوانەی رەزامەندی یەتی، یان مەبەست ئازار دانی پێغەمبەرە(ﷺ) ناوبردنی خوا لەبەر زیادە ریٚز و نرخ پیٚ دانە بە پێغەمبەر(ﷺ) تا ئەو رادەیە ئازاردانی ئەو بە ئازاردانی خۆی سەرنج ئەداو دائەنیٚ، هەرچۆنیٚ گویٚ رایەڵی ئەوی داناوە بە گویٚ رایەڵی خۆی، هەروەها ئەو ناوبردنە دەست نیشان ئەکات بە ئەوپەڕی گەورەیی تاوانی ئازاردانی پێغەمبەر(ﷺ) تا ئەو رادەیە ئازاردانی ئەو وەکو ئازاردانی خوا وایە!!

وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ

ئینجا ئەچێ بۆ باسی خراپی ئازاردانی ئیمانداران کە شوێن کەوتووی پێغەمبەرن(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ کەسانێ کە ئازاری پیاوە ئیماندارەکان و ئافرەتە ئیماندارەکان ئەدەن ﴿بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ﴾ بە بێ تاوانێ کە کردبێتیان، واتە شتیان بۆ هەڵئەبەستن ﴿فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا﴾ بێگومان ئەو کەسانە بوختان و گوناهێکی روون و ئاشکرایان خستووەتە سەرشان و گرتووەتە گەردن. ئەم توند و تیژیی بەکار هێنانە وا نیشان ئەدات کە لەو کاتەدا لە مەدینەدا کۆمەڵێ بوون هەڵسابن بە پیلان و پڕو پاگەندەی خراپ دەربارەی ئیمانداران، قسەی خراپیان بە دەمەوە کردبن و بڵاویان کردبێتەوە، شتی ناهەق و ناڕەوایان بۆ هەڵبەستبن، کردەوەی خراپیان نابنە شوێن و خەڵکیان بەد گومان کردبێ لێ یان، ئەو جۆرە پیلان و فاك و فیکە شتێکی گشتی یە و لە هەموو چەرخ و شوێنێ هەر بووە و هەر هەیشە و هەر ئەیش بێت. ئیمانداران هەمیشە نیشانە بوون و ئەبن بۆ ئەو تیرە ژاراوی یانە لەلایەن پیاو خراپ و بەد نیهاد و ناپاك و دڵ نەخۆشانەوە، خوای گەورە تۆڵەی سەندوون لەباتی ئەوان و پیاو خراپ و ناپاکانی دەم کوت کردووە و بەرپەرچی داونەتەوە و لەکەداری کردوون بە هەڵگرتنی بوختان و گوناهێکی روون و ئاشکرا، فەرمودەی خوا لە هەموو شتێك راست ترە.

ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بڵێ بە هاوسەرانی و کچەکانی و ئافرەتانی ئیمانداران بە شێوەی گشتی کە کاتێ لە ماڵ دەرچوون بۆ پێویستی خۆیان سەر و مل و یەخە و بەرۆکیان داپۆشن، تا جوێ ببنەوە لەو ئافرەتانەی کە تەماعیان تێ ئەکرێ، مەترسی یان نەمێنێ لە نیازی خراپە و دەست درێژیی ناموسیان لەلایەن فاسق و خراپەکارانەوە، چونکە ئەو شێوەی شەرم و داپۆشراوی یە تەقێ و ترێز و سام و بیم ئەخاتە دەروونی ئەو

خراپەکارانەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﴿قُل لِّأَزْوَاجِكَ﴾ بلێ بە هاوسەرەکانت ﴿وَبَنَاتِكَ﴾ بە کچەکانت ﴿وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بە ژنانی ئیماندارەکان ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ﴾[1] با دابدەنەوە بەسەر خۆیان دا هەندێ لە پۆشاکە دەرەدامانەکانیان کە لەسەر جل و بەرگەوە ئەیپۆشن، خۆیان بەوە داپۆشن. واتە بە شێوەیەکی تایبەتی خۆیان داپۆشن بەشتێ کاتێ لەماڵ دەرئەچن ئیتر مەبەست دادانەوە بێت بەسەر هەموو لەشدا، وەکو دیمەن و رواڵەتی ئایەتەکە ئەیگەیەنێ یان مەبەست سەر و مل و ئەگریجە و دەم و چاوە بەس، وەکو هەندێ ئەفەرمون، چونکە لە چەرخی نەزانی – جاهلی – کۆندا هەر ئەوە دەرئەکەوت، وەکو جاهیلی تازە نەبوون، کە ئەیانەوێ ئاوا بەرەڵا و رووت و قووت بن، ئینجا چەند رایەك هەیە لە شێوە و چۆنیەتی ئەو داپۆشینەدا، هەموو یەك ئەگرن لەمەدا کە ئەبێ ئەو داپۆشینە سەرو مل و ئەگریجە و گەردن و یەخە و بەرۆك داگرێ و نابێ هەموو روو دەم و چاو بە دەرەوە بێت، ئیتر ئایا هەردوو چاو لەگەڵ کەمێ لە دەم و روودا دانەپۆشینی رەوایە؟ یان بەس چاوێ یان هەردوو چاو قەیناکات؟ ئەمانە چەند رایەکە لەلایەن زانایانەوە. سوود و بەرهەمی ئەم خۆ داپۆشینە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ﴾ ئەو خۆ داپۆشینە نزیك ترە بەمەی بناسرێن بە داوێن پاکی و خۆ پارێزەری، یان بناسرێن کە ئەوانە ئازادن، کەنیزەك و جاریە نین. ﴿فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ کەواتە تەقێ و ترێزیان لێ ئەکرێ و ئازار نادرێن بە نیازی خراپە و دەست درێژی کردنە سەر ناموسیان.(سدّي) ئەفەرموێ: چەند کەسێ لە پیاو خراپی مەدینە بەشەو دەرئەچوون کاتێ تاریکی دائەهات بۆ رێگای مەدینە بە نیازی خراپە و نیازی پیس دەربارەی ئافرەتان. شوێن و ماڵەکانی مەدینە بچووك و تەنگەلان بوون، جا کاتێ ئافرەتان بە شەو دەرئەچوون بۆ پێویستی دەرکردنی خۆیان، ئەو فاسق و خراپەکارانە ئەگەڕان بەدوای ئەو کارە پیسەدا، ئینجا هەر ئافرەتێکی داپۆشراویان بدیبایە، ئەیان وت ئەمە ئازادە و جاریە نی یە، بەهۆی ئەوەوە وازیان لێ ئەهێنا، ئەگەر ئافرەتێکیان بدیبایە بەو جۆرە داپۆشراو نەبوایە ئەیان وت: ئەمە جاریەیە و بەهۆی ئەوەوە پەلاماریان ئەدا.

---

[1] ﴿جلابيب﴾ کۆیە و تاکەکەی ﴿جلباب﴾ ە کە پۆشاکێکی درێژ و پان بووە و پۆشراوە بەسەر جل و سەرپێچ و سەرپۆش دا وەکو عەبا یان کوڵەبانەی زۆر گەورە.

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ خوا هەمیشە زۆر لێ بوردە و بەزەیی دارە، واتە ئەبورێ و بەزەیی بەکار ئەهێنێ سەبارەت بەوەی تێپەڕی کرد لە ڕۆژ و چەرخی نەزانی دا چونکە بێ ئاگا و نەزان بوون بەوەی ئیسلام هێنای.

هەندێ لە بەرهەمی ئەو لێ بوردن و بەزەیی یە ئەوەیە کە ئەو هەموو خەریك بوون و تێکۆشانە هەمیشەیی یەی کرد بۆ پاك و خاوێن کردنی ئەو کەلە بت پەرستە کە چەنای چەند ساڵ و چەرخ دەقیان پێوە گرتبوو بەو هەموو نالەباری و خووڕەوشتی پیس و چەپەڵەوە، تا ئەو ئەندازەیە تا نزیکی دواهاتنی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا مەدینەی پیرۆز پاك بووەوە لەو باو و ڕەوشتە پیسانە ئەوەش بەو هەموو تەمێ و پەند و پەروەردە بێ وێنەی کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی هەڵسا بە یارمەتی خوا و لەبەر ڕووناکی قورئان دا.

ئینجا لەدوای ئەم دەرسەدا هەڕەشە لە ناپاك و دڵ نەخۆشەکان ئەکات کە هەمیشە خەریکی تێکدان و شێواندنی کۆمەڵی موسڵمانان بوون هەڕەشەیان لێ ئەکات بەمەی ئەگەر کۆتایی نەهێنن خوا پێغەمبەریان بەسەردا زاڵ ئەکات هەرچۆنێ زاڵی کرد بەسەر جوولەکەکان دا لەوەوبەر، خوێنیان حەڵاڵ ئەکات تا مەدینە پاك ئەکاتەوە لێ یان، هەرچۆنێ پاکی کردەوە لە جولەکە، ئەفەرموێ: ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ناپاکە دوو ڕووەکان کۆتایی نەهێنن بە ناپاکی و ئازاردانی موسڵمانان بە پەنهانی ﴿وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەوانەی کەلە دڵیان دا نەخۆشی و لاوازی بڕوا و دانەمەزراوی هەیە و بە هۆی ئەوەوە نیازی خراپەکاری ئەکەن، ئەگەر ئەوانە کۆتایی نەهێنن لەو بارو ڕێگا چەوتەی وان لەسەری،

وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لَنُغۡرِيَنَّكَ بِهِمۡ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٠﴾ مَّلۡعُونِينَۖ
أَيۡنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقۡتِيلٗا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ
لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴿٦٢﴾

---

﴿وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ قسه گێڕو دیعایه چی و فاك و فیك كەرەكان لە مەدینەدا كە دڵی موسڵمانان بێ ئارام ئەكەن واز نەهێنن لەو كردەوە خراپەی ئەیكەن، ئەگەر ئەو تاقمانە كۆتایی نەهێنن سوێند بەخوا ﴿لَنُغۡرِيَنَّكَ بِهِمۡ﴾ ئەی پێغەمبەر تۆیان لێ هان ئەدەین و فەرمان ئەدەین پێت بە جەنگ و كوشتار لەگەڵیان و دەركردنیان و ناچار كردنیان بە دەرچوون. ﴿ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ ئینجا بەسەرهاتی گەورەیان ئەمە ئەبێ كە هاوسێیەتی تۆ ناكەن لە مەدینەدا مەگەر ماوەیەكی كەم، یان هاوسێیەتی یەكی كەم. واتە دەرئەكرێن لە نیشتمانەكەیان و نامێننەوە مەگەر ﴿ مَّلۡعُونِينَ﴾ بە نەفرین لێ كراوی ﴿أَيۡنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقۡتِيلٗا﴾ لە هەر شوێنێ دەست كەون ئەگیرێن و ئەكوژرێن بە ئەوپەڕی كوشتن، ئەمە كە بەسەریان دێت تەنها بەسەر ئەمانە نەهاتووە، بەڵكو ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ﴾ خوا ئەوەی كردووە بە باو لەو گەل و كۆمەڵانەی كە لەمەو پێش هاتن و رۆیشتن و تێپەڕیان كرد لە جوولەكەكانی لەمەوپێش لە مەدینەدا لەسەر دەستی پێغەمبەردا، لە هەموو تاوانبارانی گەلەكانی ئەم ئەتەوە. باوی خوا هەر بەو جۆرە بووە ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا﴾ هەرگیز دەست ناكەوێ گۆڕاندن بۆ باو و رەوشتی خوا.

لەم هەڕەشە دەرئەكەوێ تا چ ئەندازەیەك موسڵمانان بەهێز بوون لە مەدینەدا لەپاش(بنی قریظە) و تا چ ئەندازەیەك دەوڵەتی ئیسلام زاڵ بووە بەسەر مەدینە و كاروباری وڵات دا، دوژمن و ناپاكەكان نەیانتوانیوە خۆیان دەرخەن و هەڵسان بە هیچ كارو كردەوەی بەدی خۆیان مەگەر لەپەنای پەردەوە.

ئینجا لەم یازدە ئایەتی داهاتووەدا کە کۆتایی سورەتەکەی پێ ئەهێنێ چەند شتێك ئەهێنێ، پرسیاری بێ بڕواکان لە ڕۆژی دوایی و پەلە نانەوەیان بە هاتنی و گومانیان تیای دا و وەڵامی ئەم پرسیارە، ئینجا شێوەیەکی سامناکی سزای ئەو ڕۆژە ئەخاتە بەرچاو.. ئینجا خەڵکی ئەگێڕێتەوە بۆ ئەم جیهانە و هەندێ تەمێ و مۆچیاریان ئەکات، ئینجا سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بە شتێکی زۆر گرنگ پێی ئەگەین بە یارمەتی خوا، ئەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ﴾ پرسیارت لێ ئەکەن لە ڕۆژی دوایی؟ خەڵکی هەمیشە پرسیاریان ئەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەی کە بە درێژیی ئەدوێ لێ ی و باسی بۆ ئەکردن، ئەیترساندن لێ ی , قورئان شێوەی بەسەرهاتەکانی ئەخستە پێش چاویان بەجۆرێ وەکو ئێستا ئامادە بێت و ببینن پرسیاریان لێ ئەکرد لەکاتی هاتنی، پەلەیان ئەنایەوە بە هاتنی ئەو کاتە، ئەو پەلە نانەوەش یان لەبەر گومان و دوو دڵی بوو تیای دا یان هەر بە دڵ بە درۆیان ئەزانی و ئەیان ویست دەری بڕن کە شتێکی درۆیە، یان مەبەستیان لاقرتی کردن بوو پێی، ئەوەش بە گوێرەی حاڵ و باری پرسیارکەرەکان، دووری و نزیکی یان لە ئیمان و باوەڕەوە.

ڕۆژی دوایی غەیب و نادیاریی یە و کاتی هاتنی و زانینی خوا تایبەتی کردووە بە خۆیەوە، نەیویست هیچ کەس زانا و ئاگادار بکات پێی، تەنانەت پێغەمبەران و مەلائیکەیش – سەلامی خوایان لێ بێت – وەکو حەدیسەکە کە چوار لە کتێبە سەحیحەکان ئەیهێنن لە عومەری کوڕی خەتتابەوە – خوای لێ ڕازی بێت – کە جوبرەئیل لە شێوەی پیاوێکی نەناسراودا هاتو چەند پرسارێکی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) یەکێ لەو پرسیارانە ئەمە بوو: وتی: هەواڵم بدەرێ لە ڕۆژی دوایی، پێغەمبەریش(ﷺ) لە وەڵامدا فەرموی: پرسیار لێ کراو زاناتر نی یە پێی لە پرسیار کەر. کەواتە پرسیار لێ کار پێغەمبەر بوو(ﷺ) و خاوەن پرسیار کە جوبرەئیل بوو هەردوو ئاگادار و زانا نەبوون پێی وەکو لە چەند شوێنێك لە قورئان دا ئەو زانینە تایبەتی ئەکات بە خواوە،

قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٦٥﴾

یەکێ لەو شوێنانە ئێرەیە کە ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ﴾ لە وەڵامیاندا بڵێ: زانینی ئەو ڕۆژە نی یە لای هیچ کەس جگە لە خوا و تەنیا لای ئەوە. خوای گەورە ئەو زانینەی نەدا بە کەس لەبەر هەر هۆیەك کە خۆی باش ئەزانێ، ئێمەیش کەمێکی لێ تێ ئەگەین و هەندێ بەرژەوەندی ئاشکرای تێدایە، با خەڵکی هەمیشە لە ترس و پارێزەری دا بن لێ ی، هەمیشە چاوەڕوانی بن، هەمیشە لە خۆ ئامادە کردن دا بن بۆی نەك لەناکاودا بێت، ئەوەش بۆ ئەوانە کە خێر و چاکەی ویستبێ بۆیان، سیفەتی سام و ترسی خوای لە دڵیان دا جێگیر کردبێ، ئەوانەی کە بێ ئاگان لێ ی و گوێ یان لێ ی نی یە، هەموو کاتێ ئاژین لەسەر خۆ ئامادەکردن بۆ پێگەیشتنی، ئەوانە کەسانێکن لەگەڵ خۆیان ناپاکن، نایانەوێ خۆیان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ، خواش شتەکەی بۆ ڕوون کردوونەتەوە، ترساندوونی لێ ی، کاتەکەی دیاریی نەکردووە و کەسی ئاشنا نەکردووە پێ ی و بە جۆرێکی کردووە هەموو کات چاوەڕوانی هاتنی بکرێ لە شەو و ڕۆژدا، وەکو ئەفەرموێ ﴿وَمَا يُدۡرِيكَ﴾ ئایا چی تۆی پێ زانا و ئاگادار ئەکات، واتە تۆ نازانی لە چ کاتێك دا دێت و بەرپا ئەبێ. ﴿لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾ خوا خۆی ئەزانێ لەوانەیە ڕۆژی دوایی شتێکی نزیك بێت و بەرپا ببێ لەم نزیکەدا، ئەوانە پرسیار ئەکەن لە ڕۆژی دوایی، دەی با بزانن ڕۆژی دوایی ڕاستە و بەدی دێت و ئەمەش شێوەیەکە لە شێوەکانی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا کافرەکانی دەرکردووە لە بەزەیی خۆی و نەفرینی لێ کردوون ﴿وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا﴾ ئامادەی کردووە بۆیان ئاگرێکی هەڵگیرساوی بڵێسەدار ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ کە ئەمێننەوە تیای دا بێ بڕانەوە ﴿أَبَدٗاۖ﴾ هەتا هەتایە بە بێ دواهاتن ﴿لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا﴾ دەستیان ناکەوێ هیچ کاربەدەست و دۆستێك کە پارێزگاری یان بکات، ﴿وَلَا نَصِيرٗا﴾ نە کۆمەك و یارمەتی دەرێ ڕزگاریان بکات،

يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا
سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ

---

﴿ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ ﴾[1] رۆژێ که دەم و روویان ئەم دیو و ئەو دیو ئەکرێ لە ئاگردا بە وێنەی گۆشتێ ببرژێنرێ، ئەوانە لەم رۆژەدا سەرکێشن و گوێ یان نی یە لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام لە رۆژی دوایی دا پەشیمان ئەبنەوە و قەپ ئەکەن بە ئەژنۆی خۆیان دا و ﴿ يَقُولُونَ ﴾ ئەڵێن: ﴿ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾ ئای کاشکێ گوێ رایەڵی خوا و گوێ رایەڵی پێغەمبەرمان بکردایە. بەڵام بە داخیانەوە ئەوە ئاواتێکی بێ نرخ و بێ سوودە، تازە بێ جێ و وەرنەگیراوە، چونکە کات و هەلی لە دەست دەرچوو، ئەو ئاواتەی لەوێ هیچ بەرهەمی نی یە بێجگە لە داخ و مەراق خواردن لەسەر ئەوەی تێپەڕی کرد!!

ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە ژێر دەستە و شوێن کەوتووەکان ئەیانەوێ تاوانی خۆیان بخەنە مل سەرۆك و گەورەکان، دڵیان ئەکوڵێ لە داخ و خەشمیان دەربارەیان: ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ ﴾ ئەوانە لەو رۆژەدا ئەڵێن: ﴿ رَبَّنَآ ﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا ﴾ بەڕاستی ئێمە لە دنیادا گوێ رایەڵ بووین بۆ سەرۆك و پادشا و پیاوە گەورەکانمان، شوێنی ئەوان کەوتین ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ ئینجا ئەوان ئێمەیان گومڕا کرد و لە رێگای تۆی لایان داین، ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾ ئەی پەروەردگارمان دوو قاپ لە سزایان پێ بدە و دوو چەندانەی بکە بۆیان، سزایەك لەسەر گومڕایی خۆیان و سزایەك لەسەر گومڕایی ئێمە، ﴿ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴾ نەفرینیان لێ بکە بەنەفرینێکی زۆر بەتین و گەورە.

ئەوە نموونەیەك بوو لە سزای رۆژی دوایی، کەواتە لە چی پرسیار ئەکەن لێ ی؟ بێگومان ئیمان و کردەوەی چاکی ئەمڕۆ رزگار کەرە لە سزای ئەو رۆژە، وا دەرئەکەوێ

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە و هەموو ئەگونجێن و دڵ داچڵەکێنەرن.

خواستنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ زەینەب – خوای لێ رازی بێت – کە پێچەوانەی باوی چەرخی نەزانی بوو کە ئیسلام ویستی ئەو باوە ناڕاستە تێك بدات و نەیهێڵێ بە کردەوە – وەکو باس کرا – وا دەرئەکەوێ ئەو بەسەرهات و مەسەلەیە هەروا بە سووك و ئاسان تێ نەپەڕیبێ و دەم درێـژیی زۆری لەسـەر کرابێ لەلایـەن ناپـاك و دڵ نەخۆشـەکانەوە، هـەروەها لەلایـەن ئەوانەی تێنەگەیشتبوون لە مەبەست و ئامانجی ئیسلام، دەم بەرەڵا بوو بوو بە تانە و تەشەر و رەخنە گرتن، چپە ئەکرا و دڵ کرمێن ئەکرا لە ئاستی ئەو مەسەلەیە، قسەی گـەورە لـەم دەم دەرئەچوو! ناپاك و پڕو پاگەندەچی و فیك و فاك کـەرەکان هیچ کات نەوەستاوون، هـەموو کـات بەدوای هـەل و رێکـەوتێك دا گـەڕاون بـۆ بڵاو کردنـەوەی ژاری شـەیتانی خۆیـان، وەکـو ئەوەی دیتمـان لـە غـەزای خەنـدەق دا، لـە دەلەسـەی بوختـان بـۆ دایکـی پـاکی ئیمانداران، لـە دابـەش کردنـی ئـەو دەسـت کەوتانـەی کـە بـێ جـەنگ و کوشـتار خـوا خـستی یـە دەسـتی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەر هەل و بە بۆنەی هەر شتێکی ترەوە بە ناهەق ئەوانە نەوەستان.

لەم کاتەدا – لەپاش نەهێشتنی جوولەکە بە تەواوی – لە مەدینەدا کەس نەمابوو کە بە ئاشکرا کافر بێت، بەڵکو هەموو دانیشتوانی مەدینە گەڕا بە موسڵمان، ئیتر یان بەڕاستی یان بـە ناپـاکی، لـەم کاتـەدا ناپاکـەکان بـوون هەڵئـەسان بـە بڵاو کردنـەوەی ئـەو دەلەسـە و پـڕو پاگەندەیە، هەندێ لـە ئیمانداران کەوتبوونـە داویانـەوە، لەگـەڵیان ئەڕۆیـشتن لـە هەنـدێ لـەو قسە و باسـە ژاراوی یانـەیان، ئینجا قورئـان هاتـە خـوارەوە ئەیانترسـێنێ لـە ئـازاردانی دڵـی پێغەمبـەری ئـازیز(ﷺ) بـە وێنـەی ئیـسرائیلی یـەکان کـە ئـازاری موسـایان ئـەدا – سـەلامی خوایان لێ بێت – و تەمێ یان ئەکات کە وتە و وتاریان با رێك و پێك بێت نـەك بـێ مەبەست و ئامانجێکی چاك، گەیشتن بە ئامانجی گەورەیان لا خۆشەویست ئەکات کە بەرهـەمی گوێ رایـەڵی خـواو پێغەمبـەرە(ﷺ) ئەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئـەی کەسـانێ کـە باوەڕتـان هێنـاوە ﴿لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ﴾ وەکـو ئەوانـە مـەبن کـە ئـازاری موسـایان داو شـتی درۆ و ناڕەوایان بۆ هەڵبەست ﴿فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ﴾ تا خوا دەری خست پاك و خاوێنی موسا لـەوەی وتیان دەربارەی.

چەند ریوایەتێك هاتووە لە بابەت مەبەست بەم ئازاردانە، بەڵام ئەوەتا قورئان هیچی دیاریی نەکردووە و هیچ پێویست نی یە بۆ ئێمەیش هەوڵ بدەین بۆ دیاریی کردنی شتێ کە قورئان دیاریی نەکردووە، بێگومان مەبەست ترساندنە لە هەر شتێ کە دڵ ئازاری پێغەمبەری تیا بێ(ﷺ)، قورئان لە چەند شوێنێك دا باسی لاری و لادانی ئیسرائیلی یەکانی کردووە، کەواتە بەسە دەست نیشان کردن بۆ ئازار دانەکەیان ئیتر لە هەر بارو روویەکەوە بووبێت، ترساندنی موسڵمانان لە پەیڕەوی و شوێن کەوتنی ئەوان لەو کردەوە خراپەدا بۆ ئەوەی هەموو بڕواداری قێز بکاتەوە و خۆی دوور بگرێ لەوەی کە وێنەی ئەو کۆمەڵە لار و لادەرە بێت کە قورئان ئاوا جاڕی ئەو کردەوە خراپەی لێ دان، کردنی بە وێنەو نموونەی خراپی و لاری، ئەوانە هەر پیلان و خراپەیەکیان تەنند خوا خاوی کردەوە و پاکی و بێ لەکەیی موسای دەرخست ﴿وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا﴾ موسا لای خوا رێز و قەدر دار و خاوەن روو بووە، خوا دەرخەر و روون کەرەوەی پاکی و بێگەردی پێغەمبەرەکانی بووە هەمیشە لە هەر دەلەسە و بوختانێ بۆیان کرابێ و هەر لەکە و رەخنەیەك ئاراستەیان کرابێ، بێگومان پێغەمبەرمان – کە گەورەتر و بەڕێز تری هەمووانە – شایانترە بەمەی خوا بەرگری لێ بکات و پاکی و بێ لەکەیی دەربخات.. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە هەر شتێك هۆی خەشم و ناڕەزایی خوا بێت، ﴿وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا﴾ وتە و وتارێ بڵێن و قسە و باسێ بکەن کە راست بێت و مەبەست و ئامانجێکی راستی هەبێت و مەبەست پێی گەیشتن بێت بە حەق و راستی، واتە هەر قسەیە ئەکەن وردی بکەنەوە و بزانن بۆ کوێ ئەڕوا و مەبەست بەو قسە چی یە؟

يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا
عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ

**شوێن هەموو قسە و باسێ مەکەون و گوێ مەگرن لە قسەی ناپاکان و پڕو پاگەندە چی یان، ئەگەر ئێوە بەو جۆرە بن خوا ئەم دوو ئامانجە گرنگەتان بۆ فەراهەم ئەهێنێ:**

**١- ﴿ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴾ کردەوەکانتان بۆ چاك ئەکات بە وەرگرتن و پاداشت دانەوە.**

**﴿ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ﴾ ئەسڕێتەوە و دائەشارێ لەبەر ئێوە گوناهو تاوانەکانتان، بەهۆی ڕاست و دامەزراویتان لە وتار و کرداردا، ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ هەرکەس گوێ ڕایەڵ و فەرمان بەری خوا و پێغەمبەرەکەی بێت ﴿ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ بەڕاستی ئەو کەسە گەیشتووە بە مەبەست و ئامانجێکی زۆر گەورە، چونکە لەم جیهانەدا ئەژی بە کامەرانی و سوپاس کراوی، لە ڕۆژی دواییش دا بە گەیشتن بە خۆش بەختی و نازو ڕێزی نەبڕاوە. بێگومان گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لە خۆی دا گەیشتنە بە ئامانجی گەورە، چونکە ئەو گوێ ڕایەڵی یە بریتی یە لە دامەزران و ڕێك ڕاوەستان لەسەر ڕێگا و بەرنامەی خوا، ئەوەش هۆی ئارامی دڵ و دامەزراوی یەتی، ڕێگای ڕاست دانە بەر، خۆی لە خۆی دا خۆش بەختی و کامەرانی یە، ئیتر با هیچ پاداشتێکی بە دوادا نەیەت، بێگومان کەسێ بڕوا بە ڕێگایەکی تەخت کراوی ڕووناکدا بە وێنەی کەسێ نی یە کە بڕوا بە ڕێگایەکی لارو سەخت و تاریك دا، کەواتە گوێ ڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) پاداشتەکەی خۆی لەگەڵە، گەیشتنە بە ئامانجی گەورە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، لوتف و بەزەیی یەکەی زیادەیە بە خۆڕایی و بێ بریتی و موقابیل. بەڵێ ئەجرو پاداشتەکە خوا ئەیداتەوە لەسەر ئیمان و کردەوەی چاك زیادە لوتف و بەزەیی یەکە خوا بەکاری ئەهێنێ لەگەڵ ئادەمی دا، لەبەر لاوازی و بێ دەسەڵاتی یەکەی، لەگەڵ گرنگی و گرانی ئەو ئەرکە قورسەی کە خستوویەتیە سەر شانی، ئەرکی هەڵگرتنی ئەو سپاردەی کە ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان لێ ی ترسان و نەیانتوانی بچنە ژێری و هەڵیان نەگرت، ئادەمی هەڵی گرت، بەڵێنی دا بە هەڵگرتن و بەجێ**

هێنانی بە تەنیا، ئادەمیش ئەم ئادەمی یەیە بەم لاوازی و زۆر زەختی و ئارەزووات بەسەریەوە، بە کەم و کوڕی زانین، کەم و کورتی تەمەن و ژیان، بەم هەموو بەرهەڵستی گەورە و گرنگەی کە هەیە لەبەردەم و بەرچاوی. بەرهەڵستی کات و چەرخ و شوێن، کە بەرگری ئەکەن لە ناسین و زانینی تەواو و دیتنی هەر شتێك و هەر بەسەرهات و ڕووداوێك کە لەو دیوی ئەو بەرهەڵستەوە، کەواتە هەرکات هەڵسا بە جێ بەجێ کردنی کارو فرمانێ لێ ی داوا کراوە ئەو کاتە خوا لوتفی لەگەڵ ئەکات و ئەجرو پاداشتی گەورەی ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ﴾[1] بەڕاستی ئێمە سپاردەمان خستە بەردەم ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان و نیشانمان دان بۆ گرتنە گەردن و چوونە ژێری و هەڵبژاردنی بە مەیل و ئارەزووی خۆیان، سپاردەی هەرشتێك کە داوایان لێ بکرێ لەلایەن خواوە و پێویست بکرێ پارێزگاری و چاودێر بێ و هەڵسان پێ ی بە خواهیش و هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا﴾ ئینجا ئەوانیش ملیان پێدا نەکرد و نەچوونە ژێر ئەوەی هەڵی گرن و بیگرنە گەردن،﴿وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾ مەترسیان کرد لەو سپاردەیە. ئەم ئاسمان و زەوی و بوونەوەرە پان و فراوانە کە تەنها خوا ئەنداز و ڕادەی ئەزانێ، خوای پەروەردگاری خۆی ئەناسێ بە بێ هەوڵ و تێکۆشان، ڕێگای هەموو کارو فرمانی خۆی ئەداتە بەر، بە موو لانادات لە یاسا و ڕژێمێ کە بۆی دانراوە بە بێ بیرو سەر لێ کردنەوە، بە بێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا، بە بێ وچان و وەستانێ چرکە بە گەردش و خولانەوەی خۆی ئەکات بە بێ دواو بەر و لادان، هەڵئەسێ بەو هەموو کارو فرمانی سەر سوڕهێنەرە بە سروشتی خۆی بە بێ هەست و خواهیشی خۆی.

٢- ئەم خۆرە گرنگە چەرخە ئەکات لە ئاسمان و خولگەکەی خۆی دا بە چەرخەیەکی ڕێك و پێك کە هەرگیز هەڵە ناکات و تیشکی خۆی ئەهاوێ و ئیش و کارێ خۆی بۆی

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، هەندێکیان نزیکە و ئەگونجێن و هەندێکی تریان کەمێ دوورە و هەندێکی تریان زۆر دوورە، بەهەرحاڵ ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە زۆر جێگای باوەڕە و دڵم زۆر ئارامە پێ ی، لەبەر ئەوە هەڵم بژارد و بە پێویستم نەزانی درێژە پێدان و باسی هیچ جۆرێ ترم نەکرد.

دیاریی کردووە بەجێی ئەهێنێ، پاشکۆو شوێن کەوتووەکانی رائەکێشێ بە بێ ویست و خواهیش لەلایەن خۆی و ئەوانەوە، بەو جۆرە دەوری خۆی ئەبینێ بە تێرو تەواوی لەم بوونەوەرەدا. ئەم زەوی یە چەرخەی خۆی ئەکات، کشتوکاڵی خۆی دەرئەکات، خۆراکی رۆڵەکانی ئەدات، مردووەکانی ئەگرێتە خۆی، ئەیانشارێتەوە، ئاو و کانیاوەکانی هەڵئەقوڵێنێ، بە پێی ئەو باو و خواهیشی خوا و بە بێ دەسەڵات و خواهیشی خۆی. ئەو مانگ و ئەستێرانە، ئەو باو هەورە، ئەو هەواو ئاوە... ئەو چیاو شاخانە، ئەو هەموو دۆڵ و دەشت و دەرە.. هەموو ئەوانە کارو فرمانی خۆیان بەجێ ئەهێنن بە فەرمان و ئیزنی خوا، خوای خۆیان ئەناسن، مل کەچن بۆ مەیل و خواهیشی خوا بە بێ هەوڵ و ئەرك و تێکۆشان لەلایەن خۆیانەوە. ئەوان ترسان لەو سپاردەیە کە بە خواهیش و هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان بکرێ. ﴿وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ﴾ ئادەمی ئەو سپاردەیەی هەڵگرت و گرتی یە گەردن. ئەو ئادەمی یەی کە بە هەست و تێگەیشتنی خۆی خوای خۆی ئەناسێ، رێگا ئەداتە بەر بۆلای مەبەست و کاری خۆی بە بیرو تێروانینی خۆی، ئیش و کاری خۆی ئەکات بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی، گوێ رایەڵی خوا ئەکات بە مەیل و ئارەزووی خۆی، لە هاندان و پەلاماردانی خۆی، بە بەرگری کردنی لادان و ترازانی خۆی، بە بەربەرەکانێ و دژ هەڵسانی لەگەڵ مەیل و ئارەزووەکانی دەروونی خۆی.. ئەو ئادەمی یە لەم هەموو هەنگاوانەدا خواهیش و مەیل دار و زانا و تێگەیشتووە. بە هەڵبژاردن و ئارەزووی خۆی رێگای خۆی ئەداتە بەر وەم ئەزانێ ئەو رێگایە بۆ کوێ ئەڕوا و سەری لە کوێوە دەرئەکات!!

بەڕاستی سپاردەیەکی زۆر گەورە و گرنگە کە ئەم ئادەمی یە گرتی یە گەردن، بەو بچووکی و بێ هێزی و لاوازی و تەمەن کورتی یەوە کە هەمیشە کۆست و گرێی دەروونی و دەرەوەی زۆر و زەبەنەی هەیە و بەرگری ئەکەن. بەڕاستی هەڵگرتنی سپاردەی وا زۆر جێگای مەترسی یە و بارێکی ئێجگار قورس و گرانە،

جا لەبەر ئەوە فەرموی: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ بەڕاستی ئادەمی زۆر ستەم کار بوو لە خۆی. زۆر نەزان بوو بە تاقەت و توانای خۆی، ئەمە سەبارەت بەو ئەرك و بارە گرانەی دای بەسەر خۆی دا و ئەو مەترسی یە گەورەی خۆی تێ فڕێ دا، بەڵام کاتێ هەڵسێ بەو ئەرکە زۆر گەورە و گرنگە. کاتێ بگاتە زانین و ناسینێ کە بیگەیەنێ بە پەروەردگاری، ڕێ بردن لە ڕێوە بە ڕژێم و یاسای خۆی، گوێ ڕایەڵی تێرو تەواو بۆ خوای خۆی.

ئەو زانین و ناسین و ڕێ بردن و گوێ ڕایەڵی یەی کە لە سووك و ئاسانی و تێرو تەواویدا بگاتە ڕادەی ئەوەی کە فەراهەم هات و هەیە لە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکاندا.. کاتێ بگاتە ئەو ڕادەیە، لە کاتێك دا کە ئادەمی تێگەیشتوو و زانا و خواهیش دارە، بێگومان ئەو کاتە ئادەمی ئەگاتە ڕادە و پلەیەکی بەرز و بەڕێز، ڕادە و پلەیەکی جیاوازی تاقانە لەناو هەموو دروست کراوەکانی خوادا، بێگومان ئەم خواهیش و سەربەستی و زانین و تێگەیشتن و هەوڵ و تێکۆشان و هەڵگرتنی ئەرکی کردەوە کە خوا داوێتی بە ئادەمی بوومتە هۆی جیا بوونەوەی ئەم گیان لەبەرە لە هەموو گیان لەبەرەکانی تر. ئەوەیە هۆی ئەو ڕێز پێدانە کە خوا ئاشکرای کردو هەواڵی پێدا لەناو کۆمەڵی هەرە بەرزدا، ئەوە بوو هۆی سوژدە بردنی مەلائیکە بۆ ئادەم. وەکو قورئان جاڕی پێ ئەدات.. کەواتە با هۆی ئەو ڕێز پێدانەی خۆی بناسێ، با هەڵسێ بەو سپاردەی کە هەڵیبژارد، نیشان ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان دراو ئەوانیش نەچوونە ژێری و نەیان گرتە گەردن و مەترسی یان لێ کرد. کارەکە بەو جۆرە هات و ڕووی دا ﴿لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ﴾ بۆ ئەمەی خوا سزای ناپاکەکان بدا چ پیاو و چ ئافرەت، ﴿وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ﴾ سزای هاوبەش بڕیار دەرەکان و بت پەرستەکان بدات چ پیاو و چ ئافرەت،

﴿وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ تۆبە و گەڕانەوە وەرگریٚ لە بڕوادارەکان چ پیاو و چ ئافرەت، واتە تایبەتی ئادەمی بە هەڵگرتنی ئەو سپاردەیە و گرتنە گەردنی ئادەمی بۆ ئەمەی زانین و ناسین و کردەوە و هەوڵ و تێکۆشان و ڕێگای ڕاست دانە بەری بە خواهیش و مەیل و هەڵبـژاردنی خۆی بیٚ.. ئەوانە هەموو بۆ ئەمە بوو بەرهەم و دوا ڕۆژی کردەوەی خۆی لەسەر شانی خۆی بیٚ، تۆڵە و پاداشتی لە کردەوەی خۆیەوە فەراهەم بیٚ، ئەو کاتە بێگومان ئەم ئادەمی یە بە مەیل و خواهیشی خۆی ئەبیٚ بێتە دوو تاقم و دوو کۆمەڵ، ئەبیٚ هەر تاقمیٚ بگات بە بەر و بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەی خۆی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ هەمیشە خوا زۆر داشاردەر و لیٚ بوردوو بەزەیی دارو میهرەبانە، بەهۆی ئەوەوە تۆبە و گەڕانەوە وەرئەگریٚ لە ئیمانداران هەرچەند هەڵە و گوناهیان ببیٚ، پاداشتیان ئەداتەوە بە گەیشتن بە ئامانجی هەرە گەورە لەسەر گویٚ ڕایەڵی و چاکەیان لە لوتف و کەرەمی بەزیاد بێت، داوای سڕینەوەی گوناهو تاوان و بەزەیی لیٚ ئەکەین.

ئینجا لە کۆتایی دا شتیٚ ماوەتەوە پێویستە ڕوون کردنەوەی، ئەوەش بریتی یە لە مەبەست و چۆنێتی نیشاندانی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان، کە خیلاف و دووبەرەکی زۆرو زەبەندەی تێدا هەیە، وەك و بە درێژیی لە گەلیٚ کتێبەکانی تەفسیردا باس کراوە.

لەناو ئەو هەموو ڕایانەدا ئەم ڕایە هەڵئەبـژێرم و باوەڕم پیٚ ی بەهێزە کە ئایەتەکە لە دیمەن و ڕواڵەتی لانادات و ئەڵیٚ خوای گەورە ڕووی فەرمودەی کردە ئەوانە و داوای لیٚ کردن ئەو سپاردەیە بگرنە گەردن، بەڵام نەك بە پێویست کردن لەسەریان، بەڵکو بە شێوەی ئیختیاری و ئارەزووی خۆیان، ئەوانیش کە خوای خۆیان ئەناسن و هەمیشە بە زمانی تایبەتی خۆیان یاد و تەسبیحی خوا ئەکەن، ئەو داوا و فەرمودەیان بیست و وەرگرت و تیٚ ی گەیشتن و زانییان کە بار و ئەرکەکە زۆر قورسە و ترسان لیٚ ی زاتیان نەبوو بچنە ژێری. بەڵام ئادەمی ئەوەتا بیٚ سەر لیٚ کردنەوە گرتی یە گەردن و چووە ژێری، جا هەرکەس

بڕوای بەمە هەیە چاکە و هەرکەس ئەم رایە ناچێتە دڵیەوە - چونکە دژ و پێچەوانەی باوە - با سەرنج بدا لەو راکانی تر ئەوەی بە دڵیەتی هەڵیبژێری، ئەگەر هیچ کام دڵنیای ناکەن دەی زانینەکەی حەواڵەی خوای بکات و بڕوای وا بێ کە شتەکە راستە و ئەم تێ ی ناگات بە وێنەی ئایەتە(متشابه)کان، ئەبێ هیچ کەسێ لە خۆی نەگۆڕێ و بزانێ کە ئێمە بەشێکی زۆر کەم لە زانینمان پێ دراوە، بە تایبەتی لە ئاستی قورئان ئەبێ ئێمە ئاگامان لە چی ببێ و چی بزانین لە نهێنی یەکان کە هەرگیز دوایی یان نایەت.

بەڕاستی من زۆر سەرم سوڕ ئەمێنێ لە هەر ئیماندارێك لەو جۆرە شتانەی کە باس کران، یان سەربکاتەوە لە دەسەڵات و توانینی خوا بەسەر ئەوەدا ئەم دارو بەرد و شتە بێ گیانانە زانا و ئاگادار و تێگەیشتوو بکات بە هەرشتێ خوا بیەوێ. ئایا ئێمە لەشمان لەو خۆڵ و دار و بەردە پێك نەهاتووە و کراین بەم گیانلەبەرە زانا و ژیرو گۆیا؟!!

وصلى الله و سلم على سيدنا محمد و على آله و صحبه، و كل تابع لهم بإحسان.

# ﴿ئاگادار كردنەوەيەك﴾

دوژمنەكانی ئەم ئايينە گەورەی ئيسلامە هەر لە كۆنەوە خەريك بوون و ئەوەی لە دەستيان هات بەكاريان هێنا بۆ ئەوەی لە هەر لايەك كون و كەلەبەرێك بدۆزنەوە تا بەهۆی ئەوەوە دەمی ژاراوی خۆيان بخەنە كار بۆ گەستنی رۆڵە نەشارەزاكانی ئيسلام و دوو دڵ كردنيان بەرامبەر ئايينە پاكەكەيان. سوپاس بۆ خوا لە هەر كون و كەلەبەرێكەوە سەريان دەرهێنا درا بە تەوقی سەريان دا و پان كرايەوە. بۆ نموونە:

١- رەوا دانی ئايينی ئيسلام بۆ خواستنی زياد لە يەك ئافرەت تا چوار بە شێوەی گشتی.

٢- زۆری حەرەمەكانی پێغەمبەر(ﷺ) و جياكردنەوەی لە نەتەوەكەی لەو بارەيەوە.

ئەم دوو شتەيان كرد بە تانە و رەخنەيەكی زۆر گەورە و كرديان بە فاك و فيك و كاريان كرد لە دڵی زۆر لە نەشارەزا و نەزانەكان. جا بە بۆنەی ئەم سورەتی ﴿الأحزاب﴾ەوە كە زۆر لە كاروباری ژن و مێردی تيايە و بە تايبەتی حەرەم و خێزانەكانی پێغەمبەر(ﷺ) بەو بۆنەيەوە بە جوانم زانی دوان و لێكۆڵينەوەيەك بكەم لە بارەی ئەو دوو باس و مەسەلەيەوە، بە شێوەيەكی كورت و سووك.

لەبارەی يەكەمەوە ئەڵێين: چەند هۆيەكی ئاشكرا هەيە بۆ رەوادانی خواستنی زياد لە يەك ئافرەت، هەركەس ژيريی لەكار نەكەوتبێ بە تەنيا هۆيەك لەوانە دڵنيا ئەبێ و باوەڕ ئەهێنێ كە ئەو رەوادانە شتێكی راستە و پێويستی و ناچاری هەيە بەو بڕيارو ياسايە. جا با بە وردی بيانخەينە روو:

أ- زۆر جار ژنی كابرا نەزۆكە و بێگومان منداڵ گرنگ ترين ئامانجە، كەواتە ناچارە بە ژن هێنان، يان دووچاری نەخۆشی يەكی هەميشەيی چار نەكراو دێت يان نەخۆشی يەكە سيرايەت ئەكات و خەڵكی دووچار ئەبێ لێ يەوە، ديارە لەو كاتەدا كەڵكی مامەڵەی ژن و مێردی نامێنێ، دەی لەو كاتەدا ئەگەر رەوا نەبێ ئەو مێردە ژنی تر بهێنێ ناچار يان ئەبێ ئەو ئافرەتە نەخۆشە دەست لێ هەڵگرێ و بەرەڵای بكات بۆ ئەمەی بتوانێ ژن بێنێ، كە ئەوەش جەورو ستەمێكی زۆر گەورەيە دەربارەی ئەو ئافرەتە نەخۆشە دڵ رەنجەيە. بەڵكو ئەگونجێ ئەو نەخۆشە داماوە بێكەس بێت و لان و يانەيەك شك نەبا ا. كەواتە ئەگەر تەڵاق درا بۆ كوێ بڕوات؟! يان منداڵ دارە لە مێردەی و بەو تەڵاق دانە بە تەواوی سەر ئەشێوێ لەو ماڵ و منداڵە و تەفرەتە ئەكەوێتە ناو ئەو منداڵ و باوك و

دایکە، ئەو مێردە یان ئەبێ ئەو ئافرەتە نەخۆشە تەلاق بدات و ئەو خراپە و تاوانە روو بدات یان ئەبێ بە بێ نامووسی و داوێن پیسی بژی و ئارەزووی ژن و مێردی خۆی تێر بکات!!

ب- زۆر بە دەگمەن ئەگەر دەست کەوێ ولاتی کە ژمارەی ئافرەتی زۆرتر نەبێ، بە تایبەتی هەر ولاتێ جەنگ و کوشتاری گەورەی تیا کەوێ. دەی ئەو ئافرەتانەی کە زیادن یان ئەبێ شوو نەکەن و بێبەش بن لەماڵ و مێرد و رۆڵە و لانە و یانە، ئەو کارگە گرنگەی ئادەمی یە لە ئیش بخەین، یان ئەبێ ئەو ئافرەتە داماوانە بەرەڵا بن و بە کاری بێ شەرەف و داوێن پیسی ژیان بەرنە سەر، ئەو کاتە هەر منداڵێکی بوو زۆڵە و بێ خاوەن، کەواتە دایکە نارەواکەی ناچارە ئەبێ بیکوژێ و لەناوی بەرێ چونکە باوك و کەسی نی یە بەخێوی بکات، یان ئەبێ توری بداتە ناو کوڵان و سەرجادە بەڵکو شارەوانی بەخێوی بکات. جا وەرە سەرنجی دڵ و دەروونی ئەو دایکە بدە ئەبێ چ ژیانێ بەسەر ببات، هاوەڵ و هاورێکانی ئەژین لەناو ماڵ و منداڵ و مێردی خۆیان دا بە خۆشی و ئەمیش ئەبێ بەو جۆرە بژی کە باس کرا، بێجگە لە روو رەشی و تاوانباری لای خواو لەناو بەندەکانی خوادا، مەترسی سزای دۆزەخ.

ج- ئایینی پاکی ئیسلام هانی ئیمانداران ئەدات و داوا ئەکات کە هەوڵ بدەن بۆ زۆر کردنی ئەولاد و وەچە و نەوە تا بەهۆی گەلی ئیماندار زۆر و گەورە بێ و دوژمن بیمی لێ بکات و نەتوانێ دەست درێژیی لێ بکات، ئەو زۆر بوونەش ناگونجێ بەمە نەبێ خواستنی زیاد لە یەك ئافرەت رەوا بدرێ.

د- قەدەغە کردنی خواستنی زیاد لە یەك ئافرەت سەری لەوە دەرئەچێ و هۆی پەیدا بوونی زۆڵ و منداڵی ناشەرعی یە لە ولاتدا بە زۆری، وەکو رووی داوە لە زۆربەی ولاتە رۆژئاوایی یەکان دا، کە ئەو قەدەغە کردن و بەرگری یە بوو بەهۆی بلاو بوونەوە و زۆر بوونی گەلێ نەخۆشی کوشندەی چارەسەر نەکراو لە زۆر لەو ولاتانەی کە ئەو قەدەغە و بەرگری یە ئەکەن، لە سەرەنجامی بلاو بوونەوە و زۆر بوونی داوێن پیسی تێکەڵ و پێکەڵی پیاو و ئافرەت. تا رادەیەك لەم سالانی دوایی یەدا سەرۆکی پزیشکی سوید لە رۆژنامە و گۆڤاردا بلاوی کردەوە کە لەو ولاتانەدا چەند هەزار نەخۆشی هەیە، کە ٨٠٪ بەرهەمی ئەو داوێن پیسی و تێکەڵی یە نارەوایە، وتی هیچ چارە نی یە بۆ رزگار بوون بە گەرانەوە نەبێ بۆ ژن هێنان و تێکەڵی شەرعی. ئەم جۆرە بەرهەمە پیسانە بوون بە

هۆی ئەوە لە ئەڵمانیا بڕیار درا سڕینەوەی بڕیاری ئەو قەدەغەیە هەرچەند پێچەوانەی عەقیدە و باوەڕی مەسیحێتی خۆیانە.

ئەمە بوو بە کورتی هەندێ هۆی ڕەوادانی ژن هێنان و خواستنی زیاد لە یەك ئافرەت، کە بێگومان هەرکەس ڕێزی ژیریی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز ملە جەڕە ناکات و دان نانێ بە ڕاست و ڕەوایی بڕیاری ئایینی پاکی ئیسلامدا، ئینجا سەرە رای ئەو هەموو هۆیانە ئایینی پاکی ئیسلام ڕێگای بەرەڵا نەکردووە هەرکەس بە ئارەزووی خۆی هەرچەند ژن بێنێ بە بێ هیچ مەرجێك. بەڵکو ژمارەی دیاریی کردووە و مەرجیشی بۆ داناوە، ئەفەرموێ: ﴿فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً﴾ بخوازن ئەوەی پێتان خۆشە لە ئافرەتان دوو دوو سێ سێ و چوار چوار، ئەگەر مەترسیتان کرد لەوەی بە عەدالەت نەجووڵێنەوە ئەوە تەنها یەکێ بخوازن، ئیتر ئایا هیچ کەس ڕێگای دەمبازی هەیە لەم مەسەلەیەدا، بەڕاستی لە دوای ئەم تۆزە لێکۆڵینەوە زۆر جێگای سەرسوڕمانە هیچ کەس سەر بکاتەوە لەو بڕیارە بەفەڕەی ئیسلامە!!

ئینجا با بێینە سەر لێکۆڵینەوە و روون کردنەوەی ڕاست و ڕەوایی دووەمیش. پێش ئەوەی بچینە باسەکە چاك وایە بیرێ لەوە بکەینەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ژیانی بردە سەر ماوەی ٢٥ساڵ لەگەڵ یەکەم هاوسەری خۆی خاتوون خدیجە کە پێش پێغەمبەرێتی خواستی، لەو کاتەدا خۆی لە تەمەنی ٢٥ ساڵی دا بوو ئەمیش تەمەنی ٤٠ ساڵ بوو، کەواتە خۆی لە جۆشی گەنجی دا بوو ئەمیش بەرە و پیری ئەڕۆیشت، کە بە پێی باوی خەڵکی ژیان لەنێوان پیاو و ئافرەتێکی وادا بە دەگمەن بە خۆشی بڕواو بەسەر ببرێ. کەچی بە پێچەوانە ژیانێکی ئێجگار بەرز و بەڕێز و بە خۆشەویستیان بەسەر برد هەتا خاتوو خەدیجە لە دنیا دەرچوو، لەپاش مردنیشی یاد و باسی نەبڕی، ساڵی لە دنیا دەرچوونی ناوبرد بە(عام الحزن) ساڵی داخ و غەمباری، ئینجا سێ ساڵ مایەوە بە بێ خێزانێ تا تەمەنی بەفەڕی گەیشتە ٥٣ ساڵ و ئینجا یەك لە دوای یەك ئەم ئافرەتانەی خواست کە باسیان ئەکەین – خوا لێ یان ڕازی بێت – کەواتە لە کاتی هێزو گەنجی تێپەڕی نەکرد لەو تەنیا ئافرەتەی کە باس کرا، هەتا لە تەمەنی ٥٣ ساڵی دا کە پێی نایە پیری، ئەبێ هۆیەکی بەهێز و بەرژەوەندی یەکی گەورە بوو لە خواستنی هەرکام لەو هاوسەرانەدا، هۆ و بەرژەوەندی یەکی تر، نەك بەجێ هێنانی ئارەزووی ژن و مێردی، هەرچەند پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئادەمی یە بەشدارە لە خواست و ئارەزووە سروشتی یەکانی ئادەمی دا،

بە تایبەتی لەم بارەی پیاوەتی یەوە تێرو تەواو تر بووە لە هەموو ئادەمی یەکی تر. چونکە ئەگەر مەبەستی ئارەزوو بوایە لەو ماوەی ٢٥ ساڵەدا نەئەمایەوە بە دیاری تەنیا ئافرەتێکی بێوەژن کە ١٥ ساڵ لەخۆی گەورەتر بوو و لەوە و پێش دوو شووی کردبوو.

ئینجا بێگومان هەموو کەس خوا خوای بوو پێغەمبەر(ﷺ) ژنی لێ بخوازێ و هەموو ئافرەتێ ئاواتە خواز بوو خوا ئەو پایە و بەهرەیەی بداتێ. کەواتە ئەگەر مەبەستی لە ژن هێنان بەجێ هێنانی ئارەزوو بوایە چاوی هەڵنەخست کام کچ جوان و سەرتەڵ بوایە ئەوەی ئەخواست، هەرچەندی بویستایە بە سووك و ئاسان و بە شانازی یەوە دەست کەوتی ئەبوو، ئەگەر مەبەستی دڵداری بوایە بەو جۆرەی ئەکرد. ئەمانەی نەئەهێنا کە زۆربەیان پیرو بێوەژن و نەویستە بوون. کەواتە با گوێ شل کەین بۆ هەندێ لەو هۆو بەرژەوەندی یانە:

**بەرژەوەندی گشتی:**

١- بێگومان پەیام و پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ) گشتی یە بۆ پیاو و ئافرەت، یاساکانی شەریعەتەکەی هێندێکیان گشتی یە بۆ پیاو و ئافرەت هێندێکیان تایبەتی یە بە یەکێکیانەوە، بەهۆی زۆری یاساکان و زۆری و بڵاوی ئیمانداران و کەم و کورتی ماوەی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) هەرکام لەو جۆرە یاسایانە پێویستن بە ژمارەیەکی زۆر لە ئیمانداران بۆ راگەیاندن و پێناسین و فێر کردنیان، ئەگینا ئەو راگەیاندنە بە تێرو تەواو بەدی نەئەهات. هەندێ لەو یاسایانەی کە تایبەتین بە ئافرەتەوە، ئافرەت شەرم ئەکات لە پیاوی وەرگرێ. پیاویش شەرم ئەکات رایگەیەنێ، بۆ نموونە دایکی باوەڕداران عائشە – خوای لێ رازی بێت – ئەگێڕێتەوە کە ئەسمای کچی یزیدی ئەنساری هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: چۆن غوسلی خۆم دەرکەم لە بێ نوێژیی؟ ئەویش بۆی باس کرد و فەرموی: پارچە لۆکەیەکی میسك پیا کراو وەبگرە، ئەویش تێ نەئەگەیشت و پرسیارەکەی دووبارە و سێ بارە کردەوە و پێغەمبەریش(ﷺ) هەمووجارێ ئەیفەرمو: سبحان الله، شەرمی ئەکرد و رووی نەئەهات شتەکەی بە تەواوی بۆ روون بکاتەوە، لەپاشان لەشەرم دا رووی وەرگێڕا. ئینجا عائشە – خوای لێ رازی بێت – پەلی گرت و شتەکەی حاڵی کرد کە مەبەست ئەوە ئەو پارچە لۆکە میسکاوی یە بخاتە ناو عەیبی. کەواتە پێویستە ژمارەیەك لە ئافرەتان ئەو یاسا تایبەتی یانە وەرگرن لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئینجا رایگەیەنن بە ئافرەتانی تر، بێگومان جگە لە هاوسەرەکانی هیچ کەسی تر شیاو نی یە بۆ ئەو وەرگرتنانە، چونکە ئەوان بە

هۆی تایبەتی یان پێ یەوە لە روویان ئەهات هەموو جۆرە شتێکی لێ وەرگرن و باشتر تێ ئەگەیشتن لە مەبەستی.

٢- بێگومان ژن و ژن خوازی زۆر هۆیەکی بەهێزە بۆ پەیدا بوونی یەکێتی و خۆشەویستی و یارمەتی دان، کەواتە زۆر کردنی ئەو دەست و پەیوەندی یە زۆر پێویست بوو لەبەر راکێشانی دڵی تیرە و بەرە ژن لێ خوازراوەکان بۆ ژێر ئاڵای ئیسلام، بۆ یارمەتی دان و بەرگری کردنیان لە پێغەمبەر(ﷺ).

٣- پێویست بوو دڵخۆش کردن و دڵنەوایی ئەو ئیماندارانە کە لە رێگای ئایینی ئیسلام دا دووچاری ئەشکەنجە و دەربەدەری بوون، دەستیان هەڵگرت لەوەی دڵ ئارەزووی بکات لە پێناوی ئایینی ئیسلام دا، بێگومان ژن خواستنی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەر تیرە و بەرەیەك هۆی شادمانی و شانازی بوو بۆ هەموو باوەڕدارانی ئەو تیرەیە، سارێژ بوونی هەموو ئێش و ئازارێکیان، ئەمانە چەند هۆیەکی گشتی بوون بۆ زۆر کردنی ئەو دەست و پەیوەندی و ژن خواستنە.

ئینجا با بێینە سەر باسی هۆ تایبەتی یەکان بۆ هەرکام لە دایکی ئیمانداران: لەپاش خەدیجە:

١- سودەی کچی زمعە کە خێزانی سەکرانی کوڕی عەمر بوو کە هەردوو موسڵمان بوون و لەپاشان زۆریان پێ هێنرا و ناچار بوون بە جووتە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، لەوێ سەکران بە رەحمەتی خوا چوو ئەو ئافرەتە بێ کەس مایەوە، ئافرەتێکی پیری لەڕو لاوازی نەویستە بوو، بەڵام تێکۆشەر و کۆڵ نەدەر بوو لە رێگای ئیسلام دا، لەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) رێز و پایەی پێدا مارەی کرد، ئەگەر ئەو لوتفەی لەگەڵ نەکردایە هەروا ئەمایەوە بە بێ کەس و بێ دەر لەو وڵاتی غەریبی یەدا، یان ناچار ئەبوو بهاتایەتەوە بۆلای ئامۆزا و کەس و کارە بێ بڕواکانی، ئەو کاتە یان ئەیان کوشت، یان هەڵیان ئەگێڕایەوە لە ئایینەکەی، ئینجا دوای ساڵێ سەودە وەفاتی کرد - خوای لێ رازی بێت - پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەدا تەمەنی گەیشتە ٥٤ ساڵ بە بێ خێزان و بنەوان مایەوە لەپاش سەودەی خوا لێ خۆش بوو.

٢- عائشەی کچی ئەبوبەکری هێنا بۆ پاداشت دانەوەی ئەبوبەکر - خوای لێ رازی بێت - کە یەکەم پیاو بوو بڕوای هێنا، ئەوپەڕی رادە پێغەمبەری خۆشویست و بە هەموو جۆر ئەیویست خۆی نزیك بخاتەوە لێ یەوە، ئەو دەست و پەیوەندی یە جێگای شادمانی و

شانازی بوو نەك تەنها بۆ ئەبوبەکر، بەڵکو بۆ ئەو دەست و پەیوەندی یە جێگای شادمانی و شانازی بوو نەك تەنها بۆ ئەبوبەکر، بەڵکو بۆ ئەو بنەماڵەیە و هەرکەسیش پەیوەندی بوو پیێ یانەوە، ئەوەتا عبدالله ی کوڕی زوبەیر کە کچەزای ئەبوبەکر بوو شانازی ئەکرد بەسەر بەنی هاشم دا بە خواستنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عائشەی پوری.

٣- حفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتابی هێنا لە پاش شەهید بوونی مێردەکەی بەهۆی زامێکەوە لە غەزای بەدردا، دوای ئەوە عومەر بە دەمی خۆی دای بە ئەبوبەکر و ئەویش نەیویست، ئینجا دای بە عوسمان ئەویش نەیویست، ئینجا بە داخەوە چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای خۆی کرد لە دەست ئەو دووانە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی بە عومەر: یەکێکی باشتر لە ئەبوبەکر و عوسمان، حەفصە ئەهێنێ، یەکێکی باشتر لە حەفصە شوو ئەکا بە عوسمان، عومەر بەو فەرمودەیە ئێجگار دڵخۆش و شادمان بوو، لەپاشان ئوم کەلثومی کچی خۆی دایە عوسمان و خۆیشی حەفصەی هێنا.

خواستنی حەفصە بوو بەهۆی فەخر و شانازی حەفصە و باوکی و هەموو کەس و کاری، لەلایەکی ترەوە عومەر پەیوەندی تایبەتی دەست کەوت بوو، وەکو ئەو سێ وەزیرەکەی تر: ئەبوبەکر و عوسمان و عەلی – خوا لە هەمووان رازی بێت – دوانیان خەزورە و دوانیان زاوایە، بەخ بەخ لەو دەست و پەیوەندی یە بەفەڕە لە نێوان پێغەمبەر و هەر چوار یار و وەزیرەکانیا، حەفصە – خوا لیێ ی رازی بێت – ئافرەتێکی جوان و جاحێل نەبوو، لە هەمان کات دا توند و تیژو توڕەیش بوو، جا لەبەر ئەوە باوکی پیێ ی ئەفەرموو: رۆڵە لەبەر من نەبێ پێغەمبەر(ﷺ) تۆی ناوێ.

٤- زەینەبی کچی خوزیفەی هێنا کە زۆر تێکۆشەر بوو، لەبەر باشی و خزمەت گوزاری پیێ یان ئەوت: دایکی هەژاران، مێردەکەی لە جەنگی(ئوحود) دا شەهید کرا لەبەر چاکی و پاداشت دانەوەی هێنای، بەڵام دوای دوو سێ مانگ کۆچی دوایی کرد – خوای لیێ رازی بێت –.

٥- هیندی هێنا کە ناوبانگە بە(ام سلمە) لە دوای وەفاتی عبدالله ی مێردی کە پورزای پێغەمبەر و برای شیری بوو، ئەو پیاو و ئافرەتە لە تێکۆشەرانی ئیسلام بوون و لە کۆچ کەرانی حەبەشە، ئەم ئافرەتە پیرو هەتیو بار بوو، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پاداشتی

دایەوە بەمەی مارەی کرد و بەخۆی و منداڵەکانی یەوە بردنیە ماڵی خۆی و بەخێوی کردن. کەواتە مارە کردنەکەی تەنها لەبەر خوا بوو.

٦- زەینەبی کچی جەحش کە پورزای خۆی بوو، کاتی خۆی بە لایە زۆر و لایە رەزا دای بە زەیدی کوڕی حاریثە، ئەو ئافرەتە هەڵکەوتووەی کە لە پۆپەی قورەیش بوو مارەی بڕی لە زەید کە بەندەیەکی غەریبی ئازاد کراوی خۆی بوو، کە ئەوەش بە پێی باوی قورەیش شتێکی زۆر قورس و گران بوو لە دڵ و دەروون دا، چونکە قورەیش خۆیان بە هاوتا و هاوکوفێ هیچ کەس نەئەزانی چ جای بەندەیەکی غەریبی وەکو زەید، بەلام پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی کرد بۆ بەدیهێنانی یەکسانی و نەهێشتنی رەگەزایەتی، لە پاشان زەینەب پێی نەخوارد ژیانی لەگەڵ ئەو پێ نەکرا و ناچار تەلاقی دا، ئینجا خوا ئەم ئافرەتەی مارە کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نەهێشتنی باوێکی نارەوای ناو عەرەبەکان کە ژنی کوڕە دەست کردەکانیان بەلاوە مەحرەم و قەدەغە بوو بە وێنەی ژنی کوڕی راستەقینە. وەکو بە درێژیی لە سورەتی ﴿الأحزاب﴾ دا باس کرا.

٧- جوێری یەی کچی حارث کە ئەو حارسە سەرۆکی بنی مصطلق بوو، لە غەزای ئەو هۆزەدا جویریە بە دیل گیرا لەگەڵ چەند دیلێکی تردا، لەپاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئافرەتەی کڕی و ئازادی کرد و مارەی کرد، کە ئەوەش کردەوەیەکی پیرۆز و پڕ سوود بوو، دڵنەوایی ئەو ئافرەتە پەسەندە وەجاغ زاد و باوکە سەرۆکەکەی و هەموو تائیفەکەی تێدا بوو، رێنموونی و دەست نیشان بوو بە ئازاد کردنی دیلەکانی تریش، سوپاس بۆ خوا کارەکەش بەو جۆرە گەڕا، ئەوە بوو هەرکەس هەر ئافرەتێکی دیلی بەلاوە بوو ئازادی کرد و مارەی کرد، ئینجا بەهۆی ئەو کردەوە شیرینە هەموو تائیفەکە موسڵمان بوون.

٨- ام حبیبەی کچی ئەبو سوفیان، کە ژنی عبدالله ی کوڕی جەحش بوو، هەردوو کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە، بەلام لەوێ عبدالله بوو بە گاور و لە پاشان مرد. ام حبیبە بە بێ کەس و بە بێ دەر ماوەیە لەو غەریبی یەدا مایەوە و نەی وێرا لە ترسی ئەبوسوفیانی باوکی بچێتەوە بۆ مەککە، ئینجا دوای ماوەیەك پێغەمبەر(ﷺ) دڵنەوایی ئەو ئافرەتە بە شەرەف و تێکۆشەرە داماوەی کرد، ناردی بۆ خوازبێنی و نجاشی حەبەشەی کرد بە وەکیلی قبوڵی نیکاحەکەی، ئەویش کە ئەو هەواڵەی پێگەیشت لە خۆشیدا گەشایەوە و خالیدی کوڕی سەعیدی کرد بە وەکیل نیکاحی بکات، لە پاشان

موسـڵمانەکانی حەبەشـە هـاتن بـۆ مەدینـە و ئەویـشیان لەگـەڵ خۆیـان هێنـا بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ). خواستنی أم حبیبە لە لایەکەوە پاداشت دانـەوەی فیداکاری یەکەی بوو لە ڕێگای ئیسلام دا لە لایەکی ترەوە بۆ ڕاکێشانی دڵـی ئەبو سوفیانی باوکی بوو بۆ لای ئیسلام.

٩- صـفیەی کـچی حوبـەی کە لـە جوولەکـەکانی بنـی نـضیر بـوو بـاوکی لـە جـەنگی بـنی قریظـەدا کوژرا و مێردەکەشی لـە جـەنگی خـەیبـەردا، خۆیشی بـەدیل گیرا، لـە دابـەش کـردن دا بـەر پێغەمبـەر(ﷺ) کـەوت، ئـەویش ئـازادی کـرد و مـارەی کـرد، ئـەو کـردەوە شیرینە بوو بەهۆی تیماری دڵ ڕەنجەیی ئەو ئافرەتە لێ قەوما و جێگیر بوونی ئیمان و ئیسلام لە دڵی دا، هەروەها بوو بەهۆی ئەوە هەموو دیلەکانی تریش ئازاد کران و مارە کران و ئەوانیش موسڵمان بوون.

١٠- مەیمونەی کچی حارث کە لە مەککە هێنای لە ساڵی حەوتەمی کۆچی دا ساڵی(عمرة القضاء) ئەو خواستنە بوو بەهۆی موسڵمان بوونی زۆر لـە خزمـەکانی، کـە یـەکێکیان خالیدی کوڕی وەلید بوو کە خوشکەزای مەیموونەیە. ئەمە دواترین ئافرەتە کە هێنای خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

بێجگە لەوانە ماریەی دایکی ئیبراهیمی هـەبوو کە پادشای میسر بە دیاریی بۆی نارد لەگەڵ سێ کەنیزەکی تـردا کە ئـەو سیانەکەی تری دابـەش کـرد و یـەکێکیانی دایـە حسانی کـوڕی ثابـت. ئـەوە بـوو بـە کـورتی دەنـگ و باسـی حەرەمـەکانی پێغەمبـەری ئـازیز(ﷺ) کـە هەرکەس تۆزێ تێگەیشتنی ببێ ئەزانێ کە هێنانیان هۆی بەمێزو بەرژەوەندی گەورەی تێدا بووە، بە هیچ ڕەنگ جێگای دەم درێژیی هیچ کافرێکی دوژمنی نەفام نی یە، هەرکـەس هـەر ڕەخنەیەکی گرتبێ هەر دەم درێژیی بۆ ئەمێنێتەوە و خۆی بێ ئابڕوو ئەکات.

ئینجا ئـەو حـەرەم و هاوسـەرانە کـە بـە(ماریـە) وە ژمارەیـان گەیـشتە ١٢ سـیانیان لـە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) کۆچی دوایی یان کرد. خدیجە و سودە و زەینـەبی کـچی خزیمـە – خوا لێ یان ڕازی بێت – بەو جۆرە کە باس کرا. نۆیان کۆبوونەوە و یەکیان گرت و مانەوە تا لە دنیا دەرچوونی و بەجێمان لـێ ی، ئینجا پێویستە بزانین بە پـێ ی باوی عەرەب و لەناو عـەرەب و گـەلێ نەتـەوە و میللـەتی تـریش دا ژمارەیـەکی تایبـەتی دیـاریی نـەکراوو بـۆ خواستنی ئافرەتان و کۆبوونەوەیان لە ژێر ڕکێفی پیاودا، بەڵکو هەرکەس تا هەر ژمارەیـەکی بهێنایە ڕەوا بوو، ئەو باوە لە یەکەم جاری هـاتنی ئیسلامیش دا هـەر مایـەوەو ڕەفتـاری پـێ

ئەكرا تا ئایەتی سورەتی ﴿النساء﴾ هاتە خوارەوە و سنووری دانا و تا ژمارەی چواری دیاریی کرد و زیاد لە چواری قەدەغە کرد، تەنانەت هەرکەسێ زیاد لە چواری لە ژێر رکێفدا بووفەرمانی پێدراچواریان هەڵبژێرێ وزیادلەچواربەرەڵا بکات، بەڵام بڕیاری ئەو ئایەتە نابێ حەرەم وهاوسەرەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بگرێتەوەوئەمانی لێ بەدەر کرا، لەبەر ئەم چەن هۆیە:

أ- وەك روون کرایەوە خواستنی هەرکام لەمان لە بەر چەند هۆو بەرژەوەندی یەکی گشتی و تایبەتی بوو، دەی هێشتنەوەی چوار و دەست لێ هەڵگرتنی ئەوانی تریان ئەو هەموو هۆ و بەرژەوەندی یە گرنگانەی بەتاڵ ئەکرد و ئەیسڕی یەوە، ئەوەش دژی پێچەوانەی حیکمەتی و کار دروستی یە.

ب- ئەمانە خوا گێڕانی بە دایکی ئیمانداران و قەدەغە کران لەسەر هەرکەسێ تر لە چەرخی پێغەمبەر و لە پاش لە دنیا دەرچوونی، دەی چۆن دەست هەڵگیرێ لە پێنج کەس لەمانە سەر شۆڕ و سەرگەدان بکرێن و بێبەش لە مێرد و هاوسەر، بێگومان هەموو کەس ئەزانێ کە ئەوە ناڕەوایە و دوورە لە دادەوە.

ج- ئایەتی سورەتی ﴿الأحزاب﴾ هاتە خوارەوە – وەك لە کاتی تەفسیر کردنی دا روون کرایەوە دایکی ئیماندارانی سەربەست کرد بۆ هەڵبژاردنی هەرکام لەم دووبارە: ژیانی ئەم جیهان و خۆش گوزەرانی و تەڵاق دان و دەست لێ هەڵگرتنیان، یان مانەوەیان لای پێغەمبەر(ﷺ) بە کەم و کوڕی تەنگ گوزەرانی یەوە، ئەوانیش یەك بە یەك بە خۆشی و سۆز و پەرۆشەوە خوا و پێغەمبەر و ژیانی رۆژی دوایی یان هەڵبژارد بۆ خۆیان، دەی ئایا خوا چۆن رەوا ئەدات دەست لێ هەڵگرتنی ئەوان؟!!

لە کۆتایی دا لە خوا داواکارم کە ئەم نووسینانەم لێ وەرگرێ و خەڵکی پێ سوود بەخش بکات و یارمەتیم بدات بۆ تەواو کردنی ئەم تەفسیرە.

وصلى الله و سلم على سيدنا و سيد القادة و قائد السادة محمد و على آله و صحبه و كل من تبعهم بإحسان.

رۆژی ٢١ رمضان ١٤٠٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾

# سورەتی(السبأ)
# مەككەیی یە و ٥٤ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتەش وەكو زۆربەی سورەتە مەككەیی یەكانی تر مەبەستە سەرەكی یەكانی بریتین لە تاك و تەنیایی خوا و بڕوا بە سروشی و بە زیندوو بوونەوە. لەگەڵ ئەوەدا راست كردنەوە و روون كردنەوەی هەندێ هەڵە و لادان لە بیر و باوەڕدا كە پەیوەندی یان هەیە بە ئایین و عەقیدەوە. ئەوەی زۆرتر بە گرنگ گیرابێ لەم سورەتەدا بریتی یە لە زیندوو بوونەوە و پاداشت و تۆڵەی رۆژی دوایی، دڵنیا كردن و روون كردنەوەی فراوانی و گشتی زانینی خواو ئاگاداری بە هەموو شتێك.

لە یەكەم جارەوە دەست پێ ئەكات بە سوپاس كردن بۆ خوایەك كە خاوەنە بۆ هەرچی وا لە ئاسمانەكان و زەوی دا، ئەفەرموێ ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ هەموو ستایش و سوپاسێك بۆ خوایە كە ناوی ﴿الله﴾ یە، كە تەنها هینی ئەوە هەرچی وا لە ئاسمانەكان و هەرچی وا لە زەوی دا بە دروست كردن و پەروەردە و راگیر كردن. لە هەموو بارو روویەكەوە ئەو خاوەنی هەمووە ﴿وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ تەنها بۆ ئەوە هەموو سەنا و سوپاسێك لە رۆژی دوایی دا، چونكە هەموو چاكە و بەهرەیەك لە رۆژی دوایی دا یەكسەر لە رێوە لە خواوە دەست كەوت ئەبێ، بە بێ هیچ هەوڵ و تێكۆشانی هیچ كەسێك، ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ تەنها ئەو لێزان و كار دروستە و هەموو كارو بڕیاری بەجێ یە و بەرژەوەندی تیایە و ئاگا و خەبەر دارە بە هەموو شتێ و هەموو كارێ و هەموو تەگبیرێ و زانایە بە هەموو شتێكی شاراوە بە زانینێكی تێرو تەواو.

ئینجا لاپەڕەیەك لە لاپەڕەكانی زانینی خوا دەرئەخات، كە لە چوار چێوەی ئاسمان و زەوی دایە، ئەفەرموێ: ﴿يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەزانێ و ئاگایە بە هەر شتێك كە ئەچێ بە زەوی دا، ﴿وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا﴾ هەرچی لە زەوی دەرئەچێ، ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ هەرچی لە ئاسمان دێتە خوارەوە، ﴿وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۚ﴾ هەرچی بەرز ئەبێتەوە تیایدا و بەناوی دا. مەردوم ئەوەستێ بەرامبەر ئەم لاپەڕەیە كە خراوەتەوە بەرچاو و بە چەند وشە و رستەیەكی كەم و كورت، كە بیر ئەكاتەوە و سەرنج ئەدات كۆمەڵ و قەرەباڵغێكی ئێجگار زۆر و گەورە و گرنگ خراوەتە بەرچاوی، كە خەیاڵیش پیایدا ناگات و خۆی پێ ناگیرێ لە ئاستی!

ئەگەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی تەمەن و ژیانی خۆیان بەخت كەن لە ژمارە كردنی ئەوەی روو ئەدات لە یەك كات دا و لەحزەدا، لەوانەی ئەم دەست نیشانی بۆ ئەكەن هەموو پەك كەوتوو دەستە پاچە ئەبن لە وەرگرتن و ژمارە كردنیان لە رووی راستی یەوە!! چونكە هەركاتێ بگیرێ بەدەستەوە ئایا ئەبێ لەو كاتەدا چەند شت بچێ بەناو زەوی دا؟ چەند شتی لێ دەرچێ؟ چەند شت لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە؟ چەند شت بەرز ببێتەوە بەناوی دا؟ ئاخۆ چەند كرم و مارو جانەوەر و گیان لەبەر لە كاتێك دا بچێ بەناو ئەم زەوی یە پان و پۆڕ و گەورە و فراوانەدا بە هەموو بەش و چمكێكی یەوە؟ چەند تۆمە و دانەوێڵەیە بچێ یان بكرێ بەناو زەوی دا لە هەموو ناوچەكانی دا؟ چەند دڵۆپە ئاو، چەند زەڕە گاز و چەند روناكی كارەبا ئەچێ بەناو زەوی دا؟ چەند و چەند لەو هەموو شتانەی تر ئەچن بەناوی زەوی دا و چاوی قودرەت وا بەسەریەوە بە هەمیشە و هەرگیز نانوقێ لە ئاستیان و خەو و وەنەوز رووی تێ ناكات؟ ئەی ئەبێ لە هەر كاتێك دا چەند شتی لێ دەرچێ؟ ئاخۆ چەند رواوو سەوز بووی لێ دەرچێ؟ چەند كانی و چەشمەی لێ هەڵقوڵێ؟ چەند بوركان بتەقێتەوە و لێ ی دەرچێ؟ چەند گیانلەبەر لە كون و درزەكانی دێنە دەر و دەرئەچن لە زەوی؟ چەند و

چەند لەوەی ئەبینرێ و لەوانەی نابینرێن، لەوانەی کە ئێمە ئەیناسین و ئەیزانین، ئەوانەی کە نایان ناسین و نایانزانین کە زۆر زۆریشن؟

ئایا ئەبێ چەند شت لەکاتێ دا لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە، چەند نوختە و دڵۆپە باران و ئاو؟ چەند بزیسکە و چەخماخە؟ چەند رووناکی سووتێنەر، رووناك کەرەوە؟ چەند بڕیارو قەزا و قەدەر؟ چەند رەحم و بەزەیی بە شێوەی گشتی یان تایبەتی بە هەندێ لە بەندەیان، چەند لە رۆزی یە کە بە لێشاو دێتە خوارەوە، یان بە کەم و کوڕی بە پێ ی مەیل و خواهیش خوا.. چەند و چەند لەوەی کە بێجگە لە خوا کەس ژمارەی نازانێ. ئاخۆ لە هەرکاتێك دا چی و چەند شت بەرز ببێتەوە بۆ ئاسمان؟ چەند هەناسە بەرز ئەبێتەوە لە درەخت و سەوزە و ئادەمی و هەرگیان لەبەرێ تر ناسراو و نەناسراوە؟ چەند رۆح و گیانێ ئەکێشرێ و ئێمە ئەیزانین یان نایزانین، چەند مەلائیکە بەرز ئەبێتەوە بە کارو فرمانی کە تەنها خوا ئەیزانێ.

ئاخۆ لە هەر کاتێك دا چی و چەند شت بەرز ببێتەوە بۆ ئاسمان؟ چەند هەناسە بەرز ئەبێتەوە لە درەخت و سەوزە و ئادەمی و هەرگیان لەبەرێ تر ناسراو و نەناسراو؟ چەند رۆح و گیانێ ئەکێشرێ و ئێمە ئەیزانین یان نایزانین، چەند مەلائیکە بەرز ئەبێتەوە بە کارو فرمانی کە تەنها خوا ئەیزانێ.

ئینجا ئاخۆ چەند قەترە و دڵۆپە هەڵم لە دەریاکانەوە بەرز ئەبێتەوە، چەند زەرە گاز لە لەشەکان بەرز ئەبنەوە؟ چەند و چەند و چەند لەوانەی بێجگە لە خوا کەس نایانزانێ؟ ئایا زانین و ژمارەی ئادەمی ئەبێ چۆن پیایا بگات بەوەی کە لە تەنیا لەحزە و کاتێك دا روو ئەدا؟ بێگومان پیای دا ناگات با بە هەموو هێز خەریك بن و تەمەنی خۆیانی تیا بەخت بکەن. بەڵام زانینی بێ سنووری خوا بە یەك جا و بە یەك جۆر چوار دەوری هەموو شت و هەموو رووداوی داوە لە هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێك دا... هەموو دڵێ و هەر نیاز و خەتەرەیەك کە تیایەتی، هەموو کردەوەیەك چاك و خراپ وا بە پێش چاوی قودرەتی خواوە، کەچی لەگەڵ ئەوەدا بە گوێرەی ئەو هەموو تاوان و خراپەیە رەفتارمان لەگەڵ ناکات،

چونكه ﴿وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ﴾ تەنها ئەو زۆر بە بەزەیی و لێ بوردوو سەرەڕەوە و داشار دەری گوناهو تاوانە، ئەگینا هەموو تیا ئەچووین، لە لوتف و بەزەیی یەكەی بە زیاد بێت. بێگومان تەنیا ئایەتێكی وەكو ئەم ئایەتە بەڵگەیەكی روونە لەسەر ئەوە ئەم قورئانە لەلایەن خواوە هاتووە و ئادەمی پەك كەوتوو دەستە پاچەیە لە ئاستی، چونكە هەرگیز دڵ و خەیاڵی ئادەمی ناڕوا بۆ بیر كردنەوە لەو هەموو شتە و ئەو هەموو رووداوە و ئینجا كۆكردنەوە و دەور دانی بەو چەند وشە و رستە بچكۆلانە!!

لەپاش روون كردنەوەی فراوانی زانین و ئاگاداری خوا، ئینجا باسی بێ بڕوایی كافرەكانمان بۆ ئەكات بە هاتنی رۆژی دوایی و ئەوەمان بۆ ئەگێڕێتەوە. ئەو بێ بڕوایانە كە نەزانن و ئاگایان لە دواو بەری خۆیان نی یە و نازانن لە داهاتوودا چی یان بەسەر دێت، خوایش ئەو خوایە كە هیچی لێ ون نابێ و ئاگادارە بە هەموو شتێك، بە پێی ئەو زانینی ئەوە هاتنی ئەو رۆژە هیچی تێ ناچێت و پێویستیشە هاتنی بۆ ئەمەی هەموو كەس رەفتاری لەگەڵ بكرێ بە گوێرەی كردەوەی خۆی كە خوا ئاگادارە پێی، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ﴾ ئەوانەی كە كافرو بێ بڕوان وتیان و ئەڵێن: رۆژی دواییمان بۆ نایەت و ئەو رۆژە بەدی نایەت، ئیتر مەبەستیان لەوە دان پیا نەنان و دەربڕینی بێ بڕوایی خۆیانە، یان مەبەستیان پەلە نانەوە بوو بێت لەبەر گاڵتە و لاقرتی كردن بەو هەڕەشە و ترساندنەی كە ئاراستە ئەكران، بە هەر جۆر بووبێ بێ بڕوایی یەكەیان لەبەر تێنەگەیشتن و نەفامی یانە و نەگەیشتوون لە لێزانی و كاردروستی خوا، تێ نەگەیشتوون لەوە كە هاتنی ئەو رۆژە پێویستە و نەهاتنی دژ و پێچەوانەی دادو دادپەروەری یە. نەگەیشتوون لەوە كە پێویستە پاداشت دانەوە و تۆڵە سەندن، تا چاكان و پاكان بەرهەمی كردەوەی خۆیان دەست كەوێ و تاوانبارانیش دووچاری سزا و تۆڵەی خۆیان بێن، خوای گەورە هەواڵی داوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەكانی – درودی خوایان لەسەر بێت – كە تۆڵە و پاداشت هەموو یان هەندێكیان ئەهێڵێتەوە بۆ رۆژی دوایی. كەواتە هەركەس تێگەیشتوو بێت ئەزانێ كە هاتنی ئەو رۆژە شتێكی پێویستە و ئەبێ هەر ببێ... ئەو بێ بڕوایانە كە ئەڵێن ئەو رۆژەمان بەسەر نایەت لەبەر نەفامی و تێ نەگەیشتنیانە...

﴿قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾﴾

ئینجا ئەو خوا بەرپەرچی دانەوە و فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە دڵنیایی بەهێز بکات لەسەر هاتنی، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان: ﴿بَلَىٰ﴾ نەخێر وا نی یە کە ئێوە ئەیڵێن و نەهاتن نی یە بەڵکو ئەو رۆژە دێت ﴿وَرَبِّي﴾ سوێند بەخوای پەروەردگارم ﴿لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾ بێگومان ئەو رۆژەتان بۆ دێت، ئەوانە هەر لە خۆیانەوە بە نەزانی دەم ئەکوتن و شتێ ئەڵێن کە بێ ئاگان لێ ی، ئەو خوایەی کە هەواڵی داوە بە هاتنی ئەو رۆژە و دڵنیایی کرد لەسەری ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ﴾ زانایە بە هەموو غەیب و شتێکی نادیاری و هەست پێ نەکراو، ئینجا ئەو زانینە بێ سنوورەی خۆی نیشان ئەدات لە شێوەیەکی نایابی بوونەوەریی وەکو ئەو شێوەیە کە تێپەڕی کرد، کە ئەمیش وەکو پێشووە کە شایەتە لەسەر ئەوە کە ئەم قورئانە ناگونجێ لە دەست کردی ئادەمی بێت، چونکە دڵ و خەیاڵی ئادەمی ئەم جۆرە شتانەیان پیا گوزەر ناکات، ئەفەرموێ: ﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ ون نابێ لەو خوایە ئەندازی(ذرة) ئەتۆمی نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەوی دا، ﴿وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ بچووکتر لەو ئەندازی ئەتۆمە زەڕەیە نی یە و گەورەتر نی یە مەگەر لە کتێبێکی روون دایە، واتە زانینی خوا کە فراوان و گشتی یە بۆ هەموو شتێ و هیچی لێ یاخی نابێ، یان مەبەست(لوح المحفوظ) ە، واتە هەموو تێیدا نووسراوە، لێرەدا با بوەستین تۆزێ بیر بکەینەوە لەوەی ئەم ئایەتە سەرنجی بۆ رائەکێشێ. وشەی زەڕە لە کۆن دا بەکار ئەهێنرا بۆ مێرووله زۆر وردەکان کە بە حاڵ و چاو ئەبینرا، ئینجا بەکار هێنرا بۆ بچووک ترین لەش و قەبارە، کە ئیتر لەوە بچووک تر نەبێ، ئینجا ئێستا – لەپاش پارە پارە کردنی – خەڵکی ئەزانن کە بچووکتر لە زەڕە هەیە کە بریتی یە لەو بەش و پارەی کە لێ ی پێك هاتووە کە لەوەوبەر هیچ کەس شتی وا بە دەروونی دا گوزەری نەکردووە! پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایە کە بەندەکانی زانا و ئاشنا ئەکات بە هەر ئەنداز مەیلی ببێ لە شتە نهێنی یەکان لەم بوونەوەرەدا.

لِّيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوۡ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٞ ﴿٥﴾

**هـاتنی ئـەو ڕۆژی دوایـی یـە پێویـستە و ئـەبێ هـەر بێـت ﴿لِّيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۚ﴾ بـۆ ئەمـەی پاداشـتی ئەوانـە بداتـەوە کـە بڕوایـان هێنـا، کـردەوە چاکەکانیشیان کرد، پاداشـتیان بداتـەوە بـەم جـۆرە کـە ئەفـەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ ئەوانـە بۆیان هەیە لێبوردنی گوناهو کەم و کوڕی یان و سڕینەوە و داشاردنی، بۆیـان هەیـە ڕۆزی و گوزەرانێکی خۆش و بەڕێز بە بێ ئەرك و ماندوویی، بە بێ منـەتنان بەسـەریان دا ﴿وَٱلَّذِينَ سَعَوۡ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ﴾ کەسانێ کە بڕوایان نەمێنا و تێکۆشانیان کرد لەم جیهانەدا لە ڕەخنە و لەکە گرتن لە ئایەتەکانی ئێمە و بەرگری کردنی خەڵی لە بڕوا هێنان پێ ی لـە کاتێك دا لایـان وایە لە دەست ئێمـە دەرئەچن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٞ﴾ ئەوانـە بۆیـان هەیـە سزایەك لـە جۆری بـەتین تـرین سـزای بەسۆی ئێش و ئازار دەر، بە کـورتی ئـەبێ ڕۆژی دوایـی بێـت بـۆ بەدی هێنانی دادو دادپەروەریی بەم ڕەنگە هـەموو کـەس بگـات بـە بـەرو بەرهـەمی کـردەوەی خـۆی بـەو جـۆرەی بـە کـورتی لـە ئایەتەکـەدا باسـی فـەرمو، ئینجـا بـە بۆنـەی بـەدگومانی بـێ بڕواکـان لــە نــەهاتنی ڕۆژی دوایــی، دڵنیـا کردنــی خــوا لەســەر هــاتنی، ڕاگەیانــدنی پێغـەمبـەر(ﷺ) ئـەوەی خـوا فـەرمانی پـێ دا بـە ڕاگەیانـدنی لـەبارەی هـاتنی ئـەو ڕۆژە، بـەو بۆنــەوە ڕوونــی ئەکاتــەوە کــە ئــەو کەســانەی زانــان ئــەزانن و شــایەتی ئــەدەی کــە ئــەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێنای لەلایەن خواوە تەنها ئەوە ڕاستە و ڕێنموونی ئەکات بۆ ڕێگای خوا،**

وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ

**ئەفەرموێ: ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ ئەوانەی کە زانینیان پێ داوە ئەزانن ﴿ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ﴾ ئەوەی هێنرایە خوارەوە بۆلای تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە تەنها ئەوە راستە ﴿وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ رێنموونی ئەکات بۆ رێگای خوایە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا، سوپاس کراوە لە هەموو کاروبارێك دا. ئەو رێگایەش بریتی یە لە پەرستن و گوێ رایەڵی خوا بە تاك و تەنیا لە هەموو کاروبارێك دا.**

**لەهەندێ ریوایەت دا هەیە کە مەبەست بەو زانایانە زانایانی ئەهلی کیتابە، کە ئەوان لە کتێبی خۆیانەوە بۆیان روون بووە کە ئەم قورئانە راستە و رێنموونی ئەکات بۆ رێگای خوا. بەڵام دیمەن و رواڵەتی ئایەتەکە فراوانتر و گشتی ترە لەوە، کەواتە ئەوانەی کە زانینیان پێ دراوەلەهەرکات وچەرخێك دا، لەهەر شوێن و وڵاتێ لە هەر چین و تاقم و تیرەیەك، ئەوەئەزانن هەرکات زانینەکەیان رێك و راست بێت و شایان بێت بەوە بە زانین دابنرێ و ناو ببرێ!**

**قورئان کتێبێکی کراوەیە بۆ هەموو تاقم و چینێ هەتا هەتایە، ئەوەی تیایەتی راستە و خۆی دەرئەخات بۆ هەموو خاوەن زانینێکی راستەقینە، ئەو راستی و رێکی یەی کە شاراوەیە لەم بوونەوەرەدا دەری ئەخات و روونی ئەکاتەوە. ئەو رێگای رێنموونی بۆ ئەکات بە بەرنامەیە کە خوا ویستی بۆ هەموو بوون و بوونەوەر، هەڵیبژارد بۆ ئادەمی تا هەنگاوەکانی رێك و پێك بێت لەگەڵ هەنگاوەکانی ئەم بوونەوەرەی تێیدا ئەژی، ئەو رێگایە یاسا و رژێمێکە کە چاودێرە بەسەر هەموو بوونەوەردا، بەم ژیانی ئادەمی یەی کە بەشێکە لێ ی و لە بنەڕەت و پەیدا بوونی دا جوێ نابێتەوە لێ ی، هەروەها لە رژێم و هەموو بزووتنەوەی دا جوێ نابێتەوە لەم بوونەوەرە و هەرچی و هەرکەس لەم بوونەوەرەدایە.**

**رێنموونی ئەکات بۆ ئەو رێگا راستە بەوەی ئیماندار حاڵی ئەکات و تێ ی ئەگەیەنێ لە بوون و بوونەوەر و پەیوەندی و پەیوەستی یەکانی و پایە و پلەی ئادەمی لەناو ئەو بوونەوەرەدا، دەورو کاری تیای دا، هاوکاری هەموو بەش و پارچەکانی ئەم بوونەوەرە لە نێوان خۆیان و لەگەڵ ئادەمی دا لە پێك هێنانی خواهیش و حیکمەتی و کاردروستی خوا لە دروست کراوەکانی دا، هەروەها رێك و پێکی بزووتنەوەکانی هەموو، یەکگرتن و رێك**

کەوتنیان لە مل کەچی و ڕوو کردنیان بۆ پەروەردگار. ڕێنموونی ئەکات بۆ ئەو ڕێگا ڕاستتە بەهۆی ڕاست کردنەوەی بەرنامەی بیر کردنەوە، دامەزراندن و ڕاگیر کردنی لەسەر چەند بنەڕەتێکی ساغ و سەلیم، بە جۆرێك تێ بگات لە سروشتی ئەم بوونەوەرە و یاساکانی، یارمەتی و کۆمەکی لێ وەرگرتنیان، هاوکاری لەگەڵیان بە بێ دوژمنایەتی و دژایەتی و گیروگرفت.

ڕێنموونی ئەکات بۆ ئەو ڕێگا ڕاستە بەهۆی ئەو بەرنامەی پێگەیاندن و پەروەردە کردنەی کە دایناوە و گەل و ئەندامی گەل ئامادە ئەکات بۆ یەك کەوتن و ڕێك و پێکی نێوان خۆیان، نێوان ئەمان و هەموو دروست کراوەکانی تردا، ئینجا ئەو هەمووە ڕێك و گونجاو ئەکات لەگەڵ سروشتی ئەو بوونەوەرەی تیای دا ئەژین... ئەمانەش هەموو بە سووك و ئاسان و نەرم و نیانی.

ڕێنموونی ئەکات بۆ ئەو ڕێگا ڕاستە بەهۆی ئەو ڕژێم و یاسایە کە ڕاست و گونجاوە لەگەڵ سروشتی ئادەمی و زروف ژیان و گوزەرانی، کە ئەوەش ڕێك و گونجاوە لەگەڵ یاسای گشتی دا، کە کار ئەکات و حوکمڕانە بەسەر ئادەمی و هەموو زیندەوەرانی ترو هەموو دروست کراوەکانی تر، کەواتە ئادەمی تاك نابێتەوە لێ یان بە ڕژێم و یاساکانی، ئادەمی ئەزانێ کە ئەم ئوممەتێکە لەو هەموو ئوممەتانەی تر لە چوار چێوەی بوونەوەری گەورەدا.

ئەم قورئانە خۆی بەڵگە و رابەرە بۆ ئەو ڕێگا ڕاستە، بەڵگە و ڕابەرێکە کە داهێنەری ئادەمی و ئەو ڕێگایە دایناوە، کە زانایە بە سروشتی ئەمیش و ئەویش، بێگومان بەختەوەر کەسێکە کە کاتێ بڕوا بە ڕێگایەکی دوور و درێژدا بەڵگە و نیشانەی ئەو ڕێگایەی بە دەستەوە بێت، بەڵگە و نیشانەیەك کە موهەندیسی ڕێگاکە داینابن، دەی ئەبێ چۆن بێت ئەگەر داهێنەری ڕێگا و ڕێبوارەکەیشی دەست کەوێ؟!! لەپاش ئەم بێدار کردنەوە و وریا کردنەوە ئینجا هەمیتر ئەگەڕێتەوە سەر بێ بڕواکان قسە و باسیان ئەگێڕێتەوە لەبارەی زیندوو بوونەوەو سەرسامی یان لێ ی، بە جۆرێ ئەو کەسەی بڵێ زیندوو بوونەوە ڕاستە و بەدی دێت ئەو بێ بڕوایانە بە شێتی دەرئەکەن، یان بە ئیفتراچی و دەلەسە هەڵبەستی دائەنێن، ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون هەندێکیان وتیان بە هەندێکی تریان بەسەرسامی یەوە و بە شێوەی لاقرتی کردن ﴿هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ﴾ ئایا دەست نیشان و ڕێنموونیتان بکەین بۆ سەر پیاوێك - واتە محمد - ﴿يُنَبِّئُكُمۡ﴾ کە هەواڵتان ئەداتێ بە شتێکی زۆر سەیر کە هۆی سەرسوڕمانە،

إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿٧﴾ أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ فِي ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلْبَعِيدِ ﴿٨﴾

واتە ئەڵێ: ﴿إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ کاتێ ئێوە پارە پارە کران بە هەموو پارە پارەیە. واتە مردن و بوون بە خۆڵ و ئێسکە رزیو، بێگومان ئێوە ئەچنەوە دروست کردنێکی تازەو دووبارە وەکو خۆتان لێ ئەکرێتەوە!! ئەوانە تا ئەو رادەیە سەرسام ئەبن لە مەسەلەی زیندوو بوونەوە، ئەوەتا خەڵکی لێ سەرسام ئەکەن و بە شێوەی لاقرتێ پێ کردن و ئابڕوو بردن ئەو قسە راستە ئەگێڕنەوە لەو کەسەی ئەیڵێ. ئینجا بەوە ناوەستن ئەڵێن: ﴿أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ﴾ ئایا ئەو پیاوە کە ئەو قسەیە ئەکات درۆ بەدەم خواوە هەڵئەبەستێ بە دەستی ئەنقەست یان شێتی هەیە، کەواتە ئاگای لە خۆی نی یە و هەروا قسەیە و دێت بەدەمی دا وڕێنە بکات؟ ئایا ئەوانە لە چی سەریان سوڕ ئەمێنێ لە کاتێك دا کە خۆیان ئەزانن لە یەکەم جارەوە نەبوون و دروست کران؟ کەواتە خۆیان سەر لێ تێك چوون و هەر بۆ ئەوە چاکن کە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ فِي ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلْبَعِيدِ﴾ نەخێر، نە درۆی هەڵبەستووە و نە شێتی هەیە، بەڵکو ئەوانەی کە بڕوایان نی یە بە رۆژی دوایی وان لە سزاو گومڕایی و ون بوونێکی دووردا.

هەڵئەگرێ مەبەست بەو سزایە سزای رۆژی دوایی بێت کە ئەوەندە بەدی هاتنی راستە وەکو ئێستا هەبێ و ئەمانی تێ کەوتبن، چونکە ئێستا وان لە گومڕایی یەك دا کە چاوەڕوانی گەڕانەوە و رزگاربوونیان ناکرێ لێ ی کە ئەوەش سەری لەو سزایەوە دەرئەچێ. هەڵئەگرێ مەبەست ئەو سزای دەروونی و بێ ئارامی دڵە بێت کە ئەو بێ بڕوایانە تیای دا ئەژین بە هەمیشەیی لەم جیهانەدا پێش سزای نەبڕاوەی رۆژی دوایی. چونکە ئەو کەسەی لەم جیهانەدا بڕوای بە رۆژی دوایی نەبێت ئومێد و چاوەڕوانی نی یە نە بۆ پاداشت دانەوە و نە بۆ ئەمەی تۆڵەی بۆ بسێنرێ لە دەست درێژیی کەرانی، نە بۆ بریتی و قەرە بوونی هەر زیان و بەسەرهاتێکی خراپ کە لەم جیهانەدا دووچاری بووبێ، لەم ژیانی ئێستادا چەند هەڵوێست و چەند تاقی کردنەوە روو ئەدات هیچ کەس بەرگەی ناگرێ مەگەر کەسێ کە لە دەروونی دا ئومێد و چاوەڕوانی ئەو رۆژەی هەبێ، بە تەمای ئەوە بێت بگات بە رەزامەندی خواو نازو نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشت، ئەو کەسەی بێ بەش بێت لەو رووناکی یە بێگومان وا لە سزای دەروونی دا هەرچۆنێ وا لەناو چاڵی ون بوون و سەر لێ شێواوی دا.

أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٩﴾

لەم جیهانەدا ئەژی بەو دوو دەردە سەختەوە، پێش سزای گەورەی ڕۆژی دوایی. بەڕاستی بڕوا بە ڕۆژی دوایی چاکە و بەهرەیەکە خوا ئەیبەخشێ بەو کەسانەی کە شایانن بۆی، بەهۆی ڕاستی خۆیان و پاك و خاوێنی دڵ و دەروونیان. کەواتە بێ بەشی لێ ی سزایەکی گەورەیە، لەم شوێنەدا مەبەست بەو سزایە باری دووەم بێت زۆر ڕێکە و بەهێزە لە دڵ دا.ئەو بێ بڕوایانە زۆر بە توند و سەختی بێدار ئەکاتەوە و سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆ بەسەرهاتێکی سەخت و سامناك لەم جیهانەدا ئەگەر خوا بیەوێ و مەیلی ببێ، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ دەی ئایا ئەو بێ بڕوایانە کوێر بوون و سەرنجیان نەداوە بۆلای ئەو ئاسمان و زەوی یەی کە دەوری داون و بەهەر لایەك دا بڕۆن و تەماشا بکەن ئەیبینن، بیریان نەکردووەتەوە کە کەسێ دەسەڵاتی بەسەر ئەو ئاسمان و زەوی یەدا هەیە و داهێنەر و پەروەردگاریانە، ئەتوانێ ئەوان دووبارە بکاتەوە لە پاش مردن و ڕزانیان، واتە با سەرنج بدەن و بیر لەوە بکەنەوە یان ئەو بێ بڕوایی یانە نەمێنێ و باوەڕ بهێنن، با ئەوانە بترسن لە سزای خوا بێتە سەریان لەسەر ئەو بێ بڕوایی یە هەر لەم جیهانەدا. چونکە ﴿إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ﴾ ئەگەر ئێمە بمانەوێ ئەیانبەینە خوارەوە بە ناخی زەوی دا ﴿أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ﴾[1] یان ئەیانخەینە خوار بەسەریاندا چەند پارچەیەك لەو ئاسمان و زەوی یەی کە بە چاو ئەیبینن، ئەو سزای زەمینی یان ئاسمانی کە هەموو کات لەوانەیە ڕوو بدات ئەگەر خوا مەیلی ببێ، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ﴾ لەوەش کە باس کرا بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون هەیە بۆ هەر بەندەیەك کە گەڕاوە بێت بۆلای خوا، کە هەرکەس بەو جۆرە بێت ون نابێ و دووچاری ئەو گومڕایی یە نابێت.

ئینجا باسی هەندێ لەو بەندەیانە ئەکات کە گەڕاوە بوون بۆلای خواو خوایش چاکە و بەهرەی ڕشت بەسەریان دا، بەو بۆنەوە چەند نموونە و شێوەیەك لە سوپاس و مل کەچی بۆ خوا و چەند شێوە و نموونەیەك لە یاخی و یاخی بوون ئەهێنێ و ئەیخاتە بەرچاو،

---

[1] ئەم ئایەتە بە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە کە زۆر باشە و هەڵئەگرێ بەڵام لەم کاتەدا ئەم جۆرەم نووسی کە زۆر لە زانایان کردوویانە بە تەفسیر.

هەروەها چەند نموونە و وێنەیەك لە ژێر بار كردنی چەند هێزو خاوەن هێزیْ كە ئەگەر ویست و دەسەلاْتی خوا نەبوایە ژێر بار كردنی ئەوانە نەئەگونجا بۆ ئادەمی. لە یەكەم جارەوە باسی داود پێغەمبەر ئەمێنیْ – دروودی خوای لەسەر بێت – ئەفەرمویْ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا﴾ سوێند بەخوا بەخشیمان بە داود لەلایەن خۆمانەوە بە لوتفی خۆمان چاكە و بەهرەیەكی گەورە، كە بێجگە لە پێغەمبەرێتی و زەبوور، شاخ و چیاكان و پەلەوەری بۆ ژێر بار كرد كە لەگەڵی زیكرو تەسبیحی خوا بكەن و ئاوازەی بسێننەوە و ئاسنی بۆ نەرم كرد، فێری پیشەسازی زریْ و تاس كلاْوی كرد، وەكو ئەفەرمویْ: ﴿يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ﴾ وتمان: ئەی شاخ و چیاكان لەگەڵْ داود زیكر و تەسبیح بكەن و بۆی بسێننەوە، پەلەوەرەكان ئێوەش لەگەڵی بڵێن و بۆی بسێننەوە. شتێكی بەناو بانگە و لە زۆر ریوایەتدا هەیە كە داود دەنگ و ئاوازەیەكی زۆر شیرین و خۆشی پیْ درا بوو زیاد لە سنوور، بەو دەنگ و ئاوازەیە زەبووری ئەخوێند و تەسبیح و موناجاتی پیْ ئەكرد، جا كاتیْ ئەو دەستی پیْ ئەكرد بە فەرمانی خوا شاخ و پەلەوەریش ئەهاتنە دەنگ و ئاوازە و بۆیان ئەسەندەوە كە ئەوەش موعجیزەیەكی تایبەتی كەس نەدیوە.

ئەم بوونەوەرە بە هەموو جۆر و بەش و پارچەكانیەوە خوای خۆی ئەناسیْ و ئەیپەرستیْ و بە زمانی تایبەتی خۆی زیكرو سوپاس و سەنای ئەكات وەكو لە چەند ئایەت و حەدیسی سەحیحەوە وەرئەگیریْ ئەو هەموو جۆرو بەشە، خوا جیاوازی خستووەتە نێوانیان و جویْی كردوونەتەوە لە یەكتر و پەردە و بەرهەڵستی خستووەتە نێوانیان لە ژیانی رواڵەتی ئەم جیهانەدا، كاتیْ بەندە خۆی پاك و خاوێن كرد و لێبڕا و خۆی رووت كرد لە هەموو شتێك جگە لە یادی خوا، ئەو كاتە لەوانەیە ئەو پەردە و بەرهەڵستە نەمێنیْ و هەموو جۆر و بەشەكان پەیوەندی و پەیوەستی فەراهەم بێت لە نێوانیاندا، جا داود خوا ئەوەی بۆ كرد، ئەو بەرهەڵست و پەردەیەی بۆ هەڵگرت و هەموو یەكیان گرت و چوون بە دەم یەكەوە لە زیكر و تەسبیحی خوادا، گەیشتن بە یەك و بە یەك دەنگ و ئاوازە پەیوەندی یان كرد لەگەڵْ خوای هەمووان، ئەوەش رادە و پلەیەكە كەس پیْی ناگات مەگەر بە لوتف و گەورەیی خوا، كە پەردە و بەرهەڵستی ماددی هەڵگریْ و لایبات لەناوا، بیانگێڕێتەوە بۆ كیان و بوونی راستەقینەی لای خوا، كە هەموو ئەگەن بە یەك و یەك ئەگرن تیای دا، ئاگادارەكان–نەك هەموو كەس–ئەوهەواڵْ ودەنگ وباسەئەزانن،ئەوتام و بۆنەیان چەشتووە!!

وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِي ٱلسَّرْدِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ

---

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە، کە ئەم بەهرە و چاکەیە باس ئەکات ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ﴾ ئاسنمان نەرم کرد بۆ داود، بێگومان ئەو نەرم کردنە موعجیزەیەکی تایبەتی بووە، نەك بە گەرم کردن و لە ڕێگایەکەوە کە لە توانای ئادەمی دایە و بە هەوڵ و تێکۆشانی ئادەمی فەراهەم بێت، بەڵکو وەکو قتادە ئەفەرموێ: خوا بۆی ژێر بار کرد لە دەستی دا وەکو مۆم یان هەویری لێ کرد بە بێ پێویست بە گەرم کردن و لێدان بە چەکوش!! ﴿ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ﴾ واتە فەرمانمان دا بە داود کە لەو ئاسنە پۆشاکەکانی جەنگ دروست بکە کە پان و فراوان بن، هەموو لەش داگیر بکەن، کە پێی یان ئەوتریْ زریْ و تاس و کڵاو. ﴿وَقَدِّرْ فِي ٱلسَّرْدِ﴾ تەندنیان ڕێك و پێك بکە بەم ڕەنگە ئەڵقەکانی یەکسان بن و ئەوەندە تەنگ بن بەرگری نوکی تیر و شیر و رم بکەن، لە رادەیەك دا بن نەبڕێن و نەشکێن، ئەوەندەش قورس نەبن کە ببن بە بار بەسەر ئەوانەی ئەیان پۆشن. ئەگێڕنەوە کە لە پێش داود ئەو پۆشاکە دروست ئەکرا بە یەك لەوح و یەك پارچە، کەواتە زۆر قورس بوون، بەرگری هەڵس و کەوت و دانەوینەوەیان نەئەکرد. ئینجا خوا خستی یە دڵی داود و فێری کرد کە بەو جۆرە شایان و سووك و ئاسانە دروستی کرد. ئینجا رووی فەرمودەی کردە داود و ئال و بەیتی، فەرموی: ﴿وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا﴾ کردەوەی چاك بکەن، ﴿إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ چونکە بەڕاستی من بینام بە هەر کردەوەیەك ئێوە ئەیکەن، واتە نەك تەنها لە دروست کردنی ئەو پۆشاکەدا، بەڵکو لە هەموو شتێك دا با کردەوەتان چاك بێت، ئێوە لە هەموو شتێك دا وان لە ژێر چاودێریی خوادا، کەواتە با ئاگاتان لە خۆتان بێت. خوای گەورە ئەو لوتفانەی لەگەڵ داود کرد – درودی خوای لەسەر بێت –.

دەربارەی سولەیمانیش بەم جۆرەی کرد کە ئەفەرموێ: ﴿ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾ ژێر بارمان کرد بۆ سولەیمان با ﴿غُدُوُّهَا شَهۡرٞ﴾ تاقی بەیانی یەکەی مانگێ رێگا بوو، ﴿وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞ﴾ تاقی ئێوارەکەی مانگێ رێگا بوو. کەواتە لە رۆژێك دا ماوەی دوو مانگە رێگای ئەبڕی.

لەبارەی ئەم ژێر کردنەوە قسە و باسی زۆر و زەبەنە کراوە، ریوایەتی زۆر هەیە، کە شتێکی ئاشکرایە زیادە رەوی و سەرپەتی ئیسرائیلی یاتی تیایە، خۆپاراستن لە شوێن کەوتنی ئەو ئیسرائیلی یاتە زۆر پێویستە، جا لەبەر ئەوە هەندێ لە زانایان لە دیمەن و رواڵەتی قورئانەکە تێپەڕ ناکەن و ئەڵێن: خوا بای ژێر بار کرد بۆ سولەیمان کە مانگێ بەرەو ئەڕۆیشت و مانگێ بە پێچەوانەوە ئەگەڕایەوە. ئەوەش بە پێی بەرژەوەندی یەك کە سولەیمان ئەیزانی و بە فەرمانی خوا پێکی ئەهێنا، بێگومان تەفسیری ئەم ئایەتە بەم جۆرە زۆر رێك و پێکە لەگەڵ دیمەن و رواڵەتی ئایەتەکە و دوورە لە مەترسی زیادە رەوی و شوێن کەوتنی ئیسرائیلی یات، هەرچەند ئەمە رێك و بێ مەترسی یە، بەلاّم بەم شێوە تەفسیرم نەکردەوە چونکە شتێکی زۆر بەناوبانگە کە ژێر بار کردنی بۆ هاتوچۆ و گواستنەوەی سولەیمان و لەشکرەکەی بووە بۆ هەر ولاّتێ بیویستایە. بەم رەنگە بە وێنەی کەشتی شوێنی گەورە و فراوانی دروست ئەکرد و ئەچوونە ناوی و ئینجا فەرمانی ئەدا با هەڵی ئەگرتن و بە چەسپانی ئەیبردن بۆ جێگا و شوێنی پێویست. هەروەك ئەم هەواڵ و دەنگ و باسە دەست کەوتووە لە پارچە هۆنراوەیەك دا بە ناوی یەکێ لە هاوەڵانی سولەیمان – سەلامی خوای لێ بێ – کە بە زمانی عەرەبی ئەو پارچە شیعرەی وتووە و هەڵی کەندووە لە بەردێ و بەردەکە دۆزرایەوە لە ولاّتێك دا، حەزم کرد ئەو پارچە شیعرە بخەمە بەرچاو لەم تەفسیرەدا:

ونحن ولا حول سوى حول ربنا ... نروح من الأوطان من أرض تدمر
إذا نحن رحنا كان ريث رواحنا ... مسيرة الشهر و الغدوّلاخر
اناس شروا الله طوعا نفسهم ... بنصر ان داود النبي المطهر
لهم في معالي الدين فضل و رفعة ... وان نسبوا يوما فمن خير معشر
متى تركب الريح المطية اسرعت ... مبادرة عن شهرها لم تقصر
تظلهم طير صفوف عليهم ... متى رفرفت من فوقهم لم تنفر

وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ وَمِنَ ٱلۡجِنِّ مَن يَعۡمَلُ بَيۡنَ يَدَيۡهِ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍۚ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ

---

جا بەهۆی ئەوەوە تەفسیرەکەم بە جۆرێ کردەوە لەگەڵ ئەو بارەدا رێکە کە بەناوبانگە لە ناو خەڵك دا و لە پەڕاوەکانی تەفسیردا، بێگومان لەسەر هەرکام لەم دووبارە کە باس کرا ئەو ژێر بار کردنە فەزڵ وم موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ سولەیمان – درودی خوای لەسەر بێت – هەرچۆنێ فەراهەم هێنانی کانیاوی مس و ژێر بار کردنی جنۆکە، دوو موعجیزەی گەورە بوون کە لێرەدا بۆمان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ﴾ کانی و چەشمەی مسمان بۆ جاری کرد، واتە هەرچۆنێ ئاسنمان نەرم کرد بۆ داود بۆ دروست کردنی پۆشاکی جەنگ هەروەها مسمان فەراهەم هێنا بۆ سولەیمان و تواندمانەوە بۆی بە وێنەی ئاوی چەشمە بێت و بڕوا بە سووك و ئاسان بەکاربهێنرێ لە دروست کردنی ئەو شتانەی کە پێویستن ﴿وَمِنَ ٱلۡجِنِّ مَن يَعۡمَلُ بَيۡنَ يَدَيۡهِ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ﴾ ژێر بارمان کرد بۆی لە تیرە و بەرەی جن کەسێ کە ئیش و کار بکات لەبەردەستی دا بە ئیزن و فەرمانی خوا و بە ژێر بار کردنی خوا، واتە تاقمێ لە جنۆکەمان ژێر بار کرد ئیش و کار و پیشەسازی بکات بۆ سولەیمان ﴿وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ هەرکەس لەوان لایدا لە فەرمانی ئێمە دەرخواردی ئەدەین و پێی ئەچەژین لە سزای ئاگرێکی بڵێسەداری تاو دراو، هەندێ لە ئیش و کارەکانی ئەو تاقمە جنۆکە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ﴾ ئیش و کار بکەن بۆ

سولەیمان ئەوەی مەیل و ئارەزوو ئەکات و ئەیەوێ ﴿مِن مَّحَٰرِيبَ﴾ لە چەند جێگا و شوێنی خواپەرستی، ﴿وَتَمَٰثِيلَ﴾ چەند وێنە و سورەت و هەیکەلێ کە لەو شەریعەتەدا دروست کردن و راگیر کردنیان حەڵاڵ و رەوا بووە، ﴿وَجِفَانٍ﴾ چەند قاپ و قاچاغی نان و چێشت خواردن کە لە گەورەیی دا ﴿كَٱلْجَوَابِ﴾ بە وێنەی حەوزی گەورە گەورە بوون ﴿وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ﴾ چەن قازان و مەنجەڵ کە لەبەر گەورەیی دامەزراو بوون بەسەر سێ کوچکە و کوچ کارەوە و دانەئەگیران.

خوای گەورە تاقمێکی زۆر بار کرد بۆ سولەیمان – سەلامی خوای لێ بێت – بۆ ئەمەی ئیش و کاری بۆ بکەن بە پێی ویست و خواهیشی خۆی، ئەوانە کە باس کران چەند نموونەیەك بوون لە ئیش و کارەکانیان کە پێی هەڵئەسان بە فەرمانی خوا، هەموو ئەو شتانە کارێك بوون پێچەوانەی باو و عادەتی خەڵکی و هیچ کەس ناتوانێ بەو جۆرە فەراهەمی بێنێت لەسەر دەستی ئەو جۆرە دروست کراوانەدا کە ناو ئەبرێن بە(جن).

ئینجا رووی فەرمودەی کردە تاقم و بەرەی داود، فەرمووی: ﴿ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا﴾ کردەوەی چاك بکەن بۆ خوا ئەی ئالی داود لەبەر سوپاس و چاو لەبەریی بۆ خوا. واتە بەرامبەر ئەو هەموو بەهرە و چاکەیە کە پێی دان و رشتی بەسەرتان دا لە شەخسی داود و سولەیمان دا ئێوەش هەڵسن بە کردەوەی چاك و گوێ رایەڵی بۆ خوا.

ئینجا بەشیٚ لە گەورەیی و فەزلٚ و چاکەی خوا دەرئەخات تا رادەیەك کەم کەس هەیە بتوانیٚ هەڵسیٚ بە سوپاسی، بەشیٚ لە کەم و کوڕی ئادەمی دەرئەخات سەبارەت بە هەڵسانیان بە سوپاسی چاکەی خوا و کەم تەرخەمی کردنیان لەوەدا. ئەفەرمویٚ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ﴾ کەمیٚ لە بەندەیانم زۆر سوپاس کەرن، بەم رەنگە هەرچی چاکە و بەهرەیە خوا پیٚی داوە بەکاری بیٚنیٚ لە گویٚ رایەڵی خواو رەزامەندی خوادا، بە دڵ و دەم و ئەندامەکانی خەریك بیٚت لە زۆربەی کات دا، بیٚگومان لەگەڵ ئەویش دا ماف خۆی بەجیٚ ناهیٚنیٚ، چونکە هەڵسانی بەو سوپاسە چاکە و نیعمەتیٚکە سوپاسی ئەویٚ، سوپاس لەسەر ئەو سوپاسە سوپاسی تری ئەویٚ، هەروەها هەتا هەتایە. یان بە جۆریٚ تر بڵیٚین هەموو هەناسەیەك لە هەناسەکانمان دوو چاکە و نیعمەتی تیٚدایە، کەواتە لە هەموو هەناسەیەك لە هەناسەکانمان دوو شوکرو سوپاسی پیٚویستە بۆ هەموو سوپاسیٚك سوپاس پیٚویستە.. وە هەروەها. ئیتر با باوەستیٚ کە چاکە و بەهرەکانی خوا بۆ ئیٚمە نایەنە ژمارە. هەموو کات لە ناو ناز و نیعمەتدا ئەتلیٚینەوە و واین لە ژیٚر شەپۆلی چاکە و بەهرەی خواوە و لەسەرو خوارو لە هەموو لایەکەوە دیٚت بۆمان. کەواتە بە هیچ کلۆج بە هیچ دا ناگەین، باشترین شت ئەوەیە کە خۆمان بە دەستە پاچە و پەك کەوتوو و داماو دابنیٚین لە ئاستی سوپاسی خواو هەمیشە چاو لەبەر و سەر شۆڕ بین بەرامبەر چاکە و بەهرەی خوا.

سولەیمان – درودی خوای لەسەر بیٚت – لەم جیهانەدا ژیانی بردە سەر بەو هەموو چاکە و بەهرەیەی کە بەشیٚکی باس کرا. بەو هەموو دەسەلاٚت و گەورەیی و لەشکرو سوپاوە. بەلاٚم هەموو کەس لەم جیهانەدا ئەبیٚ مردن بچەژیٚ، کەواتە ئەبیٚ ئەمیش ئەم جیهانە بەجیٚ بهیٚلیٚ، مردنەکەی لەسەر شیٚوەی تایبەتی کەس نەدیو بووە، وەکو ریوایەت کراوە کە خۆی ئەدا بە مل دار دەستەکەی دا و لە دنیا دەرئەچیٚ و ئیتر بەو شیٚوە ئەمیٚنیٚتەوە و کەس نازانیٚ نەماوە و کەس زاتی نابیٚ بانگی بکات یان دەستی تیٚوە بدات، ئەو تاقمە جنۆکە خوا ژیٚر باری کردبوون بۆی، خەریکی ئیش و کاری قورس بوون کە دابووی بەسەریان دا، لە ترسا نەئەوەستان و نەیان زانی کە نەماوە تا کرم و خۆرە دایە دار دەستەکەی و لەناوەوە خواردی بەهۆی ئەوەوە سولەیمانی راگیر نەکرد و شکا و ئەویش کەوت و لەو کاتەدا بۆیان دەرکەوت کە نەماوە،

﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِى مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ ۖ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ۖ

**جا ئەوا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە و ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ﴾ ئینجا کاتێ بڕیاری مردندمان دا بەسەر سولەیمان دا و مرد ﴿مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ﴾ هیچ شتێك ڕێبەری ئەوانی نەکرد لەسەر مردنەکەی بێجگە لە کرم و خۆرەی زەوی کە ﴿تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ﴾ دار دەستەکەی خوارد، بەهۆی ئەوەوە دار دەستەکە شکا و ڕاگیری نەکرد و ئەویش کەوت ﴿فَلَمَّا خَرَّ﴾ ئینجا کاتێ کەوت ﴿تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ﴾ باش ڕوون بووەوە بۆ جنۆکەکان و زانیان کە ئەگەر ئەوان غەیبیان بزانییایە ﴿مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾ نەئەمانەوە و بەردەوام نەئەبوون لەو سزای ڕیسواکەرەی کە تیای دا بوون، واتە ئەگەر غەیب زان بوونایە – وەکو خۆیان وا دائەنا – ئەبو بیانزانیایە بە نەمانی سولەیمان و ئەو کاتە وازیان ئەهێنا لەو هەموو ئیش و کارە قورس و بە ئەرکەی کە لە ترسی سولەیمان خەریك بوون پێ یەوە.**

**ئەو جنۆکەی کە هەندێ لە ئادەمی ئەیان پەرستن ئەوانە بوون کە ژێر بار و مل کەچ بوون بۆ بەندەیە لە بەندەکانی خوا، ئەوان بێ ئاگا و نەزان بوون بە مردنی سولەیمان – سەلامی خوای لێ بێت – کە چەندە نزیك بوو لێ یانەوە. کەچی هەندێ لە ئادەمی داوای شتی نهێنی و غەیبی زۆر دووریان لێ ئەکردن!**

**لە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی ئالی داود، باوەڕ بە خوا و سوپاسی خوا لەسەر چاکە و بەهرەکانی و کردەوەی چاك نیشان درا، ئینجا بەرامبەر ئەوە لاپەڕەیەکی تر ئەهێنێ و نیشانی ئەدات. لاپەڕەی(سبأ) کە ناوە بۆ گەل و نەتەوەیەکی دانیشتووی لای خوارووی**

یەمەن، ئەوانە لە خاك و ولآتێکی خۆشی پڕ لە خێرو بێردا بوون تا ئێستەش هەر بەشێکی ماوەتەوە. ئەو گەلە بەرز و پێشکەوتوو بوون لە شارستانی و ئاوەدان کردنەوەی ولآتدا تا رادەیەك، ئەو هەموو ئاوی بارانەی کە بە لێشاو و زۆری بۆیان ئەهات لەلای خوارووی رۆژهەلآتەوە بەهۆی دەریای سورەتەوە، ئەو هەموو بارانەیان دەر دەست کرد و بەکاریان هێنا لە بەرژەوەندی ولآتەکەیان دا، بەم رەنگە سەدد و بەرهەڵستێکی زۆر گرنگیان دروست کرد کە بەناوبانگە ئێستاش لە جیهان دا ناو ئەبرێ بە(سد مأرب). ئەو سەدەیان دروست کرد لە نێوان دوو شاخ دا بەینەکەیان بەربەست کرد و چەند کون و کەلەبەرێکیان تێ کرد کە پێ یان بەرەلآ بکرێ و بگیرێتەوە. بەهۆی ئەوەوە هەموو ئاوەکەیان کۆ کردەوە و بەکاریان هێنا بۆ کشت و کاڵ و باغ و باخچە و پێویستی ولآتەکەیان تا کردیان بە بەهەشتێ لەم جیهانەدا، ئینجا لەباتی سوپاس و گوێ رایەڵی خوا سەریان کردە تاوان و خراپەکاری تا خوا ئەوەی بەسەر هێنان کە لەم باسەدا دەست نیشانی بۆ ئەکات. لە یەکەم جارەوە دەست ئەکات بە باسی ئەو هەموو ناز و نیعمەت و رۆزی فراوانەی کە بوویان، بەرامبەر ئەوە داوایان لێ کرا بە پێی توانا سوپاس و گوێ رایەڵی خوا بکەن، ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ ﴾ سوێند بەخوا بۆ گەلی(سبأ) هەبوو لە جێ و شوێنی خۆیان دا نیشانە و بەڵگەیەکی روون لەسەر تاك و تەنیایی خوا و دەسەلآتی بەسەر فەراهەم هێنانی شتی گرنگ و نایاب دا، ئەو نیشانە روونەش ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ﴾ دوو کۆمەڵە باخات بوو لای راست و لای چەپی ولآتەکەوە. ئەو کۆمەڵە بەهەشت و باخاتە لای راست و لای چەپەوە نیشانەی خۆشی و ئاوەدانی و هەرزانی و فراوانی نازو نیعمەت و رازاوەیی ولآتەکە بوو، کە ئەوەش نیشانەیەکی روونە و خوای بەخشندە و میهرەبان بیر ئەخاتەوە. ئەو هەموو ناز و نیعمەتەیان پێ دراو لەلایەن خواوە پێ یان وترا لەسەر زمانی پێغەمبەریان بە زمانی حاڵ

كُلُواْ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥ ۚ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُواْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ

﴿كُلُواْ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ﴾ بخۆن له ڕۆزی پەروەردگارتان ﴿وَٱشْكُرُواْ لَهُۥ﴾ سوپاس بکەن بۆ خوا و گوێ ڕایەڵی بن، هۆی سوپاس و گوێ ڕایەڵی زۆرە، چونکە زیاد لەو هەموو ناز و نیعمەتە ئەمەیش هەبوو!! ﴿بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ ئەو ولآتەی کە نیشتەجێ بوون تیای دا ولآتێکی پاك و خاوێن و خۆشە، خوایشیان پەروەردگارێکی زۆر لێ بوردە و داشاردەر و پاك کەرەوەی گوناهو خراپەیانە. کەواتە ئەبێ چی بیان وەستێنێ لە سوپاس و گوێ ڕایەڵی؟ بەلآم سوپاس و گوێ ڕایەڵی یان نەکرد و خوای خۆیان لەبیر چوو، تەمێ و مۆچیاریان وەرنەگرت. وەکو ئەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرَضُواْ﴾ ئینجا ئەوانە ڕوویان وەرگێڕا لە سوپاسی خوا و کردەوەی چاك و ڕەفتار و جوڵانەوەی ڕاست و ڕەوا لەگەڵ ئەو هەموو چاکە و بەهرەی خوا ڕشتبووی بەسەریان دا، بەهۆی ئەوەوە خوا ئەو خۆشی و شادمانی یەی نەهێشتن و گۆڕی بە ناخۆشی و تەنگ گوزەرانی بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ﴾ بەهۆی ئەوەوە بەرەلآمان کرد بەسەریان دا لافاوی سەختی بەهێز کە لە ڕێگای دا بەرد هەڵگرێ و لەگەڵ خۆی بیبا، سەدد و بەرهەڵستەکەی ڕووخاند و ئاوەکەی دای بە ملی باخ و بێستان و کشتوکاڵەکەیاندا، ئینجا کە سەددەکە نەما و ئاوی باران کۆو خەزن نەکرا باخ و بێستان وشك بوون و درەخت نەما مەگەر درەختی دێم کە بێ کەڵکە و بەکار نایەت، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ﴾ دوو تاقمە باخ و بەهەشتەکەمان گۆڕین بە دوو تاقمە باخێك ﴿ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ﴾ کە خاوەن بەرێکی تفت و تاڵ و ناخۆش بوون ﴿وَأَثْلٍ﴾ خاوەن دار گەز کە درەختێکی بێ بەری بێ کەڵکە،

وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِمَا كَفَرُواْۖ وَهَلۡ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلۡكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ
وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا قُرٗى ظَٰهِرَةٗ وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَۖ

---

**﴿وَشَيۡءٖ مِّن سِدۡرٖ قَلِيلٖ﴾[1] شتێکی کەم لە درەختی مۆرد. کە بەری ئەم درەختە هەرچەندە بەکار ئەهات و ئەخورا، بەڵام ئەویش ئاوا کەم بوو ﴿ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم﴾ ئا بەو جۆرە سەختە تۆڵەمان لێ سەندن ﴿بِمَا كَفَرُواْۖ﴾ بەهۆی ئەو ناسوپاسی و چاو لەبەر نەبوونیان بۆ چاکەی خوا و دان نەنانیان پێ‌ی. ﴿وَهَلۡ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلۡكَفُورَ﴾ ئایا بەو جۆرە سەختە تۆڵە ئەسێنین لە هیچ کەس بێجگە لە کەسێ کە زۆر ناسوپاس و بەد نمەك بێت؟ واتە نەخێر لە خۆڕایی تۆڵە ناسێنین و هەموو تۆڵە و سزامان راست و بەجێ یە.**

**ئەوانە تا ئەم کاتە هەر مابوونەوە لە شارو ماڵەکانی خۆیان دا بەس خوا تەنگ گوزەرانی کردن، ئەو نازو نیعمەتەی لەوەو بەری نەمێشتەوە و گۆڕی بە ناخۆشی و ناتەواوی، بەڵام پرژو بڵاوی نەکردبوونەوە بە وڵاتان دا، ئاوەدانی و شار لەسەر شار و دێ لەسەر دێ هەر مابووەوە تا ئەیگەیاندن و ئەیلکاندن بە وڵاتی بەفەڕەوە: مەککە لەنیوە دورگە و قودس لە شام تا بەهۆی خراپی خۆیان خوا ئەوەیشی لێ سەندنەوە و شارو دێکانی وێران کردن و خۆیانی پرژ و بلاو کردەوە بە وڵاتاندا. وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا قُرٗى ظَٰهِرَةٗ﴾ لەنێوان ئەوان و ئەو شارو دێهاتانەی کە پیت و فەڕمان تێ خستبوون، چەند شارو دێهاتێکمان فەراهەم هێنا بوو کە دەرکەوتوو ئاشکرا بوون لە یەکترەوە یان ئاشکرا دەرکەوتوو بوون بۆ رێبوار، چونکە لە شوێنی بەرزی دا بوون و لەسەر رێگا ﴿وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَۖ﴾ رۆیشتن و هاتوچۆ لە نێوان ئەو شارو دێهاتانەدا رادە و ئەندازێکمان بۆ بڕیار دابوو، بە جۆرێ وەکو ئەڵێن رێبوار بەیانی لە شارێکەوە دەرئەچوو بۆ نیوەڕۆ ئەگەیشتە شارێکی تر، دوای نیوەڕۆ دەرئەچوو بۆ خۆرئاوا ئەگەیشتە شارێکی تر، کەواتە کەس پێویستی بە هەڵگرتنی توێشوو نەئەبوو، شەو لە چۆڵی دا نەئەمایەوە، مەترسی نەئەکرا لە دوژمن و درندە و بە بێ غەم و مەترسی هاتوچۆ و سەفەر ئەکرا بۆ وڵاتی بەفەڕ و پیرۆز،**

---

[1] ئەم چەند وشەیە بە چەند شتێ تریش تەفسیر کراونەتەوە هەموو هەر ئەگونجێ و چاکن.

سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ

وەكو ئەفەرموێ: ﴿سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ﴾ وتمان پێ یان بڕۆن و بگەڕێن پیایان دا هەرکات ئارەزوو ئەکەن بە شەو و بە رۆژ بە ئارام و بێ مەترسی لە هەر شتێ پێتان ناخۆشە.

بە کورتی: ئەوانە لە هەموو بارو رووییەکەوە تێرو تەواو بوون، بەهۆی خراپی خۆیانەوە دووچاری یەکەم بەسەرهات هاتن و بەو جۆرەیان لێ هات کە باس کرا. لەپاش ئەو بەسەرهات و سەر لێ شێوانە هەر هێشتا باش بوون لە جێگا و شوێنی خۆیان دا مابوونەوە بەو شێوە سووك و ئاسانە هاتوچۆ و گەڕانیان بۆ ئەکرا، بەلاَم بەو یەکەم ترساندنە تەمێ خوار نەبوون، نەگەڕانەوە بۆلای خوا، بەڵکو ئەو خۆشی و کامەرانی یەی کە لێ ی سەندبوون بیان داتەوە، بەڵکو خراپتر بوون و بە نەفامی و نەزانی شەڕیان لە خۆیان کرد، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا﴾ ئینجا ئەوانە وتیان: ئەی پەروەردگارمان دوری بخەرە نێوان سەفەر و هاتوچۆکانمان، واتە ئەو ئاوەدانی یانە مەهێڵە با سەفەری دوور و درێژ بکەین بە کاروان و ئاو و نان و توێشوو لەگەڵ خۆمان ببەین! ئەوەش لە خۆگۆڕان و خۆ بە زل زانی یە، ﴿وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانە جەورو ستەمیان لە خۆیان کرد، بەم رەنگە رێز و نرخی چاکە و بەهرەی خوایان بەلاوە نەبوو، هەڵنەسان بە سوپاسی، خۆیان خستە بەر خەشم و سزای خوا. بەهۆی ئەوەوە ئاوایان بەسەرهات کە ئەفەرموێ: ﴿فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ﴾ ئینجا گێڕامانن بە قسە و دەنگ و باسێ کە بۆ خۆشی و بە سەرسوڕمانەوە خەڵکی بەسەرهاتیان بگێڕنەوە، ﴿وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾ پرژو بلاَومان کردنەوە بە هەموو پرژ و بلاَو کردنەوەیە و ئەوپەڕی رادە. ئەوە بوو هەر تیرە و بەرە و بابێ کەوتە ولاَت و ناوچەیەك لە نیوە دورگە بەسەر لێ تێك چوویی و ماڵ وێرانی: بەشێ کەوتە شام و بەشێ مەدینە و بەشێ توهامە و بەشێ عومان، بەسەرهاتیان بوو بە قسە و دەنگ و باس هەر ئەگێڕرێتەوە، بوون بە چیرۆك و مەتەڵ بۆ هەر گەل و کۆمەڵی بەش بەش و پرژ و بلاَو ببێتەوە و پێ یان ئەڵێن:(تفرقوا ايدي سبأ).

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بەڕاستی لەوەی کە باس کرا لە بەسەرهات و سەرگوزەشتەی ئەو گەلە چەند بەڵگە و نیشانەیەکی روون هەیە بۆ هەرکەسێ کە زۆر خۆگر بێت لە کاتی تەنگی و بەسەرهاتی ناخۆش دا و زۆر سوپاس کەر و چاو لەبەر بێت بۆ خوا لە کاتی خۆشی و نازو نیعمەت دا. بێگومان چەند رابەر و نیشانەی روون هەیە لەو بەسەرهاتەدا بۆ تەمێ و پەند وەرگرتن، بەڵام هەموو کەس سوود وەرناگرێ لەو بەڵگە و نیشانە روونانە، جگە لە کەسێ کە خاوەنی ئەو دوو سیفەتە بەرزە بێت. لێرەدا بە جوانی ئەزانم ئەندازێ بدوێم لەبارەی ئەو بەرهەڵستە گرنگەی کە بەناوبانگە بە(سد مأرب) خوای گەورە بۆ گەل و دانیشتوانی ئەو وڵاتەی رێك خست تا وڵاتەکەیان بە هۆی ئەوەوە بوو بە بەهەشتی رووی زەوی و ئینجا ئەوانە بە کردەوەی خراپی خۆیان لە خۆیانیان تێك دا و ئەوەیان بەسەرهات کە بەسەریان هات.

مێژوو نووسانی عەرەب لە چەند چەرخی جیاوازدا باسی ئەو بەرهەڵستەیان کردووە، راست ترین کەس کە بە راستی باسی کردبێت(همدانی) یە لە کتێبەکەیدا(وصف جزيرة العرب) ئەڵێ: لەلای خواروی رۆژئاوای(مأرب) زنجیرەیەك شاخ و کێو هەیە کە چەند دۆڵ و شیوێکن لە شاخی(السراة) کە بەناوبانگە ئەو زنجیرەیە درێژە ئەکێشێ چەند سەد میلێ بەرە و رۆژهەڵاتی لای سەرووی وڵاتەکە، لە نێوان ئەو شاخانەدا چەند شیوێك هەیە، ئاو و لافاویان ئەڕژێتە شیوێکی گەورە کە عەرەب پێی ئەڵێن: پلوسکی رۆژهەڵات کە گەورەترینی شیوەکانی رۆژهەڵاتە، کاتێ باران و لافاوی ئەو هەموو دۆڵ و شیوانە کۆ ئەبوونەوە و ئەڕژانە یەك، تا لە دوایی دا ئەهاتنە شیوێ کە ناو ئەبرێ بە ﴿وادي آذنة﴾، کە ۱۱۰۰ مەتر بەرزە لە دەریای سور، ئاو و لافاوەکان هەموو ئەڕۆن بەو شیوەدا هەتا ئەگەنە شوێنێ لە بەردەم(مأرب) بە ماوەی سێ سەعات کە ئەوەش تەنگی یەکە لە نێوان دوو شاخ دا کە ناوبراون بە(بلن)! بلنی دەستە راست و بلنی دەستە چەپ کە مەسافەی نێوانیان شەش سەد باڵە، لافاوی گەورە بەناوی دا تێپەڕ ئەکات لە رۆژئاوای لای خوارەوە بۆ رۆژهەڵاتی لای

ژووروو له شیوی(آذنة). ئەو گەلە ئەو تەنگایی یان هەڵبژارد له نێوان ئەو دوو شاخەدا شورە و بەرهەڵستێکی گەورەیان دروست کرد کە ناوبراوە بە(سد مأرب) یان بە(سد العرم) لەو تەنگانی یەوە تاشاری(مأرب) سێ هەزار میلی چوار گۆشە شاخ و زەوی و دەشت هەیە له پێشەوە خاکێکی وشك و بێ خێرو بێر بوو لەپاش دروست کردنی ئەو سەدە گەڕا بە باغ و بێستان کە دەربارەیان فەرموی: ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ﴾ ئەوانەی کە بەدوای دروشم و ئاساری کۆن و بەناو وڵاتان دا ئەگەڕێن، لەم چەرخی دوایی یەدا گومانیان هەبوو لە راستی هەواڵ و دەنگ و باسی ئەو(سد مأرب) ەدا هەتا(آرنوي) فەرەنسایی توانی بێتە ئەو جێگایە له ساڵی ١٨٤٣ دا بەچاوی خۆی دروشم و نیشانەکانی بینی، شێوە و وێنەی بڵاو کردەوە لە(المجله الفرنسیه) لە ساڵی ١٨٧٤ دا. ئینجا لەپاش ئەو نمالیفی و غلازر چوونە ئەو شوێنە و ئەوەی کە(ارنو) نووسی بووی لەبارەی ئەو بەرهەڵستە و نیشانە و دروشمەکانی، شایەتیان دا لەسەری و بە راستیان دایە قەڵەم. باسەکەیان لە زۆر بار و رووەوە رێکە لەگەڵ ئەوەی همدانی نووسی بووی لە کتێبی ناوبراوی دا، ئینجا لەپاش چەند خەت و نووسراوێکی هەڵکەنراویان دۆزی یەوە لەناو وێرانە و رووخاوەکانی دا کە راستی کردەوە. ئەو سەددە پێش ئیسلام رووخاوە بە چوار سەد ساڵ وەکو ئەسفەهانی ئەڵێ. ئەوانە بەو جۆرە خوا بۆی رێکخستن و کەچی خۆیان له خۆیانیان تێکدا تا بەو جۆرەیان بەسەرهات کە باس کرا. له کۆتایی باسەکەدا قورئان له چوار چێوەی سەرگوزەشتەکە دەرئەچێ بۆ چوار چێوەی تەگبیری گشتی خوایی و بڕیاری رێك و بەجێ و رەوشتی گشتی خوا لەناو بەندەکانی دا و حیکمەت و کاردروستی خۆی دەرئەخات لەم بەسەرهاتە و هاو وێنەکاندا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ﴾ سوێند بەخوا شەیتان گومانی خۆی بە راست گێڕا بەسەر ئەوانەدا، واتە ئەو گەل و تاقمە کەوتنە سەر ئەو رێگا چەوتەی خۆیان کە سەری لەو سزا و بەش براوی یەوە دەرچوو، هۆی ئەوەش ئەوە بوو کە ئەوانە لە رێگای راستی خوا لایان دا، لە پێشەوە گومانی برد بوو کە ئەتوانێ ئادەمی لەو رێگا راستە بترازێنێ. جا ئەو گومانەی بە راست گێڕا لەو گەلەدا،

﴿فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ﴾

---

﴿فَاتَّبَعُوهُ﴾ بەم رەنگە هەموو دوای شەیتان كەوتن و پەیڕەوی یان كرد ﴿إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ جگە لە تاقمی بڕواداران كە ئەوەش هەر هەیە، لەناو هەموو گەل و كۆمەڵێك دا تاقمێ هەیە كە بۆی لانەدرێ وەكو شەیتان خۆیشی ئەوەت وت و دانی پیانا، ئەوەبوو وتی: ﴿لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾[1] ﴿وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ﴾ نەبووە و نی یە بۆ شەیتان هیچ دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ﴾ مەگەر بۆ ئەمەی بزانین و دەری خەین كەسێ كە بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەیە و جوێ ببێتەوە ﴿مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ﴾ لە كەسێ كە لە گومان دایە و لەو ڕۆژە و دوو دڵە لە ڕاستی ئەو ڕۆژەدا، واتە شەیتان دەسەڵاتی نی یە بە زۆر پێ هێنان و ناچاركردن، بەڵكو دەسەڵاتی ئەو بریتی یە لە هاندان و خەڵەتاندن بە خەتەرە و بە شێوەی نهێنی، ئەوەش بۆ ئەمەیە دەركەوێ چاك و خراپ و جوێ ببنەوە لە یەكتر، چاكە و خراپە ئاشكرا بێت، تا بە پێی كردەوە پاداشت و تۆڵە بەجێ بێت. چونكە خوا بە پێی زانین و ئاگاداری خۆی ڕەفتار لەگەڵ بەندەكانی ناكات بەڵكو ئەبێ ئەوەی خوا ئەیزانێ بەدی بێت، ئینجا پاداشت ئەدات و تۆڵە ئەسێنێ.

بێگومان خوا سەرەتای نی یە و بە هیچ كلۆج گۆڕان و كەم و كوڕی ڕووی تێ ناكات، لە پێش دروست كردنی هەموو شتێ و پاش دروست كردنی زانین و ئاگاداری وا هەر بووە و هەر هەیە و هەر ئەبێ، كەواتە لێرەو لە وێنەی ئێرەدا مەبەست پەیدا بوونی زانین نی یە بۆ خوا، ئەبێ ئەم جۆرە وشەیانە لە دیمەن و ڕواڵەتەكەی لابدرێ جا لەم بارەیەوە زانایان چەند مانا و مەبەستێكیان باس كردووە لە چەند جێگایەك لەم تەفسیرەدا ئەو باسەمان بە درێژی كردووە. یەكێ لەو مانا و مەبەستانە دەرخستن و بەدی هێنانە وەكو دەست نیشانمان بۆ كرد لە تەفسیری ئایەتەكەدا.

---

[1] واتە سوێند بە گەورەیی تۆ و دەسەڵاتی تۆ هەموویان گومڕا ئەكەم مەگەر بەندەیانێكت كە پاك و خاوێنت كردوون بۆ خۆت و گوێ ڕایەڵی خۆت. سورەتی الحجر ٣٩-٤٠.

وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ

---

﴿وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ خوای تۆ ئەی پێغەمبەر چاودێر و ئاگاداره بەسەر هەموو شتێك دا، کەواتە هیچی لێ یاخی نابێت و هیچی لێ ون نابێت، لە هەموو شتێ ئەپرسێتەوەو هیچ شتێك زایە ناکات.

ئینجا بە کورتی گەردشێ ئەکات بە دڵ و دەروون سەبارەت بە بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان و باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا، بەڵام گەردشێکە دڵ و دەروون ئەگێڕێ بەناو بوونەوەردا. ئاشکراو نهێنی، حازرو غائبی، ئاسمانی و زەوی یەکەی، ئەم جیهان و ئەو جیهانی. لە چەند هەڵوێستێکی سامناك دا ئەیوەستێنێ کە شایانە ڕەگ و دەمار بهێنێتە لەرزە، گەورەیی خوا هەست و هۆشی لا ئەمێڵێ، هەروەها چەند هەڵوێستی تر، ئەوانەش هەموو ئاراستە ئەکات بەو جۆر و شێوە تایبەتی یە کە تەنها لە دەست قورئان دێت، ئەفەرموێ: ﴿قُلِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بت پەرست و هاوبەش بڕیار دەرانە ﴿ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بانگ و هاوار بکەن لەوانەی بێجگە لە خوا کە لاتان وایە پەرستراون و شایانی پەرستن و هاواریان لێ ئەکەن بۆ بەرگری زیان و دەست کەوتی سوود. بانگ و هاواریان لێ بکەن، با بێن، با دەرکەون، ئایا هیچیان بە دەستە؟ ﴿لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئەوانە خاوەنی ئەنداز و کێشانەی زەڕەیە نین نە لە ئاسمانەکان دا و نە لە زەوی دا. بێگومان بە هیچ کلۆج ڕێگایان نی یە داوای موڵکایەتی و خاوەنی هیچ شتێ بکەن لەم ئاسمان و زەوی یەدا، چونکە هەرکەس خاوەنی هەر شتێك بێ ئەبێ بتوانێ بە ئارەزووی خۆی کاری تیا بکات، چی پێ بکات ئەیکات، دەی ئایا ئەو بت و پەرستراوانە ئەبێ خاوەن چی بن و چی یان بە دەست بێت؟ لە چ بارو ڕوویەکەوە بتوانن دەست بخەنە کاری ئەم بوونەوەرە پان و فراوانە؟

ئەوانە بە قەدەر كێشی زەڕەیە خاوەنێتی ڕاستەقینەیان نی یە بە سەربەخۆ، ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ﴾ نی یە بۆیان لە ئاسمانەكان و زەوی دا هیچ جۆرە بەشداری و هاوبەشی یەك، نە بە خاوەنی و نە بە دروست كردن و نە بە كارتیا كردن ﴿وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ﴾ نی یە بۆ خوا لەلایەن ئەو بت و پەرستراوانەوە هیچ یارمەتی دەر و كۆمەك و پشتیوانێك، چونكە بێگومان خوا پێویستی نی یە بە یارمەتی و كۆمەكی.. دەی هەركەسێ كە بە هیچ جۆرێ لەم جۆرانە دەخلی نەبێ بەم بوونەوەرە ئەبێ چۆن بپەرسترێ و شایان بێت بۆ پەرستن؟ هەركەس ژیر و تێگەیشتوو بێت ئەبێ چۆن ئەوانە بە پەرستراو دابنێ و ناویان ببا؟!!

ئەو بت پەرستانە چەند جۆر و تاقمێ بوون، جا وا دەرئەكەوێ كە ئەم ئایەتە لێرەدا دەست نیشان ئەكات بە جۆرێكی تایبەتی لەوانە و مەبەست تاقمێكە لە پەرستراوان كە بریتین لەمەلائیكە كە عەرەبەكان ناویان ئەبردن بە كچی خوا، لایان وا بوو تكایان بۆ ئەكەن لای خوا، ڕەنگە لەوانە بن كە ئەیان وت: ئێمە ئەمانە ناپەرستین لەبەر ئەوە نەبێ نزیكمان بخەنەوە لە خواوە...

جا لەبەر ئەوە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَـٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾ سوودی نی یە تكا كردن لای خوا مەگەر بۆ كەسێ كە خوا ئیزنی تكای دابێ بۆی تكا بكات، یان تكای بۆ بكرێ، كەواتە تكا كردن بەستراوە بە ئیزنی خواوە، بێگومان خوا ئیزنی تكا كردن نادات بۆ ئەو كەسانەی بێ بڕوان و شایان نین بۆ ڕەحمەت و بەزەیی خوا. دەی ئەوانەی بت پەرستن و هاوبەش بۆ خوا ڕەوا ئەدەن شایان نین بۆ ئەوە ئیزنی تكایان بۆ بدرێ نە لەلایەن مەلائیكەوە نە لە لایەن هیچ كەسی ترەوە كە شایانی تكا كردنن و ئیزنی تكایان ئەدرێ.

ئینجا شێوەیەكی زۆر داچڵەكێنەر و سامناك ئەخاتە بەرچاو كە تكا كردن ڕوو ئەدات تیای دا، شێوەی ئەو ڕۆژە سەختە، كە خەڵكی هەموو تیایا ئەوەستن ماوەیەكی دوور و درێژ، تكا كاران و تكا بۆ كراوان چاوەڕوانن خوای پەروەردگار ئیزن دەربكات بە تكا كردن بۆ ئەوانەی ئەگەنە ئەو پلە و پایە بەرزە، چاوەڕوانی یەكە بە دڵە لەرزەوە درێژە ئەكێشێ، هەموو سەر داخراو و مل كەچن، بە هیچ ڕەنگ وركە و سركە نامێنێ و هەموو بێ دەنگن،

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن
يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾

دڵ پڕە لە سام و ترس و چاوەڕوانە. ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ﴾[1] واتە تکاکاران و تکا بۆ کراوان ئەوەستن لەو هەڵوێستە سامناکەدا، تکا بۆ کراوان دەستە و داوێن بە ئومێدن لە تکاکاران، ئەمانیش وەستاوون لەسەر قاچی پەنا هێنان و پاڕە و لالە. بە ئەوپەڕی شەرم و ئەدەبەوە لەبەر قاپی تکا کردن دا وەستاون و تەقەی ئیزن خواستنیان داوە لە قاپی و بە سام و ترسەوە چاوەڕوانن نازانن خوای پەروەردگار بڕیاری چی ئەدات لەسەر پێشنیارەکەیان و چۆن ئیمزای ئەکات بەم شێوە ئەمێننەوە هەتا سام و بیمەکە لە دڵیان لائەبرێ و هۆش ئەکەنەوە، بەهۆی دەرکەوتنی بڕیارو ئیمزای ئارام دەر و دڵ خۆش کەر، رووناکی وەرگرتن و ئیزن دان، لەو کاتەدا ﴿قَالُوا۟﴾ هەندێکیان ئەڵێن بە هەندێکی تریان ﴿مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ﴾ ئایا چی وت پەروەردگارتان؟ ئەوانەی کە هۆش ئەکەنەوە بە باشی، یان مەلائیکە گەورە نزیک خراوەکان لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا ﴿قَالُوا۟﴾ ئەڵێن: ﴿ٱلْحَقَّ﴾ خوای پەروەردگارمان قسە راستەکەی فەرمو، بڕیارە راستە بەجێکەی دا کە بەرژەوەندی تیایە، کە ئیزن دانە بە تکا کردن بۆ ئەوانەی خوا خۆی ئەزانێ شایانن و رەزای لێ یەتی، هەموو فەرمودە و بڕیاری خوا راست و بەجێ یە ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ تەنها ئەو بەرز و بڵندە و گەورەیە.

ئەم وەڵامە کورتە ئەوپەڕی خۆشی و شادمانی نیشان ئەدات، کە لەو کاتانەدا تەنها وشەیەکی ئاوا ئەوترێ و شەپۆلی خۆش دێت بەسەردا. ئەمە بوو هەڵوێست و شێوەیە ئیتر هیچ کەس رێگای هەیە بڵێ ئەوانە هاوبەشن بۆ خوا، تکا کار ئەبن بۆ ئەوانەی هاوبەش رەوا ئەدەن بۆ خوا؟ گەردش و گێڕانی یەکەم دوایی هات بەو جۆرەی کە تێپەڕی کرد.

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوانە نالکێن بە دڵەوە و دڵ بە ئارام نی یە پێیان، خوا خۆی باش ئەزانێ.

ئینجا دووەم دێتە پێشەوە لەبارەی ئەو رۆزی یەی کە پێی ئەژین و گوزەران ئەکەن، بێ ئاگان لە سەرچاوەکەی، کە بەڵگە و نیشانەیەکی روونە لەسەر تاك و تەنیای ئەو رۆزی دەرە، کە ئەو رۆزی فراوان ئەکات و کەم و کورِی ئەکات، بە پێی زانین و لێزانی خۆی، ئەو رۆزی دەرەی کە هیچ هاوبەشێکی نی یە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ ئایا کێ رۆزیتان ئەدات لە ئاسمانەکان و لە زەوی یەوە؟ رۆزی ئاسمان ئەوەی کە ئاشکرا بوو بێت باران و گەرمی و تیشك و رووناکی یە... بێجگە لەوەش چەند شتێ تریش هەیە کە هۆی فەراهەم هاتنی رۆزی یە و بەرە بەرە دەرئەکەون.. رۆزی زەویش ئەوەی کە هەر لە کۆنەوە ناسراوە و زانراون ئەوانەی کە لە زەوی ئەروێن مالآت و گیانلەبەران و چەشمە و کانیاوەکان و غەزنەی زەوی یە... هەروەها ئەو هەموو هێزو و وزەیانە کە بەرە بەرە دەرکەوتن و دەرئەکەون.. ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەو رۆزی دەرە خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە، بێگومان ناتوانن دەمە پێچە بکەن لەوەیش دا، ناتوانن بێجگە لەو خوایە هیچ کەسێ تر بکەن بە رۆزی دەر، ئینجا کاری خۆت و کاری ئەوان حەواڵەی ئەو خوایە بکە. بێگومان تۆ و ئەوان یەکێکتان لەسەر رێگای راستن و یەکێکتان گومران، ناگونجێ هەردوو یەکێ لەو دووبارەتان ببێ: ﴿وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ بڵێ بێگومان ئێمە کە تاقمی خواپەرستین و ئێوە کە تاقمی بت پەرست و هاوبەش بریار دەر، یەکێکمان ئێمە یان ئێوە لەسەر هیدایەت و رێگای راستە یان چووە بە قووتا و لە ناو چاڵی گومرایی دا...

بەراستی ئەمە ئەوپەری ئینساف و رێك و پێکی و راستی یە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمودەی ئاوا ئاراستەی ئەو بت پەرستە نەفامانە بکات!!

بەراستی پێغەمبەرە ئازیزەکەمان رێگا نیشاندەر و چاو ساغێکی ئێجگار بەکار بووە بۆ دەست کێشانی کوێران، مامۆستای فێرکردن و پەروەردەیە خوا پاداشتی شایانی بداتەوە لەباتی ئەم نەتەوە آمین.

بانگ کردن و لێکۆڵینەوە بەم شێوە و جۆرە نەرم و ناسکە چاکترین هۆیەکی بەهێزی بەکارە بۆ چاو کردنەوە و راکێشانی هەر دڵێ کە زیندوو بێت و تەرِایی تیا مابێ، ئەمە رچە و رێبازێکی زۆر گرنگە کە نەخشەی کێشا و پێویستە شوێن کەوتوو بانگ کەرانی رێگاکەی ئەم رێبازە بەر نەدەن.

قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾

---

**ئینجا ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان: ﴿لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا﴾ ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێ لە تاوانێ ئێمە کردبێتمان ﴿وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ئێمەش پرسیارمان لێ ناکرێ لە کردەوەیەك ئێوە ئەیکەن. رەنگە ئەم ئایەتە بەرپەرچ دانەوە و دەم کوت کردنی بت پەرستەکان بێت، کە پێغەمبەرو باوەڕدارانیان لەکەدار ئەکرد بەمەی هەڵە و تاوانبارن! ناویان ئەبردن بە(الصائبة) هەڵگەڕاوەکان لە ئایینی باو باپیریان، ئەوە پیشەی ئەهلی بەتاڵە کە ئەهلی حەق لەکەدار ئەکەن بەو جۆرە لەکە و تەشەرە خراپانە! بە کەشخە و ئەوپەڕی بێ شەرمی و بێ شەرافەتی یەوە ئەو قسە ناڕاستانە ئەکەن، جا بەرامبەر ئەوە خوا فەرمانی دا کە بەو جۆرە بەرپەرچیان بداتەوە کە ئەوە ئەوپەڕی ئینساف و پیاوەتی یە و هیچ کەسی تر ناگاتە ئەو پلە بەرزە، ئەوەتا تاوان و کردەوەی خراپ بۆ خۆیان رەوا ئەدات، کردەوەی ئەوان هەر بە کردەوەی رووت نیشان ئەدات، هینەکەی خۆیان بە کردەوەی رابوردوو نیشان ئەدات کەواتە شتەکە رووی داوە لێ یانەوە، بەڵام کردەوەی ئەوان ئاوا بە داهاتوو نیشان ئەدات کە هەڵنەگرێ بەدی نەیەت. ئا بەو شێوە نایابە بێدار و وریایان ئەکاتەوە بۆ تێفکران و بیر کردنەوە، سەرنجیان رائەکێشێ بۆ ئەمەی سەرنجێکی هەڵوێست و کرداری خۆیان بدەن. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بڵێ پێ یان: ﴿يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا﴾ پەروەردگارمان کۆمان ئەکاتەوە لە رۆژی دوایی دا ﴿ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ﴾ لەپاشان بڕیار ئەدات لە نێوانمان دا بە حەقیانەت و بە راستی و دادپەروەریی، بەم رەنگە ئەوانەی رێگای حەقیان دایە بەر ئەیانخاتە بەهەشت و ئەوانەی لەسەر رێگای بەتاڵ و ناحەق رۆیشتن ئەیانخاتە ئاگر ﴿وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ﴾ تەنها ئەو حاکم و بڕیار دەری راستەقینەیە و کەرەوەی هەموو مەسەلەیەکی داخراوی قوفڵ دراوە کە خەڵکی بڕیارو حوکمی نازانن چ جای ئەو مەسەلانەی کە ئاشکران، تەنها ئەو زانای راستەقینەیە بە هەموو شتێك و بە هەموو بڕیارێك. بێگومان هەرکەس ژیر بێت، ئەبێ بزانێ کە هەڵە و گومڕایی خۆی لەخۆی دا شتێکی خراپە و شایانە بە دوور کەوتنەوە لێ ی، چ جای ئەوە کە ئاوا لێپرسینەوەی ببێ و تۆڵەی سەختی بۆ دانرابێ.**

﴿قُلْ أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾

ئینجا لە دوایی دا وەکو یەکەم جار بەریان لێ ئەبڕێتەوە لەبارەی ئەو بتانەوە کە کردوویانن بە هاوبەشی خوا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان: ﴿أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ﴾ نیشانم بدەن ئەو بتانەی کە لکاندوتانن بە خواوە و بردوتاننە ریزی خوا بە هاوبەش لە پەرستن دا... ئەوانەم نیشان بدەن. ئەوانە کێن؟ ئەوان چین؟ نرخیان چی یە؟ سیفەت و نیشانەی شایان بوونیان بۆ پەرستن چی یە؟ پایە و پلە و رێزیان چی یە؟ بە چ هۆیەك شایان بوون لەلایەن ئێوە کە بە پەرستراویان دابنێن و ناویان ببەن؟ مەبەست لەم داوایانە بێزاری دەربڕینە لەو پەرستن و پەرستراوە ناڕەوایانە و روون کردنەوەی سووك و ترۆیی و بێ نرخی ئەو پەرستراوانەیە. کەواتە شایانن بەم ئینکار و تێ خوڕینە: ﴿كَلَّا﴾ واز بێنن لەو شتە ناڕەوا... چونکە ئەوانە هاوبەشی خوا نین، خوا هاوبەشی نی یە، کار بەو جۆرە نی یە کە ئێوە ئەڵێن ﴿بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڵکو کار ئەوەیە خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە تەنها ئەو زاڵ و بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێك دا و لێزان و کاردروستە و هەرکەس ئەوە سیفەت و نیشانەی بێت، ئەو بتانە ناچنە ریزی و نابن بە هاوبەشی، بە هیچ کلۆج نابێ ئەو خوایە هاوبەش و وێنەی ببێ.

ئا بەم جۆرە رێك و راستە قورئان ئەکۆڵێتەوە لەگەڵ گومڕاکان و رێنموونی یان ئەکات. ئینجا لەم ١٥ ئایەتی داهاتووەدا سەرنجی دڵ و دەروون رائەکێشێ بۆ چەند مەبەستێکی گرنگ.

هەڵوێستی بێ بڕواکان بەرامبەر ئەو ئایینە راستەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هێنان، هەڵوێستی ئەوانەی کە بە لێشاو خوا ناز و نیعمەتی رشتووە بەسەریان دا. هەڵوێستیان بەرامبەر هەموو پەیام و پێغەمبەران – درودی خوایان لێ بێت – ئەوانەی کە سامان و دارایی و دەسەڵات ئەیان خەڵەتێنێ، تا رادەیەك ئەیکەن بە بەڵگە و نیشانە لەسەر چاکی و هەڵبژاردەیی خۆیان، گومانیان وایە بەرگری یان ئەکات لە سزای هەردوو جیهان، جا لەبەر

ئەوە رۆژی دوایی خۆیان ئەخاتە پێش چاویان، وەکو ئێستا ئامادە بێت لە بەرچاویان، تا بزانن کە هیچ شتێ لەوانەی پارێزگاری یان ناکەن و سوودیان نابێ بۆیان، هەروەها تا بزانن ئەوانەی ئەیانپەرستن لەم جیهانەدا بێجگە لە خوا و هاواریان لێ ئەکەن هیچ سوودیان نابێ و فریایان ناکەون. لەناو بەناوی ئەو لێکۆڵینەوە و وت و وێژەدا، قورئان ئەو شتانە روون ئەکاتەوە کە لە ترازووی خوادا قورس و بە نرخن، بەهۆی ئەوەوە بێ نرخی ئەو شتانە روون ئەبێتەوە کە ئەمان لەم جیهانەدا کەشخەی پێوە ئەکەن و هەر ئەوە بە شت ئەزانن، هەروەها روونی ئەکاتەوە کە زۆری و کەمی سامان و رۆزی بەدی دێن بە پێی خوایش و ویستی خوا، نیشانە و بەڵگە نین لەسەر رەزامەندی یان خەشمی خوا، لەسەر دووری و نزیکی لە خواوە، بەڵکو ئەو زۆری و کەمی یە لەوانەیە خەڵکیان پێ تاقی ئەکرێتەوە.

ئەم باس و بەیانە هات لە پاش ئەو گەردش و خولانەوەی کە کردی بە دڵ و دەروون، لەو چەند ئایەتانەی رابوردوو، کە روون کرایەوە تیایان دا کە هەموو کەس لێپرسراوە لەوەی خراوەتە سەرشانی، هەرکەس بەرهەمی کردەوەی خۆی وەرئەگرێ، لە نێوان چاکان و خراپان هەر روون کردنەوە و بانگ کردن هەیە و ئیتر دوای ئەوە کاری هەمووان حەواڵەی لای خوا ئەکرێت و بۆلای ئەو ئەگەڕێتەوە. بەو بۆنەیەوە کارو ئیشی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا ئەکات، لەگەڵ نەزانی و بە نەفامی بێ بڕواکان و بێ ئاگاییان لەو کارو فەرمانە و پەلە نانەوەیان بەو هەڕەشە و بەڵێنەی کە رایئەگەیەنن.

ئینجا با گوێ بگرین بۆ قورئانی بەفەڕ ئەو مەبەستە گرنگانەمان بدات بە گوێچکەدا. لە یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ ﴾[1] ئەی پێغەمبەر تۆمان رەوانە نەکردووە مەگەر بە رەوانە کردنێ کە گشتی یە بۆ هەموو ئادەمی و هەمووی ئەگرێتەوە ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ لە کاتێک دا کە تۆ مژدە دەر و ترسێنەریت بۆیان، ئەمە سنووری پێغەمبەرێتی یەکەیە کە گشتی یە بۆ هەموو ئادەمی، کارو فرمانیشی مژدە دان و ترساندنە. ئیتر بەرهەمی ئەو موژدە و ترساندنە بە دەست ئەم نی یە، تەنها بە دەست خوایە،

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە کە وشەی ﴿كافة﴾ سیفەتە بۆ سەرچاوەی ﴿أرسلنا﴾، ئەگونجێ حاڵ بێت لە ﴿ك﴾ یان لە ﴿الناس﴾ و پێش خرابێت و بە پێی ئەم دوو جۆرەش تەفسیر کراوەتەوە، مەبەست لە هەموو هەریەکە، لە پێغەمبەرێتی یەکەی دا گشتی یە.

وَلَـٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوۡمٍ لَّا تَسۡتَـٔۡخِرُونَ عَنۡهُ سَاعَةً

﴿وَلَـٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵكی ئەوە نازانن، نەزانی یەكەیان پاڵیان پێوە ئەنێ بۆ ئەو بارە لارەی كە وان لەسەری، ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَـٰدِقِينَ﴾ لەبەر نەزانی یان ئەڵێن بە پێغەمبەر و باوەڕداران، ئایا كەی ئەم بەڵێنە ئەبێت و بەدی دێت ئەگەر ئێوە راست ئەكەن و راستگۆن، واتە بە شێوەی لاقرتی ئەڵێن: ئەوەی كە موژدەی پێ ئەدەن و خەڵكی پێ ئەترسێنن كەی ئەبێت و ئەگەر راست ئەكەن كوا بۆ بەدی نەهات، ئەم پرسیارە ئەیگەیەنێ كە ئەوانە نەزان و بێ ئاگان لە سروشت و سنوور و كار و فرمانی پێغەمبەر و پێغەمبەرێتی، جا قورئان ئەیەوێ بیر و باوەڕی تاك و تەنیایی خوا پاك و خاوێن بكات و هیچ كەس بەرز نەكرێتەوە بۆ سنووری خوایەتی بەم رەنگە داوای شتێكی لێ بكرێ، كە بە دەست خوایە و لە سنووری دەسەڵات و توانای بەندە بەدەرە، با پێغەمبەریش بێت. ئەوەتا لێرە و لە چەند شوێنێكی تردا روونی ئەكاتەوە كە كار و فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) راگەیاندنە و رابەری یە و مژدە دان و ترساندنە، ئەم لە سنووری كارو فرمانی خۆی دا ئەوەستێ و لێ ی تێپەڕ ناكات، خاوەنی هەموو كارێ خوایە. ئەو خوایە پێغەمبەری رەوانە كردووە، ئیش و كاری بۆ دیاریی كردووە، بەدی هێنانی موژدە و هەڕەشە بە دەست ئەم نی یە و تەنها بە دەست خوایە، تەنانەت زانینی كاتی بەدی هاتنی هەڕەشە و مژدەكەیشی پێ نەداوە...

ئەوانە هەموو بە دەست خوا خۆیەتی و خۆی سنووریان ئەزانێ و دیاریی ئەكات، كەواتە نابێ پرسیاریشی لێ بكرێ لە هەر شتێ كە خوا ئاگاداری نەكردبێ بەسەری دا، نەیدابێتە دەستی، خوا فەرمانی دا كە وەڵام و بەرپەرچێكی دیاریی بداتەوە و ئەویش پێ ی هەڵسا وەكو ئەفەرموێ: ﴿قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوۡمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان بۆ ئێوە هەیە بەڵێنی رۆژێ ﴿لَّا تَسۡتَـٔۡخِرُونَ عَنۡهُ سَاعَةً﴾ كە دوا ناكەون لێی ساتێك،

وَلَا تَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ بِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَلَا بِٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ

---

﴿وَلَا تَسۡتَقۡدِمُونَ﴾ پێش ناکەون لێیشی. واتە هەموو بەڵێنێکی خوا بەدی دێت لە کاتی خۆی دا، کە خوا بڕیاری داوە و بۆی دیاریی کردووە، ئیتر نە لە بەر داوا و ئارەزووی هیچ کەس دوا ئەکەوێ و نە پێش ئەکەوێ. هیچ شتێك لەوانە لە خۆڕایی نابێ و بە ڕێکەوت نی یە، بەڵکو هەموو شتێ پەیوەستە و بەستراوە بە شتێکی ترەوە، خوا هەموو ڕووداوێ و هەموو شتێ بەڕێز ئەهێنێ لە کات و جێگا و شوێنی تایبەتی دیاریی کراوی خۆی دا بە پێی لێزانی و کاردروستی خۆی کە هیچ کەس لە بەندەیان هیچی لێ نازانن مەگەر ئەندازێ کە خوا بۆی دیاریی کردبن و ئاگاداری کردبن لێ ی. پەلەنانەوە بەڵگەو نیشانەی ئەو نەزانی و تێ نەگەیشتنەیە، زۆربەی ئادەمی نەزان و بێ ئاگان کەواتە بەهۆی ئەوەوە ئەو جۆرە پرسیارو پەلە نانەوەیان هەر بووە... ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ بِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَلَا بِٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾ ئەوانەی کە کافر بوون وتیان: هەرگیز ئێمە بڕوا ناهێنین نە بەم قورئانە، نە بەو کتێبانەی لە پێش ئەمەوە هاتن و بوون... بێگومان ئەو عیناد و سەرکێشی یە هەر لە یەکەم جارەوە و بڕیار دانە لەسەر وەرنەگرتنی ڕێنموونی لە هیچ سەرچاوەیەکی ترەوە، نە لە قورئان و نە لە هیچ کام لە کتێبە پێشووەکان، نە ئەم و ئەوان هیچ کامیان ناوێ و ئامادە نین بۆ بڕوا هێنان نە ئێستا و نە لە داهاتوودا، جا لەم کاتەدا ئەوا قورئان بەرەنگاری یان ئەکات و شێوەی ڕۆژی دوایی یان ئەهێنێتە بەرچاو، شێوەی بەد بەختی و بەش بڕاوی و سزای سەخت و پەشیمانی یان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ﴾ ئەگەر

ئەبینی و سەرنج ئەدەیت ئەو کاتە ئەوستەم کارە بێ بڕوایانە ئەوەستێنرێن و ڕاگیر ئەکرێن لای خوای خۆیان، واتە لە مەیدانی حیساب و لێ پرسینەوەدا ﴿يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ الْقَوْلَ﴾ لەکاتێك دا کە قسەو وتە ئاراستەی یەکتر ئەکەن، بەم ڕەنگە تانە و تەشەرت لێ ئەدەن و یەکتر تاوانبار ئەکەن، ئەوانە کە لەم جیهانەدا ئەو هەڵوێستە ناڕاستەیان هەبوو ئەگەر سەرنجی بەسەرهاتیان ئەدەی لەرۆژی دوایی داکەراگیرئەکرێن بەریسوایی وبەوهەموو سام و بیم ونائومێدی یەوە،بەڕاستی شتێ ئەبینێ کەزۆرسامناك وناهەموارەوهۆی سەرسوڕمانە[1].

قسە و وتەکانیان بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿يَقُولُ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا﴾ ئەوانەی کە بە بێ دەست و لاواز دانران و ژێر دەست کران، واتە شوێن کەوتوو بەردەستەکان ئەڵێن بەوانەی خۆیان بە زل دائەنا و بە دەسەڵات بوون: ﴿لَوْلَا أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە نەبوونایە بێگومان ئێمە بڕوادار ئەبووین، واتە خەتای ئێوە بوو ئێمە بڕوامان نەهێنا.

ئەوانە لەم جیهانەدا نەیان ئەوێرا و زاتیان نەبوو ڕووبەڕوویان بوەستن بەهۆی زەلیلی و مل کەچی خۆیانەوە، بەهۆی ئەو ئازادی و سەربەستی یە کە خوا دای بە ئادەمی ئەوانە دەستیان لێ هەڵگرت و وازیان لێ هێنا و فرۆشتیان. بەڵام لەوێ مل قوت ئەکەنەوە و ڕووبەڕوویان ئەوەستن و تاوانباریان ئەکەن، چونکە لەو ڕۆژەدا ئەم کەشخە و فشەی ئەمڕۆ نامێنێ و ڕۆژێکی زۆر تەنگی یە و هەرکەس بۆ خۆی هەوڵ ئەدات کەواتە بێ ترس و باك بەو جۆرە تاوانباریان ئەکات. دیارە خۆ بە زل زانەکان بەوە زۆر تەنگە تاو ئەبن، چونکە هەر ئەنداز وان لە بیم و سزادا ئەوا شوێن کەوتووەکان خەریکن سزا و ترسەکەی خۆیشیان ئەدەن بەسەریان دا لەبەر ئەوە بە بێزاری یەوە بەرپەرچیان ئەدەنەوە بەم شێوە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا﴾ خۆ بەزل زانەکان ئەڵێن بە: ﴿لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا﴾ ئەوانەی کە لاوازن و ژێر دەست کراون.

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: وشەی ﴿لو﴾ بۆ ئاواتە و وەڵامی نی یە، زۆریە لەسەر ئەوەیە بۆ شەرتە و وەڵامی لابرلوە لەبەر گەیاندنی گرنگی و سامناکی. هەردوو هەریاشە، تەفسیرەکە لەسەر باری دووەم کرا.

أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ
ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ

---

﴿أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُم﴾ ئایا ئێمە بەرگری ئێوەمان کرد لە ڕێنموونی پاش ئەوەی هات بۆتان؟ نەخێر وا نەبوو ﴿بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ﴾ بەڵکو ئێوە تاوانبار بوون. خۆ بە زل زانەکان ئەو تاوانە لە خۆیان دائەڕنن، دان ئەنێن بە ڕێگای ڕاست و ڕێنموونی خوادا، ئەوانە لەم جیهانەدا هیچ نرخێکیان دانەئەنا بۆ ژێر دەستەکان هیچ قسە و ڕایەکیان لێ وەرنەئەگرتن، بوون و کیانیان بۆ دانەئەنان، هیچ دژو جووڵانەوە و لێکۆڵینەوەیەکیان چاوپۆشی نەئەکرد لێ یانەوە. بەڵام لەو ڕۆژەدا – وەکو لە بەردەم ئەو سزا سەختەدا – بەو جۆرە ئەیانویست خۆیان پاك بکەنەوە و تاوانەکە ئەخەنەوە بە مل خۆیان دا وەکو باس کرا. ئینجا شوێن کەوتووەکان دێنە قسە و بێ دەنگ نابن لە خۆ بەزل زانەکان وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ﴾ ئەوانەی کە ژێر دەستە کرا بوون ئەڵێن: ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ بەوانەی خۆ بە زل زان بوون ﴿بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ نەخێر تاوانی خۆمان نەبوو، بەڵکو فێڵ و فڕی ئێوە بە شەو و بە ڕۆژ و بە هەمیشەیی بەرگری لێ کردین و سەری لێ شێواندین ﴿إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ﴾ لەو کاتەی کە فەرمانتان پێ ئەداین بەمەی بڕوامان نەبێ بە خوا بەو جۆرەی شایانە ﴿وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗا﴾ چەند وێنە و هاوبەشی بۆ بڕیار بدەین لە پەرستن دا.

ئینجا هەردوو تاقم بۆیان دەرئەکەوێ کە ئەو شەڕە قسە و دەمە دەمێ هیچ سوودێ نادات هیچ کات ڕزگار ناکات، هەردوو لا تاوانباران وەك یەك، خۆ بە زل زانەکان تاوانی گومڕایی خۆیان و گومڕا کردنی ئەوانی تریان لە گەردنە، شوێن کەوتووەکانیش تاوانی خۆیان لە گەردنە کە شوێنی ئەوان کەوتوون لە کوفرو گومڕایی دا، ژێر دەستەیی یەکەیان ڕزگاریان ناکات، چونکە خوا ڕێزی گرتن بە زانین و ژیریی و ئازادی و سەربەستی، کەچی خۆیان دەستیان نا بەوانەوە و ژێر دەستەیی و شوێن کەوتنیان بۆ خۆیان هەڵبژارد، کەواتە شایانی سزان لەگەڵ ئەوان دا.

وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ

---

**جا لەبەر ئەوە هەموو داخ و پەشیمانی ئەپێچنە دڵی خۆیان وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ﴾ ئەوانە کاتێ سزای رۆژی دوایی ئەبینن پەشیمان ئەبنەوە و داخ و مەراق دڵیان داگیر ئەکات، ئەو پەشیمانی و داخەش دەرنابڕن و بەدەم نایڵێن لەبەر ئەوە ئەحەپەسێن و لە حەیبەتا گوێ یان ئەبەسترێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ زنجیر ئەخەینە گەردنی ئەوانەی کە کافر بوون، پەنا بەخوا زنجیری ئاسن کە ئاخۆ گەورەیی و قورسی لە چ رادەیەك دا بێت، بەو شێوە رائەکێشرێن بۆ ناو دۆزەخ!! ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ ئایا ئەوانە تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ جگە لە تۆڵەی ئەوەی کە لەوەو بەر کردوویانە؟ واتە نەخێر بەڵکو ئەوە تۆڵەی کردەوەی پێشووی خۆیانە و رێك و پێك و سەر و بەرە لەگەڵی و هیچ زیادە رەوی تیا ناکرێ.**

**شێوەی سزای ئەو دوو تاقمەی هێنایە بەرچاو بە جۆرێ وەکو ئەمڕۆ ئەو رۆژە بێت، با هەر لە ئێستاوە شێوەی سامناکی دوا رۆژی خۆیان ببینن، خەڵکیش لەو شێوەدا سەرنجیان بدات، ئەمڕۆ هەل و کاتیشیان لە دەست دەرنەچووە و دەسەڵاتیان هەیە دوورکەونەوە لە هۆی ئەو سزایە، ئەو شێوە ناهەموارەی خستە بەرچاویان و ئیتر وازیان لێ ئەهێنێ وەکو پەردەیە بێنێ بەسەریان دا و ئەگەڕێتەوە سەر سەرۆکە بێ بڕواکانی قورەیش کە وێنەی ئەوانە هەر بووە لە گەلە رابووردووەکان دا، ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ﴾ رەوانەمان نەکردووە لە هیچ شارێك دا هیچ پێغەمبەر و ترسێنەرێ ﴿إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ﴾ مەگەر خاوەن دەسەڵات و ناز و نیعمەت پێ دراوەکانی هەر شارێ لەوانە – ناپاکان – وتیان بە ترسێنەرەکان،**

﴿إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە کافر و بێ بڕواین بەو ئایینەی کە ئێوەی پێ ڕەوانە کراوە، واتە: ئەی پێغەمبەر دڵ گران و دڵ ڕەنجە مەبە لەو سەرکێش و مل هوڕانە کە بەو جۆرە و بە بێ شەرمانە کافری و بێ بڕوایی خۆیان دەرئەبڕن. چونکە ئەوە تەنها دەربارەی تۆ نەکراوە و تەنها بە تۆ نەوتراوە، بەڵکو هەموو پێغەمبەرێ لە پێش تۆ ئەوەی دەربارە کراوە و وتراوە. کەواتە ئەوە یەك ئاوازەیە لێ ئەدرێتەوە، هۆکەشی یەك شتە، کە ئەو دەسەلآت و ناز و نیعمەتەی کە بە فراوانی و بە لێشاو خوا ڕشتوویەتی بەسەریان دا، دڵی ڕەق ئەکا و سروشتیان تێك ئەدات، لە پەت بەرەڵآ ئەبن و خۆیان لێ ئەگۆڕێ، بە پێچەوانەی پیاوی چاکی سروشت پاك کە هەتا ناز و نیعمەت و دەسەلآتی زۆر تر بێت چاو لەبەر و مل کەچ تر و گوێ ڕایەڵ تر ئەبێت بۆ پەروەردگاری بەخشندە و میهرەبان.

ئەو ناپیاوە لە خۆگۆڕاوانە هەڵنەخەڵەتێن وا گومان ئەبەن کە ئەو سامان و دارایی یە بەرگری یان ئەکات لە سزای خوا، ئەوە نیشانەی ڕەزامەندی خوایە، یان ئەوانە پلە و پایەیان بەرزترە لەوەی حیساب و پرسیاریان لێ بکرێ و سزا بدرێن، وەکو لێ یانەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ ئەوانە وتیان: ماڵ و سامان و ئەولادمان زۆرترە، بەڕاستی ئێمە سزا دراو نابین، ئیتر لەبەر ئەوە سزادان ڕوونادات و بەدی نایەت، یان لەبەر ئەوە کە وتمان: لایان وایە خوا لەوان ڕازی یە و پلە و پایەیان بەرزترە لەوەی سزا بدرێن!!

قورئان تەرازووی ڕێك و ڕاستی خۆی دائەنێ بۆ کێشانەی شتی نرخ دار و بێ نرخ، ڕوونی ئەکاتەوە کەم و زۆری و سامان نیشانەی ڕەزامەندی و خەشمی خوا نی یە، لە خۆی دا بەرگری سزا ناکات و هۆی سزادان نی یە. بەڵکو ئەو زۆری و کەمی یە شتێکی جیاوازە لە حیساب و تۆڵە و سزا و ڕەزامەندی و ناڕەزایی، ئەو زۆری و کەمی یە بە پێ ی یاسایەکی ترە لە باو و ڕەوشتەکانی خوا لەم بوونەوەرەدا،

**ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ بێگومان خوای من ڕۆزی فراوان ئەکات بۆ هەرکەسێ کە خوا خۆی بیەوێ، کەم و کوڕیشی ئەکات بە پێی مەیل و خواهیشی خۆی. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵك ئەوە نازانن.**

**ئەم مەسەلەی زۆر و کەمی سامان و ڕۆزی یە و دەست کەوتنی هۆی خۆشی و شادمانی ئەم جیهانە و بێ بەشی و بەش بڕاوی لێ ی شتێکە لە دڵی زۆر کەسدا دێت و ئەچێت و هۆی بێ ئارامی یەتی، ئەوەش کاتێ کە ئەبینین هەندێ پیاو خراپ و ئەهلی شەڕ بە لێشاو ئەم دیو و ئەو دیو ئەکات لەناو خۆشی و ناز و ڕێزی ئەم جیهانەدا، هەندێ پیاو چاك و ئەهلی خێر بێ بەش و بەش بڕاوە، بەهۆی ئەوەوە هەندێ کەس گومان وا ئەبەن کە هەرکەس خوا سامان و دارایی ڕشت بەسەری دا ئەو کەسە پایە و پلەی بەرزە لای خوا، لە کاتێك دا کە خاوەن خێرو چاکە بەش بڕاو و بێ بەش بێت.**

**جا ئەوا قورئان شت و مەکی ژیانی ئەم جیهانە جیا ئەکاتەوە لەو شتانەی کە نرخ دارن بەلای خواوە و خوا بە چاوی لوتف و ڕێز سەرنجیان ئەدات، ڕوونی ئەکاتەوە کە خوا بە پێی ویست و خواهیشی خۆی ڕۆزی زیاد و کەم ئەکات. ئەمە مەسەلەیەکە و ڕەزامەند و خەشم مەسەلەیەکی ترە و پەیوەندی یان بە یەکەوە نی یە. هەندێ جار خوا بە لێشاو سامان و ڕۆزی ئەڕێژێ بەسەر چەند کەسانێك دا کە خەشم و غەزەبی هەیە بۆیان، هەرچۆنێ بەو شێوە ئەیشی ڕێژێ بەسەر کەسانێ تردا کە ڕازی یە لێ یان، هەندێ جار تەنگ و کەم کوڕیشی ئەکات لەسەر کافران، هەرچۆنێ تەنگ و کەم و کوڕیشی ئەکات لەسەر چاکان و ئەهلی خێر بەڵام هۆ و مەبەستەکە یەك شت نی یە لەم حاڵەتانەدا.**

**خوای گەورە بەندەکانی خۆی ئەناسێ و ئاگادارە بەسەر هەموو نیاز و مەبەست و کردەوەیەکیان دا جا بە پێی ئەوە هۆی نیاز و مەبەستەکەی خۆیان بۆ فەراهەم ئەهێنێ. زۆر جار سامان و ڕۆزی بە لێشاو ئەدا بە کافر و خراپان تا بە پێی نیازی بەدی خۆیان باری**

سەرشانی خۆیان گران بکەن لە تاوان و خراپەکاریدا و ئەو دەسەلات و سامانە بەخت بکەن لە هۆی سزا و عاقیبەت شەڕی یان دا، ئینجا کاتێ مەنی خۆیان پڕ کرد ئەو کاتە بیانگرێ لەم جیهان یان لەو جیهان یان لە هەردووکیان، ئەوەش بە پێی لێزانی و کاردروستی خوا. ئەوە لە زمانی شەرع دا پێی ئەوترێ(استدراج) هەندێ جار تەنگی و بێ بەشی ئەدا بەسەر تاقمی کافر و خراپان دا تا ئەو تەنگی یە ببێتە هۆی شەڕ و تاوان و بێ ئارامی و نائومێدی لە رەحم و بەزەیی خواو ئێجگاری بەوە باری خۆیان قورس بکەن و شایانی خەشم و سزای خوا بن. هەندێ جار ئەیڕێژێ بەسەر چاکاندا، تا بگونجێ بۆیان بە پێی نیازی پاکی خۆیان هەڵسن بەو کردەوە چاکانەی کە بۆیان نەئەکرا بە بێ ئەو دەسەلات و سامانە، بۆ ئەمەی سوپاسی چاکەی خوا بکەن بەسەریانەوە بە دڵ و بە زمان و بە کردەوەی چاك، بەهۆی ئەوەوە زەخیرە و توێشووی چاك و فراوان بنێن بەیەکەوە بە پێی نیازی پاکی خۆیان. هەندێ جار تاقمی چاکان بێ بەش و تەنگ گوزەران ئەکات تا بەهۆی ئەوەوە تاقی یان بکاتەوە لە خۆگری و دڵنیایی و دڵ بەستن بە خواو بە قەزا و قەدەری خوا و رەزامەندی یان بە بەشی خوا، بەهۆی ئەوەوە بگەن بە رەزامەندی خواو پاداشتی نەبڕاوەی خوا. ئەم مەسەلەیە گەلێ کەسی تیا ئەچێ، تا سەریان لە کوفر و رەخنە گرتن لە خواوە دەرئەچێ. لەبەر ئەوە قورئان لە گەلێ شوێن دا دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوەی راست و حەقیقەتە، لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا دەست نیشانی بۆ کراوە، زانا و خواناسەکانی ئوممەتیش بە جوانی روونیان کردووەتەوە، کەواتە با هەموو موسڵمانێ شارەزا بێت و لە رێگا راستەکەی لانەدات، بە باشی تێ بگات کە هۆی زۆر و کەمی رۆزی و سامان هەر شتێ ببێ، شتێکی جیاوازە لەوەی لەخۆی دا بەڵگە ونیشانە بێت لەسەر ئەوە کە سامان و رۆزی و ئەولاد خەڵکی پێش بخەن لای خوا یان دوای بخەن. بەڵکو ئەوانە بەسراون بە کردەوەی ئەو کەسەی ئەو کەسەی کە خوا زۆری پێداوە یان کەم. کەواتە هەرکەس خوا سامان و رۆزی و رۆڵەی زۆری پێ بدات و ئینجا ئەویش باش بجووڵێتەوە و بەکاریان بێنێ لە شتی چاك دا ئەوە ئەو کەسە پاداشت و ئەجری چەند قاتە بە پێی رادەی کردەوە چاکەکەی.

وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ
ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسۡعَوۡنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ فِي
ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥۚ

---

**سامان و دارایی و ئەولاد خۆیان لە خۆیان دا هیچ نرخێکیان نی یە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ﴾ نە سامان و دارایی و نە ئەولادتان شتێ نی یە نزیکتان بخەنەوە لە ئێمەوە بە نزیك خستنەوە ﴿إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ [1] مەگەر کەسێ کە بڕوای هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێ. ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ﴾ ئەوە بۆ ئەوانە هەیە پاداشتی چەند قات و چەند چەندانە – کە لای خوارووی دە قاتە – بەهۆی کردەوەی چاکیانەوە ﴿وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ﴾ ئەوانە لە کۆشك و مەنزڵەکانی بەهەشت دا ئەبن و مەترسی یان نابێ لە هیچ ناخۆشی یەك. ﴿وَٱلَّذِينَ يَسۡعَوۡنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ﴾ کەسانێ کە هەوڵ و تێکۆشان ئەکەن لە ئایەتەکانی ئێمەدا بەتەشەر دان و بەرگری و بەرپەرچ دانەوە. لە کاتێك دا کە خۆیان بە پەك خەر و بەرگری پێغەمبەرەکانمان ئەزانن. یان بە لە دەست دەرچوو لە دەسەڵات و سزای ئێمە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ﴾ ئا ئەوانە لە سزای دۆزەخ دا ئامادە کراو ئەبن، پشتیان بە هەرچی بەستبێ سوودی لێ وەرناگرن.**

**ئینجا یاسای پێشوو دووبارە ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بە خەڵکی ﴿إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم ڕۆزی زۆر و فراوان ئەکات بۆ هەرکەس لە بەندەکانی کە خوا بیەوێ و مەیلی ببێ، تەنگ و کەم و کورپشی ئەکات بۆ هەرکەس بیەوێ و مەیلی ببێ.**

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ئیستیسنای موتەسیلە، زۆر کەس ئەیکەن بە مونقەتیع، هەردوو هەر باشە و ڕێك و گونجاوە.

وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُواْ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمۖ بَلْ كَانُواْ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا

---

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥۖ﴾ هەر شتێك سەرف بكەن لە ڕێگای خوادا ئەوە خوا جێگای پڕ ئەكاتەوە و لە باتی ئەوە پاداشت ئەداتەوە ، ئیتر لەم جیهانەدا یان لەو جیهان، ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ خوا باشتری هەموو ڕۆزی دەرانە، چونكە هەركەس هەرچی بدات خوا پێ ی ئەدات.

ئینجا باسەكە دوایی ئەهێنێ بە خستنە پێش چاوی شێوەیان بە كۆكراوەیی لە ڕۆژی دوایی دا. ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾ باسی ڕۆژێ بكە كە خوا خۆ بەزل زانەكان و ژێر دەستەكان كۆ ئەكاتەوە هەموو پێكەوە ﴿جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ ئینجا ئەفەرموێ بە مەلائیكەكان ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُواْ يَعْبُدُونَ﴾ ئایا ئا ئەوانە ئێوەیان ئەپەرست لە دنیادا؟ واتە ئێوە فەرمانتان دا بەو پەرستنە و ڕازی بوون بەوە؟ ﴿قَالُواْ﴾ ئەوانیش ئەڵێن: ﴿سُبْحَٰنَكَ﴾ پاكی بۆ تۆ لە هەموو هاوبەش و لەكەیە و ئێمە تۆ بە پاك ڕائەگرین لەوە ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمۖ﴾ تەنیا تۆ خاوەن و كاربەدەست و خۆشەویستی ئێمەی و ئێمە خۆشەویستی و پەیوەندیمان لەگەڵ تۆیە بە بێ ئەوانە، ﴿بَلْ كَانُواْ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّۖ﴾ ئەوانە جنیان ئەپەرست. لەناو عەرەب دا باو بوو پەرستنی جنۆكە. یان مەبەست بە جن شەیتانە كە ئەو پەرستنە ناڕاستەی لەبەرچاو شیرین كردبوون. ﴿أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾ زۆربەی ئەو بت پەرستانە بڕوادار بوون بەو جنۆكە و شەیاتینانە.

ئینجا لەم كاتەدا كە شێوەكە خراوەتە بەرچاو، ڕووی فەرمودەكە وەرئەگێڕێ و ئاراستەیان ئەكات بە ڕەزیل كردن و دەم كوت كردنەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا﴾ ئینجا ئەمڕۆ هیچ كامتان خاوەنی هیچ سوود و زیان نین بۆ هیچ كامی ترتان، نە مەلائیكە خاوەنی هیچە بۆ خەڵكی نە كافرەكان هیچیان بەدەستە بۆ یەكتر.

وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ

﴿وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ ئەڵێین بەوانەی کە کافر بوون و جەور و ستەمیان کرد لە خۆیان ﴿ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ بچەژن سزای ئاگرێ کە ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، هاتنیتان بە درۆ ئەزانی. بەم هەڕەشە سامناکە باسەکەی دوایی پێ هێنا کە داڕێژرا بوو لەسەر مەسەلەی زیندوو کردنەوەو حیساب و پرسیار، بە وێنەی باس و گەردشەکانی تری سورەتەکە.

ئینجا لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا باسی بت پەرستەکان ئەکات، وتە ناشیرینەکانیان سەبارەت و پێغەمبەر(ﷺ) و تەمێ یان ئەکات و ئەیانترسێنێ بەو سزا سەختانەی کە دووچاری وێنەی ئەمان هات لە گەلە رابوردووەکان، کە ئەوان بەهێزتر و زانا تر و بە دەسەلات تر بوون لەمان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ کاتێ ئەخوێنرێتەوە بەسەر بێ بڕواکان دا ئایەتەکانی ئێمە لەکاتێك دا کە روون و ئاشکران و ئاین و ڕێگای راست روون ئەکەنەوە ﴿قَالُوا۟﴾ ئەوانە ئەڵێن ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ﴾ ئەمە – واتە محمد – هیچ نی یە جگە لەوە پیاوێکە ئەیەوێ بەرگریتان بکات لەوەی کە باوك و باپیرتان ئەیپەرست.

ئەو بەد بەختانە بەرامبەر ئەو ئایەتە راست و روونانەیان ئەکرد، بەو بیرو باوەڕە پڕو پووچە تاریکەی کە بۆیان بەجێ مابوو لە کۆنەوە، بەو لاسایی و شوێن کەوتنە کوێرانەی کە لەسەر بۆش دامەزرا بوو، بێگومان هەستیان ئەکرد بە گرنگی ئەوەی کە قورئان بۆی هێنا بوون، هەستیان ئەکرد بە بێ نرخی و بێ کەڵکی ئایینە بۆشەکەی خۆیان و ئەیانزانی ئەوەی ئەخوێنرێتەوە بەسەریان دا بە پڕو پووچەکەی خۆیان بەرگری ناکرێ، لەبەر ئەوە نەیان ویست بە پڕو پاگەندە و بەو جۆرە وتە ناڕاستانە بەرگری لێ بکەن. بەڵام تەنها ئەوە بەسی نی یە بڵێن دژ و پێچەوانەی ئایینی باو باپیرە، ئەوە شتێ نی یە هەموو کەس دڵنیا و دڵ ئارام بێن پێی. لەبەر ئەوە ویستیان خەڵکی دوو دڵ و دڵ کرمێن بکەن لە ئاستی ئەو ئایینەی کە پێ یان رائەگەیەنرێ،

﴿وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾﴾

وەکو ئەفەرموێ ﴿وَقَالُوا۟﴾ وتیان: ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى﴾ ئەم قورئانە هیچ شتێك نی یە جگە لەوە وتارێکی درۆ و ناڕاستە و دەست هەڵبەست کراوە بەدەم خواوە. ئەوەیان وت تا هەر لە یەکەم جارەوە خەڵکی بەد گومان بکەن لە نرخی دا، کاتێ کە گومانیان خستە سەرچاوەکەی. بێگومان ئەو قورئانە کاری ئەکرد لەدڵ و دەروونیان، سەرسامی کردبوون، کەواتە تەنها ئەوە بەس نی یە بڵێن درۆ و هەڵبەستە، لەبەر ئەوە ویستیان هۆی کار کردن و زاڵی یەکەی بەسەر دەروون دا بە شتێ باس بکەن کە بچێتە دڵەوە. بەم رەنگە بڵێن جادووە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ﴾ ئەوانەی کە کافر و بێ بڕوا بوون دەربارەی ئەو قورئانە حەق و راستە کاتێ بۆیان هات وتیان: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەمە هیچ نی یە جگە لەوە جادوویەکە ئاشکرا و روونە جادوویەتی یەکەی.

ئەمانە زنجیرەیە بوون لە پڕوپاگەندە و لەکەدار کردن، هەڵقە لە دوای هەڵقە، بەرەنگاری ئەو ئایەتە روونانەیان پێ ئەکرد بۆ ئەمەی ببن بە پەردە و بەرهەڵست لە نێوان ئەو ئایەتانە و دڵی خەڵکی دا، هیچ نیشانە و بەڵگەیەکیان نەبوو لەسەر راستی ئەو قسە و وتە ناڕاستەیان، بەڵام ئەوانە کۆمەڵە درۆیەك بوون هەڵسان پێی بۆ گومڕا کردن و سەر لێ شێوانی کوێر و جەماوەر، ئەوانەی کە هەڵسان بەو پڕو پاگەندە و فاك و فیکە – کە سەرۆك و گەورەکان بوون – بەباش ئەیانزانی کە ئەمە قورئانێکی بەرێزە، لە دەسەڵات و توانای خەڵکی بەدەرە!! لەمەو پێش لە چەند شوێنێك دا باسی ئەوەمان کرد کە ئەو گەورە و سەرۆکانە ئەیان وت لەناو خۆیان دا سەبارەت بە قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) لەناو خۆیان دا دانیان ئەنا بە راستی قورئان و پێغەمبەردا(ﷺ) هەموو ئەم فڕ و فێڵ و فاك و فیکەیان هەر بۆ ئەوە بوو کە بەرگری خەڵك بکەن لەم قورئانە و باوەڕ پێ هێنانی. جا قورئان ئەوا کاروباریان دەرئەخات و روونی ئەکاتەوە کە ئەوانە نەخوێندەوار بوون و لەمەوبەر کتێبیان بۆ نەهاتووە کە کتێبی تری پێ بەراورد بکەن. بەهۆی ئەوەوە سروشی خوا جۆی بکەنەوە لە دەست هەڵبەست، تا بەهۆی ئەوەوە بڕیار دەرکەن کە ئەمەی بۆیان هات، کتێب و سروشی خوا نی یە، لەمەوبەر پێغەمبەرێ تریان بۆ نەهاتووە، کەواتە شتێ ئەڵێن کە زانا نین پێی.

وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن
قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُواْ رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم
بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا﴾ [1] ئەوانە لەمەوبەر پێمان نەداون چەند كتێبێ كە بیانخوێنن ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ﴾ رەوانەمان نەكردووە بۆ لایان لە پێش تۆ هیچ ترسێنەرێك تا بەهۆی ئەوانە ئاین و سروشی خوا و پێغەمبەری خوا بناسن و جوێ یان بكەنەوە لە دەست هەڵبەست و دەلەسە كەران. ئینجا ئەم هەڕەشەیان لێ ئەكات: ﴿وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئەوانەی كە لە پێش ئەمان بوون بە درۆیان دەرهێنا ﴿وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾ ئەمانە نەگەیشتبوونە دەیەكی ئەوەی دامان بەو پێشووانە لە هێز و سامان و دارایی و دەسەلاّت و تەمەنی درێژ ﴿فَكَذَّبُواْ رُسُلِى﴾ ئینجا ئەوانە پێغەمبەرەكانی منیان بە درۆزن دانا و بڕوایان پێ نەهێنان ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ ئینجا ئایا چۆن بوو ئینكاری من بۆ ئەوان؟ واتە كاتێ ئەوانە بڕوایان نەهێنا بە پێغەمبەرەكانی من ئینكار و بەرامبەری من بۆ ئەوان بەو جۆرە بوو كە لەناوم بردن و بەربادم كردن. قورەیش جێ و شوێنەكانی هەندێ لەوانەیان ئەزانی كە لە نیوە دورگەدا بوون. كەواتە ئەم تەمێ و مۆچیاری یە بەسە، ئەم پرسیارە كە مەبەست لاقرتی پێ كردنیانە، تەقە ئەدا لە دڵیان، لەكاتێك دا كە ئەزانن ئەوانە چی یان بەسەر هات!!**

**ئینجا لێرەدا بانگیان لێ ئەكات بە بانگ كردنێكی پاك و خاوێن بۆ رێگا و بەرنامەی بەدوا گەڕان و لێكۆڵینەوە لە حەق و راستی، ناسینی درۆ و دەلەسە لە راست و راستی، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان: ﴿إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ﴾ من ئامۆژگاری و**

---

[1] ئەم ئایەتە مەبەستی تریشی بۆ باس كراوە، ئەویش هەر ئەگونجێ و جوانە بەلاّم لەم كاتەدا ئەم مەبەستە و ئەم جۆرەم هەڵبژارد كە لە تەفسیرەكەدا وتم و یەك شتن.

ڕێنموونیتان ناکەم بە تەنیا شتێ نەبێ کە ئەوەش ئەمەیە: ﴿أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ﴾ هەڵسن و ڕاپەڕن و تێکۆشان بکەن بە پاك و خاوێنی لەبەر خوا و ڕەزامەندی خوا ﴿مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ﴾ بە دوو دوو یەکە یەکە. واتە کۆمەڵ و قەرەباڵغ مەکەن کە هۆی پەرت و بڵاوی هۆش و دەروونە و تێکەڵ و پێکەڵی قسە و گفتوگۆیە، بەڵکو دوو دوو بن یان پێکەوە بکۆڵنەوە و بەراورد بکەن بە قسە و مەبەستەکانتان.. بە یەکە یەکەش خۆتان لەگەڵ خۆتان بۆ ئەمەی بە ئارام و لەسەرخۆ لە دەروونی خۆتان دا بکۆڵنەوە، ئەمە بانگ کردنێکی پاك و خاوێنە، دوور لە ئارەزوو و هەوای نەفس، دوور لە بەرژەوەندی. دوور لە هەموو شت و مەکی ئەم زەوی یە، دوور لە هەموو پاڵ پێوە نەرێکی تر جگە لە ڕاستی لەگەڵ خوادا، تا بەهۆی ئەوەوە دوور بکەوێتەوە لە خوا. بانگ کردنەکە بۆ شتێکی سووك و ئاسان و ڕێك لەگەڵ سروشت و تێگەیشتنی دڵ.ڕاپەڕین و تێکۆشان تەنها بۆ خوا ﴿ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ﴾ ئینجا بیر بکەنەوە و تێفکرێن لەکاری محمد و ئەو ئایینەی بۆی هێناون، تا بەباشی تێ بگەن و شتەکە لە رووی ڕاستی یەوە بزانن، واتە پەلە مەکەن و لە خۆتانەوە بە بێ بیر کردنەوەو ورد بوونەوە باری عیناد و سەرکێشی مەدەنە بەر، بەڵکو بە دڵێکی پاك بە شوێنی حەق و ڕاستی دا بکەڕێن.. ﴿مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ هاوڕێکەتان – واتە محمد کە لەگەڵی ژیاون و باش ئەیناسن – بە هیچ ڕەنگ شێتی نی یە و دووچاری شێتی نەبووە، خۆتان باش ئەیناسن و بەناوبانگە لەناوتان دا بە ژیریی و بیرو هۆشی بەهێز. کەواتە ئەبێ ڕاست بکات لەمەی پێتان ڕائەگەیەنێ. واتە ئەم قسە و داوایانە کە محمد ئەیکات زۆر گەورەیە و گەورەترە لە داوای پادشایەتی و هەموو پایە و پلەیەکی بەرز لەم جیهانەدا. کەواتە یان ئەبێت شێت بێت و بە هەوا و کەڵکەڵەی شێتی ئەمە ئەڵێت و دەربەستی ئابڕوو چوون نی یە، یان ئەبێ ڕاست بکات و پشت پڕ بێت لە ڕاستی خۆی و لە ڕابەر و بەڵگەی بەهێز لەسەر ڕاستی یەکەی، خۆ ئاشکرایە خۆیشتان ئەزانن کە دوورە لە شێتی یەوە و ئەوەی ڕائەگەیەنێ ڕێك و پێکە لەگەڵ ژیریی و سروشت دا،

إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾

**کەواتە ئەبێ بەم جۆرە بێت کە ئەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ محمد هیچ نی یە جگە لەوەی ترسێنەرە بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزایەکی بەتین و بە سۆ، کە سزای سەختی رۆژی دوایی یە، خەڵکی ئەترسێنێ بۆ ئەمەی هەرکەس گوێی بۆ بگرن و گوێ رایەڵ بێت، رزگار ببێ لەو سزا بەتینە. بە وێنەی جاڕ دەرێ کە خەڵکی ئاگادار ئەکاتەوە لە ئاگر و حەریقێ ئەگەر نەچن بەسەر دەمیەوە وڵاتەکە ئەسوتێنێ.**

**ئیمامی ئەحمەد – خوای لێ رازی بێت – حەدیسێ ئەهێنێ کەلە عبدالله ی کوڕی بەریرەوە هاتووە و ئەویش لە باوکی یەوە کە ئەفەرموێ: رۆژێ پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ناومان و سێ جار جاڕی دا و بانگی لێ کردین: ئەی خەڵکینە ئەزانن وێنەی من و ئێوە چی یە؟ ئەوانیش وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی خوا باش ئەزانن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: وێنەی من و ئێوە وەکو گەل و کۆمەڵێکە بترسن لە دوژمنێ بێتە سەریان. ئینجا پیاوێ بنێرن هەواڵیان بۆ بزانێ، ئینجا ئەو پیاوە دوژمنەکەی بەدی بکات، ئینجا پەلامار بدا و روویان تێ بکات بۆ ئەمەی بیانترسێنێ، بەهۆی ئەوە لە دوورەوە بە جل و بەرگەکەی دەست نیشانیان بۆ بکات، پلێ خەڵکینە ئەوا درا بەسەرتان داو دوژمن هات...**

**ئینجا ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بلێ: ﴿مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾ هەر کرێ و ئەجرێکم داوا کرد لێتان لەسەر ئەم پەیام و راگەیاندنە ئەوە بۆ ئێوە. لە یەکەم جارەوە بانگی کردن بۆ بیر کردنەوەیەکی پاك و لەسەرخۆ.. کە هاوڕێکەیان شێتی نی یە... لێرەدا بانگیان ئەکات کە بیر بکەنەوە و پرسیار بکەن لە خۆیان لەبارەی ئەوەی پاڵ ئەنێ پێ یەوە بۆ هەڵسانی بەو ترساندن و راگەیاندنە. ئایا بەرژەوەندی لەوەدا چی بێ؟ ئایا ئەبێ قازانج و دەست کەوتی لەوەدا چی بێ؟ ئەوەتا ئەڵێ هەرکرێ و دەست کەوتێکم ببێ هەمووی بۆ ئێوە و من هیچم ناوێ، واتە داوای هیچتان لێ ناکەم ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ ئەجرو کرێی من لەسەر هیچ کەس نی یە بێجگە لەسەر خوا... ئەو ئەم فەرمانەی پێ سپاردووم، ئەو ئەجرو پاداشتم ئەداتەوە، ئەجرو پاداشتەکەی ئەوەیە کە من چاوەڕوانی ئەکەم لەلای ئەو. هەرکەس چاوەڕوانی لای خوا بێت هەموو شتێکی بەلاوە بێ نرخ و لەڕ و لاوازە. ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا، ئەو ئەزانێ و ئەبینێ و هیچی لێ شاراوە و پۆشیدە نی یە، ئەو ئەزانێ و ئەبینێ من چی ئەکەم؟ چی ئەڵێم؟ نیازم چی یە؟**

﴿قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿٤٨﴾ قُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَمَا يُبۡدِئُ ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلۡ إِن
ضَلَلۡتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِيۖ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٞ قَرِيبٞ ﴿٥٠﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ
فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٥١﴾

ئینجا توند و تیژی بەکار ئەهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ بڵێ: ﴿إِنَّ رَبِّي يَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ﴾ [1] بەڕاستی پەروەردگارم بەهێز و بە توندی بە حەق ئەدا لە بەتاڵ و ناحەق، واتە ئەوەی من بۆم هێناون حەق و راستە. حەق و راستێکە کە خوا ئەیوەشێنێ و ئەیدا لە بەتاڵ و ناڕاست، جا ئایا کێ خۆی پێ ئەگیرێ بۆ ئەو حەق و راستی یەی کە خوا لێدان و دەست وەشاندنی پێ ئەکات؟ شێوەی فەرمودەکەی زۆر سەیر و سەرنج راکێشە. وەکو ئەو حەق و ئایینە راستە بۆمبا و قازیفەیە بێت بدا بەسەر تەوقی سەری بەتاڵ و ناحەق دا پارە پارەی بکات... ئەو خوایە بەم حەقە ئەدا بە بەتاڵ، ﴿عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾ ئەو پەڕی رادە زانایە بە هەموو غەیب و شاراوەکان. کەواتە بە زانینەوە ئەیوەشێنێ، بە زانینەوە ئاراستەی ئەکات، نیشانەکەی لێ ناگۆڕێ و شاراوە نابێ، لە مەبەست و ویستی خۆی تێپەڕ ناکات، هیچ بەرگر و بەرهەڵست و رێگرێ ناتوانێ بوەستێ وخۆی بۆناگیرێ لە ئاستی ئەو حەقەی خوا ئەیوەشێنێ و قەزفی پێ ئەکات.

ئینجا بە توند و تیژیی ئەمەش ئاراستە ئەکات: ﴿قُلۡ﴾ بڵێ ﴿جَآءَ ٱلۡحَقُّ﴾ حەق هات و ﴿وَمَا يُبۡدِئُ ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ بەتاڵ نامێنێ و ئەڕوا و دوایی دێت، بەجۆرێ هیچ کردەوە و دروشمێ نامێنێ. حەق هات لە شێوەیەك لە شێوەکانی دا، لە دواترین پەیامیدا، لە قورئانەکەی دا، لە بەرنامە راستەکەی دا ئەم جارە بدە، ئەم بڕیارە بە روونی بڵێ. ئەم رووداوە گرنگە روون کەرەوە، ئەم هەواڵە بە رێکی و بە بێ پێچ و پەنا بدە، حەق هات بە هێزو توانایەوە، هات بە راپەڕین و پەلاماردانی یەوە، هات بە سەرکەوتن و بەرزی و دەسەڵاتی یەوە، بەتاڵیش رۆیی و گیانی تیا نەما.

---

[1] ئەم ئایەتە بە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە. ئەویش هەر رێك و جوانە.

بەڕاستی ئەمە شتێکی ڕاست دەرچوو و بەدی هات، چونکە لە کاتێکەوە قورئان هات بەرنامەی هەق دامەزراو جێگیر بوو و ڕوون بووەوە، بەتاڵ هیچی بۆ نەمایەوە بێجگە لە دەمەدەمێ و فێڵ و تەڵەکە بەرامبەر حەق کە ڕوون و ڕەوان و بێ گرێ یە، هەرچەند بە ڕواڵەت سەرکەوتن و زاڵ بوون بووبێ و ببێ بۆ بەتاڵ لە هەندێ چەرخ و کات و بەسەرهات دا، بەڵام زاڵ بوون و سەرکەوتن نەبووە و نابێ بەسەر حەق دا، بەڵکو سەرکەوتن و زاڵ بوونە بەسەر ئەوانەی کە خۆیان بە ئەهلی حەق دائەنێن، زاڵ بوون و سەرکەوتن بەسەر خەڵك دا نەك بەسەر بیرو باوەڕدا. ئەوەش شتێکی کاتی و وەختی یە و لەپاشان ئەبێ هەر بڕوا و نەمێنێ، بەڵام حەق هەر هەیە بە ڕوون و ڕەوانی و تا بێت ڕوون تر ئەبێتەوەو ناسراو تر و خۆشەویست تر و وەرگیراو تر ئەبێت. ئینجا دواترین شت کە ئاراستەی ئەکات لێرەدا ئەمەیە: ﴿ قُلْ ﴾ بلێ: ﴿إِن ضَلَلْتُ ﴾ ئەگەر من لابدەم لە حەق و گومڕا ببم ﴿فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِيٓ ﴾ ئەوە بە دژ و زیانی خۆم لائەدەم و گومڕا ئەبم و ئێوە هیچ زیانێ ناکەن ﴿وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓ ﴾ ئەگەر ڕێنموونی وەرگرم و ڕێگای حەق بدەمە بەر ئەوە بەهۆی ئەوەیە کەخوای پەروەردگارم سروشم بۆ ئەکات. خوا ئەوەم بۆ ئەکات و من خاوەنی هیچ شتێك نیم بۆ خۆم مەگەر بە ئیزن و ویستی ئەو، من وام لە ژێر ویست و مەیلی ئەودا و دیل و بەندەی لوتفی ئەوم. ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴾ بەڕاستی ئەو بیسەر و نزیکە، کەواتە وتە و کردەوەی هیچ کەسی لێ ون نابێ، دەی لە جێ یە پێغەمبەر(ﷺ) وابێ ئەبێ خەڵکی تر چاکتر بەو جۆرە بێت، بەڕاستی بە تەواوی دەمی بێ بڕواکانی بەست، ئەگەر فامدار و تێگەیشتوو بن.

ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەمێنێ بە نیشاندان و خستنە پێش چاوی شێوەیەك لە شێوەکانی ڕۆژی دوایی. ئەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەگەر ئەبینی ئەو کاتە کە ئەوانە دائەچڵەکێن و بێ ئارام ئەبن لە کاتی مردن دا، یان لە ڕۆژی دوایی دا لە کاتی بینینی بەسەرهات و شتە سامناکەکاندا. ئەگەر ئەوە ئەبینێ بە ڕاستی شتێکی زۆر گەورە ئەبینێ، کە جێگای سەر سوڕمانە. ﴿فَلَا فَوْتَ ﴾ کەوا ڕزگار بوون و قووتار بوون و لە دەست دەرچوون نی یە ﴿وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴾ ئەگیرێن لە شوێنێکی نزیکەوە، لەسەر پشتی زەوی بۆ ناو سکی، یان لە شوێنی ڕاوەستانیان بۆ ناو دۆزەخ،

وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ
وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن
قَبۡلُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ فِي شَكّٖ مُّرِيبِۭ ﴿٥٤﴾

﴿وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ لەو كاتەدا ئەڵێن ئەوا باوەڕمان هێنا پێ ی – واتە بە محمد – ئەوە ئەڵێن لە پاش ئەوەی کاتی نەماو هەل و فرسەتیان لە دەست دەرچوو ﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ﴾ لە کوێ دەستیان ئەکەوێ و بۆیان ئەکرێ بە ئاسانی وەرگرتنی بڕوا هێنان لە شوێنێکی دوورەوە، شوێنی بڕوا هێنان ئەم جیهانەیە کە نەماو ئەوانە وان لەو جیهان و دوورکەوتونە لە جێگا و شوێنی بڕوا هێنان، ﴿وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ﴾ ئەوانە لەوەو پێش لەم جیهانەدا کافر بوون پێ ی و بڕوایان پێ ی نەبوو. ﴿وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ﴾ لە خۆیانەوە دەمیان ئەکوتا لە شتی غەیب و شاراوە لە شوێنێکی دوورەوە؟. واتە ئەوانە لەم جیهانەدا بڕوایان نەبوو بە ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژەش شتێکی غەیب و شاراوە بوو، هیچ بەڵگە و ڕابەرێکیان نەبوو لەسەر بێ بڕوایی و ئینکاری یەکەیان، بەڵکو هەر لە دوورەوە دەمیان ئەکوتا لە خۆیانەوە، لەو ڕۆژەدا ئەیانەوێ و خەریکن باوەڕ بهێنن لەو شوێنەوە کە دوورە لە شوێنی باوەڕهێنان، ﴿وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ﴾ بەرگری ئەخرێتە نێوان ئەوان و ئەوەی ئەوان ئارەزووی ئەکەن، کە بریتی یە لە بڕوا هێنان لە کاتێك دا کە کاتی خۆی نی یە، قوتار بوون لەو سزای کە ئەیبینن، ڕزگار بوون لەو خەتەرە گەورەی کە ڕوویان تێ ئەکات، واتە ئەوەی ئاواتی بۆ ئەخوازن و داوای ئەکەن بۆیان نابێ ﴿كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن قَبۡلُۚ﴾ هەرچۆنێ بەو جۆرە کرا دەربارەی وێنەکانیان لەوەو پێش... لەوانەی کە خوا قاری لێ گرتن و سزای سەختی خوایان هاتە سەر و ئینجا داوای ڕزگار بوونیان کرد لەپاش ئەوەی کار

لــەكارەگا تــرازا. ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ﴾ چــونكە ئەوانــە لــە گومــان دا بــوون لــەوەی پێغەمبـەرەكانیان هـەواڵیان پـێ دان، گومـانێكی بـێ ئـارام كـەر. بـە جـۆرێ دڵیـان دانەمـەزرا لەسەر ئەوەی پێ یان راگەیاندن...

لەكاتی خۆی بڕوایان نەهێنا و دڵ ئارام نەبوون بەو حەق و راستەی پێ یان راگەیەنرا تا بە جوانی بەدی هات و بینییان ئەو كاتە بە بێگومـان بڕوایان هێنا، بەڵام تازە بەوان چی و شتەكە لە دەست چوو.

ئا بەم جۆرە سورەتەكە كۆتایی پـێ هێنـرا بەم شتە راستانە كە بەهێز و توند و تیژیی ئاراستە كران. كۆتایی پێ هێنرا بە شێوەیەك لە شێوە سامناكەكانی رۆژی دوایی، مەسەلەی زیندوو كردنەوە و پاداشت و تۆڵەی خستە بەرچاو كە لـەم سـورەتەدا زۆر بە گـرنگ و توند گرتی. سورەتەكە بەوە دەستی پێ كرد و بەوەش كۆتایی پێ هێنرا.

لە خوا داواكارین دڵ و دەروونمان تەمێ وەرگرێ و پـڕ ببێ لـە فـەڕ و پـیتی ئـەم قورئانـە پیرۆزە.

**كۆتـایی هات لە رۆژی سێ شەممە ١٠ شەعبانی ١٤٠٢ ی كۆچی بەرامبەر ١ ی ٦ ی ١٩٨٢ ی میلادی.**

**خوا بە بەزەیی خۆی وەری گرێ و یارمەتی بدات و یار بێ بۆ داهاتوو كە ئەم تەفسیرەمان پێ تەواو بكات.**

# سوورەتی (فاطر)
## مەككەیی یە و ٤٥ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە شێوە و رەوشتێكی تایبەتی هەیە لە مەبەست و هۆنینەوەی دا نزیك ترە لە سورەتی ﴿الرعد﴾ەوە ئەمیش وەكو ئەو لە سەرەتاوە تا دوایی چەند شتێ ئەخاتە دڵ و دەروونەوە، هەموو كاریگەرە و راوەستێنەر و وریا كەرەوەن، بێدار كەرەوەن لە خەوی بێ هۆشی و بێ ئاگایی بۆ ئەمەی بیر بكرێتەوە لە گەورەیی و گرنگی و شیرینی ئەم بوون و بوونەوەرە، بیر بكرێتەوە لە رابەر و نیشانە روونەكانی خوا كە بە زۆری پرژ و بڵاو بووەتەوە لەناو ئەم بوونەوەرەدا و بیر بكرێتەوە لە هەموو بەهرە و چاكە گرنگەكانی خوا، هەست بكرێ بە بەزەیی و چاودێری و سەرپەرشتی خوا بۆ بەندەكانی، بێ ئەوەی بهێنرێتە بەرچاو لەناو چوون و لە ریشە هێنانی ئەو گەل و تاقمە رابردووانە و شێوە و باری رۆژی دوایی یان، بۆ ئەمەی بیم و سام و مل كەچی لە دڵ دا جێگیر ببێ بۆ خوا لە كاتێك دا كە رووبەڕوو بكرێ لەگەڵ كرداری نایابی خوادا، بەرهەم و جێگە دەستی قودرەتی لە شاراوە و پێچراوەكانی بوونەوەر و لە ناخ و بێخی دەروون و لە ژیانی ئادەمی و لە رووداوەكانی مێژوو. لەكاتێك دا كە ئەبینێ حەق و راستی و یەكێتی یاسا و رژێم، یەكێتی ئەو دەستە قودرەتەی كە داهێنەر و بەهێز و دەسەڵات دارە بە بێ سنوور... ئەمانەش هەموو ئاراستە ئەكات و ئەیان گەیەنێ بە شێوە رەوشتێ كە هەر دڵێ زیندووبێت خۆی بۆ راگیر ناكرێ لە ئاستیان.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ

ئینجا با گویْ بگرین بۆ قورئانی بەفەڕ ئەم هەموو مەبەست و شتە نایابەمان بدا بە گوێچکەدا. قاپی سورەتەکە ئەکاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾. هەموو وەسف و سوپاس و سەنایەك بۆ خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە. دەست پیْ ئەکات بە پێشکەش کردنی ئەم سوپاس و سەنا گرنگە، کەواتە هەر لە یەکەم جارەوە تەمیْ و رووکردنی دڵە بۆلای خوا، بێدار کردنەوەیەتی بۆ سەرنج دان و بینینی چاکە و بەهرەکانی، هەست پیْ کردنە بە بەخشین و بەزەیی یەکەی، ئینجا بە دوای سوپاسەکەدا باسی سیفەتێکی ئەکات کە بەرهەمی ئەو بەزەیی یە بیْ سنوورەیەتی و کانی ئەو هەموو چاکە و بەهرەیە. ئەفەرمویْ: ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ کە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە لە نەبوون و بەبیْ پێشکەوتنی وێنە. ئەو خوایە داهێنەری ئەم بوونەوەرە گرنگەیە کە لە هەر لایەك بین هەندیْ لەو دروست کراوانە ئەبینین بەلای سەروومانەوە و هەندیْ بەلای خواروو لە ژێر پێمان دا، کە هیچیْ لەوانە ناناسین و کەمیْ ئەبیْ لە بچووك تر و نزیك تر لێمانەوە.... ئەم زەوی یەی کە دایکمانە و لەو دەرهاتووین.

ئەم بوونەوەرە پان و فراوان و گەورەیەی کە بە رژێم و یاسایەك هۆنراوەتەوە یەك خراوە زۆر بە رێکی و رێك کەوتوویی هەموو بەش و پارچەکانی، لەگەڵ ئەو هەموو دووری و جیاوازی یەی کە هەیە لە نێوانیان دا تا رادەیەك بیر وخەیاڵیشمان پێیدا ناگات زۆر بە زەحمەت نەبیْ، لەگەڵ ئەو گەورەیی و دووری ئاسمان و جێگا و خولگەکانیان چەند شتی نهێنی هۆی یەك کەوتن و یەکگرتن و کۆمەکی هەیە لە نێوان دا، ئەگەر بچووك ترین رادەیان بگۆڕیْ یان تێك بچیْ و لەسەرباری خۆی نەمێنیْ، بە جاریْ هەموو تێك ئەشێویْ بە مل یەك دا!! ئێمە تێپەڕ ئەکەین بەلای ئەو هەموو دەست نیشان کردنانە لە قورئانی بەفەڕدا، کە

ئەیانكات بۆ ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی وا لە نێوانیان دا، تێپەڕ ئەكەین بە بێ ئەمەی بوەستین بە درێژیی و بیر بكەینەوە لەو مەبەستە گرنگەی كە دەست نیشانی بۆ كراوە و سەرنجی بۆ راكێشراوە، هەرچۆنێ شەو و رۆژ سەرنجی ئەدەین و بە چاوی سەر تەماشای ئەم هەموو شتە نایابە ئەكەین لە ئاسمان و بەلای سەرومان و لە زەوی دا. هەمیشە سەرنج ئەدەین بەلام بە بێ هۆش و بیر كردنەوە بەڵكو بەم كەودەنی یە كە هەمانە. ئەوەش بە هۆی ئەوەیە كە هەست و ژیرییمان كەودەنە بەهۆی دووری لە یادی خوا، كەواتە دیتنی ئەو شتە گرنگانە بێدارمان ناكاتەوە بە وێنەی ئەو دڵانەی كە پەیوەستن بە یادی خواوە. هەروەها ئولفەت و دەق گرتن پێ یانەوە ئەو گرنگی یەكەم جارە ناهێڵێ. كەواتە پێویستین بەم هەموو بێدار كردن و وریا كردنەوە.

هەر دڵێ كە كراوە و تێگەیشتوو بێت و پەیوەست بێت بە یادی خواوە پێویست نی یە خوێندەوار و زانا بێت بە شێوەیەكی ورد بەجێ و شوێنی ئەستێرەكان، بە قەبارە و رادەیان، بە رێگا و گەردش و خولانەوەیان لە خولگەكانیان دا، بە پەیوەندی نێوانیان لە قەبارە و بزووتنەوەیان دا... نەخێر دڵی كراوەی تێگەیشتووی پەیوەست بە خواوە بە زانینێكی ئاوا ورد، سەرنج دانی ئەم دەزگایە بە چاوی رووت بەم شێوەی سادەیە بەسە. بەسە بۆ دیتنی شێوەی شیرین و دڵ رفێنی ئەو هەموو ئەستێرە لە شەوێكی تاریكی بێ تەم و هەوردا كە پرژ و بڵاو بووەتەوە بەو لای سەرووەدا. بەسە بۆ شێوەی شیرینی مانگ و رووناكی یەكەی لە شەوێكی مانگەشەودا. بەسە بۆی پەیدا بوون و هەڵقوڵانی رووناكی رۆژ بوونەوە لە تاریكی شەو. بەڵكو بەسە بۆی سەرنج دانی ئەم زەوی یە و ئەو هەموو شتە سەر سوڕ هێنەرەی كە تیایەتی و دوایی نایەت و ناژمێررێ و دەستە ناكرێ بۆ هیچ گەڕۆكێ كە هەموو ژیان و تەمەنی بەخت بكات لە گەڕان و سەرنج دان و وەرگرتن دا، بەڵكو بەسیەتی تەنیا گوڵێ كە بیر كردنەوە و تێفكران لە شێوەی داڕشتنی رەنگ و بۆیە و رێك و پێك كردنی...

جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجْنِحَةٖ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ ١ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٖ فَلَا مُمْسِكَ لَهَاۖ

**قورئانی بەفەڕ ئەو دەست نیشانانە ئەكات بۆ بیر كردنەوە لەو هەموو دروست كراوانە... گەورە و بچووكی و ورد و درشتی... بەسە بۆ دڵی كراوەی هۆشدار تەنیا یەكێ لەو دەست نیشان بۆ كراوانە بۆ هەست كردن و ئاگادار بوون بە گەورەیی داهێنەری، روو تێ كردنی بە پەرستن و سوپاس و وەسف و سەناو لالأنەوە لێ ی، هەموو سوپاس و وەسف و سەنایە بۆ ئەو خوای داهێنەرە كە ﴿جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا﴾ گێڕەری مەلائیكەیە بە فروستادە لە نێوان خۆی و پێغەمبەرەكانی پەیامی خۆی راگەیەنن پێ یان بە وەحی و سروش. هەروەها فروستادە لە نێوان خۆی و بەندە چاكەكانی تری بەخستنی نیازی چاك بۆ دەروونیان و هاندانیان بۆ كردەوەی چاك و نیشاندانی شتی چاك لە خەودا بەخەو بینین.**

**قسە و باس لەم سورەتە ئەخولێتەوە بە دەوری پێغەمبەران و وەحی و سروش ناردنە خوارەوەی شتی حەق و راست بۆ سەر زەوی.. مەلائیكە فروستادەی خوان بە سروش و وەحی كردن بۆلای بەندە هەڵبژێرراوەكانی خوا. بێگومان ئەو فروستادەیی یە گەورەترین و بە نرخ ترین شتە. جا بەهۆی ئەوەوە باسی مەلائیكە ئەكات بەو سیفەتی فروستادەیی یە لەپاش باسی دروست كردنی ئاسمانەكان و زەوی، مەلائیكە هۆی پەیوەندی و پەیوەستی نێوان ئاسمان و زەوین. ئەوان هەڵئەستن بە گەورەترین و بە نرخ ترین كارو فرمان لە نێوان داهێنەری ئاسمانەكان و زەوی و پێغەمبەر و رەوانە كراوەكانی بۆ سەر خەڵك، ئەوەی ئەو مەلائیكەتانە ئەیهێنن بۆ بەندەكانی خوا گەورەترین چاكە و بەهرەی خوایە بەسەر بەندەكانی یەوە و سوپاسی خوا ئێجگار شایان و بەجێ یە لەسەر ئەو چاكە و بەهرە گەورەیە.**

**باسی مەلائیكە زۆر لە قورئان دا هاتووە، لە چەند ئایەتێك دا هەندێ سیفەت و نیشانەیان باس كراوە لەبارەی سروشت و كار و فرمانیانەوە. بەڵام لێرەدا شتێك ئەفەرموێ جیاواز لەوانەی وتراون، شتێ ئەفەرموێ كە تایبەتی یە بە پێك هێنانی خۆیان و لەشیانەوە،**

ئەفەرموێ: ﴿أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ﴾ گێڕەری مەلائیکەیە بە فروستادەیەك کە خاوەنی باڵن ﴿مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ﴾ دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار. ئەمەش سیفەتێکە دیاریی یان ناکات و نایانناسێنێ بە ئێمە، چونکە ئێمە نازانین ئەوان چۆنن و ئەو باڵانەیان چۆنە، ئێمە ناتوانین هیچ بڵێین لە خۆمانەوە بەڵکو ئەبێ لەم سنوورەدا بوەستین بە بێ ئەمەی شێوەیەکی تایبەتی و دیاریی یان بۆ دابنێین. هەروەها ئەوەی لە حەدیس دا هاتووە و لە قورئانیشەوە وەرئەگیرێ کە پێغەمبەر(ﷺ) دوو جار جوبرەئیلی لە شێوەکەی خۆیدا بینی، لە ریوایەتێکی حەدیسەکەدا ئەفەرموێ: جوبرەئیلی بینی شەش سەد باڵی هەبوو، ئەمانەش شێوە و شکڵی بۆ ئێمە دیاریی ناکات. کەواتە شتەکە بۆ ئێمە نادیاریی یە و با لە خۆمانەوە هیچ نەڵێین. زانینی ئەم شتە نادیاریی یانە لای خوایە و لە هەر ئەندازێکی پێغەمبەرانی حاڵی کردبێ کردوویەتی و هەرچی تر حاڵی نەکردبن، ئەوانیش لە خۆیانەوە نایزانن. بەڵێ لەبارەی ئەم باڵانەوە ئەمە وتراوە کە دەست نیشانە بە جیاوازی رادەی پایە و پلەی مەلائیکە، ئەوەی باڵێ زۆر تر بێت بەهێزتر و بەرز ترە زیاتر دەسەڵات دار ترە بەسەر بەجێ هێنانی کارو فرمانی دا.

ئینجا بەبۆنەی باسی ئەم باڵانەوە، کە ئێمە نەماندیوە و نازانین بێجگە لە شێوەی دوو باڵ بۆ پەلەوەر، بەو بۆنەوە ئەفەرموێ: ﴿يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ﴾ خوا لە دروست کردندا زیاد ئەکات هەرچی خۆی بیەوێ و مەیلی بکات.. کەواتە ویست و خواهیشی بێ سنوورە و بەرگری و بەستنەوە و وەستاندن نابێ و ناگونجێ بۆ ویست و خواهیشی خوا لە هیچ جۆر و شێوەیەك لە شێوەکانی دروست کردندا، ئەوەی ئێمە ئەیزانین و ئەیناسین نایەتە ژمارە بۆمان لەو هەموو شێوە دروست کردنانە، بێگومان ئەوەی نایزانین و نایناسین زۆر زۆر ترە، خوا چۆن مەیلی ببێ ئەیکات، چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ بەڕاستی خوا توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك دا. ئینجا شێوەیەك لە شێوەکانی توانا و دەسەڵاتی خوا ئەخاتە بەرچاو و ئەفەرموێ: ﴿مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ﴾ هەر چاکە و بەهرەیەك خوا بەرەڵای بکات و بینێرێ بۆ خەڵکی و هەر رەحمەت و بەزەیی یەکی خۆی دەربارەی هەرکەس بکات لە هەر روویەکەوە و بە هیچ کلۆج هیچ راگیر کەر و بەرگری کەرێ نی یە بۆی،

﴿وَمَا يُمْسِكْ﴾ هەرشتێك بگرێ و بەرەڵای نەکات ﴿فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ﴾ هیچ نێرەر و بەرەڵاکەرێ نی یە بۆی ﴿مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ لەپاش راگیر کردنەکەی خوا ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ تەنها خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و لێزان و کاردروستە و هەموو شتی بەجێ یە. ئەوەی ئەم ئایەتە ئەیگەیەنێ هەرکات دامەزرێ و جێگیر ببێ لە هەر دڵێك دا گۆڕانێکی تەواو رووی تێ ئەکات لە هەموو بار و روویەکەوە. بێگومان ئەیپچڕێ لە هەموو هێز و دەسەڵاتێ کە بە رواڵەت هەیە لە ئاسمان و زەوی دا، پەیوەستی ئەکات بە هێز و توانای خواوە کە لە راستی دا تەنها ئەو بەهێزو دەسەڵاتە. نائومێدی ئەکات لە هەموو رەحمەت و بەزەیی یە لە ئاسمان و زەوی دا و پشت بەوە نابەستێ و پەیوەستی ئەکات و ئەیبەستێتەوە بە تەنها رەحمەت و بەزەیی خواوە کە تەنها ئەوە جێگای ئومێدە. هەموو قاپی یەکی لێ پێوە ئەدات و تەنها قاپی خوای لێ ئەکاتەوە، هەموو رێگایەکی لێ ئەگرێ لە ئاسمان و زەوی دا و تەنها رێگای بۆلای خوا بۆ بەرەڵا ئەکات کە بە راستی هەر ئەوە رێگایە.

رەحمەت و بەزەیی خوا لە چەند دیمەن و شێوەیەك دا دەرئەکەوێ کە بە هیچ کلۆج نایەتە ژمارە، ئادەمی دەستە پاچەیە لە دۆزینەوەو ژماردنی لە نەفسی خۆی دا چ جای شتی تر و خەڵکی تر.

ئەو رەحمەت و بەزەیی یە دەرئەکەوێ لە لێ گرتنەوەدا، هەرچۆنێ دەرئەکەوێ لە بەخشین و پێدان دا، هەرکەس خوا بەشداری کردبێ لەو رەحمەت و بەزەیی یەدا لە هەموو شتێك دا بەرهەمی ئەبینێ و دەست کەوتی ئەبێ، لە هەموو بارو لە هەموو حاڵەت و لە هەموو شوێنێك دا، دەستی ئەکەوێ لە دەروونی خۆی دا، لە هەستی دا، لە هەموو دەورو بەری دا و لە هەر شوێنێ ببێ، هەرچۆن ببێ. ئیتر با هەموو شتێکی لە دەست چووبێت کە خەڵکی بە بێ بەش و بەش براوی سەیر بکەن، هەرکەس خوا ئەو رەحمەت و بەزەیی یەی لێ بگرێتەوە، بێ بەش ئەبێ لێ ی لە هەموو شتێك دا، لە هەموو بارێك دا، لە هەموو حاڵەتێك دا، لە هەموو شوێنێك دا، ئیتر با هەموو شتێکی ببێ کە خەڵکی بە بەش و چارە و بەختەوەری سەیر ئەکەن. هەر چاکە و نیعمەتێ رەحمەت و بەزەیی خوای لێ گیرابێتەوە،

ئەگۆڕێ و ئەبێ بە بەلا و خراپە و هۆی بەد بەختی، هەر ناخۆشی و بەڵایەك ڕەحمەتی خوای لەگەڵ بێت ئەبێ بە نیعمەت و بەهرە... کابرا لەسەر دڕك بخەوێ - لەگەڵ ڕەحمەتی خوادا - ئەبێ بە بێشکەیەکی ڕازاوە و جێگای ئارام، لەسەر ئاوریشم بخەوێ - بە بەزەیی خوا - لە ئاستی ئەبێ بە دڕك و داڵ. خەریکی گرانترین کار ئەبێ و - ڕەحمەتی خوای لەگەڵە - کەچی بە ئاسانی دێت بە دەستی یەوە و لەبەرچاوی سووك و ئاسانە. خەریکی سووك ترین شتە و - ڕەحمەتی خوای لەگەڵ نی یە - کەچی گرانترین کار دەرئەچێ و لە ژێر باری گرانی دا ئەناڵێنێ، ئەکەوێتە ناو بیم و خەتەر کەچی ئەبێ بە ئارام و ئاشتی بەهۆی ڕەحمەتی خواوە. بە ڕێگای پان و ڕاست دا ئەڕوات کەچی ئەبێ بە پلەی سەخت و خۆی تیا چوون، چونکە ڕەحمەتی خوای لەگەڵ نی یە.

تەنگی و تەنگە تاوی نی یە لەگەڵ ڕەحمەتی خوادا، بەڵکو تەنگی و تەنگەتاوی لە گرتنەوەی ئەو ڕەحمەتە ئارام دەرە دایە و بەس، هەرکەسێ ڕەحمەتی خوای لەگەڵ بێت ئارامە و تەنگە تاو نی یە، با لە تاریکی بەندیخانەدا بژی، یان لە دۆزەخی سزادا بێت، خۆشی و ئارام نی یە بۆ هەرکەس ڕەحمەتی خوای لەگەڵ نەبێت، با ئەم دویوو ئەو دیو بکات لەناو ناز و نیعمەت دا، لە لەوەڕگای ژیان دا بێت بە لێشاو. چونکە بەهۆی ڕەحمەتی خواوە لە دەروون دا کانیاوی خۆش بەختی و ڕەزامەندی و ئارام هەڵئەقوڵێ. بە بێ ئەو ڕەحمەتە مار و دووپشکی بێ ئارامی و ماندوویی هەمیشە ئەگەڕێ لە دەروون دا... تەنها ئەم قاپی ڕەحمەتە بکرێتەوە ئیتر با هەموو کون و کەلەبەری تری بگیرێ و داخرێ، ئەم پیت و فەڕەی بۆ بەرەلا بکرێ، ئیتر با هەموو شتێکی لێ بگیرێتەوە، با تەنگ ڕۆزی و تەنگ گوزەران بێت، ئەم پیت و فەڕەی لێ بگیرێتەوە ئیتر با هەرشتێکی تری بۆ بەرەلا بکرێ و وەری بگرێ هیچ سوودێکی نابێ.

سامان و دارایی و ئەولاد، تەندروستی و هێز، ڕێز و دەسەلات... هەموو ئەوانە ئەبن بە هۆی سەرچاوەی بێ ئارامی و ماندوویی و ئەرك و مەینەت ئەگەر ڕەحمەتی خوای لەگەڵ نەبێ، هەموو ئەوانە هۆی ئارام و خۆشی و کامەرانی ئەبن کاتێ قاپی ئەو ڕەحمەتەیان لێ بکرێتەوە. ئەمانە هەموو شتێکی ئاشکران و لە ژیان دا بەدی دێت و ئەبینرێن. سامان و ڕۆزی فراوان ئەکات کاتێ لەگەڵ ڕەحمەت دا بوو، ئەبێ بەهۆی خۆشی و ڕابواردنی پاك و

خاوێن، ئەبێ بەهۆی کامەرانی و بەختەوەری لەم جیهانە و توێشوو بۆ ئەو جیهان، کاتێ ڕەحمەتی لەگەڵ نەبوو هۆی بێ ئارامی و ترس و بیمە، ئەبێ بەهۆی هەڵگیرساندنی حەسادەت و کینە بەری، بەهۆی چرووکی و چاوبرسێتی یان نەخۆشی، هەندێ جار لەو سامان و ڕۆزی یە بێ بەش ئەبێ، هەندێ جار بەهۆی زیادە ڕەوی و لە سنوور دەرچوون بەرباد ئەبێت و لە کیس ئەچێ. خوا ئەولاد و نەوە ئەدات کە ڕەحمەتی لەگەڵ بوو هەمووی ئەبێ بە زینەت و ئارایشی ژیان و هۆی خۆشی و شادمانی دڵ، هۆی فراوانی و چەند قات ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دوایی کاتێ لەپاش باوك و دایکیان! هەڵئەسن بە کردەوەی چاك و نزا کردن بۆیان، کاتێ ئەو ڕەحمەتەیان لەگەڵ نەبوو، ئەبن بە ئازار و خەو شوم ئەکەن لە دایك و باوکیان.

خوا تەندروستی و هێز ئەدات و ڕەحمەتیان لەگەڵە، کەواتە نیعمەت و ژیانی پاك و خاوێنە، ڕابواردنە بە ژیانی پاك و خاوێن، کە ڕەحمەتی لەگەڵ نەبوو دەرد و بەلاّ و هۆی بەدبەختی یە لە هەردوو جیهان دا، چونکە بەکاریان ئەهێنێ لە ڕووخاندنی لەش و لەکار خستنی گیان و زۆر کردنی گوناهو تاوان بۆ ڕۆژی دوایی.

خوا ڕێز و دەسەلاّت ئەدات کە ڕەحمەتیان لەگەڵ بوو ئەبن بە هۆی چاکە و چاك کردنی خراپە، بە سەرچاوەی ئارام و هێمنی، ئەبن بە زەخیرەی ڕۆژی دوایی و ڕوو سووری لای خوا، کاتێ ڕەحمەتیان لەگەڵ نەبوو ئەبن بە هۆی شێواندن و بلاّو کردنەوەی خراپە و خراپەکاری، بە سەرچاوەی سەرکێشی و دەست درێژیی، هەڵگیرسێنەری کینە و دڵگرانی لەم جیهان و سزاو ئاگری دۆزەخ لەو جیهان. زانینی فراوان و تەمەنی درێژ و جێ و شوێنی پاك و خاوێن و هەروەها هەموو شتێ. ئەمانە هەموو ئەگۆڕێن لە بار و حاڵێکەوە بۆ بارو حاڵێکی تر، بە پێی بوون و نەبوونی ڕەحمەتی خوا لەگەڵیان.

بەشێکی کەم لەوانە بەرهەم و سوودی فراوانی ئەبێ کە لوتف و ڕەحمەتی خوایان لەگەڵ بێت، بەلاّم کە لوتف و ڕەحمەتەکەی لەگەڵ نەبوو هەر ئەنداز ئەو بەشانە زۆر بن بێ خێرو بێرن.

بەشێ لەو ڕەحمەتە ئەمەیە کە هەست بکرێ بە بوونی! هەرچەند ئەو ڕەحمەتە ببێ و مەردوم بگرێتە خۆی و بباریێ بەسەریان دا، بەلاّم هەست کردن بە بونەکەی ڕەحمەتێکی تری

گرنگە، ئومێد و چاوەڕوانی بۆی ڕەحمەتێکی ترە، باوەڕ و پشت پێ بەستنی لە هەموو کارێك دا ڕەحمەتێکە. سزای بەتێن و سەختی بێ بەشی یە لەو ڕەحمەتە یان نائومێدی لیێ ی و چاوەڕوانی نەکردنی یان گومان و دوو دڵی تیای دا و پشت پێ نەبەستنی، ئەم سزایە خوا نایدا بە کۆڵی باوەڕداراندا.

هەرکەس بەدوای ڕەحمەتی خوادا بگەڕێ و چاوەڕوانی بکات بێگومان بێ بەش نابێ لیێ ی و دەستی ئەکەوێ، هەرکەس بە پێی خۆی لە هەر شوێنێك ببێ، لە هەرکات و بەسەرهاتێك دا ببێ. ئیبراهیم(علیه السلام) دەستی کەوت لەناو ئاگردا، یوسف(علیه السلام) دەستی کەوت لەناو بیرەکەدا، وەکو دەستی کەوت لەناو بەندیخانەدا. یونس(علیه السلام) دەستی کەوت لەسکی ماسیدا لەناو سێ تاریکی دا، موسا(علیه السلام) دەستی کەوت لەناو دەریادا کاتێ کە کۆرپە و ساوا بوو لە بێشکەدا بە بێ هیچ هێز و توانایەك و بە بێ هیچ پاسەوان و چاودێرێك، هەرچۆنێ دەستی کەوت لە کۆشکی فیرعەون دا لە کاتێك دا کە دوژمنی بوو، بەدوای دا ئەگەڕا و لە کەمین دا بوو بۆی، لاوە باوەڕدارەکانی غارەکە دەستیان کەوت لەناو غارەکەدا لە کاتێك دا دەستیان نەکەوت لەناو خانوو جێ و شوێنی خۆیان دا. پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی کەوت لەگەڵ یار و هاوڕێی غاری لە ئەشکەوتەکەدا، لەکاتێك دا کە قورەیش بە دەست و دەم تێ ئەکۆشان و بە دوایان دا ئەگەڕان... هەروەها هەرکەسێ تر کە پەنای بردبێ بە ڕەحمەتی خواو نائومێد بووبێ و دەستی شۆردبێ لە هەموو شتێکی تر و بە هێز و دڵنیایی یەوە رووی کردبێتە قاپی خوا و ئیتر بەس.

ئینجا وەکو ئایەتەکە بە روون و ڕەوانی فەرموی: ئەو ڕەحمەتە هەرکات خوا دای بە هەرکەس و ناردی هیچ کەس بەرگری پێ ناکرێ و ناتوانێ بیگێڕێتەوە، کاتێ گرتی و نەینارد هیچ کەس ناتوانێ بەرەڵای بکات و بینێرێ، جا لەبەر ئەوە شایان نی یە ترس لە هیچ کەس و هیچ شتێك، شایان نی یە ئومێد و چاوەڕوانی لە هیچ کەس و هیچ شتێ.

ئای ئەم ئایەتە چ ئارامی یەك ئەدا بە دڵ و دەروون؟ ئای چ دامەزراوی یەك جێگیر ئەکات لە هەست و دەروون دا؟ ئای چ زانین و تێگەیشتن ئەدات بە باوەڕدار بە روون و ڕەوانی بەرامبەر هەموو شتێك؟!

تـەنیا ئایەتێکـە شـێوەیەکی تـازە نەخـشە نەکێـشێ بـۆ ژیـان و لـە هەسـت دا نـرخ و تەرازوویـەک دائەمـەزرێنێ کـە لەخشە ناکات و بە هیچ رەنگ سـەر ناکات و ناگۆڕێ و هیچ شتێک کاری لێ ناکات.

تەنیا شێوە و بارێ دائـەمێنێ لـە هـەر دڵێک دا جێگیر ببێ، ئەتوانێ خۆی بگرێ لەبەر هەموو رووداو و هـەموو شتێ و هـەموو هێزێ، لەخشە ناکات بە وێنـەی شاخێکی گـەورەی بەرز.

ئا بەو جۆر و شێوەیە قورئان ئەو گەلە و تاقمە نایابە کەس نەدیوەی فەراهەم هێنا و پـەروەردەی کـرد و پـێ‌ی گەیانـد، لـە سـەرەتای ئیسلامەوە. ئـەو گـەل و تاقمـەی کـە فەراهـەم هێنران بەم قورئانە لە ژێر چاودێریی خوادا بۆ ئەمـەی ببن بە هۆیـەک لـە هۆیـەکانی دەسـتی قودرەت بـۆ دامەزرانـدن و چەسپاندنی ئـەم ئـایین و بەرنامـە گشتی یـەی کـە هـەموو کـون و قوژبنی ژیـانی داگیر کردووە، بۆ راهێنـان و بەدی هێنـان و چەسپاندنی چەند نموونەیـەک لـە ژیان کە ئەمڕۆ وەکو خەو و خەیاڵ دەرئەکەون.

ئەو گەل و تاقمەی کە خوا سەری خستن و زاڵی کردن بەسەر هەر ئەنداز کە خوا ویستی لەم زەوی یەدا بۆ ئەمەی دەست بە ژیان بکەن بە سڕینەوە و داهێنـان و هێشتنەوەی ئـەوەی کە خوا ویستی و مەیلی بوو.

هەڵسانی ئەو گەل و تاقمە بەو کردەوە گرنگە کـەس نەدیوانە، بە هـۆی ئـەوەوە بـوو کـە تـەنها خـەریک نـەبوون بـە وشـە و وتـەکانی قورئانـەوە بـە تـەنیا، یـان لەگـەڵ زانـینی مانـاو مەبەستە شیرینەکانی دا و ئیتر بەس... بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا خەریک ئەبوون بـە بـەدی هێنـانی ئامـانج و مەبەسـتەکانی ئـەو ئایەتانـە، لەگـەڵیان ئـەژیان و بـەوان و لەبـەر ئـەوان ئـەژیان، بەڕاستی بوون بە نوێنەر و ئاوێنەیەکی بێگەرد بۆ قورئان و ئایەتەکانی قورئان...

ئەم قورئانەی ئێستا لەبەر دەستایە هەر ئەو قورئانەیە کە بە دەست ئەو تاقمەوە بوو، ئێستایش و بۆ داهاتوویش ئەتوانێ وێنەی ئەو تاقمە فەراهەم بێنێ. بەڵام بەو مەرجە بە وێنەی ئەو یەکەم،تاقمە بەختەوەرە رەفتار بکرێ لەگەڵ قورئان دا و ئەو رێبازە بدرێتە بەر کە ئەوان نەخشەیان کێشا و پیایدا رۆیشتن لە ژێر سایەی قورئان دا. لە پاش دەست نیشان کردن بۆ ئەو چەند مەبەستانە دووبارە دەست نیشانیان بۆ ئەکاتەوە و دووبارە دەروون رووناک ئەکاتەوە پێ ی یان، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمی بە تێکڕایی ﴿ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بیر بکەنەوە لە چاکەی خوا بەسەرتانەوە و باسی بکەن و دانی پیا بنێن. چاکەی خوا بەسەر خەڵکی یەوە ئەوەندە فراوان و ئاشکرایە هیچی ناوێ تەنها بیر کردنەوە نەبێ، ئیتر شتەکە روونە، ئەیبینن و هەستی پێ ئەکەن، بەڵام لێ ی بێ ئاگا ئەبن و لەبیریان ئەچێتەوە، ئاسمان و زەوی بە دەوریان دا شەپۆل ئەدا و هەمیشە چاکە و بەهرەی خوا ئەرژێ بەسەریان دا، بە لێشاو رۆزی و هۆی گوزەران و ژیان دائەبارێنێت بەسەریان دا، لە هەموو هەنگاوێك دا، لە هەموو کاتێك دا لە پیت و فەڕ و چاکەی خوا لە ئاسمان و زەوی یەوە بۆیان دێت و روویان تێ ئەکات لەلایەن داهێنەری پەروەردگارەوە دەی ﴿هَلْ مِنْ خَـٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ﴾ ئایا هیچ دروست کەر و داهێنەرێکی تر هەیە جگە لە خوا ﴿يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ کە رۆزیتان بدات لەلایەن ئاسمان و زەوی یەوە؟ بێگومان هیچ کەس ناتوانێ بڵێ: هیچ کەسی تر هەیە، کاتێ کە لە ئەوپەڕی بت پەرستیش دا بن هەرگیز شتی وا ناڵێن. دەی کەواتە بۆچی یاد و باسی ئەو خوا ناکەن بە تاك و تەنیا و سوپاسی ناکەن؟ بۆچی لائەدەن لە روو تێ کردن و سوپاس و پەرستنی؟

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ﴾

بێگومان ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نی یە بێجگە لەو خوای دروست کەر و رۆزی دەرە. ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ کەواتە ئایا چۆن ئێوە لائەدرێن و وەرئەگێررێن لەو بروا راستە و لەو پەرستنە راستە؟ بەراستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە لادان لەو رێگا راستە. بەراستی زۆر سەیرە و جێگای سەرسوڕمانە لادان لە سوپاس و شوکر و گوێ رایەڵی ئەو خوایە.

بەش و پارچەی یەکەم لە سورەتەکە لێرەدا کۆتایی هات، سێ مەبەستی گەورە و سەرەکی و بنەڕەتی گەیاند: تاك و تەنیایی خوای داهێنەر، تایبەتێتی رەحمەت تەنها بە خواوە و خاوەنێتی خوا بۆی بە تاك و تەنیا، تاك و تەنیایی خوا لە رۆزی دان دا.

لە بەش و پارچەی دووەم دا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) بە دڵنەوایی و دڵخۆشی دانەوە لە بێ بڕوایی و بڕوا نەهێنانی بێ بڕواکان هەموو کاروباری ئەگێڕێتەوە بۆ لای خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ ئەگەر ئەوانە بڕوات پێ ناهێنن و بە درۆزنت دائەنێن بەوە تۆ دڵگران و غەمبار مەبە ﴿فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ چونکە چەند پێغەمبەری زۆر لە پێش تۆ بە درۆزن دانرا و بڕوای پێ نەهێنرا. کەواتە بەوانە دڵخۆشی خۆت بدەرەوە ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ تەنها بۆلای خوا ئەگێڕێنرێتەوە هەموو کارێ، کەواتە هەموو کەس بە پێی کردەوەی خۆی لەگەڵی ئەکرێ.

ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە خەڵکی و ئەیانترسێنێ لەوەی بخەڵەتێن بە شەیتانی دوژمن کە ئەیەوێ رایان کێشێ لەگەڵ خۆی بۆ ناو ئاگری سەختی دۆزەخ. ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمی ﴿إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ بەراستی بەڵێنی خوا بە هاتنی رۆژی دوایی و زیندوو کردنەوە و پاداشت و تۆڵە، شتێکی راستە و بەدی دێت، بەڵام ژیانی ئەم جیهانە خەڵکی هەڵئەخەڵەتێنێ،

فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾

---

﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ کەواتە با ژیانی ئەم جیهانە هەڵتان نەخەڵەتێنێ و بێ ئاگاتان بکات لەو ڕۆژە و خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو ڕۆژە. شەیتان هەڵخەڵەتێنەرە ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ با هەڵخەڵەتێنەری گەورە کە شەیتانە، هەڵتان نەخەڵەتێنێ بە خوا بەمەی خوا زۆر لێ بوردووە و بەزەیی بێ سنووری هەیە با تاوان و گوناه زۆر بێت. بەڵێ ڕاستە خوا زۆر لێ بوردە و بەزەیی دارە و بەزەیی یەکەی پێش کەوتووە لە خەشم و قاری. هەرچەند وایە بەڵام لەهەمان کات دا تۆڵەی ئێجگار سەخت و بەتینە، گوناهو تاوان بە ئومێد و چاوەڕوانی بەزەیی ولێ بوردنی خوا. هەرکەس بەوجۆرە بێت وێنەی کەسێکە سەر بکاتە خواردنی ژار و شتی کوشندەوبەتەمای ئەوە بێت دەرمانێ لەناو سکی دا پەیدا ببێ بەرگری ئەو ژارە بکات!

شەیتان کە ئەو هەوڵ و تەقەلایە ئەدات، جاڕی دوژمنایەتی خۆیشی داوە هەر لە یەکەم جارەوە لەگەڵ ئادەم و تیرە و بەرەی ئادەم دا وەکو خوا لەچەند شوێنێك دا بۆمان ڕوون ئەکاتەوە و لێرەیش دا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ﴾ بەڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنە ﴿فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾ کەواتە ئێوەیش بە دوژمنی دابنێن بە باوەڕ و بە کردەوە. هەرگیز دڵتان کەمترین مەیلی نەبێ بۆی، هەرگیز بە ڕاست و دڵسۆزی سەیر نەکەن بۆ خۆتان، شوێنی مەکەون و ڕێبازی ئەو نەدەنە بەر، چونکە هەرکەس ژیر بێت شوێنی دوژمنی ناکەوێ: شەیتان نیازی خێری نی یە پێتان و بانگتان ناکات بۆ خێرو چاکە ﴿إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ بانگی حیزب و کۆمەڵەکەی ناکات بۆ ئەمە نەبێ ببن بەوانەی کە بە هەمیشەیی نیشتەجێ ئەبن لە ئاگرێکی هەڵگیراودا هیچ مەبەستی نی یە ئەوە نەبێ بیان کات بە دۆزەخی بێ بڕانەوە! کەواتە هەرکەس ژیر بێت هەرگیز بە گوێی دوژمنی وا ناکات و ناچێ بە دەم بانگەوازی یەوە! قورئان ئەیەوێ ئاگاداری و وریایی فەراهەم بێنێ لە دەروونی باوەڕ داران دا، تا بە هەمیشەیی ئامادە بن بۆ بەرگری و بەربەرەکانی ئەو دوژمنە کە هەمیشە وا لە کەمین دا بۆ ئادەمی، ئینجا ئەو ئامادەیی و وریایی یە بەهێز ئەکات بە ڕوون کردنەوەی دوارۆژی ئەوانەی ئەچن بەدەم بانگەوازەکەی شەیتان و ئەوانەی ئەو دوژمنە ئەفرێنن و بەرگری ئەکەن،

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنٗاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ

---

ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ﴾ کەسانێ کە کافر بوون کافرن و بە کافری ئەمرن بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی بەتین، کە سزای ئاگری دۆزەخە ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێنا و کردەوەی چاکەکانیان بەجێ هێنا بە گوێرەی بڕواکەیان، واتە هەڵناگەڕێنەوە لەو بارە راستە ﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لێ بووردن و سڕینەوەی گوناهو خراپەیان، پاداشتێکی گەورە.

ئینجا شێوەی سروشتی گومڕایی و لادان لە رێگای راست ئەخاتە بەرچاو و کردەوەی شەیتان روون ئەکاتەوە، هەروەها ئەو قاپی یەی کە شەیتان ئەیکاتەوە و هەموو شەڕ و خراپەیەکی لێ دێتە دەرەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنٗاۖ﴾ [1] دەی ئایا کەسێ کە کردەوەی خراپی خۆی جوان و شیرین کرا بێ بۆی بەهۆی ئەوەوە کردەوە خراپەکەی بە چاك بزانێ و سەرنجی بدات، ئەم کەسە سەر لێ تێك دراوە بە وێنەی کەسێکە کە کردەوەی خراپ بە خراپ بزانێ و خۆی لێ دوور بخاتەوە و ئیمان و کردەوەی چاك هەڵبژێرێ بۆ خۆی؟ واتە ئەو دوو تاقمە دوا رۆژ و چارەنووسیان ئەوە بوو کە باس کرا، هۆی ئەو جیاوازی یەش ئەوەیە کە کردەوە و رەوشتیان بەم جۆرە جیاوازە و دوورن لە یەکەوە، هۆی ئەم جیاوازی و دووری رەوشت و کردەوەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ﴾ بەڕاستی هەرکەسێ خوا مەیلی ببێ و بیەوێ گومڕای ئەکات و لە رێگای راست ئەیترازێنێ، مەیلی هەرکەسیشی ببێ و بیەوێ رێنوومایی ئەکات و ئەیخاتە سەر رێگای راست. واتە خۆی ئەزانێ کێ شایانە بۆچی و بە گوێرەی ئەو زانین و کار دروستی یەی خۆی هەرکەس شایانی هەرچی بێت بەو جۆرەی لێ ئەکات، ئەو سەر لێ تێك دراوانە کە خراپە بە چاکە سەیر ئەکەن و چاکە بە خراپە، ئەوانە هەر بۆ ئەو بارە شایانن و ئەبێ هەروابن و گۆڕان و لادانیان لەو بارە لارە نابێ.

---

[1] ئەم ئایەتە بە چەند جۆر و شێوەیەك راڤە کراوە، هەرچەند هەموو یەك مەبەست ئەگرنەوە، کەواتە هەموو جۆرەکان باشن، بەڵام ئەمەی تەفسیرەکە رەواترە.

﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَاۚ﴾

**﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾ كەواتە با گیانت دەرنەچێ لەسەر ئەوانە کە بڕوا ناهێنن بەهۆی داخ و غەمی زۆرەوە کە ئەیچەژی بۆیان. واتە ئەوەندە خەفەت مەخۆ لەسەر باوەڕ نەهێنانی ئەوانە، چونکە باوەڕهێنانی ئەوانە بەدەست تۆ نی یە و لە توانای تۆدا نی یە، بەڵکو بە دەست خوایە و خوا چی بڕیار دا هەر ئەوە ئەبێ.**

**خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەری ئازیز ئەداتەوە(ﷺ) بۆ ئەمەی ئارامی روو بکاتە دڵە بەزەیی دارەکەی کە هەمیشە لە داخ و مەراق دا بوو لەبەر باوەڕ نەهێنانی ئەو تاقمە نەفامە دڵ رەقە، دڵی بەفەڕی ئێجگار بەزەیی دار بوو، ئەو ئایینە راستەی کە بۆی هێنا بوون زۆر روون و رەوان بوو لەگەڵ ئەوەدا ئەوانە ئاوا گومڕا و سەر لێ شێواو بوون، دیارە ئەبێ ئەو کاتە هەر داخ بچەژێ. بەهۆی ئەوەوە ئەوا خوای بەزەیی دار دڵنەوایی ئەکات لێرە و لە چەند شوێنی تردا بەرگری ئەکات لەوەی ئەوەندە بچێ بە تەنگ و تاسا و خۆی بەو جۆرەی خەریک و بێ ئارام بکات بەهۆی ئەوانەی کە لێ بوونەتەوە و کاریان لە کارەگا ترازاوە. ئەوە حاڵەتێکە بە سروشت روو ئەکاتە ئەوانەی کە بە دڵێکی پاکەوە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ ئایینی خوا، لە هەمان کات دا خەڵکی ئەبینن پشتیان تێ ئەکەن و کوێرن لە بینینی ئەو نوور و رووناکی یە، کەڕن لە بیستنی ئەو هەموو شتە راستەی کە ئاراستە ئەکرێن. کەواتە با هەموو بانگ کەرێ ئەم دڵنەوایی و دڵخۆشی دانەوەی خوا بگرنە گوێ. ئینجا بە هەموو هێز خەریکی بانگ کردنی خۆیان بن و دوای ئەوە داخ و مەراق نەخۆن لەسەر ئەوانەی کە خوا بڕیاری چاک بوون و رزگاری نەداوون، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ داخ و مەراق مەخۆ لەسەر ئەوانە، چونکە بێگومان خوا زانایە بە هەرشتێ ئەوانە ئەیکەن کە ئەوانە ئەیکەن، کەواتە حەواڵەی خوایان بکە ئەو خۆی ئەزانێ شایانی چین؟ خوا بە گوێرەی زانینی خۆی رێنموونی یان گومڕایی بۆ داناون. خوا زانایە و هەر زانا بووە بە هەرشتێك کە رووی داوە و روو ئەدات لە بەندەکانی یەوە، پێش روودانی و پاش روودانی، بە پێی ئەو زانینە بێ سەرەتایی خۆیە بەش و بڕیاری بۆ داناون، بەڵام حیساب و پرسیاریان لێ ناکات بە پێی زانینەکەی تا ئەوەی ئەو ئەیزانی روو نەدات و بەدی نەیەت.**

ئەم باس و بەیانە لە زۆر جێگا و شوێنی تردا بە درێژتر وتراوە و روون کراوەتەوە، کەواتە لێرەدا بەم ئەندازەیە کۆتایی پێ ئەهێنین، ئینجا گەردش ئەکات بە دڵ و دەروون و سەرنج رائەکێشێ بۆ چەند رابەر و بەڵگەیەکی روون کە بە بێ پەردە و شارانەوە وان بەسەر لاپەڕەی بوونەوەرەوە، کەواتە ئەوەی گومڕایە بە روونی گومڕایە و هیچ بڕو بیانووی نی یە، لە یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ﴾ خوا کەسێکە کە بای ناردووە و ئەینێرێ ﴿فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ ئینجا هەردوو ئەخاتە بزووتنەوە ﴿فَسُقْنَـٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ﴾ ئینجا ئەو هەورەمان ناردووە و ئەینێرین بۆ شوێن و ولاتێکی مردوو – واتە وشك و برین – بۆ ئەمەی بباری بەسەری دا ﴿فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ﴾ ئینجا بەهۆی ئەوەوە خاك و زەوی یە زیندوو ئەکەینەوە بە رواندنی گیا و درەخت و لەوەڕ و کشت و کاڵ تیایدا لە دوای مردن و وشك بوونی و نەبوونی هیچ رواوێ لەو خاك و زەوی یەدا.

لە پێشانگای رابەر و بەڵگە بوونەوەری یەکانی ئیمان و باوەڕا زۆر جار قورئان سەرنج رائەکێشێ و ئەم شێوە نایابە سەر سوڕهێنەرە ئەخاتە بەرچاو، شێوەی با، کە هەور ئەخاتە بزووتنەوە و گەردش و ئەیهێنێ لە دەریا و دەریا لووشەکانەوە، بەم رەنگە ئەو بایانەی کە گەرمن هەڵم و تەمەکان ئەخەنە بزووتنەوە، با ساردەکانیش کۆیان ئەکەنەوە و تەپەیان ئەدەن هەتا ئەبێ بەو هەورە، کە ئەبینرێ، ئینجا ئەو هورە ئەگێرێ و چەرخەی پێ ئەکات بەم لاو بەو لادا تا ئەیگەیەنێتە هەر شوێنێ خۆی ئەزانێ و ئەیەوێ و بەو جۆرە ولاتی پێ ئەژیەنێتەوە و ئەیرازێنێتەوە بەو هەموو گوڵ و گوڵزار و ئەو هەموو جۆرە رواوە شیرینە دڵ رفێنە.

ئەم موعجیزە گەورە هەمیشە بەدی دێت و زۆربەی خەڵکیش بێ هۆش و بێ ئاگان و بیر ناکەنەوە لێ ی تا پڕی دەروونیان ببێ لە ئیمان و بڕوای بەهێز بەو دەستە قودرەتەی کە هەمیشە ئەو دەستکردە گرنگە ئەخاتە بەرچاو بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە کە خەڵکی بە چاوی خۆیان ئەبینن ئەم هەموو زەوی یە مردووانە زیندوو ئەکرێنەوە و لەگەڵ ئەوەدا بڕوایان نی یە بە زیندوو کردنەوەی رۆژی دوایی و زۆر بە دووری دائەنێن، کەچی هیچ جیاوازی یەکیان نی یە بۆ خوا و لای خوا، ئەم زیندوو کردنەوە وێنە و نموونەیەکی رێك و روونە بۆ ئەو زیندوو کردنەوە،

وەكو ئەفەرمویٚ: ﴿كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ﴾ هەر بەو جۆرەیە زیندوو بوونەوەی مردووەکان لە رۆژی دوایی دا، ئاوا سووك و ئاسان و بە بیٚ ئەرك و بە گویٚرەی مەیل و خواهیشی خوا، یان مەبەست ئەوەیە: بە ویٚنەی زیندوو بوونەوەی زەوی یەکان مردووەکانیش زیندوو ئەبنەوە بەم رەنگە خوا بارانیٚکی تایبەتی ئەباریٚنیٚ و بەو بارانە لەشی مردووەکان وەکو خۆی لیٚ دیٚتەوە و ئینجا خوا گیان ئەکات بە بەریان دا، وەکو لە چەند حەدیسیٚك دا هاتووە. بە هەرکام مەبەست بیٚت زیندوو بوونەوەی زەوی بەڵگە و رابەریٚکی ئیٚجگار روون و رەوان و بەهیٚزە لەسەر زیندوو بوونەوەی رۆژی دوایی، هەرکەس بیٚ بەش نەبیٚ لە تیٚگەیشتن تەنیا بەم بەڵگە روونانە دڵنیا ئەبیٚت. ئەم شیٚوە شیرین و نایابە لە قورئان دا زۆر جار ئەخریٚتە بەرچاو، چونکە شتیٚکی بەدی هاتووی بینراوە، ریٚگا نی یە بۆ بەربەرەکانیٚ و ملەجەڕیٚ تیای دا، بەڕاستی دڵ و دەروون ئەهیٚنیٚتە جۆش و پەرۆش کاتیٚ بە وردی بیری لیٚ بکریٚتەوە، شیٚوەیەکی ئیٚجگار شیرین و جوانە، بە تایبەتی نایاب تر دەرئەکەویٚ لە دەشت و چۆڵ و بیابان دا کە دوورە لە ئاو و کانیاو، تەماشا ئەکەیت لە پیٚشەوە ئەو دەشتە وشکە پڕ لە تەپ و تۆز و بۆن و هەناسەی ناخۆش کەچی لە پڕیٚك دا تەڕ و نەرم و ناسك و بۆن و هەناسەی خۆش پەیدا ئەبیٚ لە پاش بارانەکە و ئینجا زۆری پیٚ ناچیٚ ئەڕازیٚتەوە بەو هەموو گیا و گوڵ و رووەوە شیرینانە!!

ئینجا لە شیٚوەی زیندوو بوونەوە و پەیدا بوونی گیان لە بیٚ گیان دا ئەگویٚزریٚتەوە بۆ مەبەستیٚکی دەروونی و هەستی، مەبەستی زاڵی و بەرزی و بڵندی. ئەم مەبەستەش ئەبەستیٚتەوە و پەیوەستی ئەکات بە وشە و وتەی پاك و خاویٚن و کردەوەی چاکەوە. رەنگە هۆی پەیوەستی ئەم دوو مەبەستە فەراهەم هاتنی ژیانی پاك و خاویٚن بیٚت لە هەردوودا.

بت پەرستەکانی قورەیش بت پەرستی یان ئەکرد لەبەر مانەوەی ئەو ریٚز و قەدرە ئایینی یەی کە لە مەککەدا بوویان، هەروەها هیٚشتنەوەی سەرۆکی و سەرکردایەتی یەی کە بۆیان دامەزرا بوو بەسەر هۆز و تیرەکانی تری عەرەب و بەهۆی ئەو عەقیدە و باوەڕەی کە بۆیان نیشتبوو، بەهۆی ئەو سەرۆکایەتی و سەرکردایەتی یە چەند جۆر دەست کەوتیان هەبوو، لەسەری هەمووئەودەست کەوتانەوەزاڵی وبەرزی یەکەهەمیشەبە دوای دا ئەگەڕان ولەپیٚناوی ئەوەدادەستیان ئەنابەوئاییٚنەپیرۆزەی کەبۆیان هات وزۆرلەوانەش بەراستیان ئەزانی.

جا لیٚرەدا خوای گەورە ئەفەرمویٚ پیٚ یان: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ﴾ هەرکەس سەربەرزی و گەورەیی و شەرەف ئەویٚ و بە دوای ئەوەدا ئەگەڕیٚ ﴿فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ دەی هەموو گەورەیی و

سەربەرزی و شەرەف تەنها بۆ خوایە و هێنی خوایە و لای خوا دەست ئەکەوێ. کەواتە هەرکەس بە شوێن ئەوەدا ئەگەڕێ با لە کانگا و سەرچاوە راستەقینەکەی داوای بکات کە بە راستی هیچ سەرچاوەیەکی تری نی یە، با داوای بکات لە خوا، چونکە لای ئەو دەستی ئەکەوێ و لای هیچ کەسی تر دەستی ناکەوێ، لە سایە و پەنایەکی ترا دەستی ناکەوێ، بە هیچ هۆیەکی تر دەستی ناکەوێ. ئەم باوەڕە راستە کاتێ جێگیر ببێ و نەقش ببەستێ لە هەر دڵێك دا بەسە بۆ گۆڕانی ئەو دڵە لە هەموو بار و روویەکی ژیانی لەم جیهانەدا، ئەو خەڵکەی کە قورەیش ئەیویست بەهۆی ئەوانەوە شەرەف و گەورەیی وەرگرن و بەهۆی ئەوەوە دانیان ئەگرت بەسەر ئەو ئایین و بیرو باوەڕە پووچەی کە لەسەری بوون و دوای ئەو ئایینە راستە نەئەکەوتن کە خوا بۆی ناردن. ئەوەك رێز و گەورەیی یان نەمێنێ لە دەروونی ئەو خەڵکەدا. ئەو خەڵکە کە بریتی بوون لە هۆزو بەرەکانی عەرەب. ئەوانە سەرچاوە نەبوون بۆ دەست کەوتنی ئەوەی قورەیش بە دوای دا ئەگەڕان، ئەو خەڵکە خاوەنی ئەوە نەبوون ئەوەیان بدەنێ یان بەرگری بکەن و بیگرنەوە لێ یان. چونکە ئەوەی بە دوای دا ئەگەڕان تەنها هێنی خوایە و سەرچاوەکەی خوایە. ئەگەر ئەوانە هەر هێز و دەسەڵاتێکیان بووبێ یەکەم سەرچاوەی تەنها خوایە. ئەگەر هەر گەورەیی و شەرەفێکیان بووبێ بەخشندەکەی تەنها خوایە، کەواتە هەرکەس بە دوای ئەوەدا ئەگەڕێ دەی با بچێ بۆلای یەکەم سەرچاوە، نەك بچێ بۆلای کەسێ کە لەو یەکەم سەرچاوە وەری گرتووە، یان وەری گرێ لە ئەسڵ و بنەچەکە کە خاوەنی هەموویەتی، نەچێ پاش خوان و لە دەست ماوەی خەڵك وەربگرێ. لە کاتێك دا ئەو خەڵکە وێنەی خۆیەتی، هەموو سواڵ کەر و بێ نەواو لاوازن!

ئەم بیرو باوەڕە راستە شتێکی سەرەکی و بنەڕەتە لە ئایین و عەقیدەی ئیسلام دا. جێگیر بوونی تەنها ئەمە لە هەر دڵێك دا بەسەر بۆ ئەمەی بوەستێ بە تەنیا لە رووی هەموو جیهان دا بە سەربەرزی و دامەزراوی و بە بێ لەخشە و بێ ئارامی و دڵە تەپە، چونکە زانا و شارەزای رێگایە بۆ بەرزی و گەورەیی و شەرەف، کە جگە لەوە رێگایەکی تری نی یە! بێگومان ئەو دڵە سەر شۆڕ ناکات بۆ هیچ زۆردار و ستەمکارێ. بۆ رەشەبای هیچ سەرکێشێ، بۆ هیچ بەسەرهات و رووداوێکی گەورە و گرنگ. بۆ هیچ وەزعێ و بۆ هیچ حوکمڕانی یەك، بۆ هیچ میری و دەوڵەتێ، بۆ هیچ بەرژەوەندی یە، بۆ هیچ هێزێ لە هێزەکانی ئەم زەوی یە. ئایا لەبەر چی و لەسەرچی مل شۆڕ بکات و سەر داخا؟ لە کاتێك دا کە هەموو شتەکە هی خوایە و بە دەست خوایە، هیچ کەس هیچی بە دەست نی یە مەگەر بە ئیزن و رەزامەندی خوا.

جا لەبەر ئەوە دەست نیشان ئەکات بۆ رێگا و هۆی دەست کەوتی ئەو زاڵی و بەرزی و شەرەفە بۆ کەسێ بیەوێ لە خوای داوا بکات، ئەفەرموێ: ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ﴾ [1] تەنها بۆلای خوا بەرز ئەبێتەوە وشە و وتەی پاك کە بریتی یە لە ﴿لا إله إلا الله﴾ کە هەموو ژیریی یەکی ساغ بە پاك و خاوێن و خۆشی دائەنێ، چونکە تەنها ئەو راستە و هەموو پێغەمبەران بەو وشەیە رەوانە کران بۆ چەسپاندن و بەدی هێنانی مانا و مەبەستەکەی لە ژیان دا کە تەنها ئەوە هۆی بەختەوەری یە لە هەردوو جیهان.

مەبەست لە بەرزبوونەوەی ئەو وشە پاکە وەرگرتنی یەتی، یان بەرز بوونەوەی نامە و دەفتەرەکەی بەهۆی مەلائیکە دەفتەردارەوە بۆ ئاسمان و ئەو شوێنە بەرزەی خوا دیاریی کردووە. ﴿وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ﴾ ئەو وشە پاکە کردەوەی چاك بەرز ئەکاتەوە و رێز و قەدری پێ ئەدات لای خوا، چونکە هەر کردەوەیەك هەرچەند بە رواڵەت چاك و گەورە و سوود بەخش بێت، هەرچەند بەو جۆرە سەرنج بدرێ ماتوڵ بنەڕەتەکەی ئەو وشە نەبێت و هۆ و سەرچاوەکەی ئەوە نەبێ ئەو کردەوە بەلای خواوە هیچ نرخی نی یە و هیچ سوودی لێ وەرناگیرێ لە رۆژی دوایی دا. یان مەبەست ئەوەیە کردەوەی چاك ئەو وشە پاکە بەرز ئەکاتەوە و رێزی و قەدری دەرئەخات و ئەجرو پاداشتی گەورەتر ئەکات، چونکە جوانی و بەرزی و شیرینی ئەو وشەیە کاتێ روون ئەبێتەوە کە مەبەست و ماناکەی لە واقیع و ژیان دا بەدی بێت، ئەو کاتە ئەجرو پاداشتی شایانی دەست کەوت ئەبێ. بێجگە لەو دووبارە باری تریش هەڵئەگرێ: خوا کردەوەی چاك بەرز ئەکاتەوە و رێز و قەدری پێ ئەدات. بە هەرکام و لەسەر هەربار رێگا بۆلای خوا ئەو وشە پاکەیە و کردەوەی چاك لەسەر بنەڕەتی ئەو وشەیە. هۆی رەزامەندی خوا تەنها ئەوەیە، کەواتە تەنها خاوەنی ئەو وشە و کردەوەیە بەرێزە بەلای خواوە، تەنها ئەوە هۆی شەرەف و گەورەیی و عیززەتە بەلای خواوە، کەواتە هەرکەس بە دوای عیززەت و شەرەف دا ئەگەرێ با تەنها لە خوای داوا بکات و رێگای دەست کەوتیشی تەنها وشە و کردەوەی چاکەیە.

---

[1] لەم ئایەتەدا چەند رایەك هەیە لە راڤە و تەفسیری دا، هەرچەند هەموو نەگونجێن، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدا وتراوە بە هێز ترە زۆربەی لەسەرە.

سەربەرزی و شەرەف راستەقینە سیفەتێکە لە یەکەم جارەوە لە دڵ دا جێگیر ئەبێ پێش ئەوەی نیشانە و دروشمی دەرکەوێ لەناو خەڵك دا، هەرکات ئەو سیفەتە جێگیر بوو لە دڵ دا ئەو دڵە بەرز و بڵند ئەبێتەوە بەسەر هەموو هۆی زەلیلی و سەر شۆڕی و سەر داخستن بۆ هیچ کەس و هیچ شتێ بێجگە لە خوا.

لە یەکەم جارەوە بەرز و بڵند ئەبێتەوە بەسەر خۆی دا، بەرز ئەبێتەوە بەسەر حەز و ئارەزووواتی نەفس دا کە بە هێز و پاڵ پێوەنەر و زۆردار و ناچار کەرن، زۆربەی خەڵکی لەم رێگایەوە دووچاری سەرشۆڕی و مل کەچی ئەبن بە شێوەیەکی ناڕەوا و نەشیاو و زاڵ ئەبێ و بەرز ئەبێتەوە بەسەر ترس و چاوەڕوانی لە خەڵکی و لە هەر شتێ لەم جیهانەدا، هەرکات هەرکەس ئاوا زاڵ و سەرکەوتوو بوو بەسەر ئەمانەدا ئەو کاتە هیچ کەس ناتوانێ لە هیچ رێگایەکەوە مل کەچ و سەر شۆڕی بکات. چونکە هەرکەس لەم جیهانەدا دووچاری هەر سەر شۆڕی و مل کەچی یە ببێ هەمووی لە رێگای حەز و ئارەزووواتی نەفس و ترس و بیم و چاوەڕوانی یەوە دووچار ئەبێت، هەرکەس زاڵ بێت و سەرکەوێ بەسەر ئەوانەدا بێگومان زاڵ و سەرکەوتوو ئەبێت بەسەر هەموو بەسەرهات و هەموو بار و هەموو ئادەمی و هەموو شتێك دا، ئەمەیە سەربەرزی و عیززەتی راستەقینە کە هۆی هێز و بەرزی دەسەڵاتە بۆ خاوەنەکەی.

عیززەت و سەربەرزی بریتی نی یە لە سەرکێشی و خۆ بەزل زانی و سەر دانەخستن بۆ حەق و راست و کەشخە کردن بە بەتاڵ و ناحەقی و لوت کردن بە کەڵەشاخ. بریتی نی یە لە دەست درێژیی و دەست وەشاندن و کوشتن و بڕین بە بێ سەر لێ کردنەوە و بەزەیی... نەخێر عیززەت و سەربەرزی بریتی نی یە لە هیچ کام لەمانە و هەر شتێ تری ناڕاست و ناڕەوا، بەڵکو لە راستی دا بریتی یە لە زاڵ بوون و بەرز بوونەوە بەسەر ئەو هەموو شتە ناڕاست و ناڕەوایانەی کە باس کران، ئینجا لە راستی دا بریتی یە لە مل کەچی بۆ خوا، شەرم و بیم لەخوا و سام و تری لێ ی و خۆ پاراستن لە خوا و شکاندنی سنووری، ئاگاداری و چاودێریی خوا و رەزامەندی خوا لە خۆشی و ناخۆشیدا، جا بەهۆی مل کەچی تەنها بۆ خوا سەر بەرز ئەبێتەوەلە ئاستی هەموو شتێکی تر، بەهۆی بیم و ترس تەنها لە خوا خوگر و دامەزراو و بەرگر ئەبێت بۆ هەرشتێك خوا نایەوێ، هۆی ئاگاداری بە خوا و چاودێریی ئاگاداری خوا هیچی مەبەست نابێ بێجگە لە رەزامەندی خوا، ئەوەبوو رادە و پلەی بەرزی وشەی پاك و کردەوەی چاك لای خوا کە تەنها ئەوەش بوو رێگای عیززەت و سەربەرزی.

ئینجا لاپەڕەی دژ و بەرامبەر نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ کەسانێ کە پیلان ئەگێڕن و تەگبیری تاوان و کردەوە خراپەکان ئەکەن، ئەوانە ﴿لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ﴾ بۆیان هەیە سزایەکی بەتین، بێجگە لەوەش هەر هەوڵ و تەقەلایە ئەدەن سەری لە هیچەوە دەرئەچێ و بە ئاوات و ئامانج ناگەن. وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ پیلان و تەگبیری خراپی ئەوانە بێ بەر و بووم ئەبێ و کار ناکات و نامێنێتەوە، ئەوانە ناگەن بە ئاوات و ئامانجیان، بۆ وێنە: یەکەم تاقمی پیلان گێڕی ئەم ئوممەتە هەر هەوڵ و تەقەلایان داو هەر پیلانێکیان گێڕا سەبارەت بە بەرگری ئەم ئایینە و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هەمووی سەری لە هیچەوە دەرچوو، ئەو کۆبوونەوە گرنگەی کە کردیان لە(دار الندوە) دا بۆ لەناو بردنی پێغەمبەر(ﷺ) هیچ کاری نەکرد و گەڕایەوە بەسەر خۆیان، ئەوە بوو ماوەیەکی کەم دوای ئەوە هەموو لە بەدردا تیا چوون و خوا لە ریشەی هێنان، هەروەها هەر پیلان و تەگبیرێکی خراپ لەپاش یەکەم تاقم لەلایەن جێگر و جێنشینەکانیانەوە سەری لە بۆشی یەوە دەرچوو، مەبەست و ئامانجەکەی پێک نەهێنان کە بریتی بوو لە بەرگری ئیسلام و نەهێشتنی ئیسلام، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوەتا تا بێت گەورەیی و راستی و گرنگی ئیسلام روون ئەبێتەوە، تا بێت رووناکی یەکەی پەرە ئەسێنێ و بڵاوە ئەکات لە جیهان دا، تەنانەت لەناو جەرگەی وڵاتی پیلان گێڕەکان دا، لەگەڵ ئەوە کە چەند چەرخە لە دەر و لە ناوەوە کەندە ئەکرێ لە ئیسلام!! زۆربەی ئەو تاوانبار و پیلان گێڕانە بە دوای گەورەیی و سەربەرزی و زاڵ بوون ئەگەڕێن، ئەیانەوێ ئەوەیان دەست کەوت ببێ لە رێگای ئەو پیلان و خراپەکاری یەوە، گەلێ جار وا دەرئەکەون و بە رواڵەت سەرکەوتوو بەرز و بەهێزن. بەڵام نەخێر رێگای زاڵی و سەربەرزی تەنها ئەوەیە خوا نەخشەی کێشا بۆمان. تەنیا ئەو وشە پاکە و کردەوەی چاکە، بەرو بووم و مانەوە تەنها لەو رێگایەدا دەست کەوت ئەبێ، پیلان و خراپەکاری ئەبێ هەر بێ خێر و بێر و دوا براو بێت، هەرچەند ماوەیە هێزو کەشخە و بافیش فەراهەم بێنێ بۆ پیلان گێڕەکان.

لەپاش باس و دوان لە پەیدا بوونی گیان و ژیان بە شێوەی گشتی لە ئاو، ئینجا باسی پەیدا بوون و فەراهەم هاتنی یەکەم جاری ئادەمی ئەکات. لەگەڵ باسی هەندێ لە بەسەرهات و چەند قۆناغێ کە بەسەر ئادەمی دا تێپەڕ ئەکات و هەموو ئەو بەسەرهات و قۆناغانە بەڵگە و نیشانەیەکی ئاشکران بۆ هەرکەس کە ژیریی لەکار نەکەوتبێ و سمجەسای لێ نەبڕابێ، ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ خوا ئێوەی دروست کرد لە خاك، ﴿ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٍ﴾ لەپاش ئەوە ئینجا دروستی کردن لە دڵۆپێ ئاو.

باسی پەیدا بوونی یەکەم جار لە خاك لە قورئان دا زۆر هاتووە، هەروەها باسی یەکەم قۆناغی ئادەمی لە سکی دایکی دا کە بریتی یە لەو دڵۆپە ئاوە... خاك بێ گیانە، ئەو دڵۆپە ئاوە گیانی تیا هەیە، یەکەم موعجیزە و شتێ کە سەرسوڕهێنەرە ئەو گیانەیە کە هیچ کەس نازانێ چۆن هات و دێت، چۆن تێکەڵی ئەو خاکە بێ گیانە بوو، ئەوە سیڕ و شتێکی نهێنی نەزانراوی نەناسراوە لەسەر هەموو ئادەمی، شتێکی راستیشە و هەستی پێ ئەکرێ، بە هیچ رەنگ چار نی یە و ئەبێ هەموو کەس دانی پیا بنێ، بێگومان بەڵگە و نیشانەیەکی زۆر روون و بەهێزیشە لەسەر خوایەتی خواو زانین و دەسەڵاتی، گواستنەوە لە قۆناغی بێ گیانی یەوە بۆ قۆناغی گیانداری گواستنەوەیەکی زۆر دوور و درێژ، گەورەتر و گرنگ ترە لە ماوەو مەسافەکانی چەرخ و جێگا و شوێن. بیر کردنەوەو ورد بوونەوە لەو گواستنەوە دوایی نایە و هەر دڵێ زیندوو بێت بێ تاقەت نابێ لێ ی کاتێ بە چاوێکی قورئانی سەرنجی ئەم جۆرە شتانە بدات. لەپاش ئەوە گواستنەوە لە سێڵێکی ئەو دڵۆپە ئاوە بۆ ئەو ئادەمی یە تێرو تەواوە بە هەموو کەرەسە و ئەندام و کۆئەندام و ئەو هەموو هێز و وزەیە. بەڕاستی گواستنەوەیەکی ئێجگار گرنگ و سەرسوڕهێنەرە!! چونکە ئەو تەنیا سێڵە لە کوێ و ئەو ئادەمی یە تێرو تەواوە لە کوێ، ئەگەر شتەکە ئاوا بە ئاشکرا نەبینرایە بڕوا نەئەکرا بە گونجانی ج جای بەدی هاتنی، بە تایبەتی پەیدا بوونی نێرو مێ کە دوو شتی جیاوازن لەو دڵۆپە ئاوە کە بە رواڵەت هیچ جۆرە جیاوازی یەك نی یە لە بەش و پارچەکانی دا.

پەیدا بوونی ئەو دوو جۆرە جیاوازە زۆر شتێکی گرنگە و شایانە بە تێفکران و بیر لێ کردنەوەیەکی تایبەتی وەکو بە تایبەتی دەست نیشانی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا﴾ ئینجا خوا کردنی و گێرانی بە چەند نێرو مێ یەك... ئیتر مەبەست گێران بێت بەو دوو جۆرە لەکاتی بێچوویی و لە سکی دایك دا، یان مەبەست گێرانی ئەو دوو جۆرە بێت بە حەلاڵ و هاوسەر لەپاش گەورە بوون و خواستن و شوو کردن.

بەڕاستی شوێن کەوتن و بیر کردنەوە لەو تەنیا سێڵە کە دابەش ئەبێت و ئەو هەموو سێڵەی لێ پەیدا ئەبێت، هەر کۆمەڵەیەکی تایبەتی یەك ئەگرن بۆ پێك هێنانی ئەندام و پارچەیەکی تایبەتی کە فەرمانێکی دیاریی و سروشتێکی دیاری هەیە، ئینجا کۆمەکی و یارمەتی ئەو هەموو ئەندام و پارچەیە و ڕێك و پێکی و گونجاوی یان لە نێوان خۆیان دا و یەك گرتن و کۆبوونەوەیان تا ئەبن بەو ئادەمی یە لەسەر ئەو شێوە و بارە نایابە سەرسوڕهێنەرە، هەرکام لەو ئادەمی یانە ئەبێ بە گیان لەبەرێکی جیاواز لە هەموو گیان لەبەرانی تر، لە هەموو یەکێ لە تیرەکەی خۆیشی، بەڵکو لە نزیك ترین کەسی، بە جۆرێ هیچ دوو کەسێك دەست ناکەوێ، کە وەکو یەك وابن، تەنانەت با دوانەش بن و لە سکی دایك دا یەکیان گرتبێ!! هەموو ئەوانەش لە دڵۆپێ ئاو پەیدا ئەبن کە هەست ناکرێ بە جیاوازی سێڵەکانی!

ئینجا بە تایبەتی بیرکردنەوە لەو هەموو سێڵە هەتا ئەو دوو جۆرەیان لێ دەرئەچێ – نێرو مێ – کە ئەوانیش یەك ئەگرن و لە هەمان ڕێگاوە بە دڵۆپە ئاوەکەیان تاقمی تازە فەراهەم دێت کە ئەمانیش بەهەمان قۆناغەکان دا دێن، بە بێ گۆڕان و لادان , هەروەها هات و دێت و ئەڕوا، بەڕاستی ئەمانە هەموو تا بیریان لێ بکرێتەوە جێگای خۆیەتی، تا قوڵ تر بیریان لێ بکرێتەوە نایابی یان روون تر ئەبێتەوە و زۆرتر سەر سوڕ ئەمێنێ لە کرداری بێ وێنەی خوای پەروەردگار.

ئینجا به بۆنەی ئەم دەست نیشانە و شێوەیەك لە زانینی بێ پەی خوا ئەخاتە بەرچاو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ﴾ هیچ مێینەیەك سك و بەر هەڵناپێچێ و هیچ بەری دانانێ مەگەر بە ئاگاداری و زانینی خوا.

ئایەتەكە بە مێینەی ئادەمی یەوە نەوەستا، بەڵكو تێپەری كرد بۆ هەموو جۆرە مێینەیەك لە هەر گیان لەبەرێ تەنانەت ئەوانەش كە هێلكە ئەكەن هەر ئەیگرێتەوە، چونكە هێلكەش سك و بەرێكی تایبەتی یە و لە جۆرێكی تایبەتی یە. ئەوەش بێچووەكەیە كە گەشە ناكات لەناو لەشی دایكەكەیدا، بەڵكو بە هێلكەیی دێتە دەرەوە و ئینجا گەشە ئەكات لە دەرەوەی لەشەوە بە پەروەردە و پێگەیاندنی دایكەكەی یان بە پەروەردە و پێگەیاندنی دەست كردی، هەتائەبێ بەبەچكەی تەواوئینجا دێتە دەرەوە و گەشەی عادەتی خۆی ئەكات.

زانین و ئاگاداری خوا ئا بەو جۆرە چاودێرە بەسەر هەموو هەڵپێچان و دانانێك دا لەم بوونەوەرە پان و فراوانەدا!!! شێوە كێشانی زانینی بێ سنووری خوا بەم جۆر و شێوە نایابە شتێكە لە سروشتی و زیهن و خەیاڵی ئادەمی بەدەرە و شتی وای بە خەیاڵ دا نایەت و نازانێ بیڵێ. كەواتە ئەمە خۆی بە خۆی رابەر و بەڵگەیەكی روونە لەسەر ئەوە كە خوا ئەم قورئانەی ناردووەتە خوارەوە.

ئەمە یەکێکە لەو نیشانانەی کە هەر لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ﴾ [1] هیچ تەمەن درێژ کراوێ تەمەنی درێژ ناکرێ، هیچ تەمەن کۆتایە تەمەنی کەم و کۆتا ناکرێ مەگەر هەموو ئەوە لە عیلم و زانینی خوادایە و بە پێی زانین و بڕیاری ئەو بووە و ئەبێ. جا وەرە با خەیاڵ بڕوا و بگەڕێ بەدوای هەرچی گیان لەبەر و زیندەوەر هەیە لەم بوونەوەرەدا لە درەخت و هەموو رواوێ لەم زەوی یەدا و هەموو پەلەوەر و کرم و مار و ئاژەڵ و ئادەمی و هەموو شتی تر لە هەموو جێگا و شوێن و وڵاتێك و لە هەموو کات و چەرخێ بە درێژایی تەمەنی ئەم جیهانە، ئینجا تێ بگات و بزانێ کە هەریەکێ لەو کۆمەڵە – کە نایەتە ژمارە، هیچ کەس ژمارەی نازانێ بێجگە لە پەروەردگاری – ژیان بەسەر ئەبا و تەمەنێکی تایبەتی دیاریی کراوی هەیە ئیتر زۆر و درێژ یان کەم و کورت، ئەوە هەمووی بە پێی زانین و بڕیاری خوایە، ئەو زانینە دەوری داوە و بەستراوە پێ یەوە لە پێش دروست کردنیان و لەپاش دروست کردنیان هەتا هەتایە.

بەڵکو ئەو زانین و بڕیارە گشتی یە و دەوری هەموو بەش و پارچەیەکی داوە لە هەرکام و لە هەر یەکێ لەوانەی کە باس کران. هەموو بەش و پارچەیەکیش تەمەنی درێژە یان کورت، هەر گەڵایە لە هەر درەختێ تەمەنی تایبەتی خۆی هەیە ئیتر درێژ یان کورت؛ هەموو پەڕێ لە پەلەوەر زۆر ئەمێنێتەوە یان کەم و ئەکەوێت و با ئەیبات، هەموو شاخی چوار پێ یە زۆر ئەمێنێتەوە یان کەم و لە شەڕە شاخ دا ئەشکێ و دائەکەوێ، هەموو چاوی چاودارێ یان هەموو تەڵە موویەك ماوەی مانەوەیان زۆر بێ یان کەم، هەروەها...

ئەوانە هەموو بە پێی زانین و بڕیاری خوایە و گشتی کۆبووەتەوە لەناو زانینە گشتی یە وردە بێ سنوورەکەی خوادا بە بێ ئەرك و هەوڵ و خەریك بوون , وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بەڕاستی ئەوەی کە باس کرا لەسە خوا ئاسانە.

---

[1] ڕاڤە و تەفسیری ڕستەی ﴿ولا ينقص﴾ و هەروەها وشەی ﴿كتاب﴾ بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەم بە بەهێز زانی کە لە تەفسیرەکەدایە.

کاتیٚ خەیاڵ بڕوا و بەکەوێتە شوێنی ئەوانەی کە ئەم ئایەتە دەست نیشانی بۆ کرد، بەڕاستی ئەبیٚ سەرسام و سەرگەردان ببیٚ، ئەندازیٚ تیٚ ئەگات لە بیٚ سنووری و بیٚ پەیی زانینی خوا.. بەڕاستی ئەگەر قورئان ئەم جۆرە شتانە ئەفەرمویٚ و سەرنجی خەڵکی بۆ رانەکێشیٚ هەرگیز بیرو هۆش و خەیاڵی خەڵك بۆ ئەم جۆرە شتانە ناڕوا و پەی پیٚ نابات، کەواتە هەرکەس بفامیٚ تیٚ ئەگات و دڵنیا ئەبیٚ کە ئەم جۆرە تەمیٚ و رێنموونی یە لەلایەن خواوەیە و لە سنووری ئادەمی بە دەرە.

ئەو درێژیی و کورتی تەمەنە کە دەست نیشانی بۆ کرد هەڵئەگریٚ بە پیٚی زۆر و کەمی کات و مانگ و ساڵ بێت، هەرچۆنیٚ هەڵئەگریٚ بە پیٚی پیت و فەڕ و بیٚ پیت و بیٚ فەڕی بێت، زۆرکەس بووە و هەیە خوا یارمەتی ئەدات لە ماوەیەکی زۆر کەم لە ژیانیدا ئەوەندە کاری پڕ سوود و بەفەڕ ئەکات کە بە چەند ساڵ و چەرخیٚ نەکریٚ و بەدی نەیەت، چەند کەس بووە و هەیە کە بە ساڵ و کات ماوەی ژیانی زۆر درێژە، بەلاّم هەمووی بیٚ خێرو و بێرو بیٚ سوودە و هەمووی بە فیڕۆ رۆیشت و لە دەستی چوو، ئەوەش هەموو لە زانینی خوادایە و بە گوێرەی بڕیاری ئەوە. هەرچۆنیٚ یەکە یەکە تەمەنی دیاریی کراو و تایبەتی خۆیان هەیە. هەندیٚ درێژ و هەندیٚ کورت بە پیٚی زانین و بڕیاری خوا. بەڵو هەموو شتێکی بیٚ گیانیش لەم بوونەوەرەدا بە بیٚ جیاوازی ئیتر شاخ و بەرد بێت، یان غار و ئەشکەوت، یان کانی و رووبار، هەروەها لە دەست کردەوەکانی ئادەمیش، کۆشك و خانوو، سەیارە و تەیارە و هەموو شتەکانی تر. ئەمانەش بە وێنەی گیانداران تەمەن و ئەجەلی دیاری کراوی تایبەتی یان هەیە، هەموو لە دەفتەر و کتێبی خوادایە، بێگومان تێگەیشتن و حاڵی بوون بەم شێوە راستە دڵ بێدار ئەکاتەوە بۆ بیر کردنەوە لەم بوونەوەرە بە هەستێکی تایبەتی تازە، بە رەوشتێکی تازە، هەر دڵیٚ ئاوا هەست بکات بە دەست و چاوی قودرەتی خوا بەسەر هەموو شتێك دا بەم قوڵی و وردی یە، بێگومان زەحمەتە ئەو دڵە بیٚ هۆش و بیٚ ئاگا ببیٚ یان ون و گومڕا ببیٚ، ئەو دڵە بە هەر لایەك دا لا بکاتەوە دەست و چاوی قودرەتی خوا ئەبینیٚ و چاودێریی و زۆر و دەسەلاّتی خوا بەدی ئەکات لە هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا. بەم جۆرە قورئان دڵە خوا پێداوەکان دروست ئەکات و پیٚ یان ئەگەیەنیٚ و پەروەردەیان ئەکات!!

ئینجا لە گەردشە بوونەوەری یەکەی دا سەرنج ڕائەکێشێ لەبارەی ئاو لە زەوی دا کە کردوویە بە دوو جۆر تاڵ و شیرین، هەردوو ژێر بار کراون بۆ خزمەتی ئەم ئادەمی یە. ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْبَحْرَانِ﴾ ئەو دوو جۆرە دەریا و ئاوە فراوانە کە فەراهەم هێنراون هاوتا و یەکسان نین، بەڵکو جیاوازن بەم ڕەنگە ﴿هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ﴾ ئەمەیان شیرین و خۆش و تینو شکێنە ﴿سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ﴾ خۆش گەوارە و ئاسان ئەچێتە خوارەوە لە گەروودا ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ ئەمەیان تام گۆڕا و تفت و زۆر سوێر و تیژە.

شتێکی ئاشکرایە کە ئاو بەو دوو جۆرە جیاوازە، بێگومان ئەوەش چەند حیکمەت و بەرژەوەندی تیایە کە بەشێکی ئاشکرایە لە ئێمەیشەوە، جارێ جۆرە شیرینەکەی هەموو ئەزانین کە ژیان لەسەر ئەو ڕاگیرە و هۆی فەراهەم هاتنی هەموو زیندوو زیندەوەرێکە لەم زەوی یەدا، لەبارەی بەش و جۆرە تاڵەکەیەوە کە بریتی یە لە دەریا لوشەکان با گوێ بگرین لە خاوەنی کتێبی(الإنسان لا يقوم وحده) هەندێ لەو حیکمەت و بەرژەوەندی یەمان بۆ باس ئەکات: ئاو براو لەو پەڕاوەدا ئەڵێ: بە درێژایی کات و چەرخ بە هەمیشەیی گاز و هەڵم لە زەوی یەوە بەرز ئەبێتەوە، زۆربەی ئەو گاز و هەڵمەش ژاراوی یە، کەچی لەگەڵ ئەوەدا هەوا چەپەڵ نابێ و گۆڕان ڕوو نادات لە ڕادەی هاوتاو هاوکێشی کە پێویستە بۆ ژیانی ئادەمی، هۆی ئەو نەگۆڕانەش ئەو دەریا و دەریا لوشانەیە کە ژیان و خۆراك و باران و هەوای خۆش و هەموو گیا و گژ و دانەوێڵە یارمەتی و کۆمەکییان لێ وەرئەگرن. ئەم ئەندازە کە دەرکەوتووە بۆمان بەسە بۆ ئەمەی هەموو خاوەن ژیریی یەکی ساغ تێ بگات کە ئەو وردەکاری یە هەروا لە خۆیەوە و بە ڕێکەوت بەدی نەهاتووە، بەڵکو لەسەر دەستی قودرەتی خوایەك دا بەدی هاتووە کە زانایە بە هەموو شت و لێزان و کاردروستە لە هەموو کاروبارێك دا ئاسراو و نەناسراو!! ئینجا ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەم دوو جۆرە جیاوازە یەك ئەگرن لە خزمەتی ئادەمی دا ، هەردوو ژێر بار کراون بۆ سوود و بەرژەوەندی ئادەمی.

وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى

---

ئەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ لە هەركام لەو دوو دەریا گۆشتی تەڕ و تازە ئەخۆن، ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ دەرئەهێنن خشڵێ ئەیپۆشن.

ئەو گۆشتە تەڕو تازەیە گۆشتی ماسی و گیانلەبەرانی دەریایی یە بە هەموو جۆرەکانی یەوە، خشڵەکەیش لە دوڕ و لۆلۆ و مەرجان و یاقوت و سەدەفە [1] ﴿وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾ ئەبینی کەشتی لە دەریادا ئاوەکە لەت ئەکات و هاتوچۆ ئەکات پیایان دا ﴿لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ﴾ بۆ ئەمەی هەندێ لە چاکە و بەهرەی خوا دەستی خۆتان بخەن بە گوزەر کردن و سەفەر و هاتوچۆ بە دەریاکان دا و بازرگانی و ئەو هەموو دەست کەوتی ناو دەریا ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەمەی سوپاسی خوا بکەن کە ئەو هەموو چاکە و بەهرەی ئامادە کردووە و خستوویەتە بەر دەستتان. ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە سەرنج راکێشانی بۆلای شەو و ڕۆژ و بە دوادا هێنان و بردنیان بەناو یەکتردا، ئینجا بۆ ژێر بار کردنی خۆر و مانگ بە پێی ڕژێمێکی نەخشە کێشراوی نەگۆڕاو، ئەفەرموێ: ﴿يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ﴾ شەو ئەخاتە ناو ڕۆژ، ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ﴾ ڕۆژیش ئەخاتە ناو شەو، بەم ڕەنگە ئەیان هێنێ بە دوای یەک دا و

---

[1] لە سورەتی ﴿الرحمن﴾ دا بە درێژیی باسی ئەم لۆلۆ و مەرجانەم کردووە، کەواتە لێرەدا درێژە پێدان پێویست نی یە و با تەماشای ئەوێ بکرێ.

ئەیان خاتە جێگا و شوێنی یەکتر. یان لە شەو ئەخاتە سە رۆژ و لە رۆژ ئەخاتە سەر شەو وەکو ئەبینرێ لە هەر چوار وەرزەکان دا بەو رژێمە رێك و نەگۆڕاوە بە درێژایی چەرخ و تەمەنی ئەم جیهانە، کە ئەوەش رابەر و نیشانەیەکی زۆر روونە لەسەر تاك و تەنیایی خوای پەروەردگار. ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ خۆرو مانگی ژێر بار کردووە ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەرکام لەم دووانە ئەگەڕێ بۆ ماوەیەکی ناوبرلوی دیاریی کراو. بێگومان ژێر بار کردنی ئەم دووانە و گەڕانیان تا ماوەی دیاریی کراوی خۆی کە بێجگە لە خوا هیچ کەس نایزانێ... شتێکی ئاشکرایە و وا بە پێش چاوو هەموو چاو ساغێ ئەیان بینێ، ئیتر با لە بارەیانەوە هیچی تری نەزانرێ، ئەم دووانە هەردووکیان بە بەرچاومانەوە هەڵدێن و ئاوا ئەبن، بە بەرچاومانەوە ئەم جولاّن و خولانەوە و گەردشە هەیە بە بێ شێوان و گۆڕان، جا لەبەر ئەوە ئەمەیش نیشانەیەکی روون و گرنگە بۆ هەموو ژیریی یە لە هەموو چەرخ و کاتێك دا، لەناو هەموو چین و تاقم و گەلێك دا، بەڵێ ئەمڕۆ ئێمە زۆر شت ئەزانین لەبارەی ئەم نیشانە و بەڵگەیانەوە کە یەکەم تاقم نەیان زانیوە، رەنگە لە داهاتوودا چەند شتێ تریش دەرکەوێ کە ئێمە ئێستا بێ ئاگاین لێ یان. ئەوە هیچ گرنگ نی یە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئەم نیشانە و بەڵگەیانە شتێ ئەخەنە دڵ و دەروونی ئێمە کە هەر ئەوەی خستووەتە دڵ و دەروون ئەوانەوە، دڵی ئێمە ئەخەنە لەرزە و هەشۆکە هەرچۆنێ دڵی ئەوانە ئەخست، بیرو هۆش ئەکاتەوە بە ئێمە و دەستە قودرەتە بێ وێنەکەی خومان نیشان ئەدات کە داهێنەر و ئیش کەرە لەم بوونەوەرەدا هەرچۆنێ بیرو هۆشی کردەوە بە یەکەم تاقم و ئەو دەستە قودرەتەی نیشان دان.

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾
إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ

**ئینجا لە ژێر تیشکی بەفێز و ڕووناکی ڕوونی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە ڕوونانە ڕاستی خوایەتی خوا و پەروەردگارێتی ئەو ئەخاتە بەرچاو، بێ کەڵکی و بێ نرخی و پڕو پووچی هەموو پەرستراوێکی تر، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئەوەی کە بای ناردوو هەوری فەراهەم هێنا، ئەوەی کە زەوی زیندوو کردەوە پاش مردن و وشك بوونی، ئەوەی کە ئێوەی لەخاك دروست کرد، ئەو کەسەی کە ئێوەی کرد بە چەند جۆر و هاوسەرێ، ئەو کەسەی زانا و ئاگادارە بە هەر بەرو سکێ کە مێینە هەڵی ئەگرێ و ئەیپێچێ و ئەیبێ و دایئەنێ، ئەو کەسەی کە زانایە بە هەموو تەمەن درێژ کراوی و هەموو کەسێ کە تەمەنی کەم و کورت کراوە، ئەو کەسەی کە دوو جۆر ئاوی دروست کردووە، ئەو کەسەی کە شەو و ڕۆژ ئەبا بەناو یەکتردا و خۆر و مانگی ژێر بار کردووە، تەنها ئەوە کە ناوی ﴿الله﴾ یە پەروەردگارتانە... تەنها ئەو شایانی پەرستنە ﴿لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾ پادشایەتی تەنها بۆ ئەوە و ئەو خاوەنی هەموو شتێکە ﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ﴾ ئەوانەی کە ئێوە هاواریان لێ ئەکەن و ئەیان پەرستن ﴿مِن دُونِهِۦ﴾ بێجگە لە خوا و لە پەرستنی خوا تێپەڕ ئەکەن بۆ پەرستنی ئەوانە ﴿مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾ ئەوانە خاوەنی پەردە و پێستێکی ناسك نین کە پێچراوە لە دەوری ناوکە خورما. واتە خاوەنی هیچ شتێ نین تەنانەت ئەو شتە بێ کەڵك و بێ نرخەیش.**

**ئینجا زیاتر بێ نرخی ئەو پەرستراوانە ڕوون ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِن تَدْعُوهُمْ﴾ ئەگەر نزاو هاواریان لێ بکەن ﴿لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ﴾ نزاو هاوارەکەتان نابیستن. چونکە ئەو پەرستراوانە یان دارو بەردن، یان ئەستێرە و مانگ و ڕۆژن، یان جن و مەلائیکەن، هەموو ئەوانە لە ڕاستی دا خاوەنی ئەو پەردە و پێستە بێ نرخەیش نین و کاروباری ئەوەشیان بە دەست نی یە، هەموو ئەوانە نابیستن، لە بەندە گومڕاکانیان. ئیتر هەر نابیستن، یان هێنی ئەو گومڕایانە نابیستن.**

وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾

﴿وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ﴾ ئەگەر بەمەرجێ بیشیان بیستایە نەئەهاتن بە هاوارتانەوە. چونکە ئەوانەی کە بیسەرن جن و مەلائیکەن. دەی جن بە هیچ ڕەنگ ناتوانێ بچێ بە هاواری کەسەوە. مەلائیکەیش ناچێ بە پیری ئەو گومڕایانەوە. ئەو بتانە لەم جیهانەدا بەو جۆرەن، ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾ لە ڕۆژی دواییش دا دان نانێن بە عیبادەت و پەرستنەکەتان دا، بێزاری دەرئەبڕن لە خۆتان و پەرستنەکەتان چ جای ئەوە بێن بە هاوارتانەوە. ئەم هەواڵەی کە پێتان ئەدرێ کەسێ پێتان ئەدات کە ئاگا و خەبەر دارە بە هەموو شتێ، بە هەموو کارێ، بەم جیهان و ئەو جیهانیش ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ هیچ کەس هەواڵت پێ نادات بە وێنەی کەسێ کە ئاگا و خەبەر دارە.

ئا بەمە ئەم بەش و پارچەیە دوایی هات لەم سورەتەدا، ئەو گەردشەی کە کردی بە دەروون بەو هەموو شتە نایابانەدا کۆتایی پێ هێنا، هەر دڵێ نەمردبێ و سوود وەرگربێ لەم گەردشە ئەگەڕێتەوە بە توێشووی تێرو تەواوەوە. تەنیا چەند ئایەتێکی وەکو ئەم ئایەتانە لە هەر سورەتێ بەسە بۆ هەر دڵێ کە بیەوێ ڕێنموونی وەرگرێ، بەسە بۆ هەرکەسێ کە بە دوای رابەر و بەڵگەدا ئەگەڕێ!!

ئینجا جارێکی تر ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئادەمی بانگیان لێ ئەکات کە تێڕوانینێ بکەن و سەرنجێ بدەن لە پەیوەندی یان بە خواوە، لە حەقیقەتی خۆیان، ئەگەڕێتەوە سەر پێغەمبەر(ﷺ) بە دڵنەوایی و دڵخۆشی دانەوەی لەو ئێش و ئازارەی کە ڕووی ئەکردە دڵی بەفەڕی بەهۆی بڕوا نەهێنان و سەرکێشی ئەو بت پەرستانەوە، هەروەها دەست نیشانی بۆ ئەکات بە چەند مەبەستێکی گرنگ تر وەکو بۆمان ڕوون ئەبێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾ ئەی خەڵکینە هەر ئێوەن بێ نەواو داماو پێویست بۆلای خوا ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ تەنها خوا دانەماو بێ پێویستە بە هەر شتێك، سوپاس کراوە و تەنها ئەو شایانە بۆ سوپاس بەهۆی ئەوەوە خاوەنی هەموو چاکە و بەهرەیەکە کە بە لێشاو ڕشتوویەتی بەسەر دروست کراوەکانی دا،

**﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾** ئەگەر بیەوێ ئێوە لەناو ئەبات و **﴿وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾** خەڵکێکی تری تازە ئەهێنێ لە باتی ئێوە کە لەسەر سیفەت و رەوشتی ئێوە نەبێ، **﴿وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾** ئەوە لەسەر خوا گران نی یە بە هیچ رەنگ و ئەو ئاڵ و گۆڕە یاخی نابێ لە خوا و سەرپێچی ناکات لێ ی، چونکە بۆ هەموو کار و فرمانێ هەر ئەوەی ئەوێ کە ویست و خواهیشی رووی تێ بکات ئیتر بێ تەفرە بەدی دێت بە پێ ی ویست و خواهیشەکە.

خەڵکی زۆر پێویستن بەمەی ئامۆژگاری بکرێن بەم ئایەتە و ئەوەی ئەم ئایەتە ئەیگەیەنێ پێ یان راگەیەنرێ لەکاتی بانگ کردنیان بۆلای خواو ئایینی خوا، لەکاتی هەوڵدان لە گەڵیان بۆ دەرهێنانیان لە تاریکی بۆلای رووناکی ئایینی خواو رێگا راستەکەی خوا، پێویستە تێ بگەیەنرێن کە ئەمان داماو و پێویستن بە خوا لە هەموو بار و رووبەکەوە. خوا بە هیچ رەنگ پێویست نی یە بەمان، ئەوان کاتێ بانگ ئەکرێن و بڕوا هێنان و پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا و سوپاس و چاو لەبەرییان بۆ خوا لەسەر ئەو هەموو چاکە و بەهرەیە کە رشتوویە بەسەریان دا، کاتێ بانگ ئەکرێن بۆ ئەوە بزانن کە خوا پێویستی نی یە بە پەرستن و سوپاسی ئەوان، خوا خۆی لە خۆی دا سوپاس کراوە. ئەوان هەرگیز ناتوانن یاخی ببن لە خوا و لە دەستی قودرەتی خوا دەرناچن، کەواتە ئەگەر بیەوێ ئەوان لەناو ئەبات و تاقمێ تر ئەهێنێتە جێگایان ئیتر لە وێنەو تیرەی خۆیان یان لە تیرەیەکی تر، بۆ خوا ئەوە ئاسانە و هیچی تێ ناچێ.

خەڵکی زۆر پێویستن بەو جۆرە ئامۆژگاری بکرێن و ئەو بیرو باوەڕە راستە لە دڵیان دا جێگیر بکرێ، با نەخەڵەتێن و خۆیان لێ نەگۆڕێ لە کاتێك دا کە ئەبینن خوا رێزی گرتوون و بە گرنگ گرتوونی، پێغەمبەرانی بۆ ناردوون، ئەو پێغەمبەرانەش – سەلامی خوایان لێ بێت – ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانەیان لەگەڵ داون بۆ گێڕانەوەیان لە گومرایی یەوە بۆ رێنموونی، دەریان بێنن لە هەموو تاریکی یەك بۆ رووناکی، با ئەو خەڵکە خۆیان بناسن و خۆیان لێ نەگۆڕێ و وا گومان ببەن کە ئەوان شتێکی گەورە و گرنگن لەسەر خوا! بڕوا هێنان و پەرستنەکەیان هیچی زیاد ناکات لە موڵك و پادشایەتی خوا!

خوای گەورە کە ئەو هەموو لوتف و بەزەیی یە بەکار ئەهێنێ لەگەڵ بەندەکانی، پێغەمبەرەکانی ئەو هەموو سزا و مەینەتەیان کێشاوە... خوای گەورە بەزەیی و لوتف و منەتی بەکار هێناوە و ئەبێ بەرهەمی ئەو سیفەتە شیرینانەی بەدی بێت. نەك لەبەر ئەوە کە ئەمانە موڵك و پادشایەتی خوا زیاد ئەکەن بە بڕوا هێنان و پەرستنەکەیان، یان کەم و کوڕی ئەکەن بە کوێری و سەرکێشی یان، نەك لەبەر ئەوە کە ئەوانە تاقمێکی نایابن و وێنەیان تازە دەست ناکەوێ، کەواتە چاوپۆشی یان لێ ئەکات، چونکە تازە وێنەیان دەست ناکەوێ و ناگونجێ گۆڕینیان بە تاقمێکی تر. بەو هەست و هۆش و تێگەیشتنەوە ئەبێ بەندە بەندەیی راستەقینەی پێ ناکرێ و رزگار نابێ لە سەرکێشی و یاخێتی.

بەڕاستی بەندەی تێگەیشتوو سەرسام و سەرگەردان ئەبێ لەو هەموو چاکە و لوتف و بەزەیی یە کە خوا بەکاری ئەهێنێ لەگەڵ ئەم ئادەمی یە لەڕ و لاواز و بێ دەسەڵات و دەستە پاچەدا، تا ئەو رادەیە بە گرنگ ئەیگرێ و رێزی لێ ئەگرێ و نرخی بۆ دائەنێ!

ئەم ئادەمی یە دانیشتوویەکی بچووکە لە دانیشتووەکانی ئەم زەوی یە، زەوی تابیع و شوێن کەوتوویەکی بچووکە لە تابیع و شوێن کەوتووەکانی خۆر، خۆر ئەستێرەیەکی بچووکە لەو هەموو ئەستێرەی کە نایەنە ژمارە بۆ ئێمە. هەموو ئەو ئەستێرانەش چەند خاڵ و نوختەیەکی بچووکن – هەرچەند گەورە بن – برژ و بڵاو بوونەتەوە لە بۆشایی لای سەرومان دا لەناو ئەم بوونەوەرەی کە بێجگە لە خوا هیچ کەس سنوور و ئەو پەڕ و ئەم پەڕی نازانێ. ئەم بۆشایی یە زۆر گرنگەی کە ئەو هەموو ئەستێرەی تیایە و چاو نادەن تیای دا مەگەر وەکو چەند نوختە و هەڵماتێ. ئەو بۆشایی یە گەورە و فراوانە بەخۆی و هەموو ئەستێرەکانیەوە بەشێکە لە دروست کراوەکانی خوا!!

ئینجا ئەم ئادەمی یە لەڕ و لاوازە بووە بە جێگای ئەو هەموو لوتف و بەزەیی و بەهرە و چاکەیە.. دروستی کردووە و دایهێناوە، کردی بە جێنشین لەم زەوی یەدا، هەموو هۆ و کەرەسەی هەڵسانی بەو جێنشینی یەی بۆ فەراهەم هێناوە و پێی داوە لە هەموو بار و روویەکی یەوە. ئەم ئادەمی یە گومڕا و بەرەڵا و سەر لێ تێك چوو ئەبێ تا رادەیەك هاوبەش رەوا ئەدات بۆ ئەو پەروەردگارە تاك و تەنیا و بێ وێنەیە یان هەر دانی پیا نانێ و باوەڕی بە بوونی نی یە!!

ئینجا لەخۆیان و لە تیرەی خۆیان پێغەمبەرانی بۆ ناردن، یەك لەدوای یەك، بە بەڵگە و نیشانە و موعجیزەوە، کتێب و پەڕاوی خۆی نارده سەریان، هەر بەو جۆرە هات تا دواترین

کتێبی کە قورئانە و لەم قورئانەدا بەسەرهات و سەرگوزەشتەی تاقم و گەلە رابوردووەکانی بۆ باس کردن، بەسەرهات و چارەنووسی ئەم تاقم و گەلانەی گێڕایەوە بۆیان، ئەدوێ لەگەڵیان لەبارەی خۆیانەوە، بۆیان دەرئەخات ئەو هێز و وزەی هەیانە، دەستە پاچەیی و لاوازی یان، بەڵکو بە تایبەتی ئەدوێ لە بەندەی تایبەتی و تەمێ و ئامۆژگاری ئەکات و رێگا و رچەی بۆ دائەنێ! ئەمانە هەموو ئەکات لەگەڵ ئەم ئادەمی یە بێ هێز و لاوازە کە گیان لەبەرێکی زۆر بچووك ئەژی لەم زەوی یەدا، کە ئەم زەوی یەش تابیعێکی بچووکە بۆ خۆر و خۆریش ئەو هەڵماتە زۆر بچووکەیەکە ئەخولێتەوە لەناو ئەو بوونەوەرە گەورەیەدا و خەریکە هەستی پێ نەکرێ لەچاو ئەودا! خوایش ئەو خوایە کە داهێنەری ئەم بوونەوەرەیە بە خۆی و هەرچی و هەرکەسێ کە تیایەتی بە تەنیا وشەیەك. بە تەنها روو کردنی ویست و خواهیشی، ئەو خوایە ئەم هەموو لابەرێ و لەناوی ببات و وێنەی بێنێتە جێگای هەر بەو تەنها وشە و بەو تەنها ویست و خواهیشە...

خەڵکی زۆر شایان و پێویستن تێ بگەن لەم شتە راستە و بیری لێ بکەنەوە تا ئەندازێ تێ بگەن لە گەورەیی و رادەی فەزڵ و لوتف و بەزەیی خوا و چاودێری بۆ ئەم بەندە بێ هێزو لاوازانەی، تا بە شەرم و چاو لەبەری یەوە بچن بە پیری ئەو هەموو لوتف و بەزەیی و چاودێری یەوە، لە روویان نەیەت بەد نمەك بن و دان نەنێن بەو هەموو چاکە و بەهرەدا.

ئەوەی کە ئەم سێ ئایەتە کورت و بچووکە نیشانی ئەدا و ئەیخاتە دڵ و دەروونەوە هەرچۆنێ شتێکی رێك و راستە و هەیە، هەروەها تەمێ و مۆچیاری یەکی زۆر گرنگ، دەروون و ویژدان ئەخاتە سۆز و پەرۆش و وریای ئەکاتەوە. قورئان باوی هەر وایە بەم شتە رێك و راستانە دەست ئەدات لە دڵ و تیماری دەرد و نەخۆشی یەکانی ئەکات، چونکە شتی راست هەرکات راستی یەکەی دەرکەوت باشتر کار ئەکات لە دڵ و دەروون دا، هەم قورئان راستە و بەڕاستی هاتووەتە خوارەوەو راستی هێناوە. کەواتە هەرشتێك راست نەبێت نایڵێ، بە شتی راست خەڵکی دڵنیا و دڵئارام ئەکات، حەق و راست نیشان ئەدا و ئەیخاتە بەرچاو، تەنها بۆ حەق و راست دەست نیشان ئەکات...

جا هەر بەو پێ یە و بە گوێرەی باوی خۆی ئەوا دەست کاری یەکی دڵ و دەروون ئەکات بە شتێکی تری حەق و راست کە مەبدە ء و بیرو باوەڕێکی زۆر گەورە و گرنگە، کە ناو ئەبرێ بە ﴿فردية التبعة﴾، ﴿والجزاء الفردي﴾ واتە سەرەنجام و بەرهەمی هەموو کردەوەیەك ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەن کردەوە، هەرکەس پرسیاری کردەوەی خۆی لێ ئەکرێ.

﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ نەفسێكی گوناهبار گوناهی هیچ نەفسی تر هەڵناگرێ و هەركەس تاوان و گوناهی خۆی لە مل خۆیەتی و بارە بەسەر شانی خۆیەوە. ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا﴾ ئەگەر هەر نەفسێك كە گوناه باری گران كردبێ داوا بكات بۆ هەڵگرتنی باری گوناهەكەی و بیەوێ كەسێكی تر لە كۆڵی بخات. ﴿لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ﴾ هیچ لەو باری گوناهەی هەڵناگیرێ و لەكۆڵی ناخرێ لەلایەن هیچ كەسی ترەوە، ﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ﴾ با ئەو كەسە داوا لێ كراوە خزم و كەس و خوێش بێت بۆ داواكەر. واتە هیچ كەس گوناهی كەسی تری بەسەردا نادرێ، گوناهی ناخرێتە سەر شانی هیچ كەسی تر، ئەو كەسانەی كە خۆیان گومڕان و خەڵكیش گومڕا ئەكەن دووبارە گوناهیان ئەكەوێتە سەر شان، بەڵام هەردوو بارەكە هینی خۆیەتی و خۆی دوو تاوانی هەیە: گومڕایی خۆی و گومڕا كردنی خەڵكی. نەك نەفسی گوناهی گومڕاكەی بخرێتە سەرشان وەك لە سورەتی ﴿العنكبوت﴾ دا باس كرا.

ئەم شتە راستە و ئەم بیرو باوەڕە رێكە بەرهەمێكی گرنگی هەیە لە هەست و خو و رەوشت و كرداردا. چونكە هەستی هەركەس بەمەیە كە بە پێی كردەوەی خۆی رەفتاری لەگەڵ ئەكرێ، پرسیاری كردەوەی كەسی تری لێ ناكرێ. رزگار نابێ لە كردەوەی. ئەو هەستە هۆیەكی بەهێزە لە وریا بوون و بێدار بوونەوەی بۆ پرسیار و موحاسەبەی خۆی پێش ئەوەی پرسیار و موحاسەبەی بكرێ لە رۆژی دوایی دا! لەگەڵ ئەوەش دا خۆی روو بكات لە ئومێدی ئەوە هیچ سوودێ وەرگرێ، یان ئومێدی ئەوە كەسێ تر بتوانێ گوناهێكی لە كۆڵ بخات و بچێتە ژێر باری، هەرچۆنێ لەهەمان كات دا هۆی ئارامی دڵە، چونكە هیچ كەس مەترسی ناكات لەوەی گوناهی كەسی تر یان كۆمەڵێ بدرێ بەسەریدا. تا بەهۆی ئەو مەترسی یەوە نائومێد ببێ لە سوود و فائیدەی كردەوەی چاكی خۆی و لای واب خۆی هەرچەند چاكە بكات ئەبێ ببێ بە ژێر باری گوناهی خەڵكی ترەوە. ئەم ترس و بیمەی نابێ

ماتوڵ ئەوەی لەسەریەتی بەجێی هێنابێ و هەڵسابێ پێی لەبارەی پەند و مۆچیاری و ڕێنموونی و هەوڵدانی گێڕانەوەی و بەرگری خەڵکی لە گومڕایی و گوناهو تاوان.

خوای گەورە بە لیستە و بە کۆمەڵ حیساب و پرسیاری بەندەکانی ناکات! بەڵکو یەکە یەکە، هەرکەس لەسەر کردەوەی خۆی، لە سنووری واجب و پێویستی سەرشانی خۆی، کە پێویستی سەر شانی هەموو کەسێکە نەسیحەت و ئامۆژگاری و هەوڵ و تێکۆشان بە پێی توانا لە چاك كردن و نەهێشتن و بەرگری هەموو خراپەیەك، جا هەرکەسێ هەڵسا بەم پێویستی سەرشانی خۆیە ئەو کاتە تاوان و خراپەی ئەو کۆمەڵەی تیای دا ئەژین ناگەڕێتەوە بۆ سەری لەو بارەیەوە زیاندار نابێ، بەڵکو پرسیاری چاکەی خۆی لێ ئەکرێ. هەروەها هەرکەس خۆی چاك نەبێ لە چاکەی گەل و کۆمەڵەکەی هیچ سوودێك وەرناگرێ، چونکە - وەکو لە پێشەوە وتمان - خوا بە لیستە و بە پێی کۆمەڵ پرسیار و حیساب ناکات!

قورئان بە شێوەیەکی سەیر ئەدوێ لە هەر شتێك پێویست بێت، بە جۆرێکی تایبەتی هەندێ مەبەست روون ئەکاتەوە، بۆ وێنە لێرەدا گوناهباران ئەخاتە بەرچاو لە شێوەی قافڵەو کاروانێ کە هەموو بار کراوە و هەریەکە باری گرانی خۆی هەڵگرتووە و خەریك و ماندووە پێ یەوە، کاتێ لەبەر قورسی و گرانی بارەکەی زۆری پێ بێت و هاوار بکات لە نزیك ترین کەسی خۆی بۆ ئەمەی ئەو بارە گرانەی لە کۆڵ بخات، کەچی کەسێ نایەت بە هاواری یەوە و نقەی دێت بە ژێری یەوە، هەتا ئەگاتە بەردەم تەرازوو و ئەو کەسەی کێشانەی ئەکات. ئینجا لەم کاتی نیشاندانی ئەو شێوە کاریگەرەدا، لایەك ئەکاتەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەفەرموێ پێی: ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ تۆ هیچ کەس ناترسێنێ جگە لەوانەی کە ئەترسن لە پەروەردگاریان لە پەنهانی دا و بێ ئەمەی دیبێتیان، بە رێك و راستی نوێژ ئەکەن. واتە سوود و بەرهەمی ترساندنت تەنها بۆ ئەوانەیە، ترساندنت تەنها لەوانە کار ئەکات، تەنها ئەوانە گوێ رایەڵ ئەبن و دێن بە پیری پەند و ئامۆژگاری یەکەتەوە. کەواتە هیچ لەسەر تۆ نی یە و هیچ زیانێ بە تۆ ناگات لەلایەن ئەوانەی لەخوا ترس نین و نوێژ ناکەن، گوێ یان مەدەرێ.

وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا
ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ

**﴿وَمَن تَزَكَّىٰ﴾ هەركەس خۆی پاك و خاوێن كردبێ لە چڵك و چەپەڵی گوناهو تاوان بەهۆی ترساندنی تۆوە ﴿فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ﴾ ئەوە تەنها لەبەر خۆی خۆی پاك و خاوێن ئەكات، سوود و قازانجەكەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە... نە بۆ تۆیە نە بۆ كەسی تر. ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ تەنها بۆلای خوایە گەڕانەوە، دوا ڕۆژ و چارەنووسی هەموو خاوەن كردەوەكان تەنها بۆلای خوایە و بەدەست خوایە. تەنها ئەو حیساب و پرسیار ئەكات، تەنها ئەو پاداشت وتۆڵەی بەدەستە، كەواتە هیچ كردەوەیەكی چاك لە خۆڕایی ناڕوا، هیچ خراپەیەك لە دەست دەرناچێ.**

**ئینجا چەند وێنە و چیرۆكێ ئەهێنێتەوە بۆ بێ بڕوا و بڕوادار، بۆ كوفر و ئیمان بۆ روون كردنەوە دژایەتی نێوانی ئەمانە. ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ﴾ نە كوێر و بینا وەك یەك یەكسانن ﴿وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ﴾ نە تاریكی یەكان و رووناكی. ﴿وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ﴾ نە سێبەر و فێنكی و نە خۆرەتاو و گەرما و سەبوون ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ﴾ نە زیندووەكان و مردووەكان یەكسانن وەك یەكن، واتە ئیمان و كوفر و خێرو شەڕ و چاكە و خراپە و ڕێنوومایی و گومڕایی هەرگیز وەك یەكن نین و یەكسان نین و یەكسان نابن بەلای خواوە، هەرچۆنێ كوێری و بینایی و تاریكی و رووناكی و فێنكی و گەرمایی و زیندوویی و مردن یەكسان نابن، كە لە بناغەدا جیاوازن و بە سروشت دژی یەكترن.**

**چیرۆك و وێنەكە زۆر بەجێ و ڕێك و شیرینە، چونكە پەیوەستی هەیە لە نێوان سروشتی كوفر لەگەڵ سروشتی هەركام لە كوێری و تاریك و گەرما و مردن دا، هەروەها پەیوەستی هەیە لە نێوان سروشتی ئیمان و سروشتی هەركام لە رووناكی و بینایی و سێبەر و فێنكی و زیندوویی دا. بێگومان ئیمان رووناكی یە، رووناكی یە لە دڵ دا و رووناكی یە لە چاو و گوێچكەو هەموو ئەندامەكان دا، رووناكی یە لە هەست و هۆش دا، رووناكی یەكە باری ڕاستەقینەی هەموو شتێك و هەموو رووداوێك و هەموو پەیوەستی و ڕادەی نێوانیان روون**

ئەکاتەوە، کەواتە ئیماندار بەم رووناکی یە گرنگەوە سەرنج ئەدات و ئەڕوانێتە رووناکی خوا، کەواتە هەموو شتێ لە رادە و پلەی خۆی دا ئەبینێ و ئەناسێ. لەگەڵی هاوکاری ئەکات و لەو رێگایەی داوێتی یە بەر پێ ی هەڵناکەوێ و پێ ی هەڵناخلیسکێ و هەنگاوەکانی بە رێکی ئەنێ.

ئیمان بینایی یە، ئەبینێ، بینینێکی راستەقینەی راست بە بێ تێکەڵ و پێکەڵی، خاوەنەکەی ئەبا بە رێگادا بە رووناکی و ئارام و دڵنیایی. ئیمان سێبەر و سەمەند و فێنکی بە دەروون بۆن و هەناسەی خۆشی لێ وەرئەگرێ و دڵ پێ ی ئەحەوێتەوە، سێبەر و فێنکی یە لە بۆق و گەرمای گومان و دوو دڵی و بێ ئارامی و سەرگەردانی لە چۆڵ و بیابانی رەش و تاریك دا بە بێ رابەر و رێگا نیشان دەر. ئیمان گیانە لە دڵ و دەروون و هەست دا. گیانە لە نیاز و مەبەست دا، هەرچۆنێ جووڵان و بزووتنەوەیەکی بەر و بەرهەم دار.

کوفرو بێ بڕوایی کوێری یە لە سروشتی دڵ دا، کوێری یە لە دیتنی بەڵگە و رابەری حەق و راستی، کوێری و نابینایی یە لە دیتنی شێوە راستەقینەکەی بوون و بوونەوەر و ئەو هەموو پەیوەستی و پەیوەندی یەی کە دانراوە و پێك هێنراون لە نێوان بوون و بوونەوەردا.

کوفرو بێ بڕوایی تاریکی یە و یان چەند جۆر لە تاریکی. کەواتە تا خەڵکی دوور بن لە رووناکی ئیمانەوە ئەکەونە ناو چەند رەشی و تاریکی لە هەمە جۆر و لە هەمە بابەت. رەشی و تاریکی یە کە زۆر بە دەگمەن و نایاب هیچ شتێ ببینرێ لە رادە و شێوە راستەقینەکەی خۆی دا. کوفرو بێ بڕوایی گەرما و بۆق و سەبوونە، چەند بڵێسەیەکی ئەدا لە ئامانج، دڵنیا نەبوون بە پاشە رۆژ و چارەنووس، لەپاش ئەوە ئینجا سەری لە بڵێسەی ئاگری دۆزەخەوە دەرئەچێ و سزای بەسۆی نەبڕاوەی رۆژی دوایی.

کوفرو بێ بڕوایی مردنە، مردنە لە دەروون دا، پچڕانە لە سەرچاوەی ژیان. لادان و جیابوونەوەیە لە رێگایە کە گەیەنەری رێبوارەکەیەتی. پەك کەوتن و دەستە پاچەیی یە لە تەمێ وەرگرتن و گوێ رایەڵی، کە ژیان بەم دوو شتە ئەکەوێتە سەر رەوڕەوەی بەختیاری و کامەرانی.

هەرکام لە ئیمان و کوفر سروشتی تایبەتی خۆی هەیە و هەرکام بەرهەمی تایبەتی خۆی هەیە، هەرگیز ئەم دووانە یەکسان نابن بەلای خواوە.

إِنَّ ٱللَّهَ يُسۡمِعُ مَن يَشَآءُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنۡ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ
بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ

**ئینجا لایەك ئەكاتەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و دڵخۆشی ئەداتەوە و داخ و مەراقی لە دڵ دەرئەكات، بە روون كردنەوەی سنووری كار و كردەوەی واجب و پێویستی سەرشانی لە بانگ كردنی خەڵك دا بۆلای خوا. ئیتر واز هێنان لە هەموو شتیٚ تر بۆ خاوەنی هەموو كارو فرمانیٚ بە پیٚ‌ی ویست و خواهیشی خۆی چی ئەكات بیكات. ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُسۡمِعُ مَن يَشَآءُ﴾ بێگومان خوا مەیلی هەركەس بكات و بیەویٚ ئەیكات بە بیسەر و شتی پیٚ ئەبیستیٚ، واتە تۆ بانگی خەڵكی ئەكەیت بۆلای خوا و بۆ وەرگرتن و مل كەچی بۆ ئایینی خوا. بەڵام تۆ ناتوانی بیانخەیتە سەر رێگا و ئایینی خوا، بیانگێڕی بە وەرگری ئەوەی بانگیان بۆ ئەكەیت، بەڵكو تەنها خوا دەسەلاتی بەسەر ئەوەدا هەیە، ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾ تۆ نیت بە بیسەری ئەوانەی مردوون و وان لە گۆڕەكان دا، واتە ئەوانەی كە سەركێشن و گویٚ رایەڵ نابن دڵ مردوون وەكو مردووی گۆڕستان وان، هەرچۆنیٚ ئەو مردووانە تازە هیچیان لەگەڵ ناكریٚ و رێنموونی ناكرێن هەروەها ئەو سەركێشانەیش، ماتوڵ تۆ سپاردە و پەیامەكەت راگەیاند ئیتر تۆ هیچت لەسەر نی یە، چونكە ﴿إِنۡ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾ تۆ هیچ نیت جگە لەوەی ترسێنەری، كەواتە هیچ داخ و مەراق مەخۆ لەسەر بیٚ بڕوایی ئەوانە و مل پێچی یان لە گویٚ رایەڵی. ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾ بەڕاستی ئێمە تۆمان رەوانە كردووە بە رەوانە كردنێكی راست و بە حەقیانەت لە كاتێك دا كە موژدە دەر و ترسێنەری. تەنها تۆ یەكەم ترسێنەر نیت، بەڵكو ﴿وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ﴾ هیچ گەل و ئوممەتیٚ نەبووە مەگەر تێپەڕی كردووە تیای دا ترسێنەر. ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ ئەگەر ئەوانە بڕوات پیٚ ناهێنن و بە درۆزنت دائەنێن، تۆ غەمبار مەبە بەوەو تۆ یەكەم كەس نیت كە ئەوەی دەربارە كرابیٚ ﴿فَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ چونكە گەل و ئوممەتەكانی لە پێش ئەوانەوە بڕوایان نەهێنا و پێغەمبەرەكانیان بە درۆ خستەوە و بە درۆزنیان دانان،**

جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾

---

له كاتێك دا ﴿جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ هەموو پێغەمبەرەكانیان هاتن بۆلایان بە موعجیزەكانیانەوە ﴿وَبِٱلزُّبُرِ﴾ هەندێكیان بە سوحوفەوە(شیث و ئیبراهیم)، ﴿وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ﴾ هەندێكی تریان بە كتێبێكی روون روون كەرەوە وەكو تەورات، هەروەها ئینجیل.

ئەوە بوو كارو كردەوەی ئەو ئوممەتە رابردووانە سەبارەت بە پێغەمبەرەكانیان و ئەو هەموو رابەر و بەڵگەیانەی كە پێ یان بوو. كەواتە ئەم بێ بڕوایی و كردەوە ناڕەوایانەی كە دەربارەی تۆ كرا لەلایەن ئەم گەل و كۆمەڵەوە رووداوێكی تازەو یەكەم جار نی یە، بەڵكو كار و پیشەی گەل و ئوممەتە پێشووەكانی رابردووە. جا لێرەدا چارەنووس و دوا رۆژی خراپی ئەو بێ بڕوایانە ئەخاتە بیرو بەرچاوی بێ بڕواكانی ئەم ئوممەتە بەڵكو بیر بكەنەوە و لەوانەوە تەمێ خوار بن و خۆیان عاقیبەت شەڕ و بەش بڕاو نەكەن، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ لەپاشان قارت گرت لەوانەی بڕوایان نەهێنا و كافر بوون هەریەكە دووچاری دەردی چار نەكراوی خۆیان بوون.

ئینجا بە سەرسام كردن و ترساندنیان ئەم شێوە پرسیارە ئاراستە ئەكات: ئەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ ئەی ئایا چۆن بوون ئینكار و تۆڵەی من بۆ ئەو بێ بڕوایانە؟ بێگومان قار لێ گرتن و تۆڵەكەیان زۆر سامناك و بەتین بوو، وێران كردنی وڵاتیان و لە ریشە هێنانی خۆیان بوو. كەواتە ئەمانەی كە رێگا و رێبازی ئەوانەیان گرتووە با بترسن خۆیان بپارێزن لە دووچار بوونیان بە وێنەی سزا و تۆڵەی ئەوان! ئا بەم جۆرە ئەم گەردشە پێشووەی دوایی هێنا و ئینجا دەست ئەكات بە گەردش و گەڕانێكی تازە لە شیو و دۆڵێكی تازەوە.

ئەم گەڕان و گەردشە تازەیە چەند موتالا و خوێندەوەیەكە لە لاپەڕەكانی كتێبی بوونەوەر كە زۆر جوان و سەرسام كەرن، چەند رەنگ و جۆر و تیرەی جیا جیان... هەروەها چەند موتالاَ و خوێندنەوەیە لە كتێبی هێنراوە خواری خوا. بەخشین و پێدانی ئەو كتێبە بە میراتی و كەلەپور بەم دواترین ئوممەتە و ئینجا چارەنووس و دوا رۆژی شوێن كەوتووەكانی ئەم كتێبە و ئەوانەی روویان لێ وەرگێرا و پشتیان تێ كرد، ئینجا با گوێ بگرین ئەو گەڕان و گەردشە بكات بە دڵ و دەروونمان، سەرنجمان راكێشێ بۆ موتالاَ كردن و خوێندنەوەی كە دەست نیشانمان بۆ كرد،

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ﴾

ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ ئایا نەتزانی یان نەت بینی کە خوا هێنایە خوارەوە لەلای سەرەوە ئاوێك – واتە باران – ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا﴾ ئینجا بەهۆی ئەو ئاوە دەرمان هێنا لە زەوی و لە درەختەکان چەند بەر و میوەهاتیّ کە جیاوازە رەنگەکانیان.

سەرنج راکێشانێکی گرنگ و نایابە دڵ و دەروون ئەگێڕیّ بە هەموو زەوی دا بۆ بیر کردنەوە لەو هەموو رەنگ و بۆیە جیاوازانە کە خوا داوێتی بەو هەموو شتە جۆر جۆرانە. میوەهاتەکان، شاخ و چیاکان، چوارپیّ و ئاژەڵ و هەموو گیان لەبەرەکان. سەرنج راکێشانێکە ئەو هەموو شتەی کۆ کردووەتەوە لە چەند وشەیەکی کەم و کورت دا، لەگیان لەبەر و بیّ گیان لەم زەوی یەدا، دڵ و دەروون سەرسام ئەکات بەو پێشانگا گەورە و جوان و شیرینەی کە خوا رازاندوویەتی یەوە لەم زەوی یە پان و فراوانەدا. هەموو بەرو میوەیەك هەرچۆنیّ لە رەنگ دا جیاوازن، هەروەها لە تام و بۆن و لە شێوە و شکڵ و قەبارەدا جیاوازن، کە ئەو جیاوازیانەش هەموو شتێکی گرنگ و سەرسوڕهێنەرن و بەڵگەیەکی روون و ئاشکران لەسەر دەسەڵات و زانین و لێزانی خوا. بەڵام پێشانگاکە لێرەدا بەناوی رەنگە جیاوازەکانەوە بۆ نیشاندانی تەنها ئەوەیە لەبەر ئەوە تەنها باسی رەنگیان ئەکات.

ئەم پێشانگای رەنگە بە تەنها شتێکی زۆر نایابە، تا رادەیەك هەرچی خم گەر و وێنە گر هەیە لەم جیهانەدا دەستە پاچەن لە ئاستی داهێنان و رەنگ پێدانی وێنەی بەشیّ لەم پێشانگایە، چونکە هیچ جۆریّ لە میوەهات نی یە لەم جیهانەدا وێنەی جۆرێکی تر بێت. بەڵکو هیچ تاقە میوە و دانەیە نی یە وێنەی هیچ دانەیەکی تر بێت لە هاوسەر و جۆرەکەی خۆی چ جای دانەیەکی تر لە جۆرێکی تر، ئەگەر وردە کاری بکریّ و زۆر بە وردی سەرنج

بدرێ هیچ دوو دانەیەك نی یە جیاوازی نەبێ لە ڕەنگیان دا با هاوسەری یەك بن و لە لق و پەلێ دەرهاتبن!!

ئینجا لە ڕەنگ و بەر و میوەهاتەوە ئەگوێزێتەوە بۆ باسی جیاوازی ڕەنگی شاخ و چیاکان کە بە دیمەن و ڕواڵەت ئەو دوو جۆرە دوورن لە یەکەوە و پەیوەندی و پەیوەستی یان نی یە بە یەکەوە، بەڵام کاتێ بە وردی سەرنج بدەین پەیوەستی و پەیوەندی دەرئەکەوێ بۆمان. ئەوەتا ئەو هەموو ڕەگە جیاواز و جۆر بە جۆرەی کە لە بەردی شاخەکان دا هەن زۆر ئەشوبهێن بە ڕەنگە جیاوازەکانی میوەهاتەکان. بەڵکو لە هەندێ جاردا مەردوم ڕێی ئەکەوێ لە بەرد کە لە شێوە و قەبارەدا ئەڵێ ی میوەیە! ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا﴾ لە شاخەکاندا چەند ڕێگا و خێتی سپی و سوور هەن کە ڕەنگەکانیان جیاوازە، بەڵکو سپی و سورەکانیش لەنێوان خۆیان دا جیاوازن ﴿وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ چەند ڕەشی تۆخی تەواو ڕەش هەن کە یەك ڕەنگن، ئەو هەموو ڕەنگی جۆر جۆری جیاوازە هەن لەگەڵ ئەوەدا هەموو هەر شاخ و بەردە، بەڕاستی بیر کردنەوە لەو ڕەنگە جیاوازانە لەگەڵ ئەو هەموو ڕەنگە جۆر جۆر و جیاوازانەی بەر و میوەهاتەکان دڵی بێدار و وریا ئەهێنێتە هەشۆکە. هەستی سۆز و شەوق بۆ جوانی و شیرینی لە دەروونددا بێدار ئەکاتەوە، کە ئەوەش هۆی پتەوبوونی باوەڕە بە دەسەڵات و زانین و لێزانی پەروەردگار...

ئینجا ڕەنگە جۆر جۆرەکانی گیان لەبەرەکان ئەخاتە بەرچاو ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ﴾ لە ئادەمی و گیان لەبەرەکانی تر بە شێوەی گشتی و ڕەشە وڵاخ و حوشتر و ماڵات بە شێوەی تایبەتی هەندێ هەن ڕەنگەکانیان جیاوازن،﴿كَذَٰلِكَ﴾ بە وێنەی جیاوازی میوەهات و شاخ و بەردەکان. بە تایبەتی سەرنجی ڕاکێشا بۆ ﴿الأنعام﴾ کە بزن و مەڕ و ڕەشە وڵاخ و حوشترە لەبەر تێکەڵی و زیادە پەیوەندی یان بە ئادەمی یەوە. جیاوازی ڕەنگەکانیان پێشانگایەکی شیرین و دڵڕفێنە بە وێنەی پێشانگای میوەهات و شاخەکان.

قورئانی بەفەرِ دەمی ئەم کتێبە بوونەوەری یە گرنگەمان بۆ ئەکاتەوە و پەرِەکانی هەڵئەگێرِێتەوە و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْۗ﴾ لەناو بەندەکانی خوادا تەنها زاناکانیان ئەترسن لە خوا، واتە قورئان ئەو کتێبی بوونەوەرە ئەکاتەوە و ئەیخاتە بەرچاو، ئەو زانایانەی کە ئەیخوێننەوە و تێ ی ئەگەن و بیری لێ ئەکەنەوە ئەوانە بە هۆی ئەو کتێبەوە خوای خۆیان باش ئەناسن، ئەیناسن بە بەرهەمی کردەوەکەی، تێ ی ئەگەن بەهۆی نیشانە و بەرو بومی دەسەڵات و توانینەکەی. هەست ئەکەن بە گەورەیی یەکەی بەهۆی دیتنی دەست کردەکەی. جا لەبەر ئەوە بە راستی لێ ی ئەترسن و بەراستی خۆیان ئەپارێزن لە هۆی خەشم و نارەزایی یەکەی. بەراستی ئەیپەرستن بە ناسین و تێگەیشتنەوە... ئەم چەند لاپەرەیە کە قورئان دەست نیشانیان بۆ ئەکات نموونەیەکن لەو کتێبە گەورە و گرنگەی بوونەوەرە... ئەو هەموو رەنگ و بۆیە نموونەیەکن لە شتە نایابەکانی تر، کە ئەوپەرِی رێکی و گونجاوی بەکار هێنراوە لە داهێنان و دارشتنیان دا، کە زانایانیش ئەوە ئەزانن و تێ ی ئەگەن، ئەوانەی کە زانینەکەیان نەیان گەیەنێ بە راستیی و حەقیقەت. زانینەکەیان دڵیان هەستی پێ ئەکات و وریا ئەبنەوە پێ ی، دڵیان ئەخاتە ئیش و کار، بەهۆی ئەو زانینەوە بەچاوی دڵیان دەستی قودرەتی داهێنەری خوا ئەبینن لەو هەموو شتە رەنگاو رەنگە شیرینەی کە وا لەم بوونەوەرەدا.

جوان و شیرینی مەبەستێکی سەرەکی یە لەم بوونەوەرەدا، هۆی بەدی هاتنی گەلێ کار و فرمانە لەم بوونەوەرەدا، جا لەبەر ئەوە لە قورئان دا ئەو هەموو سەرنج راکێشانە کراوە بۆ شیرینی و جوانی یە کە پەروەردگار بەدی هێناوە لەم بوونەوەرەدا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ بەراستی خوا توانا و بە دەسەڵات و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و داشاردەر و سرِەرەوەیە لە تاوان و کەم و کورِی ئەوانە کە کەم و کورِی یان هەیە لە سام و ترسان لە خوا، لە کاتێك دا کە ئەم دەست کردە نایابەی ئەبینن و تیای دا ئەژین.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً
يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ إِنَّهُۥ
غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾ وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ هُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ
بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا

---

ئینجا لە کتێبی بوونەوەرەوە ئەگوێزێتەوە بۆ باسی کتێبە گەورەکەی کە هێنراوەتە خوارەوە، باسی ئەوانەی کە ئەم کتێبە ئەخوێننەوە، باسی پاداشت و بەرهەمی کە دەست کەوتیان ئەبێ بەهۆی ئەو خوێندنەوە، ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە کتێبی خوا ئەخوێننەوە ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ نوێژیان بە ڕێك و ڕاستی بەجێ هێناوە، ﴿وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ ﴾ بەختیان کردووە و داویانە لە ڕێگای خوادا ﴿سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ بە پەنهانی و بە ئاشکرا لە هەندێ لەوەی پێمان داوون و کردوومانە بە ڕۆزی و دارایی یان، بێگومان مەبەست لە خوێندنی کتێبی خوا تەنها وتنی ڕووت نی یە، مەبەست تەنها تێپەڕ کردن نی یە بەسەر وشەکانی د، ئیتر بە دەنگ و ئاوازەوە یان بە بێ دەنگی و لەسەر خۆ، بەڵکو مەبەست خوێندنێکە کە لە دڵێکی وریا و ئاگادارەوە هاتبێ و بە بیر لێ کردنەوە، بە جۆرێ کار بکات لە بخوێنەکە، پاڵی پێوە بنێ بۆ کردەوە و ڕەوشت، ئینجا نیاز و مەبەستیان بەوانەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾ چاوەڕوانن و بە تەمای مامەڵە و بازرگانی یەکن کە هەرگیز ناوەستێ و هەمیشە ئەڕوا و قازانجی مسۆگەرە و زیان ناکات. ئەو مامەڵە و بازرگانی یەشیان کە بەو جۆرەیە ﴿ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ﴾ بۆ ئەمەی خوا ئەجرو پاداشتی کردەوەکەیان بە ڕێکی بداتەوە ﴿وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ﴾ سەرباقی ئەوە لە فەزڵ و غەزنەی ڕەحمەتی خۆی زیادیان بکات. ﴿إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ چونکە بەڕاستی خوا زۆر لێ بوردوو داشاردەری داشاردەری هەڵە و زەلەی گوێ ڕایەڵانە و وەرگری تاعەت و گوێ ڕایەڵی یانە بە ڕەزامەندی و پاداش دەریانە بە تێرو تەواوترین پاداشت.

ئینجا دەست نیشان ئەدات بۆ سروشتی ئەو کتێبە هێنراوە خوارە، تا بەو بۆنەوە باسی ئەم ئوممەتە بکات کە هەڵگری کتێبی خوان و بە میراتی دەست کەوتیان بووە. ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱلَّذِیٓ أَوۡحَیۡنَآ إِلَیۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەوەی کە سروشمان کرد بۆلای تۆ کە ئەم کتێبەیە – واتە قورئان – ﴿هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ تەنها ئەو راستە و بە راستی هەیە لە کاتێك دا ﴿مُصَدِّقٗا لِّمَا بَیۡنَ یَدَیۡهِۗ﴾ کە بە راست گێڕو شایەتی راستی هەر کتێبێکی تری خوایە کە لە پێش ئەمەوە هاتووە. راست و حەق تەنیا یەکێکە لەو کتێبە پێشووانە و لەم کتێبەدا. ناگونجیٚ زیاد لە یەك. ئەو خوایە کە ئەم حەق و راستەی ناردووەتە خوارەوە خۆی ئەزانیٚ چی شایان و چاکە بۆ بەندەکانی و چارەسەر و تیماری هەموو گریٚ و کۆسپێکیانە. ئەزانیٚ کیٚ شایانە بۆ سروش کردن بۆلای؟ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِیرُۢ بَصِیرٞ﴾ چونکە بەڕاستی خوا ئاگادار و باخەبەر و بینایە بە بەندەکانی.

ئەم کتێبە گەورە و گرنگە خوا دای بەم ئوممەتە، کە هەڵیبژارد بۆ جێگری و جێنشینی هەموو ئوممەتەکانی رابردوو، کردی بە میرات بەری ئەوان، وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِینَ ٱصۡطَفَیۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ﴾ [1] ئینجا ئەو کتێبەمان بەخشی بەوانەی کە هەڵمان بژاردن لەناو بەندەکانمان – واتە ئەم دواترین ئوممەتە کە خوا ناوی بردن بە چاکترین ئوممەت، کردنی بە ئوممەتی گەورەترین کتێب و بەڕێز تری هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لیٚ بێت –.

بەڕاستی ئەم چەند وشەیە شایانە بە بیر لیٚ کردنەوە، رێز و پلەی بەرزی ئەم ئوممەتە نیشان ئەدات، هەرچۆنیٚ فرمانی گران و ئەرکی زۆر قورسی سەرشانیان ئەخاتە بەرچاو. فرمان و ئەرکی هەڵسانیان بە مافی ئەو هەڵبژاردن و میراتی و کەلە پوورە گەورەیە، ئایا ئەم ئوممەتە هەڵبژێرراوە نەبیسیٚ و گویٚ رایەڵ نەبێت؟ خوای خاوەن لوتف و بەزەیی بەو جۆرە رێزی ئەم ئوممەتەی گرت، لەپاش ئەوە رێزی گرت بە میهرەبانی خۆی لە جەزاو پاداشت دا تەنانەت بە ئەوانەشیان کە تاوانبار و خراپەکارن،

---

[1] ئەم دوو ئایەتە چەند رایەکیان هەیە و بە چەند جۆریٚ راڤە و تەفسیر کراون. بەلآم ئەمەی لە تەفسیرەکەدایە رای زۆربەی لەسەرە و دڵ پیٚی بە ئارام ترە.

فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ
ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا
حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ

وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾ ئینجا هەندێ لەوان ستەم کارە لە خۆی بەم ڕەنگە کردەوەی خراپی زۆر ترە لە چاکی ﴿وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾ هەندێکیان میانەیە، چاکەو خراپەی هاوتاو بەقەدەر یەکن. ﴿وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ [1] هەندێ تریان پێشکەوتووە بە هۆی کردەوە چاکەکانەوە کە ئەیانکات بە ئیزنی خوا و یارمەتی و بۆ ڕێك خستنی خوا، واتە چاکەی زۆرترە لە خراپەی.. بەڵام لوتف و میهرەبانی خوا هەر سێ تاقمەکە ئەگرێتەوە، هەرسێ جێگایان ئەو بەهەشتەیە کە لەم چەند ئایەتی داهاتووەدا وەسف و سەنای ئەکات، هەرسێ جێگایان بەهەشتە بە پێی رادە و پلەی خۆیان، وەکو لە چەند حەدیسێکەوە وەرئەگیرێ لە چەند ریوایەتێکی زۆرەوە کە لە کتێبی حەدیس و تەفسیردا هەن و بە پێویست نازانین هێنانی ئەو حەدیسانە بەڵکو ئەوەی کە قورئان ئەیفەرموێ بەسە. ئایا چی لەمە گەورەتر و بە نرخ ترە کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ﴾ تەنها ئەو هەڵبژاردن و کتێب پێ بەخشینە فەزڵ و بەهرەی گەورەیە کە خوا دەربارەی ئەم ئوممەتەی کرد. ﴿جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾ ئەوانە ئەچنە ناو بەهەشتانی نیشتەجێی ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ﴾ خشڵ دار ئەکرێن لەو بەهەشتانەدا لە چەند بازن و بازێ بەندی کە لە ئاڵتوونن، ﴿وَلُؤْلُؤًا﴾ خشڵ دار ئەکرێن بە دوور ﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ پۆشاکیان لەو بەهەشتانەدا ئاوریشمی خالیسە. ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ﴾ ئەڵێن: سوپاس و سەنا بۆ خوایە کە داخ و خەفەتی لێ دەرکردین و ترس و دڵە لەرزەی نەهێشتین، ئیتر ترس و دڵە لەرزەی پاشە ڕۆژ و چارەنووسی، یان ژیان و گوزەرانی دنیا، یان هێنی ڕووداو و بەسەرهاتی ڕۆژی دوایی و حیساب و پرسیار،

---

[1] ئەم سێ تاقمە بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراونەتەوە، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدا وتراوە حەدیس زۆر یارمەتی دەریەتی و لەگەڵ مەبەستی شوێنەکەدا رێك ترە.

إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا
فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ
عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ
ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ

---

﴿إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارمان زۆر لێ بوردە و داشاردەری گوناهە و وەرگری چاکە و تاعەتە ﴿ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ﴾ ئەو خوایەی کە داینایین و نیشتەجێی کردین لە ماڵ و جێ و شوێنی مانەوەو نیشتەجێی دا بە چاکە و منەتی خۆی بە بێ ئەمەی ئێمە هیچ حەقێکمان بەلایەوە بێت. ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ﴾ دووچارمان نابێ لەو بەهەشتانەدا هیچ ماندوویی یەك، ﴿وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ﴾ تووشمان نابێ تیایان دا هیچ ئەرك و زەحمەتێك.

ئینجا لایەکمان پێ ئەکاتەوە و سەرنجمان ڕائەکێشێ بۆلای داخ و دڵە لەرزە و سزای بە سۆی ئەو کۆمەڵەکەی تر، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوانەی لەم جیهانەدا بێ بڕوا و کافر بوون ﴿لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ﴾ بۆیان هەیە و مافی خۆیانە ئاگری دۆزەخ، ﴿لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟﴾ بڕیاری مردن نادرێ بەسەریان دا تا بۆ خۆیان بمرن و لەناو بچن و ئیسراحەت بکەن ﴿وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا﴾ سوك ناکرێ لەسەریان بەشێ لە سزاکەیان. ئای هاوار هوار بۆ ئەو بەد بەختی و سیاچارەیی یە، تەنانەت بەزەیی یان دەربارە ناکرێ بە مردن و لەناوچوون!! ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ﴾ ئا بەو جۆرە تۆڵە ئەسێنین لەهەموو کەسێ کە زیاد ڕەوی کردبێ لە کوفرو بێ بڕوایی دا، یان لە سپڵەیی و بەدنمەکی دا ﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا﴾ ئەوانە هاوار و گریە و زاری ئەکەن لەو ئاگرە دۆزەخەدا ئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا﴾ ئەی پەروەردگارمان دەرمان کە و دەرمان بێنە لە دۆزەخ و بمانخەرەوە دنیا ﴿نَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾ تا کردەوەی چاك بکەین ﴿غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ﴾ غەیری ئەوەی کە لەمەوبەر کردمان. ئا بەو جۆرە ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا و پەشیمان ئەبنەوە و دان ئەنێن بە خراپی خۆیان دا، بەڵام لە پاش لە دەست چوونی هەل و کاتی خۆی، لەبەرئەوەبەرپەرچ ئەدرێنەوە و دەم کوت ئەکرێن بە ڕەزیل کردن و تەشەر لێدان.

أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾
إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ
خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ

بەم شێوە کە ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾ ئایا مۆڵەتمان نەدان و تەمەنمان درێژ نەکردن و نەمان ژیاندن کات و ماوەیەك کە بتوانێ و بگونجێ بیر بکاتەوە و تەمێ وەرگرێ تیای دا هەرکەس ویستی و بیری کردەوە و تەمێی وەرگرت؟ واتە بەڵێ مۆڵەتمان دان ئەو ماوەیە، ﴿وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾ ترسێنەریشیان بۆ هات بۆ زیادە بێدار کردنەوە، کەچی بیرتان نەکردەوە و تەمێتان وەرنەگرت و گوێتان نەدا بە ترسێنەرەکەتان، ﴿فَذُوقُوا۟﴾ کەواتە بچەژن ئەو سزای کە دراوە بەسەرتان دا. ﴿فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ چونکە هیچ کۆمەك و یارمەتی دەرێ نی یە بۆ کافران کە ستەم کار و دەست درێژیی کەری هەرە گەورە ئەوانن، ئەمەی کە باس کرا دوو وێنە و شێوەی جیاوازن بۆ ئەو دوو کۆمەڵ و تاقمە، هەموو کاروباریان دژ و بەرامبەری یەکترن: شێوەی ئارام و بێ ترسی و رەحەتی تاقمی بەهەشتی یەکان، لەگەڵ شێوەی سام و ترس و بێ ئارامی و سزای تاقمی دۆزەخی یەکان، دەنگ و ئاوازەی نزا و سوپاسی ئەوان، لەگەڵ هاوار و گریە و زاری ئەمان، شێوەی رێز و قەدری ئەوان، لەگەڵ ریسوا کردن و تەشەر لێدان و دەم کوت کردنی ئەمان. نەرم و ناسکی وشە و پیتەکان کە باسی ئەوانی پێ ئەکرێ، لەگەڵ وشە و پیتە رەق و بەتینەکانی باسەکەی ئەمان.

ئینجا بەدوای ئەو هەموو شێوە و پێشانگا و هەڵبژاردن و پێ بەخشینی کتێب و ئەو شێوەی ناز و رێز و سزا و مەینەت و ئازارەی کە خرانە بەرچاو. لەپاش ئەوانە ئەم فەرمودەیە ئەهێنێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بەڕاستی خوا زانا و ئاگایە بە هەموو غەیب و شاراوەکانی ئاسمانەکان و زەوی ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خوا ئەوپەڕی رادە زانایە بە هەرشتێك لە دڵ و دەروونذایە و گوزەر ئەکات پیایان دا. ئەم زانینە تێرو تەواو و گشتی یە بە وردی رێك تر و شیرین ترین شتە کە بهێنرێ بە دوای ئەو باس و

بڕیارانەی کە لەم ئایەتە رابوردووانەدا باس کران، هەموو ئەوانە بە پێی ئەو زانینە کراوە و بەدی هاتووە.

ئەم بەشی دوایی یەش لەم سورەتە چەند گەڕان و گەردشێکی پان و فراوان ئەکات بە دڵ و دەروون، چەند دەستکاری یەکی دڵ ئەکات و چەند شتێکی تێ ئەگەیەنێ: گەڕان و گەردش لەگەڵ ئادەمی دا لە هەموو تاقم و چینەکانی کە هاتن بە دوای یەك دا، تاقم و چینەکان هەندێکیان بوون بە جێگر و جێنشین بۆ هەندێ تریان، گەڕان و گەردش لە زەوی و ئاسمانەکان دا بۆ باس و بە دوادا گەڕانی هەر دروشم و نیشانەیەك بۆ ئەو بتانەی کە بە نەفامی ئەپەرستران و کرابوون بە هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار، ئەو باس و بەدوا گەڕانەش بۆ ئەمە دەرکەوێ کە هیچ نیشانە و دروشمێ نی یە. کەواتە ئەو هەموو پەرستراوانە ناڕاستن و شتێکی پڕو پووچن، هەروەها گەڕان و گەردشێ ئەکات لە زەوی و ئاسمانەکان دا بۆ دیتنی ئەو دەستە قودرەتەی خوا کە ئەو ئاسمان و زەوی یەی راگیر کردووە. گەڕان و گەردشێ لەگەڵ بێ بڕواکان دا بەو هەموو رابەر و بەڵگە روونانەوە لە کاتێك دا کە ئەوانە لە پێشەوە سوێندیان خوارد و پەیمانیان دا کە ئەگەر ترسێنەریان بۆ هات بکەونە شوێنی و باشتر بن لە خەڵکی تر، کەچی ئەو پەیمانەیان نەبردە سەر.

ئینجا گەڕان و گەردشێ تر ئەکات بۆ دیتنی نیشانە و دروشمی لەناو چوون و لە ریشە هاتنی بێ بڕواکانی رابردوو کە بڕوایان نەهێنا و شوێنی پێغەمبەرو بەرنامەکانی خوا نەکەوتن، کەواتە با ئەمان تەمێ خوار بن.

ئینجا با گوێ شل کەین بۆ قورئانی بەفەڕ ئەو مەبەست و شتە گرنگانەمان بدا بە گوێچکەدا، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ خوا کەسێکە کە ئێوەی کرد بە چەند چین و تاقمێ، هەر تاقم و چینێ بە جێگر و جێنشینی تاقمی پێش خۆی، یان هەر تاقم و چینێ بەکار بە دەست لە وڵات دا و کاروبار و حوکمڕانی کەوتە دەست. بێگومان بەدوا هاتنی ئەم هەموو تاقم و چینە لە زەوی دا، رۆیشتنی تاقمێ و هاتنی تاقم و چینێکی تر، وەرگرتن و دەست بەسەرا گرتنی جێ و شوێن و کەلەپووری رابردوو لەلایەن تاقمی تازەوە، دواهاتن و لەناوچوونی دەوڵەتێ و راست بوونەوە و پەیدا بوونی دەوڵەتێکی تر لە جێگای

دا، کوژانەوەی رووناکی یەك و هەڵگرانی رووناکی یەکی تر. ئەو گۆڕان و ئاڵ و گۆڕو بەدواهاتنە بە درێژیی چەرخ و زەمان... بێگومان بیر کردنەوە لەو بزووتنەوە نەوەستاوە هەمیشەیی یە شایانە بەوە کە لە دڵ و دەروون دا پەند و تەمێ خواری فەراهەم بێنیّ، هەست و هۆش پەیدا بکات بە تاقمی تازە کە ئەمانیش وەکو پێشووەکان ئەڕوا و تێپەڕ ئەکات پاش ماوەیەك، تاقمی داهاتوویان دێنە شوێن و جێگاکەی ئەمان، بیر ئەکەنەوە لە شوێنەواریان و لەناو خۆیان دا باسی هەواڵ و بەسەرهاتی ئەمان ئەکەن، هەرچۆنێ ئەمان بیر ئەکەنەوە لە شوێنەواری پێشووەکانی خۆیان و باسی هەواڵ و بەسەرهاتیان.

بیرکردنەوە لەو بزووتنەوە نەوەستاوە شایانە بەوە بێ ئاگاکان خەبەر بکاتەوە بۆ دیتنی ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەو هەموو گۆڕاندن و ئاڵ و گۆڕ و لەناو بردن و داهێنانە ئەکات. ئەو هەموو شتە دێت و ئەڕوا و دوایی دێت، تەنها خوا ناگۆڕێ و ناڕوا و هەمیشەیی یە. کەواتە با هەموو کەس وریا و ئاگادار بێت بەم ئەندازە مانەوەی خۆیە و ئەم تەمەنە کورتە لە شتی بێ نرخ و بێ کەڵك دا بەخت نەکات، بەڵکو کارێکی وا بکات ناوبانگی باش بەجێ بهێڵێ بۆ پاش خۆی، بۆ خۆی شتێ پێش بخات کە سوود بەخش بێت لە دواترین نیشتەجێی و نیشتمانی دا. لەم کاتەدا کە دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو بەسەرهات و شێوە گرنگە کاریگەرە، لەم کاتەدا سەرنج رائەکێشێ و دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە سەرەنجام و بەرهەمی هەموو کردەوەیەك ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەن کردەوەکە، هەمووی کە پرسیاری لە کردەوەی خۆی ئەکرێ، کە ئەوەش یاسایەکی ئیسلامی یە و لەم چەرخی تازەدا پێی ئەوترێ: ﴿فردية التبعة﴾، یان ﴿الجزاء الفردي﴾ وەکو باس کرا جارێکی تر لەم سورەتەدا، ئەفەرموێ: ﴿فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ﴾ ئینجا هەرکەس لە ئێوە کافر بوو لەم جیهانەدا ئەوە کوفرەکەی لە ئەستۆی خۆیەتی و بارە بەسەر خۆیەوە، سزا و تۆڵەی کوفرەکەی لە خۆی ئەسێنرێ و هیچ کەس لە کۆڵی ناخات و بەرگری ناکات لێ ی، ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا﴾ کوفری کافران هیچیان لای خوا بۆ زیاد ناکات بێجگە لە بەتین ترین خەشم و قاری خوا بۆی،

وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ

﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾ کوفری کافران هیچیان بۆ زیاد ناکات جگه له زیان و خهسارهت مهندی. پهنا ئهگرین به بهزهیی خوا له خهشمی، ئای چ زیان و خهسارهت مهندی یه بۆ هەرکەس له هەردوو جیهان دا ئەگاته زیانی خەشمی خوا لیّ ی؟ بێگومان هیچ زیانیّ تر ناگاته ئەو زیانه چ جای زیانی بەتین ترین خەشم و قار. هەرکەس بەری ئەو بەتین ترین خەشمه بکەویّ ئەبیّ له چەند بارو رووەوه زیانی تر رووی تیّ بکات؟!! ئینجا سەرنجمان رائەکێشیّ و ئەمان گێڕیّ به ئاسمانەکان و به زەوی دا، تا بزانین ئایا هیچ دروشم و نیشانه و هیچ دەنگ و باسی هەیه بۆ ئەو بتانەی که هاواریان لیّ ئەکریّ و ئەپەرسترێن. له کاتێك دا که ئاسمانەکان و زەوی هیچ دروشم و نیشانەیەك شك نابەن و هەستی پیّ ناکەن، هیچ هەواڵ و دەنگ و باسێکی ئەو بتانەیان لا نی یه. ئەفەرمویّ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵیّ بەو بت پەرستانه بۆ بەر لیّ برینەوه و دەم کوت کردنیان: ﴿أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ هەواڵم بدەنیّ لەبارەی ئەو هاوبەش و پەرستراوانەتان که هاواریان لیّ ئەکەن و ئەیانپەرستن جگه له خوا ﴿أَرُونِى﴾ نیشانم بدەن و هەواڵم بدەنیّ ﴿مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا چی یان له زەوی دروست کردووه؟ بەڵگه و رابەرەکه زۆر روون و دیاری یه، ئەمه زەوی به خۆی و هەرچی و هەرکەس تێیدایه، ئەمه هەمووی ئەبینریّ و سەرنج ئەدریّ، ئایا کام بەش و پارچەی یان چ شتیّ هەیه تیایان دا که دەست بدات و بگونجیّ بۆ هیچ کەس – بێجگه له خوا – دروستی کردبیّ و دایهێنابیّ! هەرکەس شتی وابڵیّ بێگومان هەموو شتیّ لیّ ی هەڵئەپەڕیّ و پیا هەڵئەشاخیّ و ئەیخاتەوه به درۆوه، هەموو شتیّ له ئاستی خۆی جاڕ ئەدات که خوا دروستی کردووه، هەموو شتیّ نیشانه و دروشمی دەست کردی خوای پێوەیه، که وێنەی دەست کردی هیچ کەسی تر نی یه! کەواته شتێکی روون و ئاشکرایه که ئەو بتانه سەربەخۆ هیچیان دروست نەکردووه لەم زەوی یه دا.

أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾

﴿أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ ئەی ئایا هیچ بەشداری یەکیان هەیە لەگەڵ خوادا لە دروست کردنی ئاسمانەکان دا؟ بێگومان باشتر ئەمەش ناگونجێ و نی یە! هیچ کەس زاتی نی یە و ناتوانێ بڵێ: ئەو پەرستراوانە هیچ جۆرە هاوبەشێکیان هەیە لەوەدا. هەر پەرستراو و هەرچۆن بن، تەنانەت مەلائیکە و جنۆکەش کە لەو پەرستراوانە بوون... چونکە سەبارەت بەمانیش لایان وا نەبوو کە ئەتوانن هیچ شتێك دروست بکەن یان بەشداری بکەن لە دروست کردنی هیچ شتێك، بەڵکو بە تەما بوون مەلائیکە تکایان بۆ بکات لای خوا، جنۆکەش هەواڵی ئاسمانیان بۆ بێنن و هیچ کات رادەیان لەوە بەرزتر نەکردبوو. ئەوا دەرکەوت کە ئەو بتانە بەشداریشیان نەبوو، ﴿أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا﴾ ئەی ئایا کتێبێکمان بەخشیوە بەو بتانە کە باسی ئەوەیان بۆ بکات کە ئێمە ئەوانمان کردووە بە هاوبەش، ﴿فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ﴾ تا ئەوان لەسەر رابەر و بەڵگەیەکی ئاشکرا بن لەو کتێبە و دڵنیا بن پێی؟ [1] واتە نەخێر ئەمەش نەبووە و هیچ کەسیش نی یە شتی وا بڵێ یان بەلایەوە شتێکی گونجاو بێت، بە باشی بەریان لێ برایەوە و بە تەواوی و دەم کوت کران، کەواتە هۆی بت پەرستنەکەیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا﴾ واز بێنە لەوەی باس کرا، هۆی بت پەرستی یەکەیان ئەمەیە ئەو کافرە ستەم کارانە هەندێکیان بەڵێن ئەدەن بە هەندێکی تریان، بەڵێنی سوودی ئەو بتانە و تکا کردنیان لای خوا، بەڵێنی راستی رێگاکەی خۆیان، بەڵێنەکەشیان هیچ نی یە جگە لە هەڵخەڵەتاندن، ئەوانە ئەژین بەو هەڵخەڵەتاوی یە کە سوودی هیچ شتێکیش نادات.

لەپاش ئەمە دەری خست کە ئەو بتانە هیچ باس و هەواڵێکیان نی یە نە لە زەوی و نە لە ئاسمانەکان دا. ئینجا سەرنج رائەکێشێ و دەست نیشان ئەکات بۆ ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەم ئاسمان و زەوی یەی راگیر کردووە و ئەیان پارێزێ و تەگبیری هەموو کاروباریان ئەکات بە بێ هیچ یارمەتی دەر و هاوبەشێ،

---

[1] تەفسیرەکە لەسەر ئەوەیە هەر دوو راناوی ﴿هم﴾ بۆ بتەکان بێت ، دووباری تریش ئەگونجێ: هەردوو بۆ بت پەرستەکان بێت. یەکەم بۆ بتەکان و دووەم بۆ بت پەرستەکان. بەو دوو جۆرەش تەفسیر کراوەتەوە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤١﴾

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ﴾ **بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر ئەکات لەوەی بڕۆن و نەمێنن** ﴿وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ﴾ **سوێند بەخوا ئەگەر بکەونە سەر نەمان هیچ کەس ڕاگیریان ناکات لەپاش خوا و ئەو نەمانە. بەڕاستی سەرنج دانێکی ئەم ئاسمان و زەوی یە و ئەو هەموو ئەستێرە و مانگ و خۆرە کە پرژ و بڵاو بووەتەوە لە حەوادا، هەموو ئەوانە ڕاگیرن لە جێگا و شوێن و خولگەی تایبەتی خۆیان دا، بە بێ شێوان و تێك چوون و ترازان و دەرچوون، بە بێ سستی یان چەسپانی لە گەردش و خولانەوەکەیان دا، هەموو ئەوانەش ڕاگیرن بەبێ ستوون و پایە، بە بێ بەستنەوە، بە بێ پاڵ پشت لە هیچ لایەکەوە... تەنها سەرنج دانێك بۆلای ئەو هەموو شتە گەورە و گرنگانە بەسە و شایانە بۆ ئەوەی چاوی دڵ بکاتەوە لەو دەستە قودرەتە کە ئەوانەی ڕاگیر کردووە و ئەیپارێزێ لە نەمان و لاچوون. کاتێکیش هاتنە شێوان و لاچوون و نەمان لە کاتی وێران بوونی ئەم جیهانە کە قورئان بەڵێنی پێ داوە لە چەند ئایەتی زۆردا باسی کردووە، لەو کاتەیش دا هیچ کەس ناتوانێ ڕاگیریان بکات و بیانوەستێنێتەوە.** ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا﴾ **بەڕاستی خوا زۆر بە بوردنە و پەلە ناکات و مۆڵەتی بەندەکانی ئەدات، بە پەلە و بە زوویی لەناویان نابات و ئەم جیهانە وێران ناکات، خەڵکی ڕاناکێشێ بۆ حیساب و پرسیار مەگەر لە کاتی دیاریی کراوی خۆی دا، هەل و فرسەتیان لە دەست دەرناکات بۆ تۆبە و گەڕانەوە و کردەوەی چاك و خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو ڕۆژی حیساب و پرسیارە، زۆر داشاردەر و سڕەرەوەی گوناهە، لەسەر هەموو گوناهو تاوانێ تۆڵە ناسێنێ، بەڵکو ئەبورێ و چاوپۆشی ئەکات لە گوناهو تاوانی زۆر کاتێ کە زانی خێرو چاکە لە بەندەکانی دا هەیە.**

وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا
نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ
ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ

---

**ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر ئەو بێ بڕوایانە کردەوەی خراپی خۆیان ئەداتەوە بە ناوچاویان دا، ئەیان ترسێنێ بە سزای وێنەی خۆیان لە گەڵە رابوردووەکان. ئەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ﴾ [1] ئەوانە سوێندیان خوارد بە خوا بە ئەوپەڕی سوێندەکانیان و بەتین تریان. یان زۆر بە هێز سوێندەکەیان خوارد و چوون بە تک و تاسەوە، ئەیان گوت: ﴿لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ ئەگەر ترسێنەریان بۆ بێت ﴿لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ﴾ بێگومان ئەوان گوێ گرتوو رێنموونی وەگرتر ئەبن لەهەرکام لەو نەتەوانەی کە پێغەمبەریان هاتە سەر. بت پەرستەکانی قورەیش هەواڵی جوولەکەیان ئەزانی کە چۆن لایاندا لە ئایین و شەریعەتی موسا و عیسا، بیستبوویان تاوان و خراپەکاری یان دەربارەی پێغەمبەرەکانیان، تەنانەت کوشتنیان، ئەمانیش بێزاری یان دەربڕی لەو کردەوەی ئەوانە و تەشەریان لێدان و ئەو بەڵێن و پەیمانە بەتینەیان بەو سوێندە گەورەیەوە کە قورئان بۆی باس کردین، دەردەبڕی.**

**ئینجا لەپاش بەدی هاتنی ئاواتەکەیان و ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان ئەو پەیمان و سوێندەیان شکاند و بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ ئینجا کاتێ ترسێنەریان بۆهات ﴿مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ ئەو ترسێنەرەیان هاتنەکەی هیچ کاری لێ نەکردن و زیادی نەکردن لەسەر ئەو باری خۆیانە مەگەر دوور کەوتنەوە و راکردن و تاران لە حەق و رێگا راستەکەی خوا، واتە خراپتر بوون لە جاران ﴿ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لەبەر خۆ بە زل زانی و**

---

[1] بت پەرستەکانی قورەیش سوێندیان ئەخوارد بە باوك و باپیر و بتەکانیان، کاتێ ئەیانویست بگەنە ئەوپەڕو بەتین ترین سوێند بخۆن سوێندیان بە خوا ئەخوارد. جا لەسەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿جهد أيمانهم﴾. یان مەبەست مانای دووەمە کە لە تەفسیرەکەدا وترا.

داوای گەورەیی کردن لە ولاَت دا، ﴿وَمَكۡرَ ٱلسَّيِّيِٕ﴾[1] لەبەر کردەوە و پیلانی خراپ. ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ﴾ ئەو کردەوە و پیلانی خراپە چوار دەوری هیچ کەس نادات و دووچاری کەس نابێت بێجگە لە خاوەنەکەی و خراپەکار و پیلان گێڕەکە. ئەم گەڕانەوەی پیلانە بۆ سەر خاوەنەکەی بەدی هات لە یەکەم تاقم کە بە بۆنەی ئەوانەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئەوەبوو لە بەدردا ئەوەیان بەسەرهات کە بەسەریان هات. بڕیارەکە گشتی یە لە هەموو چەرخ و چینێك دا هەروا بووە و هەروا ئەبێ لە پاشە ڕۆژدا، ئیتر زۆری پێ چوو بێ یان کەم، لە هەموو شتێك دا ئاخری کارو پاشە ڕۆژ شتە و حیسابە. ﴿فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلۡأَوَّلِينَۚ﴾ کەواتە ئایا ئەوانە چاوەڕوانی ئەکەن و بە تەمای هیچ هەن بێجگە لەباوی خوا لە گەل و نەتەوە بێ بڕواکانی پێشوودا کە تێپەڕی کرد بە سزادان و لەناو بردنیان؟ واتە نەخێر با بە تەمای بێجگە لەوە نەبن ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ﴾ چونکە هەرگیز دەست ناکەوێ هیچ گۆڕاندنێ بۆ باوی خوا، بەم ڕەنگە لەباتی سزادانی ئەوانەی شایانن سزا نەدان و بەزەیی بەکار بێنێ، ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا﴾ دەست ناکەوێ بۆ باوی خوا هیچ جۆرە لادانێك لە ڕێگای نەخشە کێشراوی خۆی. بەم ڕەنگە سزادانەکەی لە بێ بڕواکان بگوێزێتەوە بۆ غەیری ئەوان.

ئینجا بۆ بەڵگە و نموونە هێنانەوە لەسەر نەگۆڕانی باوی خوا سەبارەت بە بێ بڕواکان سەرنجی بت پەرستەکانی قورەیش ڕائەکێشێ بۆ ورد بوونەوە و تەماشا کردنی شوێنەوارە و دروشمی ولاَتە وێران بووەکانی گەلە بێ بڕوا و بت پەرستەکانی دەورو بەریان کە ئەمان تێپەڕیان ئەکرد بەلایاندا لە کاتی کۆچ و کاروانی هاوین و زستانانەی شەرم و یەمەن بۆ کڕین و فرۆشتن و بازرگانی، کە ئەو ولاَتە وێران بووانە ناسراو و بەناوبانگ بوون لایان، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئایا ئەو بت پەرستانە هەمیشە دانیشتوو نیشتەجێ بوون لە جێ و شوێنی خۆیان دا و نەگەڕاون بە زەوی و ولاَتدا،

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە ئەو دوو وشەیە ﴿مفعول لة﴾ ن، دروستە هەردوو ﴿بدل﴾ بن لە ﴿نفورا﴾. یەکەم ﴿مفعول لة﴾ بێت و دووەم ﴿عطف﴾ بێت بۆ سەر ﴿نفورا﴾.

فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا
كَسَبُواْ

---

**﴿فَيَنظُرُواْ﴾ تا سەرنج بدەن و تەماشا کەن ﴿كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئایا چۆن بوو پاشە ڕۆژ و چارەنووسی ئەو گەلانەی کە لە پێش ئەمان بوون ﴿وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ ئەوان بەتین تر بوون لەمان لەبارەی هێز و دەسەلاتەوە. گەڕان بە وڵاتاندا بە چاوێکی کراوە و بە دڵێکی بێدارەوە، ئاگادار بوون بەسەر لەناوچوون و بەرباد بوونی رابردووەکان دا، بیر کردنەوەی ژیان و بەسەرهات و دوا ڕۆژیان... ئەوانە هەموو زۆر شایانن بۆ ئەمەی لە دڵ و دەروون دا هەست و تێگەیشتن و وریایی و بیم و ترس و خۆپارێزیی فەراهەم بێنن، جا لەبەر ئەوە ئەم جۆرە تەمێ و سەرنج راکێشانە لە قورئان دا چەند بارە ئەکاتەوە.**

**ئینجا سەرنجیان رائەکێشێ بۆ هێز و توانای گەورەی خوا. ئەو هێز و توانای کە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و هیچ شتێکی لە دەست دەرناچێ، هەرچۆنێ گەلە رابردووەکانی لەناو برد و تۆڵەی لێ سەندن هەروەها ئەتوانێ ئەمانیش وەکو ئەوان لێ بکات، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ خوا هیچ شتێك نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەوی دا دەستە پاچەی ناکات و لە دەستی قوتار نابێ، چونکە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە زانایە و توانایە بە بێ سنوور و بە ئەوپەڕی رادەی زانین و توانین.**

**ئینجا لە دوا دوای سورەتەکەدا حیلم و بەزەیی خوا ئەخاتە بەرچاو لەپاش ئەوە هێز و توانینە بێ سنوورەکەی باس کرد، تەئکید و دڵنیایی ئەکات لەسەر ئەوە کە پەلە نەکردن لە سزادانی تاوانباران و مۆڵەت دانیان، کار ناکات لەوەی لە حیساب و پرسیار و تۆڵەیەك کە بڕیاری داوە بۆ دواڕۆژ و لە ڕۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ﴾ ئەگەر خوا قار بگرێ لە خەڵکی و تۆڵەیان لێ بستێنێ بەرامبەر ئەو تاوان و خراپەی کردوویانە و بە پێی ئەوە بجوولێتەوە لەگەڵیان،**

مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًا ﴿٤٥﴾

﴿مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ﴾ **هیچ گیان لەبەرێکی نەئەهێشتەوە بەسەر پشتی زەوی** دا، واتە هەمووی ئەکوشتن و لەناوی ئەبردن بەهۆی شومی و نەگبەتی ئەو هەموو گوناهو تاوانەی کە ئەکرێ. بەڵێ بەڕاستی ئەو هەموو سپڵەیی و بەدنمەکی یەی کە خەڵکی هەیانە بەرامبەر چاکە و بەهرەکانی خوا کە نایەنە ژمارە، ئەو هەموو شەڕ و خراپە و ئاژاوەیە کە ئەینێنەوە لە ولات دا، ئەو هەموو جەورو ستەم و دەست درێژیی و سەرکێشی یەی کە ئەیکەن لە ولاتدا ئەوانە هەمووی ئێجگار ناشیرین و خراپ و ناڕەوان ئەگەر خوا بە پێ ی ئەوانە بجوولایەتەوە، بێگومان تۆڵە و سزاکەی لەوان تێپەڕی ئەکرد بۆ هەموو گیان لەبەری تریش بەسەر ئەم زەوی یەوە و زەوی بە هیچ رەنگ بە شیاوی ژیان نەئەما، نەك ژیانی تەنها ئادەمی، بەڵکو هەموو ژیانی تریش. پەنا ئەگرین بە خوا، با ئەندازێ بوەستین لەبەردەم ئەم ئایەتەدا، بیر بکەینەوە لە خراپی و شوومی و نەگبەتی و گوناه، تا ئەو رادەیە کە هۆی نەمانی هەموو گیان لەبەر بێت لەم زەوی یەدا بە تاوانبار و بێ تاوانەوە، بە ژیر و زانا و نەزان و ناژیرەوە!!

هەرچەند گوناهو تاوان ئا بەو جۆرەیە بەلام خوا پەلە ناکات لەم جیهانەدا وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ بەلام خەڵکی دوا ئەخات تا ئەجەل و ماوەیەکی ناوبراوی دیاریی کراو، دوایان ئەخات بە یەکە یەکە تا دواهاتنی ماوەی یەکە یەکە و

دواهاتنی تەمەنیان لەم جیهانەدا. دوایان ئەخات بە کۆمەڵ تا دواهاتنی ماوەی جێنشینی یان کە دیاریی کراوە بۆیان و تاقمی تر دێتە جێگایان، تیرە و جۆرەکەیان دوا ئەخات تا دواهاتنی ئەو ماوە و تەمەنەی کە دیاریی کراوە بۆ تیرەکەیان و دوا هاتنی تەمەنی ئەم جیهانە و هاتنی جیهانی گەورە و نەبڕاوە. بەو جۆرە پەلە ناکات لە بەندەکانی و ماوەیان ئەدات بەڵکو کردەوەی چاک بکەن و هیچ بڕو بیانوویان نەمێنێ. ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ﴾ ئینجا کاتێ ئەجەل و ماوەیان هات، کاتی کردەوە دوای هات، کاتی حیساب و پاداشت و تۆڵە گەیشت، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا﴾ بێگومان خوا هەمیشە بینایە بە بەندەکانی، واتە جەور و ستەمیان لێ ناکات و هەموو کەس بە پێی کەسب و کردەوەی خۆی ڕەفتاری لەگەڵ ئەکات.

دوایی هات تەفسیری ئەم سورەتە، بەیانی ڕۆژی یەك شەممە ١٣ ی ڕەمەزانی ١٤٠٢ ی کۆچی. خوا بە بەزەیی خۆی وەری گرێ و یارمەتیم بدات بۆ تەواو کردنی ئەم تەفسیرە آمین.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾

## سورەتی (یس)

## مەککەیی یە (٨٣) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە، وەکو زۆربەی سورەتە مەککەیی یەکانی تر یەکەم ئامانجی چاندنی بیرو باوەڕی پاك و خاوێنی ئیسلامە لە دڵ و دەروون دا، مەبەستەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ باسی تاك و تەنیایی خوا و راستی ی هاتنی رۆژی دوایی و راستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر و پێغەمبەران، بێزاری دەربارەی پەرستی جگە لە خوا، لەگەڵ پرو پووچی باوەڕ بە هەموو بت و هاوبەشیٚ بە خوا.

لە پاش ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئەفەرمویٚ: ﴿یس﴾ ئەم دوو پیتە وەکو دوانزە پیتی تر، کە هەموو کۆ ئەبنەوە لەم رستەیەدا: ﴿نص حكيم قاطع له سر﴾ دەرگای(٢٩) سورەتی قورئانیان پیٚ کراوەتەوە ناونراون بە ﴿الحروف المقطعة﴾ ئەم پیتانە، هەندیٚ لە زانایان و پێشەوایانی ئیسلام فەرمویانە نهێنی یە لە نێوان خواو پێغەمبەردا(ﷺ). هەندیٚ تر فەرمویانە نهێنی نی یە و زانراون، ئەمانەی دوایی زیاتر لە بیست مانا و مەبەستیان بۆ باس کردوون، هەندێکیان بە نزیك دانراون، هەندیٚ بە دوور، لە بابەت تایبەتی ئەم پیتانە و ژمارەی ئەو سورەتانەی کە خراونەتە سەرەتایانەوە و جیاوازی ژمارەیان لەو سورەتانەدا لە ١،٢،٣،٤،٥ پەیوەندی پیتەکان لەنێوان خۆیاندا و پەیوەندی یان بەو سورەتانەوە، لەم هەموو روەوە چەند مەبەستێکیان بۆ باس کردووە، چەندەها شتی سەرسوڕهێنەریان فەرمووە.

بە بیر لیٚ کردنەوەیان خاوەن هۆش و بیر دڵنیا ئەبیٚ کە تەنها هێنانی ئەم پیتانە — ج جای هەموو قورئان — جگە لە خوا لە توانای هیچ کەس دا نی یە، لێرەدا ماوە نی یە درێژە بە باسەکە بدەین، هەرکەس ئەیەویٚ با سەیری کتێبە تایبەتی یەکان بکات، وەکو(کشاف) ی زەمەخشەری و(برهان) ی زەرکەشی و وێنەیان. یەکیٚ لەو مانا و مەبەستانەی ئەم پیتانە ئاگادار کردنەوەی ئادەمی یە، بە تایبەتی(عەرەبەکان) کە ئەم قورئانە لەو پیتانە پێك هاتووە کە ئەوان گفت و گۆی پیٚ ئەکەن و هەموو جۆرە وتەیەکیلیٚ پێك ئەهێنن، کەچی ئەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن وێنەی بڵێن، بەڵکو وێنەی دە سورەتی، بەڵکو وێنەی تەنها سورەتێکی، بۆ

ئەم مەبەستە قورئان چەند جار بەرهەڵستی بێ بڕوایان وەستا، پێی وتن: ئەگەر راست ئەکەن ئەڵێن ئەم قورئانە لەلایەن خواوە نەهاتووە، دەی ئازا بن وێنەی بڵێن، هەواڵیشی دانێ کە ناتوانن – وە نەیشیان توانی – کەواتە با گەردن کەچ بکەن و باوەڕ بهێنن. بێگومان کاری خوا لە هەموو شتێك دا ئاوا پایە و پلەی بەرزە و هیچ کەس نایگاتێ، ئەبینین کە ئادەمیزاد لەم خاك و خۆڵە خشت و کاشی و پەیکەر، لە کان و کارگاکان ئامێرو مەکینە دروست ئەکات، بەڵام خوای گەورە ئادەمیزادی لێ دروست ئەکات، کە دەریای زانیاری ئادەمیزاد کول و کۆڵ و پەك کەوتووە تیای دا، ئێمەیش لێرەدا بەم شێوەی کە باس کرا تەفسیری ئەم دوو پیتە ئەکەین. خوا ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *يسٓ * وَٱلۡقُرۡءَانِ﴾ سوێند بە قورئان ﴿ٱلۡحَكِيمِ﴾ کە هەموو کاروباری رێك و رساتە و هەموو شتی لە جێگای خۆی دایە. سیفەتی ﴿حكيم﴾ هەرچەندە بۆ زیندوو و زانا و خاوەن مەبەست بەکار ئەهێنرێ، بەڵام خوای گەورە بۆ قورئان بەکاری هێناوە. چونکە گوفتاری خوایە کە ﴿حكيم﴾ ە، ئاوێنەیەکی بێگەردە بووەتە هۆی روون کردنەوەو دەرخستنی پاك و خاوێنی و بێگەرد و لەکەیی و بەجێی کردار و بڕیارەکانی خوای گەورە. جگە لەوەش بەڕاستی هەقی خۆیەتی پێی بوترێ ﴿حكيم﴾ چونکە لەگەڵ هەموو کەس ئەدوێ بە ئەندازی ژیریی و توانای و ئەچێتە ناو دڵ و دەروونی و ئەودا لە بەنۆکەی دڵی و بە ئەندازێ لەگەڵی ئەدوێ پڕ بە پڕ، نە زیاد و نە کەم، بە شێوەیەك کە بەسە بۆ رێك و پێك کردن و تەمێ دادان. بەڵێ راستە ﴿حكيم﴾ ە، خەڵکی پەروەردە ئەکات و تێی ئەگەیەنێ و پێی ئەگەیەنێ بە گوێرەی بەرنامەیەکی شیاو و تەواو، دەست ناگرێ بەسەر توانا و وزەی ئادەمی دا، بەڵام پەروەردەی ئەکاو رای ئەهێنێ کە ئەو وزە و توانایە لە بار و ڕوویەکی بە نرخ و پڕ سوودا بەکار بێنێ، بە جۆرێ یاسای ژیانی داناوە کە رێگای حەز و ئارەزوو ناگرێ و لە چوار چێوەو سنووری ئەو بەرنامە رێکەی کە دایناوە. جگە لەمانە، زۆر لە خوا پێداوەکان، ئەوانەی کە چوونە ژێر سایەی قورئان، ئەوانەی کە بە رەنگێکی قورئان خۆیان رەنگ کرد، ئەوانەی کە بە خو و رەوشتە شیرینەکانی خۆیان رازاندەوە، ئەو خوا پێداوانە ئەفەرمون: قورئان رۆحێکی تایبەتی هەیە، ئەو سیفەتە شیرینانەی هەیە کە زیندوو هەیەتی، سۆز و خۆشەویستی بەکار ئەهێنێ لەگەڵ دۆستەکانی، کاتێ کە دڵیان بۆ کردەوە چەند شتی نهێنی و نایابیان پی ئەبەخشێ کە خەڵکی تر لێ یان بێ بەشە. خوای گەورە سوێند ئەخوا بە قورئانی ﴿حكيم﴾ لەسەر راستی پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ) و رێك و راستی رێگاکەی،

إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ

---

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ * عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ **بێگومان ئەی محمد تۆ یەکێکی لە پێغەمبەران کە ڕەوانە کراون بۆ سەر ئادەمیزاد. لەسەر ڕێگایەکی راست، تۆ لەسەر ڕێگای** راستیت کە ڕێگای خوایە. خوا هیچ پێویستی بە سوێند خواردن نی یە، بەڵام لەم سوێند خواردنەدا گەورەیی قورئان دەرئەکەوێ، کە ئەوەندە پلەی بەرزە خوا سوێندی پێ ئەخوات، گەورەیی پێغەمبەر و پێغەمبەرێتی یەکەی دەرئەخات. ئای ئەم سوێندە چەند شیرین و بەجێ یە! چەند ڕێك و گونجاوە لەگەڵ سوێند لەسەر خوارەوەکەدا، چونکە گەورەترین(معجزە) ی پێغەمبەرمان(ﷺ) هەتا هەتایە بریتی یە لە قورئان، گەورەترین و تێرو تەواو ترینی هەموو بەرنامەکانی خوا ئەم بەرنامەیە کە ئەم قورئانە هێنای، کەواتە سوێند لەسەر خوراوەکە بەڵگە و نیشانەی تێرو تەواوی لەگەڵ دایە وەکو فەرموبێتی: سوێند بە قورئانی حەکیم تۆ پێغەمبەری، ئەم قورئانەش بەڵگە و موعجیزەیە بە دەستەوە کە هەموو کەس لە ئاستی دەستە پاچە و پەك کەوتووە، سوێند بە قورئان تۆ لەسەر ڕێگای راستیت، ئەم قورئانە بەڵگەیە، چونکە هیچ کەس نەیتوانیوە و ناتوانێ هەتا هەتایە لە ڕووی زانین و زانیاری و راستی یەوە شتێ بدۆزێتەوە لەم قورئانەدا کە ڕێك و راست و ڕەوانە لەگەڵ هەموو ناوچە و کون و قوژبنی ژیان دا، لەگەڵ هەموو سروشتی بوونەوەردا، دوورە لە هەموو گرێ و گۆتاڵ و لاری و چەوتی و پێچ و پەنایەك. هەموو چین و گرۆیەك سوود و پێویستی تێرو تەواوی خۆی لێ وەرئەگرێ: شاری یان لادێیی، نیشتەجێ یان کۆچەریی، نەخوێندەوار و خوێندەوار، نەزان و زانا، هەژار و دەوڵەمەند، ئەوەی لە زنجدا ئەژی لەگەڵ ئەوەی لە کۆشك و عەمارەتی(ناطحات السحاب) دا ئەژی، خوای گەورە لەم سوێندەدا ڕووی فەرمودە ناکاتە بێ باوەڕەکان. بەڵکو ڕوو ئەکاتە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ) لەبەر دڵنەوایی و دڵخۆشی دانەوەی لەسەر ئەو زەحمەت و سزایەی دووچاری ئەبوو لە ڕێگەی گەیاندنی

فەرمانی ئەودا، هەرچەندە پێغەمبەر(ﷺ) باش ئەیزانی کە خۆی پێغەمبەرە و هیچ کات گومانی نەبوو، بەڵام ئەو سوێندە باشتر دڵخۆشی ئەکرد و سووری ئەکرد لە گەیاندنی فەرمانەکەی دا. هەروەها روونەکردنی ئەم سوێندە بۆ بێ باوەڕەکان ئەوە پیشان ئەدات کە ئەوانە لەوە نزم و بێ نرخ ترن کە رووی قسەیان تێ بکرێ، پایە و پلەی ئەم سوێند و پێغەمبەر و پێغەمبەرێتی یە بەرزترە لەوەی جێگای قسە و باس و لێکۆڵینەوە بێت لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەدا، ئینجا خوای گەورە خۆی ئەناسێنێ بەبەندەکانی بە هەندێ سیفەت و ناونیشانی خۆی، بۆ ئەوەی باشتر تێ بگەن لە گرنگی ی لەو بەرنامەیەی کە بۆیان هاتۆتە خوارەوە، ئەفەرموێ: ﴿ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وشەی ﴿تنزيل﴾ بە دوور جۆر ئەخوێنرێتەوە: بە بۆر و بە سەر. ئەوەی باو بێ ئێستا سەرە. لەسەر خوێندنەوەی بۆر، واتە قورئان هێنراوە خوارەوەی کەسێکە زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا و دەسەڵاتی بێ سنوور و بێ بڕانەوەی هەیە و خاوەنی رەحم و بەزەیی زۆرە. لەسەر خوێندنەوەی بەسەرە، واتە: قورئان هێنراوەتە خوارەوە بە هێنانی کەسێ کە زاڵە بەسەر هەموو شت دا و خاوەنی رەحم و بەزەیی یە، بێگومان لە سیفەتی یەکەمەوە دەرئەکەوێ کە قورئان بەرزترە لە هەموو دەسەڵاتێکی تر. لە سیفەتی دووەمەوە روون ئەبێتەوە کە خوا پێویستی بە ناردنی قورئان نی یە، پێویستی بە هیچ کەس نی یە، بەڵام رەحم و بەزەیی دێتەوە بە بەندەکانی خۆی دا، ئەزانێ بە بێ بەرنامە بەرزەکەی خۆی هەموو وێڵ و سەرگەردان ئەبن و دووچاری بەدبەختی هەردوو دنیاکەین، لەبەر ئەوە بەرنامەی بەختەوەری و کامەرانی هەردوو جیهانی بۆ ناردن. ئینجا خوای گەورە هۆی هێنانە خوارەوەی قورئان و رەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ ﴾ تۆ رەوانە کراوی، یان قورئان هێنرایە خوارەوە بۆ سەر تۆ بۆ ئەوەی گەل و کۆمەڵێ لەئاگر و سزای خوا بترسێنێ کە باو باپیرە نزیکەکانیان نەترسێنراون، واتە زۆر پێویستیان هەیە، چونکە ماوەیەکی دوورە پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە.

ئەو گەلەی کە پێغەمبەرمان(ﷺ) لەوان بووە و لەناویان دا پێگەیشت تا بوو بە پێغەمبەر گەلی قورەیشە، لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیلن، لەپاش ئیسماعیل هیچ پێغەمبەرێ تر

ڕەوانە نەكراوە بۆ سەریان تا پێغەمبەری هەمووان محمد(ﷺ) كەواتە ئەبێ بڵێین باوك و باپیرە نزیكەكانیان نەترسێنراون، چونكە دوورەكانیان ترسێنراون. لێرەدا جێگای پرسیار هەیە: ئایا محمد(ﷺ) كە بۆ سەر هەمووان ڕەوانە كراوە بۆچی لێرەدا ترساندنی تەنها بەستراوە بە قورەیشەوە نەك بە هەمووانەوە، وەك لە چەند شوێنی تردا بەو شێوە گشتی یە بڕیار ئەدات، یەكێ لەوانە: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾ [1] لە وەڵامدا ئەڵێین:

یەكەم: مەبەست ئەوانە و هەركەسی تر كە ئەم قورئانەی پێ بگات هەتا هەتایە، وەكو خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾ [2] قورئان هەندێكی ئەبێتە تەفسیر بۆ هەندێكی تری.

دووەم: ئەڵێین هەرچەندە پێغەمبەرمان(ﷺ) بۆ سەر هەمووانە، بەڵام لە یەكەم جاردا فەرمانی پێ نەدراوە كە بە یەك جار هەمووان بترسێنێ و بانگیان بكات بۆ سەر ڕێگەی خوا، بەڵكو بەرە بەرە، ئەوەتە لە پێشەوە فەرمانی پێ دراوە كە تەنها خزمە نزیكەكانی بترسێنێ، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾. [3]

پاش ئەوان بۆ باقی قورەیش، بۆ باقی عەرەب، بۆ تیرە و نەتەوەكانی تر، ئەوە بوو لە ساڵی حەوتەمی كۆچی دا نووسراوی نارد بۆ پادشای فارس و میسر و ڕۆم و باقی عەرەب، چونكە سروشتی فەرمانەكە هەر وا بووە و هەر وایش ئەبێ، بە بەرەبەرە و ئەبێ لە بنەڕەتەوە بڕوا. ئەم سورەتە مەككەیی یە ئەو كاتە هاتە خوارەوە كاتی هەوڵدانی پێغەمبەر بوو(ﷺ) لەگەڵ گەلی قورەیشدا، قورەیش لەوكاتەدازۆرپێویستیان بەترساندن وئاگاداركردنەوەبووە،

---

[1] الفرقان / ١: خێرو خۆشی زۆرە و پاكە لەهەموو لەكەیەك كەسێك كە قورئانی هێنایە خوارەوە بۆ سەر بەندەی خۆی كە محمد(ﷺ) بۆ ئەوەی ببێتە ترسێنەر بۆ هەموو عالەم.

[2] الأنعام / ١٩ بڵێ: ئەم قورئانە بە وەحی بۆم هاتووە تا ئێوەی پێ بترسێنم و هەركەسێ پێی بگات.

[3] الشعراء / ٢١٤ خزمە نزیكەكانت بترسێنە.

وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَهُمۡ غَٰفِلُونَ﴾ کەواتە ئەوان بێ ئاگان، چونکە ئەو ماوە دوور و درێژە باو و باپیریشیان پێغەمبەریان نەدیبوو. پێغەمبەر وەکو ترسێنەر بووە، هەروەها موژدە دەریش بووە بەڵکو باری موژدەی پێشتر و بەهێز تر بووە، بەڵام لێرەدا جێگای موژدە نی یە، چونکە بێ ئاگاکان بە تەواوی سەریان کردبووە سەرکەشی و تاوان، دەرمانی سەرکەشی و تاوانیش ترساندنە.

بێ ئاگایی دەردێکی هێجگار کاری یە، رووی کردە هەر دڵێ تێکی ئەدا و سەری لێ ئەشێوێنێ و پەکی ئەخات لە بە جێ هێنانی کار و فرمانی، بەرگری ئەکات لە وەرگرتنی تەمێ و ئامۆژگاری و دووچاری بەدبەختی ئەکات و ماوەی نادات بێتە سەر رێگای راست، وەکو ئەو کۆمەڵە لێ ئەکات کە خوا هەواڵیان ئەگەیەنێ بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ﴾ بێگومان ئەو بڕیاری خوای گەورە دابووی کە دۆزەخ پڕ بکات لە تاوانبارانی کۆکەڵی ئادەمی و جنۆکە هاتە جێ و جێگیر بوو دەربارەی زۆربەی ئەو سەرکەشە بێ ئاگایانە، چونکە خوا ناسیونی و زانیویە کە ئەمانە لە سەرکەشی خۆیان ناکەون و ناگەڕێنەوە، ﴿فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ کەواتە ئەوانە باوەڕ ناهێنن و گەردن کەچ ناکەن بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ).

لێرەدا هیچ زۆر پێ هێنان و ناچار کردنێ نی یە، چونکە ئادەمی وا دروست کراوە خواهیش و توانایەکی وای پێ دراوە کە هەر رێگایەکی دایە بەر بە ئارەزوو و هەڵبژاردنی خۆیەتی، خوای گەورەیش زانیویە کە ئەمانە بە ئارەزوو خواهیشی خۆیان رێگەی بێ بڕوایی ئەگرنە بەر و کۆتایی ناهێنن لە سەرکەشی، لەبەر ئەوە ئەو بڕیارەی لەسەردان. ئینجا بۆ ئەوەی نەگەڕانەوەی ئەم بێ ئایاگانە و مانەوەو بەردەوامی یان لەسەر بێ بڕوایی باش روون بکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستە، بە شێوەی چیرۆك دوو وێنەیان بۆ ئەهێنێتەوە:

یەکەم: بە چەند کەسێ کە زنجیر کرابێتە ملیان تا چەناگەیانی گرتبێ بە جۆرێ توانای سەر داخستن و تەماشای بەردەم و ئەم لاو ئەولای خۆیانیان نەمێنێ.

إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِيَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ
سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ
تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ ۖ فَبَشِّرْهُ
بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴿١١﴾

دووەم: بە چەند كەسێ كە لە پێش دەم و لە پاشیانەوە(سەدد) و بەربەست دروست كرابێ بە جۆرێ وەكو پەردەیە بەسەر چاویانەوە بەرگری یان بكات لە بینین، واتە هەرچۆنێ ئەم جۆرە كەسانە چاویان بەربەست كراوە لە بینینی رێگای راست، كە رێگای خوایە، ئەفـــەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِيَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ * وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾ ئەم بێ ئاگایانە لە نەگەڕانەوە و بەردەوامی یان لەسەر بێ باوەڕیی و تەماشا نەكردنی هیچ بەڵگە و نیشانەیەك، وەكو كەسانێكن كە زنجیرمان كردبێتە ملیان تا چەناگەیانی داگیر كردبێ، كەواتە سەریان بەرز ئەبێتەوە و توانای سەر دانەواندن و بەم لاو و لایان نامێنێ، ئەو كاتە بەردەم و ئەم لاو ئەو لای خۆیان نابینن. وەكو كەسانێكن كە لە پێش و پاشیان(سەدد) ێكمان دروست كردبێ و بەهۆی ئەوەوە بەرچاومان گرتبێ. كەواتە هیچ شتی تر نابینن لەو كاتەدا.[1] ئەم بێ ئاگایانە وەكو خۆیان هیچ بەڵگەیەك نابینن، ئامۆژگاری و هەڕەشە و ترساندنیش كاری لێ نەئەكردن، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ

[1] هەندێ لە زانایان ئەفەرمون مەبەست وێنە و چیرۆك نی یە بەڵكو مەبەست ئەوەیە ئەوانەی كە بە ئارەزوو و هەڵبژاردنی خۆیان ئەكەونە سەر رێگای كوفر و گومڕایی یەوە ئەیانەوێ دژی ئاینی خوا بجوڵێنەوە و گوێ یان لە ترساندن و ترسێنەرەكانی خوا نی یە، خوای گەورە غەزەبیان لێ ئەگرێ. بەرگرێكی نهێنی یان تیا دروست ئەكات كە توانای گەڕانەوەیان نامێنێ.

﴿ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ترساندن و نەترساندنی تۆ یەکسانە لای ئەو بێ ئاگایانە، وەك یەکە، سوودی نی یە و بە هیچ جۆر ئەوانە باوەڕ ناهێنن.

ئینجا باسی ئەوانە ئەکات کە ترساندن سوودی هەیە بۆیان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ وَخَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ﴾ ترساندنی تۆ سوود ناگەیەنێ بەو کەسە نەبێ کە شوێنی قورئان ئەکەوێ , ئەترسێ لە خوای خاوەن رەحم و بەزەیی، بێ ئەوەی دیبێتی، ئەترسێ لە سزای پێش ئەوەی کە هاتبێ و رووی دابێ. مەبەست تەنها ئەوانە نی یە کە بڕوایان هێنابێ، بەڵکو کەسانی تریش کە هێشتا بڕوایان نەهێنابێ، بەڵام ئامادەیی یان هەبێ بۆ ئیمان هێنان و گوێ رایەڵی. ئەوانە دڵیان وەکو چرایەك وایە، هەموو شتی تەواو بێ، تەنها داگیرساندنی مابێ، هەر بە ترساندنەکە رووناکی ئیمانی تێدا پەیدا ئەبێ، ئەفەرموێ لە ﴿الرحمن﴾ ئەترسێ، بۆ ئەوەی کەس هەڵنەخەڵەتێ بە رەحم و بەزەیی خواو ترسی نەمێنێ، سەر بکاتە گوناهو تاوان، بەڵکو ئەبێ لەگەڵ چاوەڕوانی رەحم و بەزەیی دا ترسیشی ببێ، چونکە خوا هەرچۆنێ خاوەن رەحمە تۆڵەیشی زۆر بەتینە. ئەو کەسەی کە سوود وەرئەگرێ لە ترساندنی پێغەمبەر(ﷺ) شایانی مژدەیە، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ﴾ بەهۆی ئەوەوە کە شوێنی قورئان کەوت و ترسا لە خوای خاوەن بەزەیی، تۆیش ئەی پێغەمبەر(ﷺ) موژدەی بدەرێ بە سڕینەوە و داپۆشینی گوناهەکانی – بە مەرجێ [1] بەردەوام نەبێ لەسەریان – موژدە بە لێ خۆش بوون و ئەجرو پاداشتێکی بەڕێز و بە نرخ.

بە بۆنەی بەڵێن دان بە پاداشتی شوێن کەوتووەکانی قورئان و لە خوا ترسەکان، لێرەشدا شوێنی ئەوەیە کە دڵنیایی بکرێ لەسەر هاتنی رۆژی دوایی بۆ ئەوەی ترساندن زیاتر کار بکات و دڵخۆشتر بین لە موژدە دان،

---

[1] ئەم مەرجە بە گوێرەی ئایەتی: ﴿ولم يصروا على ما فعلوا﴾ لە سورەتی ﴿آل عمران﴾ دا هەیە، چەند فەرمودەی پێغەمبەریش(ﷺ) بەڵگەیە لەسەر ئەم مەرجە.

لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ﴾ بێگومان ئێمە مردووەکان زیندوو ئەکەینەوە، هەرچی کردەوەیان هەیە ئەینووسین، چ ئەو کردەوانەی بەرهەمیان نەمابێتەوە بۆ پاش خۆیان یان ئەوانەی کە بەرهەمیان مابێتەوە – وەکو دروست کردنی مزگەوت و ئەو شتانەی کە خێرو چاکەن، یان زانیاری و رەوشتێکی چاك کە بە جێ مابێ، لەو بارەکەیشەوە وەکو مەلها و تیاترۆخانە و هەر شوێنێ کە جێگای تاوان و گوناه کردن بێت، یان بیرو باوەڕێ کە لە پاش دا رەفتاری پێ بکرێ – هەر شتێکمان ژمارە و دیاریی کراوە لە ﴿لوح المحفوظ﴾ دا یان لە عیلمی خۆمان دا.

ئینجا خوای گەورە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) بە باس کردن و گێڕانەوەی بەسەرهات و سەرگوزەشتەی چەند پێغەمبەرێك کە رەوانە کران بۆ سەر دانیشتوانی شارێك لەگەڵ هەڵوێستی دانیشتوانی شارەکە بەرامبەریان، پاشە رۆژ و سەرەنجامی باوەڕدار و بێ باوەڕەکانیان، فەرمانی دا بە گێڕانەوەیە ئەم بەسەرهاتە بۆ گەل و قەومەکەی بۆ پەند و ئامۆژگاری و ترساندنیان.

خوای گەورە لەم سەرگوزەشتەیەدا ناو و شوێنی ئەو شارەی دیاریی نەکردووە، هەروەها ناوی تیرەی دانیشتوان و ناوی پێغەمبەرەکانیشی نەبردووە، هەرچەند لە زۆر لە کتێبەکاندا باس کراون کە ئەو شارە شاری(انطاکیە) بووە، نێرراوەکانیش لەلایەن حەزرەتی عیساوە بوون، ناوەکانیشیان براوە بەڵام ئەو ناوبردن و دیاریی کردنە هیچ سوودێکی نی یە بۆ مەبەستی ئەم بەسەرهاتە، ئەگەر سوودی ببوایە قورئان خۆی باسی ئەکردن. جگە لەوەیش دڵنیا نین لە راستی یان، چونکە لەم بابەتەوە شتی پڕو پووچ و ئیسرائیلیات زۆرە، کەواتە خۆمان بەم شتانەوە خەریك نەکەین چاکە. بەڵام ئەوەی کە گرنگە ئەمەیە: خوا دوو پێغەمبەری نارد – وەکو چۆن حەزرەتی موسا و هارونی نارد بۆ سەر فیرعەون و قەومەکەی – بۆ ئەوەی بانگیان بکەن بۆ خوا پەرستی و واز بێنن لە بت پەرستی بەڵام خەڵکەکە باوەڕیان نەهێنا، ئینجا خوا پێغەمبەرێکی تریشی بۆ ناردن بۆ یارمەتی و بەهێز کردنی دووانەکەی تر، کاتێ کە هات، رووی کردە دانیشتوان و وتی: بێگومان منیش و ئەوانیش پێغەمبەر و رەوانە کراوی خواین، هەرسێکیان چوونە پێشەوە شانیان کرد بە فەرمانی خۆیان دا، سەر لە نوێ دەستیان کرد بە بانگ کردنیان بۆ سەر رێگەی خوا. ئیتر با بێینەوە سەر فەرمایشتی قورئانەکە، خوای گەورە فەرموی بە پێغەمبەرمان(ﷺ)،

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا
فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن
شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا﴾ سەرگوزەشتەیەکی نایاب باس بکە بۆ ئەم قەومە، سەرگوزەشتەی ﴿أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾ دانیشتوانی شارێ کە لەو کاتەدا ناسراو و بەناوبانگ بووە، ﴿إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ باسی هاتنی پێغەمبەرەکان بۆ لایان ﴿إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا﴾ ئەو کاتە کە دوو پێغەمبەرمان رەوانە کردە لایان، ئەوانیش باوەڕیان پێ نەکردن کە پێغەمبەر بن، وتیان ئێوە درۆ ئەکەن، ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ﴾ ئێمەیش ئەو دووانەمان بەهێز کرد بە رەوانە کردنی پێغەمبەرێکی سێ یەم، بە هەرسێکیانەوە دەستیان کرد بە گەیاندنی فەرمانی خوا ﴿فَقَالُوٓاْ﴾ ئینجا وتیان بە دانیشتوان ﴿إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ﴾ بێگومان ئێمە نێرراوین بە پێغەمبەری بۆ سەر ئێوە. ئەوانیش دەستیان کرد بە رەخنە لێ گرتنیان، ئەو رەخنەیەی کە بە درێژایی مێژوو لە هەموو پێغەمبەرێ گیراوە، کە رەوانە کرابێ بۆ سەر هەر کۆمەڵ و نەتەوەیەك، بەڵام رەخنەیەکی نەفامانە کە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر نەزانین و تێ نەگەیشتنی رەخنە گرەکان. رەخنەکەیش ئەوە بوو کە نابێ پێغەمبەر ئادەمی بێ، بەڵکو ئەبێ مەلائیکە بێت، چۆن ئەبێ پێغەمبەر پیاوێکی ئاسایی بێ؟! وەکو ئەو هەموو پیاوانە بخوا و بخەوێ. بگەڕێ و بچێتە ماڵان و بازاڕ. پێغەمبەر ئەبێ جیاواز بێت ئەگینا چۆن هەواڵ لە ئاسمانەوە وەرئەگرێ؟!

ئەمانە لەبەر نەزانی و نەفامی خۆیان، نەیانزانی بوو کە مەبەست لە ناردنی پێغەمبەر چی بووە و فرمانی چی یە؟ بێگومان مەبەست لە ناردنی پێغەمبەران رێنموونی بەندەکانی خوایە بۆ سەر رێگای راست، دوور خستنەوەیان لە هەر شتێك کە هۆی بەدبەختی و سەر لێ شێوان بێ لەهەردوودنیادا، بە گوێرەی بەرنامەی خوا. فرمانی پێغەمبەران(ﷺ) بریتی یە لە:

یەکەم: بەجێ هێنانی ئەو رژێم و بەرنامەیە کە خوا پێی سپاردوون، پێك هێنانی لە نەفسی خۆیان دا بە شێوەیەك کە بە رێکی ببنە نوێنەری بەرنامەکە و ئاوێنەیەکی بێگەرد بۆ بینینی ئەو بەرنامە تیایاندا، نموونەیەکی پێشەوا بن. دووەم: بانگی ئادەمی بکەن بە پەیڕەوی یان، جا ئەگەر ئەوانیش ئادەمی نەبوونایە، ئەبوو سروشتیان جیاواز بوایە بە شێوەیەك لە زۆر شت دا دژی یەکتر ئەبوون، ئەو کاتە چۆن لە توانای ئادەمی یەکان ئەبوو کە پەیڕەوی یان بکەن، خوایش ئەفەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [1] لەگەڵ ئەمەش دا لەلایەن خواوە پێویست بووە کە هەموو پێغەمبەرێ داوای پەیڕەوی بکردایە، ئەوەتا لە قورئان دا پەیڕەوی پێویست کراوە لەسەر ئێمە: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ [2] هەر لەبەر ئەوە بوو ژیانی پێغەمبەرمان(ﷺ) خراوەتە پێش چاو و قورئان بە درێژیی زۆر لە لایەنەکانی ژیانی پاکی دەرخستووە و باسی کردووە. بەڵام نەفام و نەزانەکان بێ ئاگا بوون لەمانە کە گوترا، لەبەر ئەوە بە نەفامی ئەو رەخنە بێ جێگەیان ئەگرت دەربارەی پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بێت – وەکو لەم سەرگوزەشتەیەدا خوای گەورە بۆمان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ دانیشتوانی شارەکە وتیان بە پێغەمبەرەکان: ئێوە هەر ئادەمی یەکن وێنەی ئێمە، کەواتە پێغەمبەر نین ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَىْءٍ﴾ خوای خاوەن رەحم و بەزەیی هیچ وەحی یەکی نەناردووەتە خوارەوە بۆتان لە ئاسمانەوە ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ﴾ ئێوە درۆزنن و جگە لە درۆ راست ناکەن کە ئەڵێن ئێمە رەوانە کراوین بە پێغەمبەری. بێگومان هەرکەس راست بێت، پشت بە راستی یەکەی خۆی ئەبەستێت و بێ باك و بێ ئارامە، لەبەر ئەوە پێغەمبەرەکان بە دڵنیایی و بە ئارامەوە وتیان: ﴿قَالُوا۟ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ﴾ پەروەردگاری ئێمە ئاگادارە و ئەزانێ کە ئێمە بێگومان رەوانە کراوین بۆ سەر ئێوە، تەنها ئەوە بەسە و هیچی تری ناوێ، هەروەها ئەیانزانی کە فرمانێ پێویستی بێ لەسەریان گەیاندنی، ئەو بەرنامەیە کە خوای گەورە پێی سپاردوون ئیتر پاش ئەوە هەرکەس گوێ رایەڵی نەکات گوناهی لە گەردنی خۆیەتی و روو ناکاتە ئەوان،

---

[1] البقرة / ٢٨٦ خوا تەکلیف لە هیچ نەفسێ ناکات شتێ نەبێ کە لە توانای دا بێ.

[2] الأحزاب / ٢١.

وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ لَئِن لَّمْ تَنتَهُواْ لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ

لەبەر ئەوە وتیان: ﴿وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ ئێمە هیچمان لەسەر نی یە جگە لە راگەیاندنی روون و بێ پێچ و پەنا، بە بەڵگە و نیشانەوە، واتە ئێمە پێویستی سەر شانی خۆمان جێ بەجێ کرد، رێگەی خوامان بۆ روون کردنەوە، بەڵگەمان لەسەر هێنایەوە، چونکە هەموو پێغەمبەرێ بەڵگە و نیشانەی پێغەمبەرێتی بووە، کە پـێی ئـەوترێ(معجزە)، ئیتر هیچی ئێمە بە دەست ئێوە نی یە تەنها بە دەست خوایە.

ئەو سەرکەش و بەد بەختانە – وەکو هەموو هاوڕێکانیان لە هەموو چەرخێك دا – لە جیاتی ئەوەی نەرمی بەکار بێنن بەرامبەر بە نەرمی پێغەمبەرەکان، بەڵام ئەو سەر لێ تێك چووانە خراپتر و رەقتر و بێ ئابڕوو تر ئەبوون. ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ﴾ وتیان: بێگومان ئێمە هەست بە شووم و بەد بەختی ئەکەین بەهۆی ئێوەوە، مەترسی ئەکەین کە لە ئێوەوە دووچار ببین، بەوە نەوەستان دەستیان کرد بە هەڕەشە و گوڕەشە و وتیان: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهُواْ لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئێمە بێ دەنگ نابین لێتان ئەگەر واز نەهێنن لەم کارە، بێگومان بەردە بارانتان ئەکەین و لە لایەنمانەوە دووچاری سزایەکی سەخت ئەبن. ئەو گومڕایانە ئاوا وەستان بەرامبەر ئەو پێغەمبەرانە و قسە شیرین و نەرمەکانیان. بەڵام خۆ نابێ ئیتر ئەمان بە قسەی ئەوان واز بێنن لەو فرمانە گرنگەی خۆیان، لەبەر ئەوە لە هەوڵدان نەکەوتن، وەڵامیان دانەوە ﴿قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ﴾ وتیان: هۆی شومی و بەدبەختی خۆتان لەگەڵ خۆتان دایە، لە بەد باوەڕی و بەد کردەوەیی یەکەتانەوەیە.

بەڕاستی پێویستە دڵ و دەروون و مێشك و دەماغ پاك و خاوێن بکرێ لە شتی پڕو پووچ و ئەفسانە، هەر لە کۆنەوە گەلێ شت بووە بە باو، ئەڵێن فلانە شت شوومە و فلانە شت ئامەدە، ئەوەم پێوە نایە، بەختم لەو رۆژەدا نی یە، ئەمانە و وێنەیان هەموو باوی چەرخی نەزانی و نەفامی ی کۆنی بێ ئایینی یە تا ئێستاش هەر ماوەتەوە... بەڵام لە راستی دا ئەمانە هیچ نین. شوومی و بەدبەختی و بێ چارەیی لە کردەوەی گوناهەوە روو ئەدات. شەنس و بەخت و چارەیش لە کردەوەی خێرو گوێ رایەڵی خوا و پێغەمبەرانەوە پەیدا ئەبێ،

أَيِن ذُكِّرْتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ
ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾

---

ئینجا با موسڵمانی باوەڕ راست ئەو شتە پڕو پووچانە لە دڵ و دەروونی دوور بخاتەوە.

پێ یان وتن: ﴿أَيِن ذُكِّرْتُمۚ﴾ ئایا ئەگەر ئێوە ئامۆژگاری بکرێن هەست بە نەگبەتی ئەکەن؟! یان هەڕەشە ئەکەن بە بەردە باران و سزادان؟! ئایا ئەمەیە پاداشتی ئامۆژگاری؟! ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ﴾ نەخێر ئێوە کۆمەڵێکن زیادە ڕەوی ئەکەن لە تاوان و سەرکەشی دا، بەهۆی ئەوەوە شووم و نەگبەتی سەری تێ کردوون. یاخود ئێوە لە گومڕایی دا زۆر ڕۆچوون بەهۆی ئەوەوە کە بە تانە و تەشەر و هەڕەشە پاداشتی ئامۆژگاری ئەدەنەوە.

ئەو دڵەی کە دوور بێ لە خوا و قاپی بەزەیی خوای لێ داخرابێ ئاوا ئەچێ بە پێشوازی ئامۆژگاری پێغەمبەرانەوە، ئەوەندە رەقە هیچ کاری لێ ناکات، وەکو چینە بێ ئاگاکان کە لە پێش ئەم سەرگوزەشتەیەوە باس کران، بەڵام ئەو نموونەکەی تر کە شوێنی ئامۆژگاری ئەکەوێ و لە خوای خاوەن بەزەیی ئەترسێ، رەوشتێ تری هەیە وەکو ئەو نموونەیەی کە خوای گەورە باسی ئەفەرموێ لەم بەسەرهاتەدا: ﴿وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ﴾ لەو قەومە پیاوێك سروشتێکی ساغ و زیندووی هەبوو و ئامۆژگاری پێغەمبەرەکانی وەگرتبوو، لە پێشەوە باوەڕی هێنا بوو باوەڕێکی راستەقینە کە هەموو گیانی هێنایە بزووتن و نەیتوانی دەست بە کڵاوە شڕەی خۆیەوە بگرێ و لە گۆشەیەکی دوورەوە دانیشێ و بێ دەنگ بێ لەو هەموو گومڕایی و تاوانانەی کە لە لایەن قەومەکەیەوە دەربارەی پێغەمبەرەکان ئەکران.

ئەو پیاوە پڕ لە ئیمان و باوەڕە کاتێ زانی ئاوا بێ بڕوایی و بێ شەرمی ئەکەن، لەوپەڕی شارەکەوە بە پەلە و چەسپانی هات بۆ ئەوەی پێویستی سەرشانی خۆی بەجێ بێنێ، کە بریتی یە لە یارمەتی دانی راست و راستان، بانگ کردنی خەڵکی بۆ سەر ڕێگەی راست و بەرگری تاوانباران لە تاوان بە گوێرەی توانا، چونکە باوەڕ و عەقیدەی راست کە جێگیر بوو خاوەنەکەی خۆی پێ ناگیرێ ئەوەی راست بێ نەیڵێ، وەکو ئەم پیاوە: ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ وتی: ئەی قەومەکەم شوێنی ئەم پێغەمبەرانە بکەون.

ٱتَّبِعُوا۟ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ
﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا
وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ
ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِى يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِى رَبِّى وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾

---

**﴿ٱتَّبِعُوا۟ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا﴾ شوێنی کەسێ بکەون کە داوای هیچ پارە و کرێ یەکتان لێ ناکات لەسەر ئامۆژگاری و ڕێنموونی، واتە ئەوەی بەم هەموو زەحمەت و تەقەللا دانەوە خەڵك بانگ بکات بۆ ڕێگەی خوا و بێ ئەوەی سوود و قازانج داوا بکات، سەرەڕای ئەوەیش خۆی بخاتە سزا و مەترسی یەوە، ئەبێ چی پاڵی پێوە بنێ جگە لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا، کەواتە سەرپێچی مەکەن و شوێنیان بکەون ﴿وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ ئەمانە خۆیان لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستن، چونکە ئەوەی کە بانگی بۆ ئەکەن لەگەڵ ژیریی دا ڕێك و گونجاوە و دوورە لە هەموو پڕو پووچی یەك.**

**ئینجا شێوەی ئامۆژگاری یەکەی نەرم کرد و ڕووی وتاری ئاراستەی سروشتی خۆی کرد بە شێوەی پرسیار، وتی: ﴿وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى﴾ [1] ئایا چیە و چیم لێ قەوماوە بۆچی کەسێ نەپەرستم کە لە نەبوون دروستی کردووم؟ ئایا چی لام بدات و بمترازێنێ و بەرگریم بکات لەوەی کە سروشت داوام لێ ئەکات؟ ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ ئێوەیش ئەی قەوم بترسن لە پاش مردن ئەگەڕێنرێنەوە بۆ لای ئەو کەسەی کە منیش و ئێوەشی دروست کردووە، کەواتە هەر ئەو بپەرستن. ئەمە باری خواپەرستی بوو، نیشانی دا کە شتێکی سروشتی یە و ڕێك و ڕاستە، ئینجا باری پێچەوانەی نیشان ئەدا کە گومرایی یە: ﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ﴾ ئایا جگە لە خوای گەورە چەند پەرستراوێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم کە هیچیان بەدەست نەبێ و ئەگەر خوای خاوەن بەزەیی دووچاری زیانێکم بکات، نزا و پاڕانەوەیان هیچ سوودێکم پێ نەگەیەنێ،**

---

[1] ئەمە شێوەیەکی زۆر ژیرانەیە، مەبەستی ئامۆژگاری ئەوانە و پرسیار لەوان، بەڵام بۆ خۆی بەکار ئەهێنێ، بۆ ئەوەی هەست بکەن کە شتێکی ئەوێ بۆیان کە بۆ خۆی ئەوێ، کەواتە ئەوپەڕی ڕاست و دڵسۆزی ئەکات دەربارەیان.

نەتوانن من رزگار بکەن. ﴿ إِنِّيٓ إِذًا لَّفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ بێگومان ئەگەر شتی وا بکەم لەناو گومڕایی یەکی زۆر روون و ئاشکرادام. لە وتاری ئەم باوەڕدارەدا دوو شتی گرنگ هەیە، یەکەم: باس کردنی هۆی باوەڕ هێنانی خۆی، دووەم: داچڵەکاندن و خەبەر کردنەوەی قەومەکەی بۆ واز هێنان لە بت پەرستی.

هەرچەندە ئەم پیاوە موسڵمانە، وا دەرئەکەوێ بێ دەسەڵات و بێ کەس بووبێ بەڵام بە پێچ و پەنا بڕیاری خۆی روو بە رووی قەومە بێ باوەڕەکەی دەربڕی، لە هەڕەشە و گوڕەشەیان باکی نەبوو، وتی: ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴾ بێگومان من باوەڕم هێناوە بە پەروەردگاری ئێوە، کردنی بە شاهێد لەسەر باوەڕەکەی، وتی ئێوە ببیسن لێم و ئاگادار بن، بەڵکو ئەوانیش بفامن و شوێنی بکەون، لەبەر ئەوە هیچ گوێ ی لێ یان نەبوو، چی ئەڵێن با بیڵێن. هەندێ لە زانایان ئەڵێن ئەم قسەیەی لەگەڵ پێغەمبەرەکان کرد، چونکە کاتێ کە ئامۆژگاری قەومەکەی کرد، قەومەکەی پەلاماریان دایە بەردە بارانی بکەن، ئەویش بە پەلە خۆی چەسپاندە لای ئەوان و کردنی بە شاهێد لەسەر ئیمان و باوەڕەکەی پێش ئەوەی بیکوژن. وا دەرئەکەوێ دوای ئەوە ئەو قەومە مۆڵەتیان نەدا و کوشتیان، چونکە باسەکە لێرەدا ئەبڕێتەوە، وەکو پەردەیەك بهێنرێ بەسەر ئەم دنیا و ئەو قەومە و ئەو باوەڕەی لەسەری بوون، کت و پەڕ ئەگوێزێتەوە، شێوەی ئەو شاهیدە نەمرەمان پیشان ئەدات، کە خوێنی خۆی ڕژاند لە ڕێگەی خوادا، ئەیبینین وا لەو دنیا و لەو هەموو ناز و نیعمەت و ڕێزەی ئاگادار ئەبین کە خۆی دانی پیا ئەنێ و پێ ی دڵخۆشە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ ﴾ بەو پیاوە موسڵمانە وترا: فەرمو بچۆرە ناو بەهەشت، ئەم شەهیدە کە ئاگادار بوو بەسەر ئەو پاداشتە گەورەدا، زۆر بە خۆشی و کامەرانی یەوە: ﴿ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ * بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴾ وتی: ئای کاشکێ قەومەکەم بیانزانیایە کە ئاوا خوای پەروەردگارم لێم بورد و خستمیە ڕیزی ڕێز لێ گیراوان، یان باش تێ بگەیشتنایە کە من لەسەر هەق بووم و ئەوان لەسەر ناهەق بوون، یان ئاواتەکەی بۆ ئەوەیە ئەوانیش بگەڕانایەتەوە بۆلای خوای گەورە و باوەڕیان بهێنایە، با ئەوانیش بەم شێوەیە سەرکەوتوو بونایە و ئەمەیان لە کیس نەچووایە، ئەمەیش بە گوێرەی ڕەوشتی پیاوچاکان کە ڕقی خۆیان ئەخۆنەوە و بەزەیی یان بە دوژمن دا دێتەوە.

۞ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٣٠﴾

---

بەو شێوەیەخواپاداشتی خاوەن ئیمان و باوەڕی ڕاست ئەداتەوە، بەڵام تۆڵەی سەرکەشی لە خوا، لەو دنیا دیارە ئاگرە ـ پەنا بە خوا ـ پاشەڕۆژی لەم دنیایش هەر سەرشۆڕی و ڕیسواییە. کاتێ ماوەی دوایی هات بەرباد کردن و لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنانی سەرکەشان هیچی تێ ناچێت بۆ خوا، وەکو دەربارەی ئەو قەومە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ * إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ﴾ پاش ئەو موسڵمانە هیچ لەشکرێکمان لە ئاسمانەوە نەناردە خوارەوە بۆ سەر قەومەکەی، شتی وامان نەکردووە، بەرباد کردنیان پێویستی بەهیچ نەبوو جگە لە پیاهەڵشاخانێ، ئیتر بەوە دەست بەجێ هەموو مردن و وەکو ئاگرێ کوژانەوە. هیچ درێژەی نەدا بە بەربادکردنیان، لەبەر نیشاندانی سووك و ڕیسوایی و بێ نرخیان.

ئینجا بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستی بێباوەڕەکان، لە هەموو چین و ئایینێ ئەخاتە پێش چاو، بانگی داخ و خەفەت ئەکات کە بێت و بڕژێت بەسەر ئەو بەدبەخت و بێبەشانەدا کەوا هەلیان بۆ هەڵکەوت، بەڵام خۆیان لادا، ئەفەرموێ: ﴿يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ ئای داخی سەخت وەرە ئەمە شوێنی خۆتە، وەرە بڕژێ بەسەر هەموو ئادەمی و بەندە بێبڕواکاندا لە هەموو چین و میللەتێك کەوا هەلی ڕزگار بوونیان بۆ هەڵکەوت و پشتیان تێ کرد، خوا دەرگای بەزەیی خۆی لێ کردنەوە، بە ناردنی پێغەمبەرەکان و بەرنامە شیرینەکانی، کات لە پاش کات، بەڵام ئەوان خۆیان دەگایان لەسەر خۆیان داخست، بێشەرمی و بێئابڕوویی پیشەیان بوو، بەجۆرێ هەر پێغەمبەرێکیان بۆ ئەهات، گاڵتە و لاقرتیان پێ ئەکرد. کەواتە شایانی بەزەیی وداخ بۆخواردنن، چونکە لەوانە لێ قەوماو تر نیە، هەموو چینێ لەم بێبڕوانە ئەبوایە تەمێ خوار ببوایە و پەندی وەربگرتایە لە هاوسەرانی پێش خۆی.

أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ (٣١) وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا
مُحْضَرُونَ (٣٢) وَءَايَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ (٣٣)
وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ (٣٤)

---

**﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ ئایا نەیانزانی؟ بەڵێ ئەیانزانی کە ئێمە پێش ئەمان زۆرمان بەرباد کرد لە تاوانبارانی چەرخە پێشووەکان، کە ڕۆیشتن ناگەڕێنەوە بۆ لای ئەمان، وەنەبێ تەنها بەوە وازیان لێ بهێنرێ. بەڵێ ناگەڕێنەوە بۆ ئەم دنیایە، بەڵام هەموو زیندوو ئەکرێنەوە لەو دنیا بۆ تۆڵە لێسەندن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ وشەی ﴿لَّمَّا﴾ بە دوو شێوە ئەخوێنرێتەوە:**

**یەکەم: کە باوە، بە شەدەیەو مانای (إلا)یەو (إن) بۆ نەفییە.**

**دووەم: بێ شەددەیە، (ل) بۆ تەئکیدەو (ما) زیادەیەو (إن) حەرفی مشبە بالفعلە.**

**بەگوێرەی یەکەم: هیچ کام لەو بەرباد کراوانە نیە کە زیندوو نەکرێنەوەو هەموو کۆنەکرێنەوە لای ئێمەو ئامادە نەکرێن لە ڕۆژی دوایی دا بۆ تۆڵە لێ سەندن.**

**بە گوێرەی دووەم: بێگومان هەرچی ئەوانە هەیە هەموو ئامادە ئەکرێن و کۆئەکرێنەوە لای ئێمە. پێغەمبەران –درودی خوایان لەسەر بێت– هەموویان خەڵکیان بانگ ئەکرد بۆ لای خوا، خوایش زۆر ئاشکرایە بۆ هەرکەسێ کە چاوی دڵی بە تەواوی کوێر نەبووبێ، چونکە هەرچی ئەم بوونەوەرە هەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر بوون و تاک و تەنیایی خوا، لەبەرئەوە قورئان ناوبەناو ئەم بەڵگەو نیشانانە ئەمێنێتە پێش چاومان، وەکو لێرەدا ئەم چەند شتە باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ﴾ بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ ئەوان ئەم زەویەیە کە بەسەری دا ئەگەڕێن و بەچاوی خۆیان ئەیبینن و وشک و برین و هیچ گیانی تێدا نیە، دوای ئەوە ئەیبینن: ﴿أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ﴾ ئێمە زیندووی ئەکەینەوەو ئەم هەموو دانەوێڵەی لێ دەرئەهێنین کە لێی ئەخۆن و زۆربەی هۆی ژیان و خۆراکیان ئەوەیە، ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ﴾ چەند باخ و باخاتێ لە خورما و زەوەیە مردووەدا ئەڕوێنین و کانی ئاوی زۆری تێدا هەڵئەقوڵێنین. ئەو زەویە وشکە مردووە ئەڕازێنینەوە بەوهەموو دانەوێڵەو باخ و کانیاوە جوانانە.**

لِيَأْكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴿٣٧﴾

---

﴿لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ﴾ بۆئەوەی لە بەروبوومی ئەم ناوبراوانە بخۆن کە خوا بۆی پێك هێناون، هەروەها لەو شتانەی کە دەستو کردەوەی خۆیان فەراهەمیان هێناوە، وەکو دۆشاوو سرکەو شەربەتو... هتد. ئەمە لە کاتێکدا کە وشەی ﴿ما﴾ بۆ (موصول) بێت، بەلاّم ئەگەر بۆ نەفی بێت ئەبێ بڵێین: ئەم شتانە هیچی بە کردەوەی ئەوان پێك نەهاتووە، خوا پێکی هێناوە، تەنانەت خوای گەورە دەسەلاّتو توانای داونەتێ کە ئیشو کاریان تێدا کردووە. کەواتە لەسەر هەردوو بار زۆر شیرینەو مافی خۆیەتی کە ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَشۡكُرُونَ﴾ با ئەمانە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەم هەموو نازو نیعمەتە، سەرکەشی نەکەنو سەری بەندایەتی بۆ خوا دابنەوێنن.

بەڕاستی بیرکردنەوە لە پەیدا بوونی گیان لەو زەویە وشكو برینەو سەرنج دانو سەیر کردنی ئەم هەموو درەختو کشتوکاڵو سەوزاییە کەلە پێش چاو گەورە ئەبێو ئەم درەختانە ئەچن بەناو یەکداو هەریەکێ بە ڕەنگێكو شێوەیەکی تایبەتی، ئەم هەموو میوەهاتە هەریەکە تامو بۆنو ڕەنگو دیمەنێکی تایبەتی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کەلە زەویەك دایەو بە ئاوێك ئاو ئەدرێن. بیرکردنەوە لەمانە چاوی دڵ ئەکاتەوە بۆ بینینی دەستی قودرەتی خوا بەسەر ئەمانەوەو پێکەیاندنیان لە تۆمەوە لەناو خۆڵە ئەیهێنێتە دەرەوە تا ئەیکات بە چڵە گیاو ئەیکات بە ئەمامو پەلو پۆو گەڵای لێ ئەخاتو بەرو میوەی لێ دەئەهێنێ. لەم بیرکردنەوەیەدا بەسەرسامیەوە هەر ﴿سبحان الله﴾ بە دڵدا دێت، کەواتە هەر ئەمەبەجێیە کە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ﴾ وشەی ﴿ٱلۡأَزۡوَٰجَ﴾ بەدوو مانا هاتووە: شتە جیاوازەکان، نێرو مێیەکان.

بەگوێرەی یەکەم: پاكو بێگەردی لە هەموو لەکەیەك بۆ کەسێکی ئەوتۆ کە هەموو ئەم شتە جیاوازانەی دروست کردووە ـ لە هەموو جۆرە ـ لەوانەی کە زەوی ئەیڕوێنێو سەوزی

ئەكات، لە خودی ئادەمیەکان هەر یەك دەنگ‌و ڕەنگ‌و شێوەیەکی هەیە، لەوشتانەی تر کە ئەوان نایزانن.

بەگوێرەی مانای دووەمی ﴿ٱلۡأَزۡوَٰجَ﴾: پاك‌و بێگەردی بۆ کەسێکی ئەوتۆ کە هەموو نێرو مێیەکانی دروست کردووە لە هەموو ئەو شتانەی کەلە زەوی ئەڕوێ، لە ئادەمی خۆیان‌و لەو شتانەی کە ئەمانە نایزانن، بەم جۆرێ دووەمە شتێکی زۆر گرنگ نیشان ئەدات، کە بریتیە لە یەکێتی بنەڕەتی دروست کردنی زۆربەی ئەم بوونەوەرە. ئەوەتا ئەفەرموێ: هەموو ئەوانەی کەلە زەوی ئەڕوێن لەگەڵ ئادەمی دا، بە نێرو مێ دروستی کردووە، هەروەها جگە لەمانەیش ئەو شتانەی کە ئەمان نایزانن. بەڵکو ئەتوانین بڵێین هەموو دروست کراوەکانی خوا بەو جۆرەیە بە گوێرەی دیمەن‌و ڕواڵەتی ئایەتی ﴿وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾[1] ئەم یەکێتیە بەڵگەیە لەسەر یەکێتی ئەو خوایەی کە دروستی کردوون. ئەم باسە بە درێژی لێی ئەگەڕێن بۆ سورەتی ﴿الذاريات﴾ بە یارمەتی خوا.

بالێرەدا لە ئایەتی زەوی بگوێزینەوە بۆ ئایەت‌و بەڵگەی ئاسمان‌و ئەو شتانەی کە پەیوەندیان هەیە پێیانەوەو بە چاوی ئێمە ئەیبینین: ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ﴾ بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرای تر بۆ بەندەکانی خوا بریتیە لە پەیدا بوونی شەو بەمەی کە ڕووناکی ڕۆژ دائەڕنین کە جێگای تاریکی شەون بە هۆی ئەوە خەڵکی ئەکەونە ناو تاریکیەوە.

هەر قورئانە ئەزانێ کە شت بە ڕێکی باس کات بە جۆرێك کە کار بکات لە دڵ‌و ڕاکێشێ بۆ وەرگرتنی. لێرەدا وامان پێش چاو ئەخات وەکو لەش وایەو ڕووناکی وەکو پێستی بێت کرابێ بەبەری دا، شەو بەمە پەیدا ئەبێت کە ئەم پێستەی لێ بکرێتەوە، ئەمە وەکو سەرنج ڕائەکێشێ، هەروایشە، چونکە تاریکی ئەسڵەو ڕووناکی شتێکە هاتووە بەسەری داو شێوەی ئەمانی ڕووناکی وەکو داڕنین‌و قەڵغ کردنی پێست وایە، چونکە زەوی کە خڕە هەموو خاڵ‌و پارچەیەکی بێ‌تیشکی خۆر تاریکە، کە تیشکی خۆری لێ بکەوێ وەکو پێستێکی سپی بەسەردا بێنی وایە کەلە کاتی سووڕانەوەو چەرخەدا لە ئاستی خۆرو ئەتوانرێ وەکو چەرمەکەی داڕنرێ وایە.

---

[1] الذاريات واتە: لە هەموو شتێك نێرو مێمان دروست کردووە، ئەمەتان بۆ باس ئەکەین، بەڵکو بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەربگرن.

وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ
عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ

---

شێوەی هاتنی شەوو داشاردنی ڕووناکیو داگیر کردنی تاریکی لە هەموو بستو چوار سەعاتێکدا، جگە لەو شوێنانەی لە ئاستی هەردوو قوتب دان. ئەم شێوە ساڵەهای ساڵ بە درێژیی زەوی بە ڕێكو پێكیو بێتێك چوون. بەڕاستی بیر لێ کردنەوەی هۆی بەهێز بوونی باوەڕە بە خوای گەورەو دەسەڵاتی بێ سنووری. ئایەتێ تر ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ﴾ بەڵگەو نیشانەیەکی تر ئەم خۆرەیە کە هەموو کات ئەگەڕێو ناوەستێ هەتا ئەو کاتەی یان ئەو شوێنەی کە تەنها خوا خۆی ئەزانێو دیاریی کردووە بۆ وەستانی.

ئەو خۆرەی کە ماوەیەك لە مەوپێش وا گومان ئەبرا لە شوێنی خۆی دا ئەسوڕێتەوە بە دەوری خۆی دا، لەپاش دا وا زانراوە کە ئەگەڕێ لە بۆشایی بوونەوەردا. هەموو سانیەیەك (١٢) میل ئەبڕێو ڕێك ئەڕوا.

ئەو خۆرەی کە قەبارەی دانراوە بە ملیۆنێك جار قەبارەی ئەم زەویەی کە ئێمەی لەسەرین. جا کاتێ بیربکەینەوە لەم قەبارە گەورەیە بکەوێتە جووڵەو گەڕان لە بۆشایی دا، بێئەوەی پاڵپشتێکی ببێ، کاتێ کە لەوە بیربکەینەوە، ئەبێ هەر ئەمە بڵێین کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەوە شتێکە بڕیار دراوی کەسێکە کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، دەسەڵاتو توانای بێسنوری هەیە، ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا. هەرکەس بیەوێ ڕێزی خۆی بگرێ جگە لەوە شتێ تر ناڵێ.

بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەی تر ئەم مانگەیە، ناوەستێو ئەگەڕێ بە دەوری ئێمەو زەویەکەماندا، ئەگۆڕێ بە چەند شێوەو ڕوویەك خزمەتی ئێمە ئەکات لە چەند بارێکەوە، ساڵو مانگانمان بۆ دیاریی ئەکات. با ئێمەش باش لێی ورد ببینەوە بۆئەوەی گەورەیی پەروەردگار باشتر جێگیر ببێ لە دڵو دەروونو مێشکماندا، باش بیری لێ بکەینەوە وەکو خوای گەورە ئەیخاتە پێش چاومان، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ﴾ شوێنی گەڕانی مانگمان کردووە بە چەند قۆناغێك. یان گەڕانی مانگمان بڕیار داوە لە چەند قۆناغێکدا کە کراوە بە ٢٨ یان ٢٩ قۆناغ، بۆی دیاریی کراوە. کە هەر لە شەوێکدا لە یەکێ لەو قۆناغانەدا ئەبێ بێ کەمو زیاد. بە چاو ئەبینرێ لەو قۆناغەدا، بە گوێرەی جیاوازی لەو

قۆناغەو گۆڕانی ڕووی لەگەڵ خۆردا ڕووناکی ڕووی ئەگۆڕێ لە زۆرو کەمی دا. وەکو بە چاو ئەبینرێ لە یەك شەوەوە بەرە بەرە زیاد ئەکات تا ئەگاتە ١٤ شەوەو ڕووی بە تەواوی ڕووناك ئەبێ، ئینجا بەرەو کەمی ئەڕوات بەرە بەرە هەتا ئەبێتەوە وەکو یەك شەوەو بە شێوەی عورجونی کۆنی لێ دێت، باریكو زەردو لاواز.

مانگ ئەمەندە شتێکی نایابە هەر تەماشا کردنو دڵ پێدانی تا چەرخەیەك دوایی ئەهێنێ دڵ پڕ ئەکات لە باوەڕ بەو دەستی قودرەتی کە ئەو هەموو بارە دێنێ بەسەری دا. ئیتر با تەماشاکەر نەخوێندەوار بێ و هیچ نەزانێ لە هۆی ئەو بەسەرهاتو گۆڕانە.

ئینجا سەرنجی فامدار ڕائەکێشێ بۆ ئەو ڕژێمە گرنگەی کە هەیەو ئیش ئەکات لە نێوان مانگو خۆرو شەوو ڕۆژدا ئەفەرموێ: ﴿لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ﴾ نە خۆر بۆی ئەکرێو شایانە بۆی کە بگات بە مانگ، بەم جۆرە بێتە خوارەوەبۆ شوێنەکەی، یان لە گەڕاندا وەکو ئەم وابێ یان پەکی بخاتو ڕووناکیەکەی نەهێڵێ، واتە ژێربار کراوە ئەبێ هەر ئەوە بکاتو هەر وابێ. نە شەو پێش ئەکەوێ لە ڕۆژدا، واتە وەکو بڕیار دراوە کە بێن بە دوای یەکدا ئەبێ هەر ئەوە بکات هەر وابێ. نە شەو پێش ئەکەوێ لە ڕۆژدا، واتە وەکو بڕیار دراوە کە بێن بە دوای یەکدا ئەبێ هەر وابن. ناتوانن سەرپێچی بکەن لە ڕژێمێ کە بۆیان دیاریی کراوە.

هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: مەبەست لە شەوو ڕۆژ، نیشانەکانیانە کە مانگو خۆرە. کەواتە ئەبێتە پێچەوانەی ڕستەی پێش. واتە: نە مانگ پێش ئەکەوێ لە خۆرو لەو فرمانەی کە بۆی دیاریی کراوە. مانگو ڕۆژو هەموو ئەستێرەکان شوێنی تایبەتیان بۆ دانراوە کە چەرخەو گەڕانی تیا بکەن، ئەندازەی دووریو نزیکیان لە یەکترەوە دیاریی کراوە، دەست نادات بۆ زۆرو کەم لەوەی کە دیاریی کراوە. بە وێنە: ئەڵێن مانگ ٢٤٠ هەزار میل لە زەویەوە دوورە، خۆریش ٩٣ ملیۆن میل، نزیکترین ئەستێرەی ئاسمانەکانی تر لەم کۆمەڵە خۆرەی ئێمەوە دانراوە بە چوار ساڵی ڕووناکی، واتە ١٠٤ ملیۆن ملیۆن میل دوورە لەم کۆمەڵەی ئێمەوە، لەمەوە بڕۆ بۆ ئاسمانە دوورەکانی تر، بۆ ئەم هەموو ئەستێرانەو ئەم هەموو مانگو خۆرانە، شوێنی گەڕانو چەرخەی تایبەتی هەیە، هیچ جۆرە ناڕێکیو کەمو کوڕییەك نیە لە هیچ بارو فەرمانێکیاندا.

وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾ وَءَايَةٞ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقۡنَا لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأۡ نُغۡرِقۡهُمۡ فَلَا صَرِيخَ لَهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ﴿٤٤﴾

---

**﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ﴾ هەموو ئەو مانگ‌و خۆرانە هەریەکە، لە جێگە خولانەوەو گەڕان‌و چەرخەی خۆیان، بێ لەنگەرەو تاسەو هەڵکەوتنێ ئەگەڕێن، وەکو کەشتی لەناو ئاودا بەبێ نەخشە. هەموو خاوەن باوەڕێکی ڕاستەقینە هەتا بیر لە مانە بکاتەوە زیاتر خۆی لە لا بێ پلەو پایە ئەبێت‌و بچووك ئەبێتەوەو گەورەیی پەروەردگار زیاتر قورسایی ئەکەوێتە سەر دڵ‌و دەروون‌و هەموو هەستی.**

**بەڵگەو نیشانەی تر بریتیە لە کەشتی‌و پاپۆڕ کە کەل‌و پەل‌و شت‌و مەکمان بۆ هەڵئەگرێ‌و هۆیەکی گرنگی ژیان‌و سامانمانە، هەموو ئەبینین‌و لێی ورد نابینەوە، لەگەڵ ئەمەدا زۆر جێگای بیرکردنەوەیە، بۆیە خوای گەورە ئەیخاتە پێش چاو بەم شێوە شیرینە: ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾ بەڵگەیەکی ئاشکرای تر بۆ ئەوان ئەمەیە، ڕۆڵەکانیان کە ئەیاننێرن بۆ بازرگانی، یان ژن‌و منداڵەکانیان کە لەگەڵ خۆیان ئەیانبەن، ئێمە بە دەسەڵاتی خۆمان هەڵیان ئەگرین لەناو ئەو کەشتیانەی کە پڕ کراون. بەڕاستی زۆر جێگای ورد بوونەوەیە کە ئاوی وا دروست کردووە دەست ئەدات بۆ ئەمە بە ئاسانی لەت ببێ، وەکو بایش نیە کە دەست نەدات بۆئەوەی شتی بخرێتە سەر پشت، هۆی نقوم نەبوونی فەراهەم هێناوە کە تا ٥٠ هەزار تەن قورستر هەڵ ئەگرێ‌و نانیشێ‌و نقوم نابێت، با یا هەڵم یان زەرەی دروست کردووە کە هاتوچۆ بەو کەشتیانە بکات، بیرکردنەوە بەم شێوە سادەیە بۆ هەموو کەسێك دەست ئەدات، با نەخوێندەواریش بێت، هەموویشی جێگای سەرسامیەو**

سەرنج ڕاکێشە. بەڵام ئەوانەی کە خاوەن زانستو زانیارینو ئاگادار ئەبن بەسەر ئەو شتە نهێنیانە کە هۆی پێك هاتنی ئەم مەبەستەن، ئەوانە ئەبێ سەرسامیان زیاتر بێت، باوەڕیان بە دەسەڵاتو زانینی خوا بەهێزو پتەوتر بێت.

﴿وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ﴾[1] دروستمان کردووە بۆیان، لە وێنەی ئەو کەشتیە شتێ تر کە سواریی پێبکەن. ئەم وێنەیە لە هەموو کاتێکدا هەر بووە، لە چەرخی کۆندا کەشتیە بچووکەکانو بەلەمو ئەو گیانلەبەرانەی کە سواریان پێ ئەکرێ لە وشکاییدا. بەتایبەت حوشتر بۆ وڵاتی خۆی کە پێی وتراوە (سفائن البر) واتە: کەشتیە بچووکەکانی وشکایی، لەم چەرخی تازەدا ئەتوانین بڵێین مەبەست بە وێنەی (عواصة)و ئەو شتە تازانەی ترە کە هاتوچۆی ناو ئاویان پێئەکرێ، ئەم شتانە ئەگەرچی لەسەر دەستی ئادەمیزاددا پەیدا ئەبن، بەڵام لە ڕاستی دا هەر دروست کراوی خوا پەروەردگارن، چونکە تەنها هەوڵ دانو کۆششەکەلەلایەن مرۆڤەوەیە، جگەلەوەئیترهیچ دەخلی کەسی پێوەنیە، هەمووی هی خوایە.

ڕووبارو دەریا ئێجگار سامناکە، بە تایبەتی ئەوانە ئەزانن کە هاتوچۆی تێدا ئەکەن، زۆر جێگای مەترسیە، هەر خوای خاوەن بەزەییە کە مەردوم ڕزگار ئەکات. وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ * إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ ئەگەر ئێمە بمانەوێ ئەمانە نقوم بکەین، جا ئەو کاتە هیچ کەس نیە بێت بە هاواریانەوەو پەنادەریان نیەو ڕزگار ناکرێن لە مردن. بەس هەر لەبەر ڕەحمو بەزەیی لە لایەن ئێمەوە، لەبەرئەوەی بیانژیەنین تا ئەو کاتەی کە دیاریی کراوە بۆ ماوەی ژیانیان.

---

[1] هەندێ ئەفەرموون: مەبەست لەم کەشتیە ئەوەیە کە نوح پێغەمبەر دروستی کرد بە فەرمانی خوای گەورە، کە ئەوە یەکەم کەشتی بوو لە دنیادا، دوای ئەوە کەشتی دروست کردن داهات، مەبەست لە هەلگرتنی ڕۆڵەکان ئەوەیە: کە خوا ئەو چینەی چەرخی نوحی لەناو کەشتیەکەدا هەلگرت، هەرچی ڕۆڵەو نەوەی دوای ئەوانە هەیە هەمووی لە پشتی ئەوانەیان بوو کە ئەوەیان ماوە لە پاش خۆیان.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَـٰتِ
رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ

---

لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانەدا بەندە تاوانبارەکان لەناو چاڵی بێئاگایی دان، دڵیان بێدار نابێتەوەو کۆتایی ناهێنن لە گاڵتە کردن و بێبڕوایی، بە شێوەی گاڵتەوە پەلە پەل ئەنێنەوە بۆئەوەی کە پێغەمبەران خەڵکی پێئەترسێنن. گوێ ناگرن و پشت ئەکەنە ئایەتەکانی خوا، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ * وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَـٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ کاتێ کە ئامۆژگاری بکرێن و پێیان بوترێ: خۆتان بپارێزن و بترسن لەو سزاو بەسەرهاتانەی کە دووچاری تاوانبارەکانی پێش ئێوە بووە. لە سزای ئاگرێك کە ئامادە کراوە بۆ تاوانباران لە ڕۆژی دوایی دا بترسن لەمانە، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە چاوەڕوانی بەزەیی خوا بکەن پێتان. کاتێ بەو جۆرە تەمێ بکرێن پشت هەڵئەکەن و گوێی لێ ناگرن، زیاد لەو هەموو بەڵگەو نیشانە بەهێزانەی بوونەوەر کە لە هەموو لایەکەوە چوار دەوری لێ گرتوون، زیاد لەمانە هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی کتێبە گەورەکەی خوایان بۆبێت، هەر پشت لەویش هەڵئەکەن.

ئەمانەهەروەکوسەرکەشی ئەکەن دەربارەی فەرمانی خوا، بێ ڕەحم و بەزەییشن دەربارەی هەژاران، بەم شێوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ کاتێ کە پێیان بوترێ دەست گیرۆیی هەژاران و بێ نەوایان بکەن و خۆراکیان بدەنێ لەو ڕۆزییەی کە خوا داویەتی پێتان، وەڵامیان ئەدەنەوە ـ بە شێوەی لاقرتی ـ: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ ئەوانەی کە کافر بوون، ئەیان وت بەوانەی کە ئیمانیان هێنابوو: ﴿أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە خۆراك و ڕۆزی ئەدا بەمانە، ئەو کە نەیداوەو دەسەڵاتیشی هەیە ئێمە باشتر نایدەین. زیادلەوەدەم درێژیشیان ئەکرد دەربارەی ئەوانە کە پێیان ئەوتن خێرو چاکە بکەن.

ئـەیان ووت: ﴿إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ ئێـوە لـە هیـچدا نـین، جگـە لـە گـومڕایی و سەرلێشێوانێکی ئاشکرا، کە فەرمانێکمان پێئەدەن پێچەوانەی خواهیشی خوایە، ئەمانە ئەگەر بیانفامیایەو تێبگەیشتنایە لە باوەڕو وتەی خوا لە ژیانی ئادەمیدا ئەم قسەیان بەم شێوەیە نەئەکرد. ڕاسـتە خـوا ڕزق و ڕۆزی هـەموو شـتێ و هـەمووانی بەدەسـتە، هـەموو دروستکراوی ئەوە، بەڵام ئادەمی کە جێنشینە لە زەویداو کاروباری زەوی و ژیانی دراوەتە دەست. ئەم کارە گرنگە ناڕوا تەنها بە کۆکردنەوەی سامان و ڕۆزی، بەڵکو پێویستی بەوە هەیە کە هەریەکە ئیشێ بگرێتە دەست. لەم هـەموو شتە کە ژیـان بێ ئەوانە ناڕوات: کرێکاری، پیشەسازی، کشتوکاڵ، بەننایی، خوێندەواری. ئەمەش بەوە ئەبێ کە ئادەمی لـەناو یەکـدا جیـاواز بـن لـە بـەکارەیی و بێکـارەیی و ئامـادەیی و لێنـەهاتن و زیرەکـی و کەودەنی...هتد. ئەگەر هەموو ئادەمیەك جۆر بوایە کاروباری ژیـان نەئەڕۆیشت، کەواتە سروشتی فەرمانەکە وایە، ئەبێ جیاوازی ببێ لە سامان و ڕزق و ڕۆزیداو هەندێ دووچاری کەم و کوڕی و ناتەواوی ببێ، بەڵام ڕژێمی ژیانێ کە خوا دایناوە بۆ بەندەکانی خۆی، هەرکاتێ بەکاربهێنرێ هەرگیز ماوەی ئەوە نادات تاقمێ بخوات و تاقمێ بڕوانێ، کۆمەڵێ ڕابوێرێ و زۆربەی برسی بێ، لەم بابەتەوە چەند بیروباوەڕێکی داناوە چارەسەری ئەم گرێیە ئـەکات. یـەکێك لەمانـە ئەوەیـە کـەوا پێویـستی کـردووە ئەندازەیـە لـە سـامان و ڕۆزی دەوڵەمەندان بدرێ بە هـەژاران و بێنـەوایان. نـاوی هەنـدێکی نـاوە زەکـات، دڵ و دەروونـی سامانداری پـێ پـاك ئەکاتـەوەو برایـەتی و دۆسـتایەتیەکی تـەواویش ئەخاتـە نێوان ئـەوان و هەژارەکان.[1]

موسڵمانەکان کە ئەیان وت بە سامانداره بێبڕواکان ڕۆزی و خۆراك بدەن بە هـەژارەکان، مەبەستیان جێبەجێ کردنی ئەم مافە بوو لە گەردنیاندا بە پێی فەرمانی خوا. کەواتە ئـەوان تێنەگەیـشتووو لـە گومڕاییـەکی ئاشـکرادا بـوون، نـەك ئیمانـدارەکان، دەم درێژیەکـەیان بـۆ خۆیان ئەگەڕێتەوە.

[1] بەیارمەتی خوا ئەم باسە بە درێژی دێت لە سورەتی ﴿الزخرف﴾دا.

وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾

---

**ئینجا باسی شتێك ئەكات كە سەرچاوەی هەموو كردەوەیەكی خراپ و كانی هەموو تاوانێكەو هەر ئەوەیش بوو بەهۆی خراپی ئەم نەفامانە كە ئایەتەكانی پێشوو دەربارەیان هاتە خوارەوە، ئەو شتەیش ئەوەبوو كە بڕوایان بە زیندووبوونەوە نەبوو گاڵتەو پێكەنینیان ئەهات بە هەڕەشەو ترساندن بە هاتنی ئەو ڕۆژە، ئەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەمانە ئەڵێن: ئەم وێران بوونی دنیاو زیندوو بوونەوەو سزای ئەو ڕۆژو كاتە كوا بۆچی نەبوو ئەگەر ئێوە ڕاست ئەكەن ئەڵێن: دێت، كەی دێت؟**

**با ئەو نەفام و نەزانانە بزانن ئەو بەڵێن و هەڕەشەیەی كە خوای گەورە كردوویەتی، نەبە پەلەی كەس پێش ئەكەوێ لەو كاتەی بۆی دیاریی كراوە، نە دوایش ئەكەوێ بە لاڵەو بوڵەی كەس. هەموو كاروبارێ بە گوێرەی زانین و حیكمەتی خوایەو كاتی تایبەتی هەیە، ناگونجێ لادان لێی. ئەو بێباوەڕانە ئەم پرسیارەیان ئەكرد و خوای گەورەیش لە وەڵامیاندا بە كورتی هەندێ لە چۆنێتی ئەو ڕۆژەمان بۆ باس ئەفەرموێ، بەم شێوەیە: ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴾ ئەمانە چاوەڕوانی ناكەن. ئەوە نەبێ كە كوت و پڕ لەناكاودا دەنگێكی گەورە پەیدا ببێ كە داگیریان بكات. دەنگی فووكردنی (ئیسرافیل) بەو شتەدا كە پێی ئەوترێ (صور) و دەنگی ڕووخان و تێك چوون و بوومەلەرزەی هەرە گەورە، ئەو دەنگە گەورەیەش لەناكاویەكی وادا دێت كەس ئاگای لەهیچ نیە خەریكی چەقەو چڕەو بەربەرەكانی و كڕین و فرۆشتن ئیش و كارن. كاتێ ئەوە ڕووی دا ئیتر كت و پڕ ئەمرن. ﴿ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾ كەواتە توانای هیچ وەسیەت و نەسیەتێكیان نامێنێ، فریای گەڕانەوەی لای ماڵ و منداڵیشیان ناكەون هەركەس لە جێگای خۆی دا ئەمرێ، واتە هاتنی ئەو ڕۆژ ئاسانەو بۆ مراندنی هەمووی یەك فووی ویست، هەروەها بۆ زیندوو كردنەوەی هەموو،**

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن
مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً
فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ نَفۡسٌ شَيۡـًٔا وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ
تَعۡمَلُونَ ﴿٥٤﴾

---

**فوویەکی تری ئەویێ:** ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ﴾ **دیسان فوو ئەکرێتەوە بەو شتەدا ئیتر دەست بەجێ هەرچی مردووان هەیە لە گۆڕەکانیانەوە دێنە دەرەوە بە چەسپانی ئەڕۆن بۆ جێگای وەستاندنیان لە دادگای خوا، هەموو لەترس‌و لەرزو داچڵەکیندا هۆشیان نامێنێ:** ﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜ﴾ **ئەڵێن ئای خۆزگە... بە مردن، ئایا کێ ئێمەی زیندوو کردەوە، کێ لە خەو هەڵیساندین‌و لە جێگای خەوەکەماندا دەری هێناین؟ واتە: ئەوەندە ڕۆژەکە سەخت‌و سامناکە فامیان نامێنێ‌و وائەزانن لە خەودا بوون. لە دوای ئەوە هۆش ئەکەنەوەو ئەڵێن:** ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ **ئەمە ئەوە بوو کە خوای بە ڕەحم‌و بەزەیی بەڵێنیداو پێغەمبەرەکان ڕاستیان کرد کە ئەیان ترساندین لەم ڕۆژە.[1] کەواتە وەکو مردنی هەمووان بە یەك دەنگی گەورە بوو، وەکو پیا هەڵشاخان، هەروەهابۆزیندوو کردنەوەو کۆ کردنەوەیشیان ئەفەرموێ:** ﴿إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ﴾ **هیچ کردەوەیەکی ترنیەجگەلەتەنهادەنگێکی گەورە، وەکو تێ خوڕین، ئیتردەست بەجێ هەمووبە کۆمەڵی لای ئێمە حازر ئەکرێن‌و ڕیز ئەکرێن. ئینجا بڕیاری گەورە دەرئەکرێ لەبابەت سروشتی دادگای گەورەی ئەو ڕۆژەو ئەدرێ بەگوێی هەمووناندا:** ﴿فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ نَفۡسٌ شَيۡـٔٗا وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ **ئەمڕۆ هیچ کەس زوڵم‌و ناڕەوایی هیچ شتێکی لێ ناکرێ، تۆڵەتان لێ ناسەنرێ جگە لە تۆڵەی کردەوەی چونکە لەو ڕۆژەدا کاروبار هەمووی خوائەیکات، نایداتەدەست کەسی تر، وەکو ئەم جیهانە نیە کە کاروباری سپاردووە بە بەندەکان ئەوانی زۆربەیان زوڵم‌و ناڕەوایی ئەکەن‌و بە گوێرەی فەرمانی خوا ڕەفتار ناکەن.**

---

[1] هەندێ ئەفەرموێ: ئەمە وەڵامی مەلائیکەیە، یان ئەو موسڵمانانەیە ئاگایان لە خۆیانە، وەکو بێبڕواکان بێهۆش‌و فام نابن، لەبەرئەوە هەندێ لە زانایان وەستانێکی کەم ئەکەن لەسەر وشەی ﴿مَّرۡقَدِنَاۜ﴾ بۆئەوەی تێکەڵی وشەی ﴿قَالُواْ﴾ نەبێ، جیاوازی وتراوەکانیان بگەیەنێ.

إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمۡ
فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٩﴾
أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٠﴾

**ئینجا هەواڵی بەسەرهاتی زنیدوو بووەکان باس ئەکاتو دەربارەی موسڵمان هیچ باسی پرسیار لێ کردنو محاکەمەیان ناکات، هەر باسی ئەو نازو نیعمەتەکە ئەیرێژێ بەسەریاندا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ﴾ بێگومان بەهەشتیەکان ئەمڕۆ لەناو نازو نیعمەت دان بەهۆی ئەوە دەستیان گیراوە پەرۆشی هیچ شتێکیان نیە خۆشیو لەزەت وەرگرتن نەبێ: ﴿هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ﴾ خۆیانو خێزانەکانیان لە سێبەرو سەهەندان، لەسەر تەختە ڕازاوەکان پاڵیان داوەتەوە: ﴿لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لەناو بەهەشتدا میوەهات چۆن ئارەزوو بکەن، چی داوا بکەنو بیانەوێ لە نێوان ئەو هەموو خۆشیەدا، لە هەموو شت بە نرخ ترو گەورەتر: ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ﴾ سەلامە ئەوترێ لە لایەن پەروەردگاری بە ڕەحمو بەزەییەوە، مەلائیکە هەموو جارێ ئەو سەلامیان پێ ئەگەیەنن لە لایەن خواوە یان خوای گەورە خۆی سەلامیان لێ ئەکات بەبێ هۆی مەلائیکە بۆ زیادە ڕێزو نرخ پێدانیان.**

**بەم شێوەیە باسی بەهەشتیەکانی کرد، باسی خۆشیو نازو کەیفو ئاهەنگی کردن، بەڵام ناپاکانو تاوانباران، بە تانەو تەشەر لێدانو ئابڕوو بردنو ڕەزیل کردنو سزادان باس ئەکات پێیان ئەوترێ: ﴿وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ جیا ببنەوە ئەمڕۆ لە موسڵمانەکان، تێکەڵیان مەبن ئەی تاوانباران، دوورکەونەوە لە هەموو خێرو خۆشیەك، یان بەش بەش بن لەناو ئاگردا هەرکەس جێگای تایبەتی خۆی هەیە: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ ئایا پێم ڕانەگەیاندن، بەهۆی پێغەمبەرەکانەوە، ئەی نەوەو ڕۆڵەکانی ئادەم، کە شەیتان مەپەرستنو شوێنی مەکەون، چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە، واتە ئەو دوژمنایەتیەی لە ئادەمی باوکتانەوە دەستی پێکرد، ئەو بوو بە هۆی دەرکردنی لە بەهەشت، ئیتر چۆن ئێوە دوای ئەوە لە جیاتی دوژمنایەتی، ئەتان پەرست؟! مەبەست لە پەرستن، شوێن کەوتنو گوێڕایەڵیە، چونکە شوێن کەوتنو گوێڕایەڵی جگە لە فەرمانی خوا دروست نیەو ئەبێتە بت پەرستی بە گوێرەی ئایینی پاکی ئیسلام:**

وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ
﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلۡيَوۡمَ
نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٦٥﴾

---

**﴿ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴾ رامگەیاند کە من بپەرستن، ئەمەیە ڕێگای ڕاست کە بتان گەیەنێ بە من و ڕەزای من ﴿ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴾ بێگومان شەیتان چەند تاقمی زۆری لە ئێوە گومڕا کردووە، ئایا ئیتر بۆچی ئێوە ژیریی و فامتان نەبوو، تەمێ خوار نەبوون و هەر کەوتنە شوێنی؟!**

**ئینجا پاش ئەم هەموو زەلیل کردن و داخ پێدان و ڕیسواکردنە ـ خوا پەنامان بدات ـ تۆڵە و سزای سەختیان بۆ ئاشکرا ئەکات، بە تانە و تەشەر لێ دانەوە ئەفەرموێ: ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾ ئا ئەمە دۆزەخەکەیە کە هەڕەشەتان لێ ئەکرا و ئەترسێنران پێی، ئێوەیش باوەڕتان نەبوو و گاڵتەتان پێی ئەهات، لە دنیادا، ئەوەتا ڕاست بوو ﴿ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾ بڕۆنە ناویەوە ئەمڕۆ سزاکەی بچێژن، بە هۆی کوفرو بێباوەڕیتان لە دنیادا، ئینجا شێوەیەکی سامناکی زۆر سەیر پیشان ئەدات، کەس شتی وای نەدیوە، شێوەی دەم شێوەی دەم و مۆر کردن وهاتنە زمانی ئەندامەکانی تریان و شایەتی دانیان لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی کەلە دنیادا کردوویانە، لەحەدیس دا هەیە کە ئەو دۆزەخیانە کاتێ دۆزەخ ئەبینن سام و ترس هۆشیان ناهێڵێ، سوێند ئەخۆن کە ئەو گوناهانەیان نەکردووە، خوایش بەو جۆرەیان لێ ئەکات کە هیچ بیانوویان نەمێنێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ ئەمڕۆ مۆر ئەنێین بەسەر دەمیاندا توانای گفت و گۆیان نامێنێ، دەستیان قسەمان لەگەڵ ئەکەن و قاچیان شایەتی ئەدا لەسەر ئەو کردەوانەی کە کردوویانە، ئەم شتە نەبینراو و نەبیستراوەشیان بەسەر ئەهێنێ زیاد لەو هەموو سزاو ناخۆشیە.**

وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ
لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ
نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ
مُّبِينٞ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾

---

**ئینجا بەم بۆنەیەوە دوو جۆر بەلاو سزا باس ئەکات، کە ئەم بێباوەڕانە شایانی ئەو بوون دووچار بکرێن لەم جیهانەدا، بەلام ڕەحمو بەزەییەکەی لە دنیادا، کافرو بێباوەڕیش هەر بەشدارە تیای دا، بەپێی حیکمەتو خواهیشی خۆی مۆڵەتو ماوەی تاوانباران بێباوەڕانی داوە. ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ﴾ ئەگەر بمانەوێ کوێریان ئەکەین بە جۆرێ جێگەی چاوەکانیشیان کوێر ئەکەینەوە، بە هۆی ئەوەوە ﴿فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ﴾ ئیتر ڕێگایان دەرنەئەکردو بە قەڵەبالغی بەریەرەکانێیان ئەکرد لە گوزەر کردنداو لە یەک هەڵئەکەوتن، چونکە ئەگەر بەو جۆرە کوێریان بکەین ﴿فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ﴾ ئیتر چۆن هیچ ئەبینن، ئەمە بەلاو سزای یەکەم.**

**دووەم: ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ﴾ ئەگەر بمانەوێ هەرلەشوێنی خۆیاندائەیان گۆڕین، شێوەی ئامادەییان ناهێڵین، ئەیانکەین بە شتێکی بێگیان وەک دارو بەرد، ﴿فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ﴾ بە هۆی ئەوەوە ئەو کاتە توانای ڕۆیشتنو گەڕانەوەیان نەئەما.**

**بەڵگەو نیشانەی ڕوون لەسەر ئەمە کە ئەتوانێ وا بکەین، ئەمەیە بە چاو ئەبینرێ ﴿وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِ﴾ ئەوەی کە تەمەنی درێژ ئەکەین هەموو ئەندامو هێزو توانای وەرئەگرینەوە، بەرەو کزیو کەمی تا وای لێ دێ پەکی ئەکەوێو جوڵەی لێ ئەبڕێ، بێ بینینو بێبیستنو فامو هۆش، بە پێچەوانەی منداڵێک کە بەرەو هێزو زیادی ئەڕوات: ﴿أَفَلَا يَعۡقِلُونَ﴾ ئایا ئەمانە فامو ژیرییان نیە هەتا بزانن کەس دەسەلاتی بەسەر ئەم بەسەرهاتی پیرەدا ئەتوانێ ئەو دوو شێوە، دەردو سزایش فەراهەم بێنێ ئەم بەسەرهاتانە وێنەی یەکن بەس بۆ پیرکە بەرەبەرەیەو بە یەک جار نیە، تا ئێرە مەبەستەکانی ئەم سورەتە ئەگەڕێتەوە بۆ سێ شت:**

١- باسی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ).

٢- تاک‌و تەنهایی خواو بێزاری دەربارەی پەرستن جگە لە خوا.

٣- باسی ڕۆژی دوایی.

ئەوا دووبارە لێرەوە تا دوایی سورەتەکە، دێتەوە سەر ئەو سێ مەبەستە بە کورتی، بە شێوەیەکی وا لێیان ئەدوێ باش باوەڕ جێگیر بێ لە دڵ‌و دەروونیدا. ئەوە بوو یەکەم جار باسی وەحی خواو پێغەمبەرێتی بوو، ئەوا لێرەش دا هەر لەو مەبەستە ئەدوێ، بە درۆ خستنەوەی ئەو پڕوپاگەندەیەی کە سەرۆکەکان ئەیانکرد دەربارەی قورئان، کە ئەم قورئانە شیعرە، باش ئەیانزانی کە وا نیەو وێنەیان نەدیوە لە زمانی خۆیاندا، ئەیانویست کە جەماوەری لێ دوور بخەنەوە، ئەوا خوای گەورەیش بە درۆیان ئەخاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ﴾ ئێمە محمدمان فێری شیعر وتن نەکردووە، کاتێ خوا فێری نەکردبێ، ئەبێ نەزانێ شیعر بڵێ، چونکە هیچ کەس هەرچی خوا فێری نەکات نایزانێ، ئەفەرموێ: شیعر شایانی ئەو نیە، چونکە زۆربەی شیعر بریتیە لە دڵداری‌و ئارەزووی نێرو مێ‌و شتی پڕوپووچ، ئەو پەڕی ڕادەی کە زۆر بەرز بێتەوە لە دەربڕینی حاڵەتێ لە دڵدا کە هەردەم بە بارێکدا ئەگۆڕێ، بەڵام قورئان بەرنامەیەکی دامەزراوە ناگۆڕێ لەگەڵ حەزوئارەزووی دڵ‌ودەروونیدا، شتێکی ترە وەکوئەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ﴾ ئەم قورئانە جگە لە یادی خواو ئامۆژگاری‌و ڕێگە نیشان دان لە لایەن خواوە هیچی تر نیە، خوێنراوەیەکی ڕوون‌و ڕەوانەو وێنەی هۆنراوەی ئادەمی نیە، قورئان بە هەموو شێوو دۆڵێکدا ناڕوات بێ هودەو بێ ئامانج وەکو زۆربەی شیعر، بەڵکو ئامانج‌و مەبەستێکی تایبەتی هەیە، هاتووە: ﴿لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا﴾ بۆئەوەی بترسێنێ ئەوەی کە زیندووەو دڵی ئامادەیە بۆ باوەڕ پێ‌ی، کەواتە ترساندنەکەی سوودی هەیە، واتە ئەوە کە ئامادەیی وای هەبێ زیندووە، ئەوەی ئەو ئامادەییەی تیا نەبێ وەکو مردوو وایەو هیچ نابیستێ، فەرمانی قورئان بۆ ئەوانە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ بۆئەوەی بڕیاری سووتاندن بە ئاگری دۆزەخ بێتە دی دەربارەی کافرەکان، چونکە خوا هیچ کەس ناسووتێنێ بە ئاگری دۆزەخ هەتا فەرمانی خۆی پێ نەگەیەنێ لە ڕێگەی پێغەمبەرەکانیەوە، ئینجا ئەویش باوەڕ نەهێنێ‌و سەرکەشی بکات. ئەواڕوون بووەوە لەقورئانەوەکەئادەمی دووتاقمن: تاقمی گوێ ڕایەڵ، ئەوەزیندووە، تاقمی سەکەش ئەویش مردووەو بڕیاری تەواوبووە.

أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَـٰمًا فَهُمْ لَهَا مَـٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَـٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾

---

**ئینجا دێته سەر مەبەستی دووەم: خوایەتی خوا بە تاكو تەنیایی بە خستنە پێش چاوی هەندێ لە نیعمەتەكانی خۆی، بۆئەوەی كە بیری لێ بكەنەوەو سوپاس و بەندایەتی بكەن، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَـٰمًا فَهُمْ لَهَا مَـٰلِكُونَ * وَذَلَّلْنَـٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ * وَلَهُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾ ئایا نازانن و نابینن كە ئێمە دروستمان كردووە بۆ سوودی ئەوان بزن و مەڕو ڕەشە وڵاخ و حوشتر كە ئەمانە لەو شتانەن كە جگە لە ئێمە كەس دەسەڵاتی تێدانیە، دوای ئەوە كردومانن بە خاوەنیان، ژێر دەست و گەردن كەچمان كردوون بۆیان بەكاریان ئەهێنن لە ئارەزووو پێویست و مەبەستی خۆیاندا، سواریان پێ ئەكەن و لێیان ئەخۆن و چەند سوودو قازانجی تریان لێ وەرئەگرن، وەكو: كورك و خوری و موو و چەند شتی تر كە ئەخوێنەوە، وەكو شیر و ماست و ڕۆن و دۆو...هتد، ئایا ئیتر سوپاس ناكەن لەسەر ئەم هەموو نیعمەتە بە نرخانە كە گرنگترین پۆشاك و خۆراك و فەرش لەوانەوە دەست ئەكەوێ و فەراهەم دێت، واتە با سوپاسی بكەن.**

**هەركەسێ لە ڕووناكی ئەم قورئانەوە تەماشا بكات و بیرێ بكاتەوە دەست بەجێ هەست ئەكات كە لەبەر لافاوی نازو نیعمەتی خوادایە، ئەو كاتە لە كانی دڵیەوە زۆر بە خۆشی سوپاسی پەروەردگاری هەڵئەقوڵێ، بەڵام هەموو بەو جۆرە نین، بەڵكو زۆر تر بەو نازو نیعمەتە ئەژێ و كەچی جگە لە خوا ئەپەرستێ، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً﴾ جگە لە خوا چەند پەرستراوێكی تریان بۆ خۆیان داناوەو كردوویانن بە هاوبەشی خوا، ﴿لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ﴾ بە هیواو چاوەڕوانی ئەوەی كەلە تەنگانەو بەسەرهاتی خراپدا كۆمەكی و یارمەتی بدرێن لە لایەن ئەو بتانەوە، لەگەڵ ئەمەدا هەڵەیان كردو كارەكە پێچەوانەیە وەكو ئەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ﴾ ئەو بتانە ناتوانن یارمەتی ئەوان بدەن، ﴿وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ**

تُحۡضَرُونَ ﴾ ئەوان سەربازێکی ئامادەکراون بۆ خزمەت کردن‌و پاراستنی ئەو بتانە، ئەوەیش ئەوپەڕی نەفامی‌و نەزانیە، ئەم نەفامیە ئێستایش زۆر باوەو زیانی زیاترە لە نەفامیەکەی لەمەو پێش‌و ڕابردوو، ئەو کاتە کە زۆربەی پەرستراوەکان دارو بەردو جنۆکەو ئەو جۆرە شتانە بوون کە زیانیان بۆ کەس نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ زۆربەی پەرستراوەکان ئەم هەموو زاڵم‌و سەرکەشانەن کە ناوەستن لە کوشتن‌و ڕین‌و هەموو جۆرە ناڕەواییەك، بەتایبەتی دەربارەی بێتاوان‌و بێ دەسەڵاتەکان‌و هێزو لەشکرو سوپایان بۆ ئەو هەموو ناڕەواییە بریتیە لەمانەی کە سەری بەندایەتیان بۆ بەستوون‌و سەرشۆڕو گەردن کەچن بۆیان، ئەگەر بێت‌و ئەمانە لێیان دوور بکەونەوە، ئەو زاڵمانە دەسەڵاتی هیچیان نامێنێ، ئەو زاڵمانە لە ڕاستی دا هیچ یارمەتی ئەمان نادەن، ئەمان سەربازێکن کە بەپەرستن قۆڵیان ئەگرن‌و هەموو کارێکیان بۆ جێبەجێ ئەکەن‌و شەوو ڕۆژ پاسەوانن‌و پاسیان ئەکەن.

بت پەرستی، هەر بت پەرستیە لە هەر شێوەو دیمەنێکدا بێت‌و بە هەر جۆر بێ، کە بیرو باوەڕی تاك‌و تەنیایی خوا تێك چوو هەموو کات بت پەرستی ڕوو ئەدات، نەزانی دێت، پەنادەرو پارێزگەر نیە بۆ ئادەمی تەنیا بەو باوەڕە پاك‌و خاوێنە نەبێت، کە تەنها خوا بکرێ بە خاوەنی هەموو کاروبارێك، بەندایەتی تەنها ئەو بکرێ‌و تەنها خوا بە پەنادەرو یارمەتی دەر بزانرێ. ئەو بت پەرستانە بەو هەموو نالەبارییەوەو بەو هەموو پڕوپاگەندەیەوە بەرەنگاری پێغەمبەرو ئایینە پاکەکەیان ئەکرد، لەو کاتەدا خوا دڵنەوایی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ئەکات‌و دڵی پڕ ئەکات لە ئارام، کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّا نَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾ با غەمبارت نەکات بت پەرستی‌و ئەوەی کە ئەو بێباوەڕانە ئەیڵێن دەربارەی خۆت‌و ئایینەکەت، واتە هیچ نرخیان نیە گوێیان مەدەرێ، چونکە ئێمە ئەزانین بەوشتانەی کە ئەیشارنەوەو ئەوەی دەری ئەبڕن، کەواتە تۆڵەیان لێ ئەسێنین. هەموو ئیماندارێکی ڕاستەقینە، چ جای پێغەمبەر (ﷺ) بێگومان ئەم فەرموودەیەی خوای بەسەو باکی نامێنێ لە بێبڕوایان‌و دوژمنانی ئیسلام.

أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾

---

ئینجا هاتە سەر مەبەستی سێیەم: بەڵگەی ڕوون و ئاسانی لەسەر دێنێتەوەو لە هۆنینەوەی بەڵگەکەدا ئەوەی کە بێبڕواکان ئەیڵێن ناشیرین و چەپەڵی ئەکات بە جۆرێ هەرکەس ڕێزی فام و ژیریی خۆی بۆی ڕووی نایەت خۆی بکات بە خاوەنی ئەو قسەیە، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ﴾ ئایا ئادەمی نەیزانیوە کە ئێمە دروستمان کردووە لە نوتفە ئاوێکی قیزەوەن، دوای ئەوە کە پێگەیی و گەورە بوو ئەبێتە داواچییەکی ئاشکراو بەربەرەکانێمان لەگەڵ ئەکات، دەربارەی ئێمە شتێکی وتووە کە هۆی سەرسوڕمانە: ئێمە بەبێ دەسەڵات و پەك کەوتوو سەیر ئەکات و لەبیری نەماوە دروست بوونی خۆی کە بە توانای ئێمە بووە بەهۆی ئەوەوە: ﴿قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ﴾ وتویە ئایا کێ ئێسکەکان زیندوو ئەکاتەوە لەکاتێکدا کە ڕزیون، ئەگەر کەمێ فام و هۆشی بێ و بیربکاتەوە لە پەیدا بوونی خۆی کە لەچی دروست بووەو چۆن پەیدا بووە، تۆزێ بیر لەوە بکاتەوە پرسیاری وا ناکات. هەموو کەس ئەزانێ کە دروست بوونی لەو ئاوە بێنرخەیە، بەڵکو لە نوختەیەکی زۆر ورد کە بە چاو نابینرێ، پێی ئەوترێ (خلية) لەو تەنها نوختە لە نێوان هەزارەها نوختە کەوا لەناو ئەو تۆزە ئاوەدا.

ئەو تەنها نوختەیە ئەلکێ بە دیواری منداڵدان و لە خوێنی ناو منداڵدان خۆراك وەرئەگرێ و بەرەبەرە بە ملیۆنەها پارچەی لێ ئەبێتەوە، لەو پارچانە هەموو ئەندام دروست ئەکرێ تا ئەبێ بەو منداڵەو لەو شوێنە تەنگ و تاریکەدا تادێتە دنیا و ئەبێ بەو ئادەمیە تێرو تەواوەو خۆی لێ ئەگۆڕێ، ئەو نەفامە بەدنەمەکە بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەو ئاوە هیچ زیادە نرخ و ڕێزێکی نیە بەسەر ئێسکە ڕزیوەکاندا کاتێك کە گونجا ئەو ئاوە بوو بەم ئادەمیە، ئایا

بۆچی ناگونجێ ئەو ئێسکانە وەکو خۆیان‌و ئەوسا ببنەوە، ئەم کارە زۆر ڕوون‌و ئاشکراترە لەوەی گیرو گرفتی تێدا بکرێ، چۆن بووو پەیدا بووە؟ هەروەها ئەبێتەوە. وەکو ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ لە وەڵامدا: ﴿يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئەو کەسەی کەلە یەکەم جارەوە دایهێنان زیندوویان ئەکاتەوە، توانای ئەو کەسە هەروەك خۆی هەیەو نەگۆڕاوەو نایش گۆڕێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ ئەو کەسەی کە زیندوویان ئەکاتەوە ئاگادارە بەسەر هەموو دروست کراوەکانی دا، ئەزانێ ئەو پارچە ڕزیوانە چیان بەسەرهات‌و لەکوێن، چۆن جوێ ئەکرێنەوە، چۆن وەکو ئەوسایان لێ ئەکرێتەوە؟

ئینجا خوای گەورە بۆ زیادە ڕوون کردنەوە، هەندێ تر لە نیشانەو بەرهەمی زۆرو توانای خۆی ئەخاتە پێش چاوو ئەفەرموێ: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾ ئەوەی کە ئێسکە ڕزیوەکە زیندوو ئەکاتەوە کەسێکی ئەوتۆیە کە ئاگری دروست کردووە بۆ سوودی ئێوە لەناو درەختی تەڕو سەوزدا کە ئەوەتە ئاگری پێ‌ئەکەنەوە، بە چاو ئەیبینن ئاگر لەو دارە تەڕو سەوزە دەرئەچێ، ئەو کەسەی کە ئاوو ئاگری کۆکردۆتەوە لەو دارە سەوزەدا دەسەڵاتی هەیە بەسەر زیندوو کردنەوەدا. گەورەیی قورئان هێجگار لەمەدا ڕوونە کە ئەو بەڵگەو دەلیلانەی ئەیانهێنێتەوە بۆ هەموو چینێ دەست ئەدات، بۆ وێنە: ئەم مەسەلەی ئاگر لەناو درەختی تەڕدا ئەوەی کە خوێندەواریش نەبێ ئەزانێ کە ڕاستە شتی وا هەیە، تەنانەت ئەوانەی کە کۆچەرو لادێیی بوون لەو عەرەبە نەخوێندەوارانە بە چاوی خۆیان ئەم شتە نایابەیان ئەبینی کە دوو جۆر دەرخت هەن ناویان (مرخ و عفار)ە مرخیان ئەکوتا بەسەر عفارداو ئەیان سوین لە یەك بە سەوزی، ئاویان لێ ئەتکاو ئاگریشیان لێ دەرچوو، بەو جۆرە ئاگریان ئەکردەوە. زانیاری ئەمڕۆ بە شێوەیەکی قوڵتر لەمە ئەگات: کە درەختە تەڕەکان لە خۆرەوە گەرمایی وەرئەگرن وەکو چۆن ئاو وەرئەگرن، ئەم ئاوو ئاگرە کۆئەبێتەوە هەر دووان لە ئەندامی دارەکەدا، ئەو ئاگرە لەو دارە ئەچێ لە کاتی کوتان‌و سوینیان لە یەك، لە کاتی سوتاندا.

هەموو دروست کراوەکانی خوا ئەگەر بێت‌و سەرنجیان بدەینێ بە چاوێکی کراوەو بە هەستێکی تێگەیشتووی ئاگاداری باوەڕمان بەهێزتر ئەبێ‌و هەموو کات ئەژین بە شێوەیەك دڵمان پڕ ئەبێ لە یادی خوا، ئەو کاتانەمان بە پەرستن بۆ دائەنرێ.

ئینجا گرنگترین‌و گەورەترین نیشانەو بەرهەمی دەسەڵاتی نەبڕاوەی خۆی ئەخاتە پێش چاو ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمۚ﴾ ئایا کەسێکی ئەوتۆ کە ئاسمانەکان‌و زەوی دروست کردووە توانا و دەسەڵاتی نیە بەسەر دروست کردنی وێنەی ئەمانەدا؟ ئینجا خۆی وەڵام ئەداتەوەچونکە وەڵامی تر نیە، ئەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەڵێ دەسەڵاتی هەیە، چونکە تەنها هەموو شتی دروست کردووەو ئاگای لە هەموو شت هەیە، دەسەڵاتی بێبڕانەوەو زانینی بێسنووری هەیە، ئاسمان‌و زەوی شتێکی زۆر گرنگن، تا بیریان لێ بکەیتەوە گرنگیان ڕوون تر ئەبێتەوە، ئەم زەویە کە ئێمەی لەسەر ئەژین‌و ملیۆنەها گیانلەبەرانی تر، بە هەموومانەوە شتێکی وانین لە چاو گەورەیی قەبارەی ئەودا، تا ئەمڕۆ شتێکی وا نازانین لە هاڵ‌و هەواڵی ئەم زەویە گەورەیە کە لەچاو خۆردا زۆر بچووکە، چونکە ئەڵێن: خۆر یەك ملیۆن ئەوەندەی زەویە، خۆر یەکێکە لە سەد ملیۆن لە نزیکترین (مجرة) لە ئێمەوە، ئەڵێن: تا ئێستا زانایان بە (رصد) سەد ملیۆن (مجرة) یان دۆزیوەتەوە، چاوەڕوانی دۆزینەوەی زیاتر لەوە ئەکەن، ئەندازەی دووری ئێمە لەگەڵ (مجرة)یەکدا دانراوە بە ٧٥٠ ساڵی ڕووناکی کە هەموو ساڵێکی ڕووناکی دانراوە بە ٢٦ ملیۆن ملیۆن میل، ئەم هەمووە چرکە سەعاتێك ناوەستن‌و ئەگەڕێن‌و گەردش‌و چەرخە ئەکەن زۆر بە وردی‌و بە ڕژێمێکی ڕاست، ئەگەر بەم شیوەش بیری نەکرێتەوە، هەر بە شێوەیەکی سادەو بە چاو تەماشا بکرێ جگە لە سەرسامی هیچی تر نامێنێتەوە، کەواتە لەو بێباوەڕانە هەرکام خۆی بە ئادەمی دائەنێ با هۆشێك بکاتەوە بۆئەوەی بە نەفامی دەم بەرەڵا نەکات شتێ بڵێ کە ببێتە چڵك‌و چەپەڵی بەناو چاریەوەو ببێتە جێگای لاقرتی‌و پێکەنین.

إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٨٣﴾

خوای گەورە لە دروست کردنی ئەم بوونەوەرە گەورەیەدا هیچ زەحمەت و ماندوو بوونێکی ڕووی تێنەکردووە، بەڵکو هەموو ئەم بوونەوەرە دروست کردنی یەکسانە لای خوا، لەگەڵ دروست کردنی باڵی مێشوولەیەکدا، چونکە بۆ هەموو شتێك هەر ئەوەی ئەوێ کە مەیل و خواهیشی خوا ڕوو بکاتە ئەو شتە ئیتر هیچی تری ناوێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[1] هەرکاتێ خوا ویستبێتی شتێك بکات و فەراهەمی بێنێ، کارو فەرمانی ئەو دەربارەی ئەو شتە تەنها بریتیە لەوە بفەرموێ ببە ئیتر دەست بەجێ، بێ دواکەوتن ئەو شتە ئەبێت.

ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە ئایەتێکی کە تەنها هەر لە دەست قورئان دێت کە شتی وا ببا بە گوێچکەی ئادەمی دا، ئایەتێ کەوا زمان بوترێ، یان بە پێنووس بنووسرێ، چەند جوانی فەرموە حەرزەتی (ئیبن و عەباس) -خوای لێ ڕازی بێت- کە ئەفەرموێ: ئەم ئەزانی کە سورەتی ﴿یس﴾ بۆچی ئەوەندە حەدیسی زۆر دەربارەی گەورەیی هاتووە، کە تەماشام کرد هەموو بەهۆی ئەم دواترین ئایەتەوەیە.

ئەم ئایەتە ئێجگار ڕێکە لەگەڵ هەموو مەبەستەکانی سورەتەکەدا بە جۆرێ لەوانەیە وەکو ئاوێنەیەکی بێگەرد ئەو مەبەستانەی تێدا ببینرێ، لە لایەکی تریشەوە ئەم سورەتە ئەو هەموو مەبەستە گەورانەی تێدا باس کرا بەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوون و ئاشکرایانەوە، کەواتە هەموو دڵێکی زیندووی پێ پڕ لە ئارامی ئەبێ، کەواتە زۆر بەجێیە لە پاش ئەم هەموو شتە گرنگانە بەم جۆرە شیرینە نایابە یادو تەسبیحی ئەو پەروەردگارە بکرێ کە ئەو

---

[1] زۆر لە زانایان ئەفەرموون مەبەست لە وشەی ﴿كُن﴾ ڕووکردنی خواهیشی خوایە بۆ ئەو شتەو پەیوەندی پێیەوە، لەبەرئەوە لە تەفسیرەکەدا بەو جۆرەم ووت لە پێش ئایەکەوە.

قورئانە بێ وێنەی هێنایە خوارەوە. ئەم ئایەتە ئێجگار سامو هەیبەتێکی نایابی هەیە، کاشکێ هەموو لەشمان ئەبوو بە دڵو زمان بە جارێ بمان وتایە: ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ وەکو پەروەردگارمان بەو جۆرە فەرموویەتی ئەوا ئێمەش بە زمانی کوردی ئەڵێین: هەموو پاکیو دووری لە هەموو لەکەو ناتەواوییەك بۆ کەسێکی ئەوتۆ کەلە دەستی قودرەتی ئەودایە، خاوەنی بێ کەمو کوڕی بۆ هەموو شتێ، واتە هەموو شتێ دروست کراوی ئەوەو موڵکی ئەوە، دەسەڵاتو توانای هەیە بەسەری دا. ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە بەڵێن دان بە پاداشتو پاشەڕۆژی کامەرانی بۆچاکان، هەڕەشەو تۆڵەو پاشەڕۆژی سەخت بۆ تاوانباران، ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ هەمووتان پاش مردن ئەگێڕرێنەوە بە زیندوویی دووبارە بۆ لای ئەو کەسەی کە هەموو شتی بە دەستە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ﴿٤﴾

## سورەتی «الصافات»
## مەککەییەو ١٨٢ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتەیش وەکو زۆربەی سورەتە مەککەییەکانی تر ئامانجی داڕشتنی باوەڕە لە دڵو دەروونداو ڕزگار کردنی لە بت پەرستی لە هەموو شێوەو وێنەیەکی دا، بەتایبەتی نەهێشتنی باوەڕێکی نەفامی پڕوپووچ کە لەو کاتەدا باو بووە، لەناو نەفامو نەزانی عەرەبدا، کە بریتیە لە باوەڕ بەوە کە مەلائیکە کچی خوایە ـ پاكو بێگەردی بۆ خوا ـ هەروەها باسی ڕۆژی دوایی و هەندێ لە هەواڵەکانی ئەکاتو هەندێ لە بەسەرهاتی کۆمەڵێ لە پێغەمبەران ـ سەلامیان لەسەر بێت ـ ناو بە ناو موژدە ئەداتو هەڕەشە ئەکات لەوانەی کە شایانی ئەوەن.

خوای گەورە لە یەکەم جارەوە سوێند ئەخوات بە چەند کۆمەڵێ لە دروست کراوەکانی لەسەرتاكو تەنیایی خۆی، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا * فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا * فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾ لەبابەت بەم سێ وشەدا: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ، فَٱلزَّٰجِرَٰتِ، فَٱلتَّٰلِيَٰتِ﴾ ڕای زانایانی تەفسیر جیاوازە، بە چوار جۆرە باسیان کراوە: یەکێ لەوانە ئەمەیە کە مەبەست پێیان مەلائیکەیە. ئێمە لێرەدا لەسەر ئەم ڕایە ئەڕۆین و ئەڵێین: واتە: سوێند بەو مەلائیکانەی کە خۆیان ڕیز ئەکەن لە پلەی بەندایەتی و خواپەرستیان دا، یان باڵیان ڕیز ئەکەن بە ئامادەیی چاوەڕوانی فەرمانی خوا ئەکەن. سوێند بەوانەی ئەخوڕنە سەرکەشان لە کاتی گیان کێشاندا، یان لە کاتی ڕۆژی دواییدا تێیان ئەخوڕن کاتی ناردنیان بۆ دۆزەخ. سوێند بەوانەی قورئان ئەخوێنن سوێند بەمانە: ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ﴾ بێگومان خوای ئێوە تاكو تەنهایە. لە شێوەی سوێند خواردنەکەی دا وەرئەگیرێ پڕوپووچی ئەو باوەڕە نارێکە کە وترا، وەکو فەرمویێتی: سوێند بەم مەلائیکانە ئێوە ئەیانپەرستن، ئەمانە شایانی پەرستن نین و خۆیان کەمەری بەندایەتیان بەستووە بۆ خواپەرستی، خوای هەمووتان یەك خوایەو تەنهایە.

ئینجا خوای گەورە خۆی ئەناسێنێ بە بەندەکانی بە سیفەت و ناونیشانێك کە ڕێکە لەگەڵ باسی تاك و تەنهاییدا، ئەفەرموێ: ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ ﴾ خوای تاك و تەنهای ئێوە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە و هەرچی وا لە نێوانیاندا، لە هەورو ڕووناکی و هەموو دروست کراوەکانی تر، کە بەرە بەرە ئادەمی پێیان ئەزانێ و زۆربەی هێشتا نەناسراوە، مەگەر بۆ لەمەوپاش، پەروەردگاری هەموو شوێنەکانی هەڵاتنی خۆرە، یان هەڵاتنی هەموو هەڵاتوویەکی تریش.

ئەوەی کە دڵی بێدار بێ هەرکات ورد ببێتەوە لە ئاسمان و زەوی و نێوانیان، بیربکاتەوە لەم هەموو ڕێکی و شیرینی و جوانی و ئەم هەموو گەورەیی و فراوانیە، بەسەر بردنی هەموو کارێ بەم ڕژێمە نایابە گۆڕاوە، هەرکەس ئاوا ورد ببێتەوە بێگومان سەری بەندایەتی شۆڕ ئەکات بۆ ئەو کەسەی ئەم کاروبارەی بەدەستە، جگە لە کەسێ کە دڵ مردوو بێ هۆشە.

لە سورەتی ﴿الرحمن﴾دا ئەفەرموێ: ﴿رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ﴾[1]. لە سورەتی ﴿المزمل﴾دا ئەفەرموێ: ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ﴾[2]. وە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ﴾ هەموو ڕاست و ڕێکە، سورەتی ﴿الرحمن﴾ کە دووان ئەفەرموێ، یان بۆ مانگ و خۆرە کە هەردووکیان شوێنی هەڵاتن و ئاوابوونیان هەیە یا بە گوێرەی هاوین و زستانە کە هەڵاتن و ئاوا بوون لە هاویندا ئەکەوێتە لای ژووروی زەوی و لە زستاندا لای خواروو، لە سورەتی ﴿المزمل﴾دا کەبە تاکە مەبەست تەرەفی هەردوو لایە، واتە هەرکەس ڕووبەڕووی خوارووی زەوی بوەستێ ری دەستی چەپ تەرەفی هەڵتنە و لای دەستی ڕاست تەرەفی ئاوابوونە.

لێرەدا ئەفەرموێ بە کۆمەڵ یان مەبەست شوێنی هەڵاتنی هەموو ئەستێرە و مانگ و خۆرێکە، یان مەبەست پلەکانە، کە هەر ڕۆژێ خۆر لە پلەیەکدا هەڵدێ، یان ئەگەر قوڵتر بۆی

---

[1] پەروەردگاری هەردوو شوێنی هەڵاتن و هەردو شوێنی ئاوابوونە.

[2] پەروەردگاری شوێنی هەڵاتن و شوێنی ئاوا بوونە.

برۆین زەوی لە خولانەوەیدا لە بەردەم خۆردا شەوو ڕۆژ بێ وەستان هەڵاتن‌و ئاوا بوون لە پارچەکانیدا پەیدا ئەبێت، بەم جۆرە: هەر پارچەیەکی تیشکی خۆری لێ کەوت ئەبێتە شوێنی هەڵاتن، بەم جۆرە ئەبێ هەموو هەڵاتنی ئاوا بوونی هەبێ، کەواتە پێویست نیە بە باس کردنی جێگە ئاوا بوونەکان. وەکو ئەگەر هەر جێگە ئاوا بوونی بفەرموایە پێویست نەئەبوو بە باس کردنی شوێنی هەڵاتن، بەڵام چونکە هەڵاتن نیعمەتێکی گەورەترە تا ئاوا بوون باسی هەڵاتنی کرد، هەروەها ئەگەر هەردووکیش بفەرموێ هەر ڕێکە وەکو لە سورەتی ﴿المعارج﴾دا فەرموویەتی: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ﴾[1] خوای گەورە لەم شوێنەدا خۆی ئەناسێنی بە بەندەکانی بە سیفەتی پەروەردگارێتی بۆ ئاسمان‌و زەوی‌و شوێنە هەڵاتنەکان، لەبەر ئەوە باسەکە باسی تاك‌و تەنیایی خوایە، ئەم سیفەتە بەڵگەیەکی زۆر تێرو تەواوو ڕوونە لەسەر ئەو مەبەستە گەورەیە، چونکە ئەم بوونەوەرە بەم هەموو گەورەیی‌و فراوانی‌و جۆر جۆری پارچەکانی‌و زۆریان، بە ڕادەیەکە نایەتە ژێر ژمارە، لەگەڵ ئەمەدا ئەم هەمووە بە یەك ڕژێم کاروباری ئەڕوات، بێ ناڕێکی‌و تێك چوون، بەڵکو کۆمەکی‌و یارمەتیەکی زۆر بەهێز هەیە لە نێوان هەموو پارچەکانی دا بێ یەکتر کاروباریان ناڕوات، ئەم بوونەوەرە بەم شێوەیە بێگومان هەموو خاوەن بیرو ژیرێ پێ ئەزانێ بە تەنها خوایە نەبێ ئەم کارە گرنگەی ناڕوا ئەگینا تێك ئەچێ بە مل یەکدا.

ئەو باوەڕە پڕوپووچە کە وترا بنەڕەتی لەسەر ئەوەیە کە خوا ـ پاك‌و بێگەردی بۆی ـ ژنی خواستووە لەتیرەی شەیتان لەنێوان ئەم دوانەدا مەلائیکە پەیدا بووە، لە یەکەم جاری سورەتەکەوە دای لە نیوەی باوەڕە پیسە ناپاکەکە، ئەوا لێرەشدا ئەدا لەوی تری بەمە کە گرۆهی شەیتان دوورو دەرکراون‌و سزای ئەدرێن لە لایەن خواوە نەك وەکو باوەڕی پڕوپووچ ئەڵێ: خزمایەتی‌و خۆشەویستی ببێ لەنێوانیاندا.

---

[1] سوێند بە پەروەردگاری هەموو شوێنە هەڵاتنەکان‌و شوێنە ئاوا بوونەکان.

إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾

---

لەم ئایەتانەی دواوە ئەو مەبەستە وەرئەگیرێ کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ * وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ * لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ * دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ * إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ بێگومان ئێمە ئارایشتمان کردووەو ڕازاندوومانەتەوە ئاسمانی هەرە نزیك لە ئێوەوە بە ئارایش و جوانی ئەستێرەکان. واتە مەبەستێ لە مەبەستەکانی دروست کردنی ئەستێرەکان: جوان کردن و ڕازاندنەوەی ئەو ئاسمانەیە کەوا بە پێش چاوتانەوە، مەبەستێ تر: پاراستنی ئاسمانە لە هاتوچۆ کردن و گوێگرتنی هەموو شەیتانێکی سەرکەش، ناتوانن بچن گوێ بگرن لە کۆمەڵی هەرە بەرز: کۆمەڵی مەلائیکە، کەویستیان بچن ئاگر باران ئەکرێن لە هەموو لایەکی ئاسمانەوە، مەگەر یەکێکیان لەناکاو بە گورگە فڕە هەڵمەتێ بداو ئەویش دەست بەجێ پارچە ئاگرێکی ڕووناك ئەکەوێتە شوێنی. شەیتان و جنۆکە هەندێکن لە دروست کراوەکانی خوای گەورە ئێمە لە هەواڵیان نازانین جگە لەوەی کە خوا هەواڵی پێداوین بەهۆی پێغەمبەرمانەوە محمد (ﷺ) کەواتە پێویستی سەرشانی هەموو ئیماندارێکە لە خۆیەوە دەم نەکوتێ نە زیادو نەکەم.

جا کەوابێ ئێمە لێرەدا هەر ئەمە ئەڵێین کە شەیتان هەیەو هەوڵ ئەدەن بۆ گوێ گرتن لە مەلائیکە بۆئەوەی دەنگ و باسێکیان لێوە وەرگرن بە نهێنی، ئەمانە بەرگری ئەکرێن بە ئاگر باران ئیتر لێرەدا نابێ هیچی تر بڵێین: ئایا چۆن گوێ ئەگرن؟ یا چۆن ئاگر باران ئەکرێن؟ یان بە چ شێوەیەك ئەستێرە ئەبێتە هۆی ئەو ئاگر بارانە؟

ئەمانەو وێنەی ئەمانە شتێکی نهێنی و غەیبین، سروشتی ئێمە توانای زانینی ئەمانەی نەدراوەتێ، ئێمە پێویستە خۆمان بناسین لە سنووری خۆمان دەرنەچین. ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت ئەمەیە: ئەو بیروباوەڕە لە چەرخی نەفامی و نەزانی عەرەبداباوبووە، کە بریتیە لە بوونی پەیوەندی ژن خوازی لەنێوان خواوشەیتاندا، ئەوباوەڕە پڕوپووچە قورئان دەیخاتەوە بەدرۆوە بەمەی کەدەری ئەبڕێ شەیتان دەرکراوەو سزا دراوە لەلایەن خواوە وەکو باس کرا.

فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ۚ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍۭ ﴿١١﴾ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾

ئینجا له پاش باسی مه‌لائیکه‌و ئاسمان‌و زه‌وی‌و نێوانیان، ئارایش کردنی ئاسمان به‌و هه‌موو ئه‌ستێره زۆره که له ژماره نایه‌ن، باسی شه‌یتان‌و ئاگر بارانیان، پاش خستنه پێش چاوی ئه‌م هه‌موو دروست کراوه گه‌وره‌و به‌هێزانه، فه‌رمان ئه‌دات به پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) که پرسیار بکات له بێبڕواکان ئه‌وانه‌ی که نه‌فام‌و نه‌زانن، زیندووکردنه‌وه به شتێکی نه‌گونجاو دائه‌نێن، لایان وایه شتی وا هه‌رگیز ده‌ست نادات‌و نابێ، ئه‌فه‌رموێ: ﴿فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ﴾ لێیان بپرسه، ئایا ئه‌وان به‌هێزو به‌تین ترن؟ یان ئه‌م هه‌موو شتانه‌ی که دروستمان کردن: مه‌لائیکه‌و زه‌وی‌و ئاسمانان، یان ئایا دروست کردنی ئه‌وان گرانتره یان دروست کردنی ئه‌وانه‌ی که وترا، ئه‌بێ ئه‌م پرسیاره به‌م شێوه‌ی دووه‌مه به گوێره‌ی فام‌و تێگه‌یشتنی بێ باوه‌ڕه‌کان بێت، چونکه به‌رامبه‌ر به خوا هیچ شتێك گران نیه‌و هه‌موو شت یه‌کسان‌و ئاسانه. له‌سه‌ر هه‌ردوو جۆر چاوه‌ڕوانی وه‌ڵام ناکرێ، چونکه:

یه‌که‌م: وه‌ڵام ئاشکرایه.

دووه‌م: مه‌به‌ست له‌مه پرسیاری ڕاسته‌قینه نیه.

به‌ڵکو مه‌به‌ست بێزاری ده‌ربڕینه ده‌رباره‌ی نه‌فامێتی‌و تێنه‌گه‌یشتنی ئه‌و بێباوه‌ڕانه که چۆن به لایانه‌وه زیندوو کردنه‌وه‌ی مردوو یاخی ئه‌بێ له که‌سێ که ئه‌م هه‌موو شتانه‌ی دروست کردبێ، له‌به‌رئه‌وه ئه‌یخاته پێش چاویان که دروست کراون له هه‌ندێ له‌م زه‌ویه که یه‌کێکه له دروست کراوه‌کانی خوای گه‌وره، ئه‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍۭ﴾ بێگومان ئێمه ئه‌وانمان دروست کردووه له قوڕێکی مچ.

قورئان له ئایه‌تێکدا ئه‌فه‌رموێ: ﴿خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ دروستمان کردوون له خۆڵ. له ئایه‌تێکی تردا له زمانی شه‌یتانه‌وه ئه‌گێڕێته‌وه که وتی به خوای گه‌وره: ﴿وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾ ئاده‌مت دروست کردووه له قوڕ. له ئایه‌تێکی تردا ئه‌فه‌رموێ: ﴿صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ﴾ له قوڕێکی وشك بوو که ته‌قه‌ی لێ بدرێ ده‌نگی لێ ئه‌بێته‌وه وه‌کو سواڵه‌ت، لێره‌یش دا ئه‌فه‌رموێ: ﴿مِّن طِينٍ لَّازِبٍۭ﴾ هه‌موو ڕاست‌و ڕێکه، ئه‌مانه هه‌موو قۆناغی جیا جیا بوون که

ڕابووردووه بەسەر دروست كردنى حەزرەتى ئادەمدا، يەكەم خۆڵبوو، كرا بە قوڕ، قوڕەكە مايەوە تا ترشا، لە پاش ئەوە زیاتر شێلرا تا مچ بوو، ئینجا شێوەی ئادەمی لێ دروست كرا بەو شێوە وشك بوو تاوەكو سواڵەتی لێ هات ئینجا گیانی كرا بەبەردا، ئادەم كە یەكەم مرۆڤە، لە چی دروست كراوە ڕۆڵەو نەوەكانی ئەچنەوە سەر كە ئەوەی لێ پەیدا بووە. زیاد لەو قۆناغانە چەند قۆناغێكی تر هەیە بۆ نەوەكانی ئادەم كە بۆ ئادەم نەبووە، ئەو قۆناغانە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- ئاو (نوتفە).

٢- خوێنی خەستو پنر وەكو جگەر.

٣- (المضغة) شتێ وەكو گۆشت پارە بە ئەندازێ كەلە دەمدا بجوێ.

٤- ئێسك ـ قەبارەی ئێسكی ـ.

٥- گۆشت بەبەردا كردن.

كەواتە ئەوانە هیچ نانوێنن لە چاو ئەو هەموو دروست كراوانەدا، ئیتر ئەبێ دروست كردنەوەیانو زیندووكردنەوەیان پی بێ لە چاو دروست كردنی ئەو شتە گەورانەدا.لە بارێكی ترەوە دروست كردنی ئەوانە لەم زەویەیە لە یەكەم جارەوە دەی بۆ ئەبێ دووەم جار دووبارە كردنەوەیان نەگونجێ؟!

هەموو خاوەن فامو ژیرییەك ئەزانێ كە شتێ جارێ ڕووی دا، دەست ئەدات كە چەند جارێكی تر ڕوو بداتەوە، بەڵكو ئەبوایە بە ئاسان تر سەیریان بكردایە، چونكە بێگومان هەموو شتێك لە یەكەم جارەوە پێك بهێنرێ گرانترە تا تێك بدرێو دووبارە بكرێتەوە، بەڵێ وەكو وترا بۆ خوا شتی وا ناوترێ: چونكە هەموو شتێ وەكو یەك ئاسانە بۆ خوا، كەواتە باوەڕ نەبوون بە زیندووبوونەوە زۆر جێگای سەرسوڕمانە، بۆیە لێرەدا خوا ئەفەرموێ: ﴿ بَلۡ عَجِبۡتَ ﴾ ئەی پێغەمبەر تۆ سەرت سوڕئەمێنێ كە ئەو بێ باوەڕانە چۆن ئاوا چاوی دڵیان كوێر بووە ئەم شتە زۆر گونجاوەیان بەلاوە نەگونجاوە، چۆن ئەبێ هەڵوێستیان بەرامبەر ئەم هەموو بەڵگەو نیشانانە وا بێ كە بیرێكی لێ نەكەنەوە؟

سەیرتر ئەمەیە تەنیا بە بێباوەڕی نەوەستاون، بەڵكو وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَيَسۡخَرُونَ﴾ گاڵتەو لاقرتی ئەكەن بە باوەڕكردن بە تاكو تەنیایی خوای گەورەو بە زیندووبوونەوەو بە ئیمانداران. ﴿ وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذۡكُرُونَ ﴾ كاتێ بەڵگەو نیشانەكانی خوای گەورەیان بیربخرێتەوەو ئامۆژگاری بكرێن وەری ناگرنو بیرناكەنەوە،

وَإِذَا رَأَوْا ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾

**بەڵکو: ﴿وَإِذَا رَأَوْا ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ﴾ کاتێ ئایەتێ لە ئایەتەکانی خوا ـ ئایەتی قورئانی یان بوونەوەری ـ ببینن کە ڕێگەی ڕاستیان نیشان ئەدات، زیادەڕەوی ئەکەن لە گاڵتە کردندا، بانگی یەکتر ئەکەن و داوا ئەکەن کە بە جارێ لاقرتی بکەن و بیکەن بە هۆسە، هەر شتێك هۆی گاڵتە کردن بێ بەکاری بێنن.**

**یەکێ لەوانە ئەوەیە کە دەربارەی قورئان دەم درێژیی بکەن لە تایبەتی کاتێ کە قورئان بەرو دوای ئەگرتن و جوڵەیان نەئەما، ئەیان وت ئەمە سیحرە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئەیان وت ئەم قورئانە جگە لە جادوو سیحر هیچی تر نیەو هەر سیحرە، گاڵتەیان لێ ئەهات دەربارەی هەڕەشە کردن لێیان بە تۆڵە سەندنی پاش زیندووکردنەوە، ئەیان وت: ﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾ ئایا ئەگەر ئێمە بمرین و ببینە خۆڵ و ئێسکە ڕزیو تازە ئێمە زیندوو ئەکرێینەوە؟ ئایا باو باپیرە پێشووەکانیشمان کەلە کۆنەوە مردوون ئەوانیش هەر زیندوو ئەکرێنەوە؟ واتە زیندووکردنەوە ناگونجێ و بە هیچ جۆرو جێگەی باوەڕ نیە، بە تایبەتی دوای ئەمە مردووە کە شێوەی ئادەمی نەمێنێ و ببێتە خۆڵ و ئێسکە ڕزیوی و چەند چەرخێکی بەسەردا بڕوات، کەواتە هەڕەشە کردن بە تۆڵە سەندنی پاش زیندووبوونەوە چ نرخێکی هەیە کاتێ ئەو بێباوەڕانە وردنەبوونەوە لەو هەموو بەڵگە ڕوونانە کە قورئان هێنایە پێش چاویان، بەو هەموو ئارامی و ڕێك و ڕەوانیە، ئینجا ئەبێ بەتین و بەهێز بێدار بکرێنەوە، لەو خەوی بێ ئاگاییە، شێوەی کین و ترس و لەرزی خۆیان بهێنرێتە پێش چاویان، ئەوکاتەی کە زیندووە، هەروەها ئاگادار بکرێنەوەبەوە، کە هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندووکردنەوە و هیچ ئەرکێکی نیە وەکو ئەفەرموێ: ﴿قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ﴾ لە وەڵامدا پێغەمبەر بڵێ: بەڵێ زیندووئەکرێنەوە، ئێوە زەلیلن و بێ دەسەڵاتن بەرامبەر دەسەڵات و توانای خوای گەورە، چیتان لێ بکات بەرگری لێ ناکرێ.**

فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى
كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ ٱحْشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُواْ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ
فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾

---

لەبەرئەمەی بەڵگەی زیندووکردنەوە ڕابورد پێویست نیە دووبارە کردنەوەی، هەم لەبەرئەوە دڵنیایی هەیە لە ڕاستی بەدی هاتنی دا، خوا فەرمانی دا کە ئاوا بێ باكو بە ئارامەوە وەڵام بداتەوە، چونکە هیچ ئەرکێکی نیە. ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ﴾ چونکە هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە هیچی ناوێ جگە لە یەك دەنگی گەورەو تەنیا تێخوڕینێ، لەگەڵ ئەو تێخوڕینە بوو: ﴿فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ﴾ ئیتر دەست بەجێ هەموو زیندوو ئەبنەوەو زرتو زیندوو ئەڕوانن یان چاوەڕوانی ئەکەن ئایا چیان بەسەر دێتو چیان دەربارە ئەکرێ کاتێ زیندوو ئەبنەوە بە گورجی غەمو ماتەمینی ئەیانگرێو ئەکەونە هاوار وەکو ئەفەرموێ دەربارەیان: ﴿وَقَالُواْ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ﴾ ئەڵێن ئای مەرگ بۆ ئێمە ڕۆژی تۆڵە سەندنە لە ناپاکیمان. لەم کاتەدا کەوان لە ماتەمینیو هاواردا، مەلائیکە بە تەشەرەوە پێیان ئەڵێن: ﴿هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ ئەمە ڕۆژی محاکمەو بڕیار دەرکردنە، ڕۆژی جیاکردنەوەی چاكو خراپە. ئەو ڕۆژەیە کە ئێوە باوەڕتان پێی نەبوو، ئەتان وت: درۆیە ڕۆژی وا نایەت.

ئینجا دوای تەشەر لێدانو ڕوو ڕەشی بەسەرهێنانیان، خوای گەورە فەرمان ئەدات بەو مەلائیکانەی کە کراون بەسەر کارو سەرپەرشتی ئیشو کاری ئەو ڕۆژە سەختەیان پێ‌سپێرراوە، ئەفەرموێ: ﴿ٱحْشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُواْ يَعْبُدُونَ * مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەوانەی کە بت پەرست بوونو هاوبەشیان بۆ خوا ڕەواداوە، ئەوانە هەموو کۆبکەنەوە لەگەڵ هەموو وێنەکانیان، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کەلە دنیاا پەرستوونیان جگە لە خوای گەورە، کۆیان بکەنەوە ئینجا ڕێنموونیان بکەن بۆ ڕێگای دۆزەخ.[1] وشەی

---

[1] مەبەست بە وێنەکانیان یان هەموو جۆرە کافرەکانی ترە جگە لە بت پەرستەکانی ئەو چەرخەی کە ئەم ئایەتەی تێدا هاتە خوارەوە، یان مەبەست ژنە کافرەکانیانە، یان مەبەست ئەو شتانەیە کە هەمیشە هاوسەریان بوون لە دلنیاندا،

﴿فَٱهۡدُوهُمۡ﴾ که گۆڕیومانه به ڕێنموونی که ئەوەش بۆ خۆشی و چاکه بەکارئەهێنرێ، لێرەدا مەبەست لاقرتی پێکردنه بۆ سزادانی دەروونیان.

ئەو کەسانەی کەلە دنیادا بیروباوەڕێك دائەهێنن و مرۆڤیان دوا ئەکەوێ و ئەبنه سەرۆك و هۆی تێك دان و گومڕاکردنی مەردوم ئەو کەسانه لەو دنیاش هەر پێشەوان ئەکەونه پێش تاقمەکانیانەوە ئەڕۆن بۆ ناو ئاگر ـ پەنا به خوا ـ سزایان سەخت تره، چونکه تاوانیان زۆرتره، ئەو پێخستنەش سزایەکی دەروونی تێدایه بۆ هەردووکیان: سەرۆك با له پێشیانەوە بڕوا به ڕوو ڕەشی و سەرشۆڕی له ئاستی ئەمانەی که دوای کەوتوون و بەدبەختی کردن، دواکەوتووەکانیش با هەر داخی سەخت بچەژن که چۆن ئادەمێتی خۆیانیان لەبیرنەبوو کەوتنه شوێن بەندەیەکی وەکو خۆیان؟ چۆن ئەوەنده نەفام بوون به دەستی خۆیان خۆیان ئاوا بێبەش کردو دووچاری سزای نەبڕاوە بوون؟ با هەر له داخەوە له دواوە تف و نەفرین بکەن له سەرۆکی پێشەوا!! هەر لەبەر ئەم سزا دەروونیه له دۆزەخیشدا هەموو کەس لەگەڵ بت و ئەوەدایه که هۆی سەر لێ شێوانی بووە لەم دنیادا بۆ ئەمەی هەرچۆنێ به ئاگر ئەسووتێ با هەموو کات له پێش چاویشی بێ هۆی سزا سەختەکەی کاتێ وتمان سەرۆکه پێشکەوتووەکان بۆ ناو ئاگر ئەوانەن کەلە دنیادا مەردومیان گومڕاکردووە و بیروباوەڕیان داهێناوە ئیتر شوێنی پرسیار نامێنێ دەربارەی پێغەمبەر (عیسا و عوزەیر)ە، هەروەها هەر پیاوێکی چاك که هەوڵی بڵاو کردنەوەی ڕێگەی خوای دابێ، له پاش خۆی شوێن کەوتووەکانی ڕێگاکەی ئەویان تێك دابێ و ترازا بن لێی، چونکه ئەو پێشەوا چاکانه هەوڵی چاکەیان داوە و هیچ تاوانیان نیه ئەوانه پاداشت ئەدرێنەوە، پەنا به خوا ئەم دۆزەخیانه له دنیادا خوا ڕێگەی ڕزگاری و خۆشی و بەختەوەری و نازو نیعمەتی نەبڕاوەی پیشان دان، گوێیان نەدایه و خۆیان کەوتنه سەر ڕێگەی سزاو بەدبەختی خۆیان لەم جیهانەدا ئارەزووی خراپەیان کردووە، کەواته جێی خۆیەتی خوا فەرمان بدات بفەرموێ: به شێوەی گاڵتە و ڕیسوا کردن، ﴿فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ﴾ کاتی خۆیان به خواهیشی خۆیان ئەو بیروباوەڕەیان هەڵبژارد بەسەر ئەوەی خوای گەورەی به ڕەحم بۆی ناردن،

---

هەندێ ئەفەرموون مەبەست به ﴿وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ هەموو جۆره بت پەرستەکانه، واته بت پەرستەکان هەموو کۆبکەنەوە، تاقم به تاقم هەموو تاقمێ پێکەوە، ئاگر پەرست، بەرد پەرست، هەروەها...

وَقِفُوهُمْۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ
يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾

کەواتە ئیتر زۆر بەجێیە بوەستێنرێن و پرسیاری بیروباوەڕو کردەوە پیسەکانیان لێ بکرێ بۆ زیادە سەر شۆڕ کردن و تەریق کردنەوەو ئابڕو بردن وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقِفُوهُمْۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ﴾ ڕایان وەستێنن چونکە بەڕاستی پرسیاریان لێ ئەکرێ، پرسیار لەو باوەڕو کردەوەیانە کە سەری لەم ڕۆژە سەختەوە دەرچوو، هەروەها شیاوی ئەوەن تانەو تەشەریان لێ بدرێ بەم شێوە پرسیارەکە ئەفەرموێ بە تەشەرو لاقرتیەوە: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ ئایا ئەوە چیتانە کۆمەکی ناکەن و یارمەتی یەکتر نادەن بۆ ڕزگاریتان؟ واتە ئەوا هەمووتان کۆمەڵن پێویستتان زۆر هەیە بە ڕزگار بوون، ئەوانەی ئەتان پەرستن و دوایان کەوتبوون لەگەڵتانن دەی بۆچی یارمەتی یەکتر نادەن؟ هەندێ لە زانایان ئەفەرمون مەبەست لەو پرسیارە لە پێشەوە فەرموی ئەم پرسیارەیە، ئەوەیش بۆ زیادە سزای دەروونی ڕاگیر ئەکرێن بۆ پرسیار، پرسیارەکەش ئەو تانە سەختەیە، دیارە هیچ وەڵام نیە لێرەدا هەروەکو مەبەست داوای وەڵام نیە. ئەمان لەدنیادا بێئاگا بوون، سەرکەشیان ئەکرد، بەڵام لەو دنیا سەرکەشی و لارە جڵەوی نامێنێ، بەڵکو سەرشۆڕن وەکو ئەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾ واتە هەموو سەرۆك و ژێر دەستەکان، پەرستراوو بەندەکان هەموویان زەلیل و سەرشۆڕو مل کەچن.

ئینجا شێوەیەکی تری بێباوەڕە تاوانبارەکان نیشان ئەدات لەکاتێکدا لە دۆزەخدا شەڕە قسەو دەمە دەمێ ئەکەن و یەکتر تاوانبار ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾ هەندێکیان ڕوو ئەکەنە هەندێکی تریان پرسیار ئەکەن، پرسیاری تاوانبار کردن و تانەو تەشەردان: ﴿قَالُوٓاْ﴾ هەندێکیان بە هەندێکی تریان ئەڵێن: ﴿إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ﴾ بێگومان ئێوە بوون لە دنیادا ئەهاتنە لامان و کەوتنە خوارو ژوورمان تا فریوتان داین و لە ڕێگای ڕاست لاتان داین، یان بە زۆر نیشتنە ملمان، یان بە سوێند ئیمەتان خەڵەتاند، کەواتە ئێوە تاوانبارن، ئەوانیش لە وەڵامدا: ﴿قَالُواْ بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەڵێن: نەخێر ڕاست ناکەن. یەکەم: ئێمە گومڕامان نەکردوون، بە قسەو هەوڵی ئێمەلاتان نەداوە، ئێوە خۆتان ئیمانتان نەبووە.

وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾

---

**دووەم: ﴿وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ﴾ ئێمە هیچ زۆرو دەسەڵاتێکمان نەبووە بەسەر ئێوەدا بە جۆرێ ناچارتان بکەین بۆ ئەمەی خۆتان ئارەزووتان لێ بێ. ﴿بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ﴾ بەڵکو خۆتان گەلو کۆمەڵی بوون لە سنووری ڕاستی دەرچووبوون، خۆتان ئارەزووتان لێ بوو. ﴿فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ إِنَّا لَذَآئِقُونَ * فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ﴾ کەواتە هۆی ئەم بەسەرهاتەمان ئەمەبوو: ئێمەو ئێوەش بڕیاری هەڕەشەی خوا جێگیر بوو لە سەرمان، کە ئەبێ سزای ئاگر بچەژین، ئینجا ئێمە ئێوەمان بانگ کرد بۆ لادان لە ڕێگای خوا، چونکە بێگومان ئێمە لامان دابوو، گومڕا بووین و پێمان بوو ئێوەش وەکو ئێمە ین، ئێوەش ئامادە بوون بۆ گومڕایی بەهۆی ئەوەوە شوێنمان کەوتن و لاتاندا لە ڕێگای خوا، واتە خۆتان ئارەزووتان بوو، کەواتە خۆتان تاوانبارن، وەکو ئێمە ئەگەر نا ئەی کێ ئێمەی گومڕا کرد؟**

**پاش گێڕانەوەی دەمە تەقێی تاوانباران دەربارەی یەکتر، ئینجا بە گوێرەی قسەکانی خۆیان باسی سزای ڕۆژی دواییان ئەکات بە شێوەی بڕیاردان لەگەڵ باسی هەندێ لە تاوانەکانیان کە لە دانیادا کردوویانەو بووەتە هۆی بڕیاری سزادانیان بە ئاگر لەو دنیا، ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ بێگومان هەموویان بە سەرۆکو شوێن کەوتوو، ئەمڕۆ هاوبەشن لە سزادا، چونکە هەموو تاوانبار بوون و لە دنیادا هاوبەش بوون لە گومڕاییدا. ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ﴾ بێگومان ئێمەبەوجۆرەڕەفتارئەکەین لەگەڵ تاوانباراندا تۆڵەیان لێ ئەسێنین هەرکەس بەپێی تاوانی خۆی. ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ ئەمانە دەربارەی خوا بارو حاڵیان وا بوو کاتی پێیان بوترایە هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی ناوی ﴿ٱللَّهُ﴾یە. مل کەچیان نەئەکرد بۆ ئەو وشە پیرۆزە کە سروشتی ئادەمی جگە لەوە هیچی تر وەرناگرێ.**

وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٖ مَّجۡنُونِۭ ﴿٣٦﴾ بَلۡ جَآءَ بِٱلۡحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمۡ لَذَآئِقُواْ
ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾

---

ئەمانە سروشتیان تێك چووە، باوەڕیان بەوە نیە، خۆیان بە زلتر سەیر ئەكەن لەوەی كە مل كەچ بكەن بۆئەوە، یان بۆ كەسێ كە ئەوەیان پێ بڵێ. ﴿وَيَقُولُونَ﴾ دەربارەی پێغەمبەرو قورئان ئەڵێن: ﴿أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٖ مَّجۡنُونِۭ﴾ های ئێمە واز ئەهێنین لە پەرستراوەكانی خۆمان لەبەر خاتری شاعیرێكی شێت؟!! واتە ئەوەی ئەیڵێت قورئان نیەو لەلایەن خواوە هاتبێ، بەڵكو شیعرەو خۆی هەڵی ئەبەستێ، خۆیشی شێتەو ئەوەی ئەیڵێ لە جنی وەرئەگرێ،

ئینجا خوای گەورە بە درۆیان ئەخاتەوەو هەڕەشەی سەختیان لێ ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ جَآءَ بِٱلۡحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ نەخێر شاعیرو شێت نیە، بەڵكو پێغەمبەرەو ئەوەی هێناویە ڕاستەو لە لایەن خواوەیە، بەڵگەی بەهێزی لەسەر هەیە، هەموو پێغەمبەران ڕێكن لەگەڵ ئەوەی محمد هێناویەتی، ئەمیش باوەڕی بەو هەموو پێغەمبەرانە هەیەو قسەكانی ئەوانی بە ڕاست دەركردووە. ﴿إِنَّكُمۡ لَذَآئِقُواْ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَلِيمِ﴾ بێگومان ئێوە سزایەكی سەختی بەسۆ ئەچەژن. ئینجا باسی ئەوە ئەفەرموێ كە ئەم سزا سەختە بە وێنەی كردەوەكەیانەو زیاد نیە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ * إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ تۆڵەیان لێ ناسێنرێ جگە لە تۆڵەیە كە وێنەی كردەوەكانی خۆتانە, ئەگەر ئەم فەرمایشتەی لەگەڵ هەموو بێت واتە ئەوەی كە تەكلیفی شەرعی لەسەر بێت ئەو كاتە وشەی ﴿إِلَّا﴾ لە ﴿عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ بۆ (استثناء متصل)ە، واتە ئەی گرۆهی ئادەمی هەمووتان تۆڵەو پاداشتتان بە وێنەی كردەوەتانە جگە لە بەندە خاوێن كراوەكانی خوا، ئەوانە خوا لوتفی دەربارەیان زۆرە پاداشتیان بە چەند چەندانە ئەداتەوە، لای خوارووی یەك بە دەیە، بەڵام ئەگەر مەبەست بەو فەرموودە تەنیا تاوانباران بێت كە باسەكە باسی ئەوانە ئەو كاتە (استثناء متصل)ە واتە تۆڵەی ئێوە: تاوانبارەكان بە گوێرەی كردەوەتانەو زیاد نیە.

ئینجا كە باسی ئەوان ئاوا كرا جێگەی ئەوەیە گومان ببرێ كە چاكانی خوا ئایا ئەوانیش هەر بە گوێرەی كردەوەیان یاخود زیاترە، ئەوا ئەو گومانە ناهێڵێ. ئایەتانەی خوارەوە، بە هەردوو شێوەكە ماناو مەبەستەكە ڕێكو ڕاستە.

أُولَٰٓئِكَ لَهُمۡ رِزۡقٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُۖ وَهُم مُّكۡرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾
يُطَافُ عَلَيۡهِم بِكَأۡسٖ مِّن مَّعِينِۭ ﴿٤٥﴾ بَيۡضَآءَ لَذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوۡلٞ وَلَا هُمۡ عَنۡهَا يُنزَفُونَ
﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ عِينٞ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيۡضٞ مَّكۡنُونٞ ﴿٤٩﴾

---

جابابێینەسەرباسی ئەونازو ڕێزە کە خوا بە ڕەحم و بەزەیی خۆی بەزیادە ئەیدا بە بەندە خاوێن کراوەکانی، ئەفەرموێ: ﴿أُولَٰٓئِكَ لَهُمۡ رِزۡقٞ مَّعۡلُومٞ * فَوَٰكِهُۖ وَهُم مُّكۡرَمُونَ﴾ ئەو بەندە تایبەتیە خاوێن کراوانەی خوا لە هەموو بارو ڕوویەکەوە نازو نیعمەت دایپۆشیون بە لێشاو:

یەکەم: ئەوانە بەندەیەکی خاوێن کراوی خوای گەورەن کە ئەوە بە رزترین پلەو ڕێزە.

دووەم: ڕزق و ڕۆزی ئەوان جیاوازە، هەمیشەیی و نەبڕاوەیە. دوای ئەوە ڕۆزی و خۆراکیان بەس بۆ لەزەت و خۆشیە، چونکە مانەوەی لەشیان پێویستی بە خۆراك نیە وەکو لە دنیادا پێویستی هەیە، چونکە لێرە وا دروست کراون بێ خۆراك ناژین، بەڵام لەو دنیادا لە شیان بە جۆرێ دووبارە ئەکرێتەوە کە نەخۆشی و پیری و نەمانی بۆ نیە.

سێیەم: لە لایەن کۆمەڵە هەرە بەرزی مەلائیکەوە ڕێز ئەگیرێن، ئەو خۆراك و ڕۆزیانەی پێیان ئەدرێ بە ڕێزەوە بۆیان ئەهێنرێ بێ ئەرك و ماندوویی و داوا کردن. ﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ * عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾.

چوارەم: لە بەهەشتانی نازو نیعمەت و خۆشی دان، جگە لەوە هیچی تری تێدا نیە. وەکو دنیا نیە کە جێگەی خۆشی و ناخۆشیە، لەسەر تەختی ڕازاوەو کورسی و ئاسکەملی نایاب دانیشتوون لە ناو ئەو بەهەشتانەدا بە جۆرێ هەموو ڕوویان لەیەکە کە جوانترین شێوەی دانیشتنی کۆمەڵە، پاش ئەمە وا مەجلیس ڕازاوە هەر ئەوە ماوە خزمەتچی بگەڕێ خزمەت بکات، شتی خۆش بگێڕێ بە ناویاندا، ئەو ئەوەیش ئەفەرموێ: ﴿يُطَافُ عَلَيۡهِم بِكَأۡسٖ مِّن

مَعِينٍ * بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ * لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴾ چەرخە ئەكرێ بەناویاندا و ئەگێڕێنرێ بەسەریانەوە پیاڵەو پەرداخی پڕ لە شەرابێك كەلە كانیاوردا دێتە دەرەوە، سپیەو بە لەزەتە بۆ ئەوانە كە ئەخۆنەوە، هیچ جۆرە زیان و ناڕەحەتیەكی نیە، فام و هۆشیان تێك ناچێ بە خواردنەوەی، واتە وەكو شەرابی ئەم دنیا نیە كە تووشی بێ هۆشی و نەخۆشی جۆر بە جۆریان بكات، بەڵكو بەو جۆرەیە كە وتراو نایە بە دڵدا لەوە چاكترو خۆشتر، ئینجا لەگەڵ ئەم هەموو نازو نیعمەت و جێگا و شوێنی چاك و گوزەرانی خۆشەدا، هاوسەری حەڵاڵ و ڕێك و پێك لە هەموو شت خۆشترە ئەوا ئەوەیشیان ئەداتێ، ئەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ * كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴾ هاوسەرانی حەڵاڵیان لایە كە چاویان بڕیوەتە مێردەكانی خۆیان، جگە لەوان كەسی تریان ناوێ، بە حەیا و داوێن پاكن چاویان ڕەش و جوان و گەورەیە، بێگەرد و لەكەن وەكو هێلكەیەك كە شارابێتەوە و پەردەی بەسەردا درابێ و تۆزی لێ نەكەوتبێ، یان وەكو هێلكەی بێ توێكڵن.

ئینجا دوای ئەوە خوای گەورە هەموو هۆی خۆشی و كامەرانی سازاند بۆ بەندە تایبەتیەكانی، شادی كردن بە یەك لەو شوێنە خۆشەدا، لەو شوێنانەدا كۆبوونەتەوە، ڕائەبوێرن بە ڕابواردنێكی ئارام و پیاوانە، لەوێدا بیرئەكەنەوە لە بەسەرهاتی ڕابردووی ئەم دنیایان و ئەو كاتە كەس نەدیوەی بەهەشتیان، لەم بابەتەوە وت و وێژ ئەكەن بە خۆشی و برایەتی. خوای گەورە ئەم ڕابواردن و قسەو باسە خۆشانەی پێداون بەرامبەر شەڕە قسەو تف و لەعنەت كردنی تاوانبارەكان لە یەكتر ئەوان ــ پەنا بە خوا ــ كۆبوونەوەكەشیانی كردووە بە سزاو عەزابێكی زیادە، بەڵام كۆبوونەوەی ئەمانی كردووە بە خۆشی و نیعمەتێكی جیاواز، ئای چەند خۆشە دۆست و برای خۆشەویست و گیانی بە گیانی پێكەوە دانیشن، بێ باك و بێ غەم، چ جای دانیشتنێ وەكو ئەم خوا پێداوانە؟!!!

فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾

جا لەو کاتە خۆشەدا ـ کە دانیشتنەکەیان ڕێك و پێکەو شەرابیان بۆ ئەگێڕن ـ دەست ئەکەن بە پرسیارکردن لە یەکتر، پرسیاری خاوێن و بە نرخ لە بەسەرهاتی ئەم دنیایان. وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾ ئینجاڕوونەکەنەیەکتروئەوقسەو پرسیارە خۆشانە ئەکەن. لەوێدا: ﴿قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ﴾ یەکێ لەوان بەسەرهاتێکی خۆی بیر ئەکەوێتەوە ئەیەوێ بۆیان بگێڕێتەوە. ئەڵێ: ﴿إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ﴾ من لە دنیادا هاوڕێیەکم هەبوو ـ واتە بێباوەڕ بوو ـ تەشەری لێ ئەدام: ﴿يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ﴾ پێی ئەوتم ئایا تۆ لەوانەی باوەڕیان هەیە بە زیندوو بوونەوە؟ واتە ئەوەندە نەفام و نەزانی! ئەمیش وەکو هەموو بێبڕواکانی تر کە هیچیان بەدەستەوەنیە جگە لەمە ئەویش ئەیوت: ﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴾ ئایا کاتێ ئێمە بمرین و ببین بە خۆڵ و ئێسکە ڕزیو ئایا تازە ئێمە زیندوو ئەکرێینەوەو تۆڵەمان لێ ئەسێنرێ و پرسیارمان لێ ئەکرێ. خوا پەنامان بدات لەم بابەتە زۆر ئەبینرێ. دوو موچە خۆر لە دائیرەیەکدا لە تەنیشتی یەکەوە دائەنیشین، یان دوو کەس لە هەر شوێنێکی تر یەکێکیان باوەڕی هەیە لەسەر سروشتی ئادەمی و ناگۆڕێ، ئەوی تریان بەدبەخت و نەفام و بێباوەڕە، ئاوا دەم درێژیی ئەکات, ئەوا خوای گەورە بۆمان باس ئەکات پاشە ڕۆژی ئەو دووانە چۆنە، کەواتە با ئیماندار ئیمانی خۆی بەهێز بکات، بێباوەڕیش ئەگەر بە تەواوی نەگبەتی سەرشانی نەگرتووە با فریای خۆی بکەوێ پێش ئەمەی هەل لە دەستی خۆی دەربکات.

خوای گەورە بۆ ئەمەی ناز و نیعمەتەکەی بە لەزەت تر بێ لای بەهەشتیەکان سزاو عەزابیش سەخت تر بکات لەسەر دۆزەخیەکان، لەبەرئەو دوو هۆیە کارێك ئەکات کە بەهەشتیەکان لە جێی خۆیانەوە دۆزەخیەکان ببینن بەو سزاو عەزابەوە. هەروەها دۆزەخیەکانیش بەهەشتیەکان ببینن بەو نازو ڕێزەوە. هەرکەس فیلمی سینەماو تەلەفزیۆنی دیبێ سەری سوڕنامێنێ لەمەی دۆزەخی و بەهەشتیەکان یەکتر ببینن، قسە لەگەڵ یەکتر بکەن. چونکە ئەوەی لە کۆشکی ئایابدا دانیشتووە بە هەموو کامەرانیەوە ئەتوانێ تەماشای فیلمی ئەوانەبکات کەلەجەنگدا پارچە پارچە بوون، بە بۆمبای ناپاڵم و زەڕە، وەکو بارەکەی تریش ئەتوانن بە لاسلکی قسە لەگەڵ یەکتر بکەن.

قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَاطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾

**جا ئەو بەهەشتیە کە سەرگوزەشتەی خۆی و خاوڕێ بێباوەڕەکەی ئەگێڕێتەوە بۆ برا بەهەشتیەکانی، ئەزانێ هاوڕێیەکەی لە دۆزەخ دایە حەز ئەکات لەو کاتەدا بیبینی لە ئاگردا لەبەرئەوە: ﴿قَالَ﴾ ئەڵێ لەهاوڕێ دانیشتووەکانی: ﴿هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ﴾[1] چاوێ بگێڕن بۆ بینینی لە جۆزەخدا. ﴿فَاطَّلَعَ﴾ ئینجا خۆی چاو هەڵ ئەخاو ورد ئەبێتەوە. ﴿فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئینجا هاوڕێ بێباوەڕەکەی ئەبینێ لە ناوەڕاستی ئاگری دۆزەخدا ـ خوا پەنامان بدات ـ ڕووی قسە ئەکاتە ئەو هاوڕێ بەدبەختەی: ﴿قَالَ﴾ ئەڵێ: ﴿تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ﴾ سوێند بە خوا بێگومان نزیك بووی لەوەوە من هەڵدێری و بمخەیتە ناو چاڵی ئاگر، واتە خەریك بوویت منیش وەکو خۆت بەدبەخت بکەیت بەو هەوڵ و تەقەلاو قسانە لە دنیادا لەگەڵ منت ئەکرد بۆ ئەمەی لە ئاینێ لام دەیت، خوا لایدام و پاراستمی. ﴿وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ﴾ ئەگەر چاکەو لوتفی پەروەردگارم نەبوایە لە ڕیزی ئەوانە ئەبووم کە ڕاکێشران بۆ دۆزەخ، واتە منیش ئێستا لەگەڵ تۆدا ئەبووم.**

**هەندێ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: لێرەدا قسەی لەگەڵ دۆزەخیەکدا دوایی دێت، ئینجا کە خۆیان ئەبینێ لە بەهەشتداو هاوڕێکەی ئەسووتێ لە دۆزەخدا بە تەواوی هەست ئەکات بە گەورەیی و بەنرخی ئەونازونیعمەتەی خوای گەورەڕێژاویەبەسەریاندا، لەخۆشیاندا بیر لە نەبڕاوەیی ئەکاتەوەو بە نازو کەشخەوە ئەڵێ: ﴿أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ * إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ ئایا ئێمە نامرین و مردن نابینین[2] جگە لە مردنەکەی یەکەم جارمان کە پێی هاتینە ڕۆژی دوایی، هەروا لەنازو نیعمەتدا ئەبین و هەرگیز عەزاب و سزا نادرێن. ئەمە بە وێنەی ئەوەیە: کابرایەك لەناخۆشیەکی گەورەڕزگار ببێ و لە ناکاو ئەکەوێتە خۆشی و بەختیاریەکی زۆرەوە وای لێ دێت خەریکە باوەڕ نەکا بە خۆی، ئەڵێ ئاخۆ ئەمە منم؟ نەخێر بڕوا ناکەم من لە کوێ و ئەمە لە کوێ.**

---

[1] ئەم پرسیارە بۆ داوایە بۆیە بەم جۆرە تەفسیرم کردەوە.

[2] ڕۆژی دوایی هەموو کەس لە مردنیەوە دەست پێئەکات، وەکو ئەفەرموێ: (من مات فقد قامت قیامته) کەواتە ئەو مردنە یەکەمە لە ڕۆژی دوایی دا ڕووت ئەدات، کەواتە جێگەی هیچ ڕەخنەیەك نیە.

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ
﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ
رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾

---

ئینجا ئەڵێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ بێگومان هەر ئەمەیە ئامانجی هەرە گەورە. واتە ئەم خۆشیە نەبڕاوە کە ئێمەی تێداین بێ مەترسی لە سزا، هەر ئەمەیە گەیشتن بە ئامانجی هەرە گەورە. هەندێ تر لە زانایان ئەفەرمون: ئەم ئایەتەیش هەر لەو قسانەیە کە لەگەڵ دۆزەخیەکەدا ئەیکات، تانەو تەشەری لێ ئەدات، چونکە لەم دنیا بەربەرەکانێی لەگەڵ کردووە، گاڵتەی لێ هاتووە کاتێ ئەم پێی ئەوت لە پاش مردن زیندوو ئەکرێینەوە، پاش ئەوە ئیتر جارێ تر نامرین، ئێمەی موسڵمان سزا نادرێین. ئێستا ئەیداتەوە بە ناوچاوی داو ئەڵێ ئەوا قسەکەی من ڕاست دەرچوو، ئایا وا نەبوو کە من وتم، بەڵێ وابوو.ئەم ڕایەش هەر جوانەو ڕێکەو مەبەستێکی شیرینە.

ئینجاپاش ئەوە پاشەڕۆژی چاکان و پاکان ڕوون کرایەوە، جێگەی ئەوەیە دڵی خەوتووان بێدار بکرێتەوە، ڕووی بکرێتە کردەوەی چاك بەم فەرموودەیە: ﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ﴾ ئەوەی هەوڵ و کۆشش ئەدا با بۆ شتی واو پاشەڕۆژی وا بیدات نەك بۆ شتێ نەمێنێتەوەو تێکەڵی داخ و خەفەت بێ، بەڵکو بۆ شتێ هەوڵبدرێت کە نەبڕاوە بێت، بێ کەمو کوڕی بێت، بێسزاو ناخۆشی و مەترسی مردن.

ئینجا بۆئەوەی باش ڕوون ببێتەوە بۆمان جیاوازی پاشەڕۆژی چاکان و پاکان لەگەڵ پاشە ڕۆژی تاوانباران، بۆئەمەی باش بیربکەینەوە لە هەردووکیان، بەراوردیان بکەین و بیاندەین لەیەك، لەبەرئەوە بە دوای باسی نازو نیعمەتی ئەواندا هەندێ لە سزاو عەزابی تاوانبارەکان ئەهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ﴾ ئایا ئەو هەموو نازو نیعمەتە کە باس کرا ــ کە ئەوەش هێشتا بەشێکی زۆر کەمە لەوەی خوا بۆی داناون ـ ئەمەی کە

باس کراوە وەك بەرکوڵێ وایە، ئەمە وەکو میوانداریەکە ئەدرێ بە میوان لە ڕێوە دێت، ئایا ئەوە باشە یان بەری درەختی ﴿ٱلزَّقُّومِ﴾ کە ئەویش بەشێکی زۆر کەمە لە عەزاب و سزای دۆزەخیەکان، دەربارەی ئەو درەختی زەقومە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان ئێمە ئەو درەختەمان کردووە بە هۆی سزاو عەزابی بێبڕواکان لەو دنیادا، یان کردوومانە بە هۆی تاقی کردنەوە لەم دنیا، چونکە کاتێ بیستیان ئەم درەختە لەناو ئاگردایە دەستیان کرد بە گاڵتە کردن، ئەیان وت: ئاگر چۆن درەختی تێدا ئەڕوێت؟

ئەوان نەزان بوون وەکو هەموو بێبڕواکانی تر ئاوڕێکیان نەئەداوە بۆ لای ئەم بوونەوەرە، تۆزێ بیرکەنەوە تا بۆیان دەرکەوێ بێسنووری و نەبڕاوەیی دەسەڵات و توانای خوای گەورە. ئەو نەزانانە کە ئەم هەڕەشە سەختەیان بیست لە باتی دڵیان داچڵەکێ کردیان بە هۆسە و پێکەنین، (ئەبو جەهل) ئەیوت: گەلی قورەیش ئەزانن ئەم درەختە چیە، کە محمد ئەتان ترسێنێ پێی؟ ئەوانیش وتیان نەخێر، وتی: خورمای مەدینە و کەرەیە، والله ئەگەر دەستمان بکەوێ تێری لێ ئەخۆین.

هەرکەس باوەڕی هەیە یان نە ء درەختی زەقوم ئەمەیە کە خوای گەورە باسی ئەکات ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ﴾ بێگومان درەختێکە لە بێخی دۆزەخەوە ئەڕوێ و دەریەت، پەل و پۆی بەرز ئەبێتەوە بەناو هەموو قاتەکانی دۆزەخدا. ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ بەرەکەی ئەڵێی سەری شەیتانە، ناشیرین و چڵ چڵاوی و دڕکینە، ئێمە نازانین سەری شەیتان چۆنە، بەڵام ناوبردنی سام و ترس ئەخاتە دڵ و دەروون، دڵی لێ ئەشێوێ و قێز ئەکاتەوە، کەواتە مەبەست ناشیرینی و قێزەون کردنیەتی، لەناو کوردیشدا وێنەی ئەمە هەیە: شتی ناشیرین و چڵ چڵاوی و چووبێ بەناو یەکدا پێی ئەڵێن: ئەڵێی شاخی شەیتانە.

هەندێ لە زانایان ئەفەرمون: تیرەیە لە ماری ناهەمواری ناشیرین هەیە سەریان پاپۆکەدارە، لێرەدا مەبەست سەری ئەم مارانەیە، بە هەر جۆر ببێ مەبەست یەکە: ناشیرینی و ناهەمواری ئەو بەرەیە، خوا پەنامان بدات ئەمانکات بە بخۆری.

﴿فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾﴾

---

دوای ئەوە کەوا ناشیرین‌و سامناکی کرد ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ﴾ بێگومان ئەو کافرانە لەو درەختە ئەخۆن، لەو بەرە ناشیرینە سامناکەی ئەخۆن، ئەوەندەی لێ ئەخۆن سکیانی لێ پڕ ئەکەن، لەبەرئەوە برسێتی زۆریان پێ ئەهێنێ، یان بە زۆر دەرخوادیان ئەدەن ـ پەنا بە خوا ـ کاتێ کە ئەیخۆن دڕکەکانی ئەگیرێنە گەروویان‌و سکیان ئەسووتێنێ، چونکە لە ناو ئاگردا ڕوواوە، خۆی ناسووتێ، چونکە لە جۆری ئاگرە، لەو کاتەدا ئاوی ساردیان ئەوێت لە گەروویان بباتە خوارەوە، تینوویەتیان بشکێنێ‌و بڵێسەی ئاگر بکوژێنێتەوە، بەڵام ئەوە دەست ناکەوێ، بەڵکو ئاوێ دەست ئەکەوێ لە گەرمی‌دا سزای کەمتر نیە لە ئاگرەکەو زۆریش پیسە، چونکە تێکەڵە لە کێم‌و زووخاوی دۆزەخیەکان‌و ئەیبێ بیکەن بەسەر ئەو خۆراکەدا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾ دوای ئەوە کە ئەو خۆراکەیان خوارد ئاوێکی وایان هەیە گەیشتۆتە ئەوپەڕی لە گەرمی دا تێکەڵیشە لەو شتە پیسانە، ئەوە ئەکەن بەسەر ئەو زەقوومەدا کە پڕی سکیان لێ کردووە.

ئینجا کە لێ بوونەوە لەو خواردن‌و خواردنەوەیە کە ڕازابووەوە بۆیان ئەو خوانە سامناکە بەجێ ئەهێڵن‌و ئەگەڕێنەوە بۆ مەڵبەندی خۆیان، ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ﴾ دوای ئەوە گەڕانەوەیان بۆ لای ئاگری بەسۆو بەتینە. بەڕاستی هەرکەسێ جارێ بە تێگەیشتنەوە ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە ئیتر هەقیەتی پێویست بە هیچ تر نەکاو هەموو ڕەفتارو خوڕەوشتی خاوێن ببێ پێی. ئینجا دوای ئەوە کە بەم چەند ئایەتانەی پێشەوە ڕۆژی دوایی هێنایە پێش چاو لەگەڵ هەندێ لە نازو نیعمەتەکانی‌و لە سزاو عەزابە سەختەکانی، پاش ئەوە ئەیخاتە پێش چاو بەشێ لە هەواڵ‌و بەسەرهاتی هەندێ لە گەلە ڕابردووەکان لەگەڵ کۆمەڵێ لە پێغەمبەرەکان ـ سەلامیان لەسەر بێت ـ لە پاش بیرکردنەوەو لێ ورد بوونەوە ڕوون ئەبێتەوە کۆمەڵی بێبڕواکان یەک جۆرو یەک شێوەن.

إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾
وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ
ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ
﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾

---

ئەوانە بەرەنگاری پێغەمبەرمان ئەبوون (ﷺ) وەکو پاشماوەی پێشووەکان وابوون، لە پاش هەموو بەربەرەکانێی بێبڕواکانی ڕابردوو پاشەڕۆژی سەرکەوتن هەر بۆ ئایین‌و ڕێگەکەی خوا بووە، سەر شۆڕیو لەناو چوون هەر بۆ بێبڕواکان بووە. کەواتە لەم سەرگوزەشتانەدا ترساندنی بێباوەڕان‌و دڵخۆشی دانەوەو ئارام پێدانی ئیمانداران هەیە. دەرگای ئەم سەرگوزەشتانە ئەکاتەوە بە باس کردنی هۆی گومڕاییو بێباوەڕی ئەو کۆمەڵەی لە چەرخی پێغەمبەرمان (ﷺ) هەبوو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ * فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ﴾ ئەوان زانیان کە باو باپیریان لەسەر ئەو ڕێگە نەبوون کە پێغەمبەرمان (ﷺ) لەسەریەتیو بانگی خەڵکی بۆ ئەکات، کەواتە ئەوانیان دەست کەوت بە گومڕا، ئینجا ئەمانیش بێ وەستان‌و بیر لێ کردنەوە کەوتنە شوێنیان بە جۆرێ وەکو زۆریان پێهێنرابێ، ئەو ڕێگەیە ئەمان لەسەری بوون ئایانزانی کە باو باپیریان هەر ئەو ڕێگەو بیروباوەڕەیان بووە، کەواتە شوێن کەوتن‌و لاسایی کردەنەوەی کوێرانە بوو بەهۆی بێبڕوایان کە ئەوەش پێچەوانەی فام‌و ژیریی ئادەمیزاد.

هەندێ لە زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: ئەم دوو ئایەتە پەیوەندی بەپێشی خۆیەوە هەیە، هۆی ئەو هەموو سزایە ڕوون ئەکەنەوە کە هەڕەشەیان پێکراوە دەربارەی ئەو کۆمەڵە بێباوەڕەی کاتو چەرخی پێغەمبەر (ﷺ)، واتە ئەوەیان دەربارەی ئەکرێ کەواتە چونکە کوێرانە بێبیر لێ کردنەوە کەوتنە شوێن باوباپیرە گومڕاکانیان ئەم جۆرەیش هەر ڕێکەو ئەگونجێ، ئەو کاتە باسی پێشووی پێ تەواو ئەبێت‌و ئەبێتە هۆی پەیوەندی ئەم سەرگوزەشتانەیش کە دێت. بە گوێرەی ئەم ڕایە ئەو سەرگوزەشتانە لەم ئایەتەوە دەست پێئەکات کە ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ پێش ئەم گەل‌و نەتەوەی تۆ، زۆربەی گەلەکانی ڕابردوویش گومڕابوون. ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ﴾ لە ناو

خۆیانـدا پێغەمبـەرانمان بـۆ ڕەوانـە کـردن کـە بیـان ترسـێنن لـە پاشـەڕۆژی خـراپ. ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ * إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ ئینجـا تـۆش تەماشـاکە ئایـا چـۆن بـوو پاشـەڕۆژی سـەخت و ناهـەمواری ترسـێنراوەکان جگـە لـە بەنـدە تایبەتیـەکانی خـوا کـە پاشـەڕۆژی کامـەرانی و بـەختیاریان بـۆ هـەموو وەکـو لـەم زنجـیرەدا ئـەو دەنـگ و بـاس و سەرگوزەشـتانە ڕوون ئەبێتـەوە، کـە دەسـت پێئـەکات لـە نـوح پێغەمبـەرەوە کەلـە نزیکـی سەرەتایی ئادەمیەوە بوو، بە کورتی باسەکەی تێ ئەپەڕێنێ و پاشەڕۆژی ڕەشی بێبڕواکان ڕوون ئەکاتەوەو یارمـەتی خـوا بۆ ئیمانـدارەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ﴾ بەڕاستی نوح نزاو هاواری لێ کردین و ئێمەیش باشترین کەس بووین بۆ وەرگرتنی نزاکەی بە تێرو تەواوی. لەوەرگرتنی نزاکەی دا چەند شتێك باس ئەکات کە لوتف و بەزەیی خـوا ڕوون ئەکاتەوەو دەری ئەخا دەربارەی نوح و ئەوانەی لەسەر ڕێگایانن، ئەفەرموێ:

١- ﴿وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ خۆی و کەس و کارە شوێن کەوتووەکانمان ڕزگار کرد لە تەنگاوە گەورەکە، کە بریتیە لە خنکان بە تۆفان.

٢- ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾ هەر ڕۆڵەو نەوەی نوحمان هێشتەوە کە ببن بە جێنشین کە سەر لە نوێ ئادەمیتی دامەزرێ و بڵاو ببێتەوە بەسەر زەوی دا بۆ ئاوەدان کردنەوەی. لەبەر ئەمەیە بە نوح ئەوترێ: ئادەمی دووەم.

٣- ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾ ڕێزو ناوبانگی باشمان هێشتەوە بۆ نوح لەناو هـەموو میللەت و گەلەکانی پاش خۆی. ئەوەتا هیچ میللەتێك نیە ناوبانگی نوحی لەناودا نەبێ.

٤- ﴿سَلَامٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِي الْعَالَمِينَ﴾ لە خواوە سەلام لەسەر نوح بێت، ئەم سـەلامەیش جاڕ بێ لـەناو عالەمدا.

هەندێ لە زانایان ڕایان وایە: مەبەست سەلامی میللەتەکانە. لەسەر ئەم ڕایە ئەوەی کە خـوای گـەورە هێشتیەوە بـۆ نـوح لـەناو گەلـەکانی پـاش خـۆی ئـەم سـەلام و نـزا بـووە لـە لایەنیانەوە کە بۆی ئەکرێ. لەسەر ڕای پێشوو مفعولی ﴿وَتَرَكْنَا﴾ لەوتندا نیەو لابراوە، لەسەر ئەم ڕایە مفعولەکە مەبەست لەم ڕستەیە. واتـە هێشتمانەوە بۆ نوح سـەلام لەسـەر کردنـی لـە لایەن هەموو عالەمەوە، لە ئادەمی و جنۆکەو مەلائیکە.

﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن
شِيعَتِهِۦ لَإِبۡرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذۡ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلۡبٖ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾

**ئینجا هۆی ئەم ڕێزو لوتفە دربارەی نوح باس ئەفەرموێ بەم ئایەتە: ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئا بەو شێوە ئێمە پاداشتی ئەوانە ئەدەینەوە کە کردەوەیان باش بووەو بە گوێرەی فەرمانی ئێمەیە، هۆی ئەوەش کە کردەوەکانی بە گوێرەی فەرمانی خوا بووە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بێگومان نوح یەکێ بووە لە بەندە ئیماندارەکان، واتە نزای نوحمان وەرگرت بەو جۆرەو ئەو هەموو ڕێزو لوتفەمان لەگەڵ کرد. چونکە یەکێ بوو لەوانەی کە ئیش‌و کردەوەیان ڕاست‌و باش بوو، بە گوێرەی ڕاو فەرمانی ئێمە ئەجولایەوە. هۆی ئەمەش ئەوە بوو کە نوح لە بەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە، کەواتە هۆی باشی نوح‌و پاداشتە بەنرخەکەی ئیمان‌و باوەڕەکەی بوو.**

**لێرەدا پێویستە باش بیربکەینەوە لە پلەی بەرزی ئیمان‌و نرخ‌و ڕێزی بە لای خواوە. کەواتە پێویستە خاوەن ئیمان خۆی زۆر بە خۆشبەخت‌و بەختەوەر تەماشا بکات. بیربکاتەوە کە خوای گەورە شتێکی وای پێ بەخشیوە کە هیچ شتی هاوتای ناکات. بەڵام ئەبێ بشزانێ کە ئیمان‌و باوەڕێ لای خوا ئەو نرخەی هەیە کە خاوەنەکەی ڕاپەڕێنێ‌و بیخاتە ئیش‌و تێکۆشان، بۆ بەدی هێنانی ئەو شتانەی ئیمانەکەی داوای ئەکات، لە بەرامبەردا نەهێشتنی ئەو شتانەی دژی ئیمانەکەیەتی، ئەگەروانەبێ ئەو نرخەی نیە.**

**ئەوەی خوای گەورە بەخشی بە نوح‌و ئەوانەی لەگەڵی بوون پاداشتی ئیمان بوو، تۆڵەی بێ ئیمانیش ئەمە بووو کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ ئینجا ئەوانی تر لە گەلەکەی نوح کە بریتی بوون لە کافرو بێبڕواکان خنکاندمانن، خرانە ناو ئاگری دۆزەخەوە. وەکو لە**

سورەتی ﴿نوح﴾دا ئەفەرمویَ: ﴿أُغۡرِقُواْ فَأُدۡخِلُواْ نَارًا﴾ واتە خنكێنران‌و خرانە ناو ئاگرەوە ـ خوا پەنامان بات ـ.

ئینجا سەرگوزەشتەی ئیبراهیم دێت بەم شێوەیە:

١- باسی بانگ كردنی گەلەكەی‌و بەربەرەكانێی ئەوان‌و هەڵوێستی خراپیان.

٢- كۆچ كردنی بۆ وڵاتێكی تر پاش ئەوە نائومێد بوو لە گەلەكەی. دەست ئەكات بە یەكەم زنجیرەو ئەفەرمویَ: ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبۡرَٰهِيمَ﴾ بێ‌گومان ئیبراهیم یەكێكە لەوانە كە بەڕاستی لەسەر ئایین‌و ڕێگەكەی نوح ڕۆیشتن، شوێنی كەوت لەمەدا كە خۆی لەسەر ڕێگای خوا بوو، بانگی مەردومیشی بۆ ئەكرد.

نوح‌و ئیبراهیم ـ سەلامیان لێ بێت ـ هەرچەند چەرخ‌و زەمانیان زۆر دوور بووە لەیەك‌و دوو پێغەمبەری سەربەخۆو خاوەنی شەریعەتێكی سەربەخۆ بوون، بەڵام ئەمان‌و هەموو پێغەمبەرانی تریش هەموو یەكن، لەمەدا كە یەك بەرنامەیان هەیەو لەسەر یەك ڕێگەن كە بەرنامەو ڕێگای خوای گەورەیە، هەموو پێغەمبەران بۆ یەك مەبەست هاتوون كە گوێڕایەڵی تەنیا بۆ فەرمانی خوا بێ‌و مل كەچی بۆ بڕیاری خواو ژیان بەسەر بردن بە گوێرەی بەرنامەی خوا بێ، دوور كەوتنەوە لە هەموو فەرمان‌و بیروباوەڕو بەرنامەیەك كە لەلایەن خواوە نەهاتبێ، ئیبراهیم پەیڕەوی نوحی كرد ﴿إِذۡ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلۡبٖ سَلِيمٍ﴾[1] ئەو كاتەی كە دڵی دەردو خراپەیەك كە هۆی دوور كەوتنەوەیە لە خوا، بەو دڵە پاك‌و خاوێنەوە چوو بۆ لای ڕەزامەندی خواو هەموو شتی واز لێ هێنا، پەیڕەوی نوحی كرد.

[1] وشەی ﴿إِذۡ﴾ لێرەدا وەكو شوێنەكانی تری قورئان. یان پەیوەندی هەر بە وشەی ﴿ٱذۡكُرۡ﴾ كە لەو شوێنەدا بڕیار ئەدرێ، یان متعلقێ تری بۆ هەیە لە پێشەوە، بە گوێرەی یەكەم: واتە خوا فەرمان ئەداتو ئەفەرمویَ: باس بكە ئەی پێغەمبەر باسی ئەو كاتە كە ئیبراهیم دڵی خۆی برد بۆ خوا بە پاك‌و خاوێنی، لەسەر دووەم: لەوشەی ﴿شِيعَتِهِۦ﴾ شوێن كەوتن وەرئەگیرێ ئەیكەن بە متعلق.

إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾

---

﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ﴾ لەو کاتەدا کە بانگی مەردومی ئەکرد بۆ ڕێگەی خواو فەرموی بە باوك‌و گەلەکەی ئایا چیە ئەوەی ئێوە ئەیپەرستن؟ واتە ئەوەی ئێوە ئەیپەرستن ئاشکرایە شایانی پەرستن نیە، بەڵکو ناحەق‌و دۆریە. ﴿أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ﴾ ئایا ئێوە لە خوا لائەدەن‌و چەند خوایەکی تر بۆ خۆتان دائەنێن لەبەرئەوە ئەتانەوێ ناحەقی‌و درۆ بکەن بەدەست قەست. ﴿فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ کەواتە ئەبێ گومانتان چۆن بێ‌و چۆن گەیشتن لە پەروەردگاری هەموو عالەم. ئایا وایە شایانی پەرستن نیە؟ بۆیە لەو لاتان داوە، هاوبەشتان بۆ داناوە. یان مەترسیتان نیە لە تۆڵەی؟

مەبەست لەو پرسیارانە بێزاری دەربڕینەو تانەوتەشەر دانە لە باوك‌و گەلەکەی لەسەر ئەوە، لە سروشتی ئادەمی لایان دابوو، بیرو ژیریی خۆیان لەکار خستبوو. لێرەدا باسی ئەوە ناکات کە گەلەکەی چۆن وەڵام‌و بەرپەرچی قسەکانیان داوە، بەڵکو ئەڕوا بۆ باسی ئەو بڕیارەی کە ئیبراهیم دای بەرامبەر ئەم درۆو ناهەقیە ئاشکرایە کە گەلەکەی لەسەری بوون.

دوای ئەوە نائومێد بوو لە گەلەکەی کە بە گوێی بکەن‌و واز بێنن لەو بیروباوەڕە پڕوپووچەی لەسەری بوون. دوای ئەوەی بڕیاری دا بتەکانیان پارچە پارچە بکات، ئەیویست هەلێکی بۆ هەڵکەوێ ئەو دەورو بەرە چۆڵ بێ. خوا هەلی بۆ هەڵخست، گەلەکەی جەژنێکیان هەبوو، وا دەرئەکەوێ جەژنی نەورۆزو سەرەتای بەهار بووبێ، باویان وابوو هەموو دەرئەچوون بۆ شوێنی سەیرانگا لەدەرەوە، پێش ئەمەی بڕۆیشتنایە لە هەموو جۆر کە بۆیان بکرایە خۆراك‌و میوەی باشیان ئەبرد لەبەردەم بتەکانیان دایان ئەنا، کە ئەگەڕانەوە بە متفەرکیان ئەزانی‌و ئەیان خوارد. ئینجا کاتێ ئیبراهیمیان بانگ کرد لەگەڵیان بڕوا بۆ جێگای جەژن‌و شادی، خوا نایە دڵی کە شتێ فەراهەم بێنی تا وازی لێ بهێنن. ﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي ٱلنُّجُومِ﴾ ئینجا تەماشایەکی لای ئاسمان‌و ئەستێرەکانی کرد.

فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾

---

﴿فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ﴾ له پاشان وتی: من نەخۆشم. (ئەستێرە گیری) باو بوو لە ناو گەلەكەی دا، ئەیویست وا بباتە دڵیانەوە كە بە ئەستێرە گیری ئەزانێ نەخۆش ئەكەوێ‌و ناتوانێ هاوبەشیان بكات لە جەژنەكەیاندا، ئەوەكو گومان ببەن كە هەر نایەوێ بەشداریان بكات. فەرموودەكەی ئیبراهیم ڕاست بوو، ئەمەش دەرئەكەوێ لە دوو ڕووەوە:

یەكەم: مەبەستی ئەوە نەبوو كە ئێستە نەخۆشم. بەڵكو مەبەستی ئەوە بوو لەمەوپاش نەخۆشی ڕووم تێ‌نەكات‌و هیچ كەس نیە نەخۆشی ڕووی تێ‌نەكات.

دووەم: مەبەستی نەخۆشی ئەو هەموو داخ‌و خەفەت‌و دڵ تەنگیە بوو كە بێ‌ئارامی كردبوو: داخ‌و خەفەتی ترازانی باوك‌و گەلەكەی لە ڕێگەی خوا، ڕێگەی ژیریی‌و سروشتی ئادەمی. چ نەخۆشی‌و دڵ تەنگیە سەخت ترە لەمەی كە یەكێ تەنیا خۆشەویستێكی ببێ لە دنیادا كەلە گیانی خۆی خۆشەویست تر بێ، لەگەڵ ئەمەدا لەناو كۆمەڵێكدا بێت كە هەموو قسەو ڕەفتاریان پێچەوانەی ویست‌و ڕای خۆشەیستەكەی بێت؟

تەنیا خۆشەویستی ئیبراهیم خوا بووە، ئەبێ چۆن ئارام بكەوێتە دڵی كە ژیاوە لەناو ئەو گەلەی بەو شێوەیە سەركەش بوون لە تاقانە خۆشەویستەكەی. ئیبراهیم ئەو بیانووەی هێنایەوە: ﴿فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەوانیش پشتیان تێ‌كردو بە گورجی ڕۆیشتن بەسەر ئیشی خۆیانەوە، ئەمەش ئەو هەلە بوو ئیبراهیم ئەیوست. ﴿فَرَاغَ إِلَىٰ ءَالِهَتِهِمْ﴾ ئینجا بە پەنهانی ئەوان چوو بۆ لای بتەكانیان بە نیازی ئەمە شتێكی خراپیان بەسەر بێنێ. ﴿فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ كاتێ كە چووە لایان ئەو هەموو خۆراك‌و میوە لە بەردەمیاندا دانرابوو، بە گاڵتەوە پێی وتن: ئایا ناخۆن؟ زیاتر بە ڕق‌و گاڵتە پێ‌كردنەوە فەرمووی: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ﴾ ئەوە چیتانە بۆ قسە ناكەن؟ وەڵام بدەنەوە، دیارە قسەو وەڵام نیە.

فَرَاغَ عَلَيۡهِمۡ ضَرۡبَۢا بِٱلۡيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقۡبَلُوٓاْ إِلَيۡهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعۡبُدُونَ مَا تَنۡحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُواْ ٱبۡنُواْ لَهُۥ بُنۡيَٰنٗا فَأَلۡقُوهُ فِي ٱلۡجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَسۡفَلِينَ ﴿٩٨﴾

﴿فَرَاغَ عَلَيۡهِمۡ ضَرۡبَۢا بِٱلۡيَمِينِ﴾ ئینجا داخی دڵی خۆی ڕشت، بەهێز لێی دان، بە دەستی ڕاست پارچە پارچەی کردن، جگە لە گەورەکەیان. وەکو لە سورەتی ﴿الأنبياء﴾دا ئەفەرموێ: ﴿فَجَعَلَهُمۡ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرٗا لَّهُمۡ لَعَلَّهُمۡ إِلَيۡهِ يَرۡجِعُونَ﴾[1] لێرەدا سەرگوزەشتەکەی کورت ئەکاتەوە بە گوێرەی شوێنەکەی هەر ئەنداز پێویست بێت ئەوە باس ئەفەرموێ، ئینجا گەلەکەی گەڕانەوەو بتەکانیان بەو جۆرە بینی، بۆیان دەرکەوت کە ئیبراهیم بەو ئیشە هەستاوە. ﴿فَأَقۡبَلُوٓاْ إِلَيۡهِ يَزِفُّونَ﴾ ئینجا بە چەسپانی ڕوویان کردە ئیبراهیم، دەوریان دا، ئەوان کۆمەڵێکی زۆر داخ لە دڵ، ئەویش تەنیا کەسێ، بێ یارمەتی دەر، بەڵام تەنیا کەسێکی ئیمانداری ڕاستەقینە پشتی بە خوای خۆی بەستبێ، تەنیا لەو کەسە نەبێ لە کەس ناترسێ، لەبەرئەوە ئەو تەنیا کەسە بەهێزتر بوو لەو کۆمەڵە کە ئەو دارو بەردەیان کردبوو بە پشتیوان بۆ خۆیان، ئەوا ئیبراهیم ئەویشی بۆ نەهێشتن، ئەم تەنیا کەسە بێباک و سام و ترس ڕووی تێکردن. تانەی لێ ئەدان، پڕوپووچی باوەڕەکەیانی خستە پێش چاویان: ﴿قَالَ أَتَعۡبُدُونَ مَا تَنۡحِتُونَ﴾ وتی: ئایا ئێوە شتێ ئەپەرستن کە بەدەستی خۆتان ئەیتاشن، پەرستراو ئەبێت شت دروست بکات نەك دروست بکرێ، چۆن ئەبێ ئێوە ئەو دروست کراوانە بپەرستن؟ ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ﴾ لەکاتێکدا ئێوەش و هەرچی ئێوە فەراهەمی ئەهێنن هەموو خوایەك دروستی کردوون کە ناوی ﴿الله﴾یە، کەواتە ئەبێ ئەو بپەرستن، لەگەڵ ئەمەدا ئەمەی کە ئیبراهیم فەرمووی شتێکی ڕوون و ئاشکرایە هیچ گرێیەکی تێدا نیە.

---

[1] واتە پارچە پارچەی کردن. جگە لە بتە گەورەکەیا. بەڵکو ئەو کردەوە بەسەر ئەوا بسەپێنن.

بەڵام بێبڕواکان بەبێ ئاگایی و لەبەر داخ و مەراقی دڵیان هیچ گوێیان نەدایە، بەڵکو کاربەدەستەکانیان سەرکێشیەکەیان یەکجار هاتە جۆش لەبەرئەوە: ﴿قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ﴾ وتیان چەند خانوو هۆدەیەکی بۆ دروست بکەن و بە ئاگر پڕیان بکەن، واتە مەنجەنیقی بۆ بچنن، ئینجا فڕێی دەنە ناو ئاگرەکەوە، ئەویش بە گوێرەی باوی سەرکەشان، کاتێ بە شتی حەق و ڕاست ڕێگایان لێ گیراو تەک و جمیان لێ بڕا، بێ بەڵگە مانەوە، پەلاماری ئاسن و ئاگر ئەدەن، تاوی ئەدەن بۆ پیاوچاکان، بەڵام پاشەڕۆژ هەر بۆ چاکانە، تاوانباران و خراپان ئەبێ هەر سەرشۆڕ بن، هەر ڕیسوایی و ڕووڕەشیان بۆ بمێنێتەوە، بەدرێژایی مێژوو هەروا هاتووە.

ئەم بەسەرهاتی ئیبراهیمە بەڵگەیەکی ڕوون و بەهێزە لەسەر ئەوەی کە وترا، ئەوە بوو هەموو ئەو گەلە بەدەسەلاتە داخ لە دڵە بە هەموویانەوە بڕیاریاندا ئەو تەنیا کەسە بە ئاگر بسووتێنن، بەڵام خوای گەورە ئەوەی ئەوان ویستیان بیکەن بەهۆی سزای ئیبراهیم هەر ئەوە خوا کردی بەهۆی زەلیلی وسەرشۆڕییان وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ﴾ گەلەکەی ئیبراهیم ویستیان سزاو زیانی پێبگەیەنن، بەڵام ئێمە نەمانهێشت سزا بە ئیبراهیم بگات، ئینجا گەلەکەیمان کرد بە زەلیلترین و سەرشۆڕترینی هەمووان، ئەوە بوو ئەو ئاگرە کە هەڵیان گراند بۆ سووتانی ئیبراهیم خوا کردی بە موعجیزەیەکی گەورە. ڕوونی کردەوە کە پێغەمبەری خوایە، کەواتە ئەبێ بە چ ڕوویەکەوە سەر بەرز بکەنەوە؟ بە ڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە کە ئیبراهیم بە تەنیا لێیان هەڵسا، بیرو باوەڕیانی خستەوە بە درۆوە، بتەکانی شکاندن، کەچی ئەوان بیریان نەکردەوە لەوەی ئەگەر ئەم بتانە شت بوونایە شتێکیان بە ئیبراهیم ئەکرد.

دواترین سەر شۆڕی ئەوە بوو ئاگریشیان کاری لێ نەکرد لەگەڵ ئەوەدا هەر بیریان نەکردەوەو تەمێ خوار نەبوون. زنجیرەی یەکەم لێرەدا کۆتایی هات، ئەوا باسی زنجیرەی دووەم دەست پێ ئەکا.

ئیبراهیم دوای ئەوە خوا بەو جۆرە سەری خست، ڕزگاری کرد لەو سزا گەورەیە کە گەلەکەی بۆیان فەراهەم هێنابوو، ئەوانی سەرشۆڕکرد بەو جۆرەی کە باس کرا، کەواتە ئیتر ئەم هیچ ئیشێکی نەما لەگەڵ باوك‌و گەلەکەی، لەبەرئەوە پشتی تێکردن بە تەواوی، بە هەموو جۆر خۆی ڕووت کرد بۆ خوای گەورە لەبەرئەوە بڕیاری دا کۆچ بکات. بەڵام لە پێشەوە کۆچێکی دەروونی کرد، بەم شێوە باوك‌و کەس‌و کارو نەتەوەو شوێن‌و نیشتمان‌و هەر شتێ پەیوەندی ببێ بە خاك‌و وڵات‌و دانیشتوانیەوە لە دڵی دەرکرد، دوای ئەم کۆچی دەروونیە ئینجا کۆچی لەشی کرد وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ وتی: ئەوا من واز لە هەموو شتێك ئەهێنم، ئەڕۆم بۆلای پەروەردگارم، واتە بۆ ئەو شوێنەی فەرمانی پێبدات بۆی، یان بۆ شوێنێ کە لەوێدا خۆم ڕووت بکەم لە هەموو شتێك جگە لە بەندایەتی خواو پەرستنی ئیتر شتی ترم نەبێ، پەروەردگارم ڕێنموونیم ئەکات بۆ ئەو مەبەستەی خۆم، بەگوێرەی ئەدەبی پێغەمبەران ـ سەلامیان لێ بێت ـ ئەبوایە بیفەرموایە: چاوەڕوانی ئەکەم، یان ئومێدم وایە ڕێنموونیم بکات بۆ مەبەستی خۆم، بەڵام لەبەرئەمەی باوەڕی بە یارمەتی‌و پشتیوانی خوا زۆر بەهێز بوو، چونکە هەروایشی دیبوو لە هەموو کاتێکدا یارمەتی خوای لەگەڵ دا بوو، لەبەرئەوە بە شێوەی پشت پڕی‌و دڵنیایی فەرموی ڕێنموونیم ئەکات‌و ئەمگەیەنێ بە مەبەستی خۆم. کەواتە فەرمودەکەی جێگای هیچ ڕەخنەیەك نیە، ئینجا دوای ئەوە ڕۆیشت‌و گەیشتە ئەو وڵاتەی خوا بڕیاری دابوو ـ ئەویش شام دەرچوو ـ بە تاك‌و تەنیا بێناسراوو خزم‌و خوێش، تا ئەو کاتە هیچ منداڵ‌و ڕۆڵەی نەبوو، هاوڕێیەتی پیاوچاکان‌و صالحان خۆشە بە تایبەتی ئەو صالحەیش ڕۆڵە بێت، چونکە ئەو کاتە لایەنی خواپەرستی بەهێز ئەکات، لەبەرئەوە نزای کردە لای خواو فەرموی: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ ئەی پەروەردگارم ڕۆڵەیەکی صالحم پێببەخشە، خوایش نزای ئەم بەندەیەی ـ کە خۆی ڕووت کردبوو لە هەموو شتێ بۆ خوا ـ وەرگرت.

بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ﴾ ئینجا ئێمەش دوای نزاکەی مژدەمان دایە بە کوڕێکی خۆگری بە ئارامی لەسەرخۆ. ئەم کوڕە هەندێ لە زانایان ئەفەرمون (ئیسحاق) بووە، بەڵام ئەوەی زۆربەی کۆڕی لەسەرە ئەمەیە کە (ئیسماعیل) بووەو ئەمەیش ڕێك ترە لەگەڵ پەڕاوەکانی سیرەت دا. لەگەڵ شێوەی باسکردنی ئەم سورەتەدا.

بەکورتی بەڵگە زۆرە بۆ ئەمە کە (ئیسماعیل)ە، بەڵام بۆ مەبەستی ئێمە لێرەدا زیاد لەمەی وترا درێژە پێدان پێویست نیە. کاتێ بیربکەینەوە لە ئیبراهیم کە خوا مژدەی وای بداتێ: مژدە بە ڕۆڵەیە خوا سەنای بکات بە سیفەت و ڕەوشتێکی زۆر گەورە کە یەکێکە لە سیفەتەکانی خۆی، ئەم مژدە گەورەیش لەکاتێکدا لە غەریبی دا بێت و برابێ ـ بە تەنیاـ لە هەموو کەس و کارو ماڵ و شوێن و نیشتمان. کاتێ ئاوا بیربکەینەوە ئەگەین لە ڕادەی ئەو خۆشی و شادمانیەی کە ڕووی کردە ئەو دڵەی کە دوور کەوتبووەوە لە هەموو هۆی خۆشی دنیا و ئەم جیهانە.

ئینجا با بیرێ بکەینەوە لەو تاقی کردنەوە گرنگەی ڕووی کردە ئەم باوك و کوڕە خۆشەویستە. هەڵوێستیان بەرامبەر بەم کارە گرنگە. دەرچوونی هەردووکیان سەد لەسەد لەو تاقی کردنەوەدا، بە جۆرێك وێنەی لە ژیانی ئادەمیدا نە بووەو نە ئەبێ. باش بیربکەینەوە با تێ بگەین کە گوێڕایەڵی و گەردن کەچی بۆ خوا ئەبێ وابێ. کەواتە با باش گوێ بگرین لە قورئان ئەم ڕووداوە بێ وێنەمان بۆ باس بکات.

خوای گەورە وەکو موژدەکەی دا بەدیشی هێنا، کوڕەکەی دایە. ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ﴾ ئینجا کاتێ کوڕەکە گەورە بوو هەتا گەیشتە ئەوە ئیش و کار بکات لەگەڵ باوکی دا، باوکی خەوێکی بینی کە ئەم کوڕە سەر ئەبڕێ، لە خەوەکەی دا وای بۆ دەرکەوت لەسەر فەرمانی خوا سەری ئەبڕێ، هەر ئەوەندەو بەس نەك لە بێداری داو وەحی بۆ هاتبێ. تەنیا بەو خەوە بڕیاری دا لەسەر بەجێهێنانی ئەم کارە گەورە کە بە بیر لێ کردنەوەشی دڵدێتە لەرزەو موچرکە بە لەشدا دێت. ئیتر هیچ لە دڵی دا نەهات ڕەخنەیەك لەم فەرمانە. یان هیچ نەبێت پرسیارێ بکات، ئایا ئەم تاکە ڕۆڵەت داومێ لەم غەریبیەدا بێ کەس و بێ دەر، لەم کاتەدا کە کاتی پیری و دوا دوایی ژیانە؟ بەڵکو بێ دڵ ئازاری بڕیاری فەرمانبەرداریدا،

قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾

زۆر لەسەر خۆو بە ئارامەوە ڕووی کردە پارچە جگەرەکەی: ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ﴾ وتی کوڕی خۆشەویستم من لە خەودا وام دی کە سەرت ئەبڕم، ئەم کارە ناهەموارە کەس نەدیوە دڵی دانەچڵەکان و بیخاتە پەلەو بیەوێ بە ناچاری زوو خۆی لێ ڕزگار بکات، بەڵکو بە شتێکی عادەتی کە دەقی پێوە گیرابێ، ئاوا بە ئارامەوە ئەم شتە گەورە ئەدا لە ڕووی ئەم ڕۆڵە تاقانە بێ سەر لێ کردنەوە. چونکە فەرمانی خوای لەسەرە. هەموو ئیماندارێکی ڕاستەقینە ــ چ جای ئیبراهیم ــ ئەبێ نارەزایی و دڵگرانی نەبێ بەرامبەر بە فەرمانەکانی خوا، ئەم باوکە گەورە نایەوێ لە ناکاو ئەم کوڕەی بگرێ و ئەوەی پێی سپێرراوە بەجێی بێنێ، بەڵکو ویستی کوڕەکەیشی بزانێ، ئەویش وەکو باوکی فەرمانەکە وەربگرێ، بە گوێڕایەڵی و گەردن کەچی. با ئەویش پاداشتی گوێڕایەڵی دەست بکەوێ، یان ئەویش لەزەت و شیرینی ئیمان و گەردن کەچی بۆ خوا بچەژێ وەکو باوکی. لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ﴾ کەواتە تۆیش بیربکەرەوە تەماشا بکە، ئایا ڕات چۆنە و چی ئەڵێیت؟ ئیبراهیم لە دڵی خۆی دا بڕیاری تەواوی دابوو کە بێ سەر لێ کردنەوە ئەم کوڕەی سەر ببڕێ، بەڵام بڕیارەکەی بە شێوەی پرس و ڕا پێکەیاند بۆ ئەمەی ئەگەر بە گوێرەی سروشتی ئادەمی ناخۆشی و بێزاریەك لە دڵی دا بێت نەمێنێ. چونکە بەم جۆرە وەکو خستبێتیە دەستی کوڕەکە: خۆی ئارەزووی چۆن بێت وابکات.

بەڵام ئەم کوڕە خۆشەویستە لەسەر ڕەوشتی باوکی بووە گەیشتە ئەو پلەی کەلە پێشەوە باوکی گەیشتبوویە لەبەرئەوە بە ئارامەوە ﴿قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ﴾ وتی: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەو فەرمانەی پێت سپێرراوە بەجێی بێنە.

ئەم هەواڵە سامناکە کەس نەدیوەی وەرگرت بە ڕەزامەندیەوە بێ‌هیچ بێزاریە، هیچ دڵی نەگۆڕی لە ئاستی باوکی خۆشەویستی هەروەکو جاران ئەدەب و خۆشەویستی لەگەڵ دا

بەكار هێنا وەكو وشەی ﴿يَٰٓأَبَتِ﴾ دەری ئەخات كە بەكار ئەهێنرێ لە كاتی ئەدەبو خۆشەویستیدا بە گوێرەی باوی زمانی عەرەب، وەكو باوكی هیچ سەری لێ نەكردەوەو پرسیاریشی نەكرد كە بۆچی سەرم ئەبڕی؟ یان نەیوت ئەمە خەوە بە چی ئەزانی لە لایەن خواوەیە؟ بەڵكو بە سروشتی پاكی تێگەیشت كە ڕاستە فەرمانی خوایە، چونكە ئەیزانی باوكی پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەرانیش لە لایەن خواوە پارێزراون لە شتی پڕوپووچو ناڕاست، كەواتە با خەو بێ هەر فەرمانی خوایە، بەرامبەر بە فەرمانی خوا نابێ خود گیری بكرێو سەری لێ بكرێتەوە لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾ ئەوەی پێت پسێرراوەو فەرمانت پێكراوە بەجێی بێنە.

ئینجالەم كاتەدا كە گیانی خۆی خستە ژێر دەستیو دای بە خوای گەورە، لەم كاتەیشدا ئەدەبی بەرامبەر بە خوا لە هۆش بوو، هەڵگرتنی ئەم بارە گرانەی نەكرد بە هونەری خۆی، بەڵكو گێڕانەوە بۆ لوتفو یارمەتی خوا فەرموی: ﴿سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ باوكی خوشەویست ئەوەی پێت سپێرراوە بەجێی بێنە. ئەگەر خوا مەیلی ببێو كۆمەكی بكات منیش یەكێك ئەبم لەو بەندەیانەی كە لە كاتی بەڵاو ناڕەحەتی دا خۆگرنو بێزاریان نابێ لەوەی لای خواوە دێت، بەو جۆرەش من ئەبینیو دەستت ئەكەوێ.

ئینجا دوای ئەم وتووێژە نۆبەی بەجێ هێنانە ئەوەیشمان بۆ باس ئەكاتو ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ﴾ ئینجا كاتێ ئیبراهیمو ئیسماعیل بە ئارامو ڕەزامەندیەوە خۆیان مل كەچ كرد بۆ فەرمانی خوا، ئیبراهیمو ئیسماعیل بەسەر زەوی دا خست تا تەوێڵی دای لە زەوی. هەندێ ئەڵێن بە ڕوودا خستی لەسەر داوای ئیسماعیل نەوەك باوكی دەمو چاوی ببینێ ڕەحمو سۆز بەرگری بكات لە بەجێ هێنانی فەرمان خوا. بەڵێ بەڕاستی ئەم باوكو كوڕە ـ سەلامیان لێ بێت ـ گەورەیی ئیمانیان ڕوون كردەوە. بە كردەوە خەڵكیان تێگەیاند لە ڕادەی ڕاستی لەگەڵ خوادا، دەرسی گوێڕایەڵیو ئیسلامەتی ڕاستەقینەیان دادا، ئەم كردەوەی ئەمانە هیچ كردەوەیەكی تر هاوتای ناكات.

وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾

---

ئەمە وەكو كردەوەی فیدایی نیە. ئەم باوكە بە ئارامو ڕەزامەندیەوە بێ سەر لێ كردنەوە، بەڵكو بە خۆشیەوە ئەیەوێ فەرمانی پەروەردگاری بەجێ بێنێ، ئاوا كوڕی خست، كوڕیش بێ جوڵەو بە ئارامەوە ڕاكشاوە، هیچ نەما جگە لە خوێن ڕژانو كوشتنی، خوایش ئەوەی ناوێ، خوا ئەو ڕاستیو خۆ بەخت كردنەی ئەوێ كە ئەم دووانە پێكیان هێنا لە ڕادەو پلەی هەرە بەرزی دا، كەواتە ئەوەی خوا ئەویست ئەمان بە ڕێكی پێكیان هێنا. لەبەرئەوە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ﴾ ئەوان ئەوەیان كرد كە كردیان، ئێمەش بانگمان كردە ئیبراهیم: ئەی ئیبراهیم بەڕاستی خەوەكەت بەجێهێنا، بەڕاستت گێڕا، ئیتر پێویست بە هیچی تر نیە. وەڵامی وشەی ﴿لما﴾ لێرەدا بڕیار ئەدرێ، واتە كاتێ ئیبراهیمو ئیسماعیل بە ڕێكی ملیان كەچ كرد بۆ خواو گوێڕایەڵ بوون، ئێمەش بانگمان كردە ئیبراهیم كە خەوەكەت بەدی هێناو بەڕاستت گێڕا، ئیتر زیاد لە مەی كردووتە مەیكەو پێویست نیە. كاتێ ئەو بانگەوازە هات هۆشیو شادی پەیدابوو، سوپاسی خوایان كرلەسەر ئەوەی كە یارمەتی دان لەم تاقی كردنەوەداو دەرچوون بەڕێكیو بەڵاكەیشی لەسەر لابردنو پاداشتیشیان ئەداتەوە. ئەم وەڵام نەوترا لەبەر گرنگ كردنو نرخ پێدان پێی، واتە لە ڕادەیەكدایە لە باس نایەتو باس كردن پیای دا ناگات. بەڵێ بەڕاستی هێنایەجێ. چونكە هەموو هێز، بێ دڵە چركەو ویستی سەری ببڕێ، هیچ كامیان نەیان ئەزانی كە خوا بەرگریان ئەكات، بەڵام خوا چونكە بەندەی خۆی ئەناسێو ئەزانێ ئەگەر بەرگریان نەكات ئەوان هیچ جۆرە سەرپێچیەك ناكەن لە تەواوكردنی ئیشەكەدا، لەبەرئەوە لوتفی كرد نەیهێشت، چونكە شتەكە پێویست نیە بیكەن وەكو لە هەموو پلەیەكدا لوتفی كرد لەگەڵیان، وەكو ئەم بەڵا گەورەی دا بەسەریاندا دڵی بەهێزكردنو بەرزی كردنەوە تا گەیشتنە ئەو ڕادەیە كە مێژووی هەموو ئادەمی شتی وای نەدیوە، كردنی بە شایانی پاداشت وەرگرتن لە هەردوو دنیادا، هەركەسێ تریش كرەوەی پاكو خاوێنی هەبێو بەگوێرەی فەرمانی خوا بجوڵێتەوە خوا پاداشتی ئەداتەوە وەكو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بێگومان بەو وێنەیە پاداشتی ئەو كەسانە ئەدەینەوە كە كردەوەیان باشەو بە گوێرەی ڕەزامەندی خوایە. ئاوا لە كاتی

تەنگانـەدا فریـای ئەکـەوین‌و دەرووی لێ ئەکەینـەوە. ئـەم ڕسـتـەیە هەنـدێ ئـەڵێن: ئەمـەش بەشێکە لەو فەرمودەی خوا کە لەگەڵ ئیبراهیم دا کردی، کاتێ بانگی کرد.

ڕایەکی تر ئەمەیە: کە سەربەخۆیەو باسی هۆی دەروو لێ کردنـەوە ئەکات. گـەورەترین‌و خۆشترین ئافەرینی خوا بۆ ئەم باوك‌و کوڕە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ﴾[1] بێ‌گومان بەڕاستی ئەم بەسەرهاتی ئیبراهیم‌و ئیسماعیلە هەر ئەمە بوو تاقی کردنەوەیەکی ئاشکرا کـە پیـاوی ڕاسـتی ڕاستـەقینەی پێ‌جیـا بێتـەوە، بەمـە ڕوون ئەبێتـەوە، ئـەوەی بـە تەواوی خۆی ڕووت کردبێ بۆ خواو خۆی داڕنیبێ لـە پەیوەنـدی بە هـەموو شتێکی تـرەوە، یان هەر ئەمە بوو بەسەرهاتی زۆر گران‌و بەڵای زۆر گەورە کە لەناو هەموو بەڵاو بەسـەرهاتی گـەورەدا دیاری بێت. دوای ئـەوە خـوای گـەورە بەرگری سـەربڕینی ئیسماعیلی کرد، ڕێزی تری گرتن بەمەی کە قوربانیەکی بۆ فەراهەم هێنا بە مالآتێ، ئیتر بەرانێکی مـاڵی بووبێ یان گـا کێویـەك، هەرچی بووە، هەرچۆن فەراهـەمی هێنـاو خستیە ژێر چنگیان ئـەوە نرخێکی زیادە نادا، کەواتە پێویست نیە لەسەر ئەوە بڕۆین.

ئەفەرموێ: ﴿وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴾ قوربانی ئیسماعیلیان کرد بە مـالآتی ئـەو سـەری ببڕێ، مالآتێکی گەورە، بە قەڵەوی لەش، یان بە قەدرو قیمەت لای خوا، چونکە خوا کردوویـەتی بە فیداکارو قوربانی پێغەمبەرێکی کوڕی پێغەمبەر - سەلامیان لەسەر بێت - پێغەمبـەرێکی وا گـەورە کـە گـەورەی هـەموو پێغەمبـەران لـە نـەوەی ئـەو پەیـدا بـوو، چـونکە پێغەمبـەرمان محمد(ﷺ) لە نەوەی ئیسماعیلە.

ئەو قوربانیە تەنیا بەوە کۆتایی نەهات بەڵکو خوای گەورە لە پاداشتی ئەواندا کردی ڕەوشت، هەروەها هات، ئەوەتا وەکو ئەبینرێ ئەو یادە پیرۆزە هەموو ساڵی تازە ئەکرێتەوە، لەو چوار ڕۆژەی جەژنی قورباندا، لـە هـەموو وڵاتێکـەوە ئەو هـەموو قوربانیـە ئەکرێ، فەقیرو هەژار، هەروەها سامانداریش ئەحەوێتەوە لەو میوانداریەی خوای گەورە، فەرمانی پێداوە، بە جۆرێ قەدەغەی کردووە ڕۆژوو گرتن لەو چوار ڕۆژەی جەژندا، ئەبێ دەم بەتاڵ بێ بۆ ئەو میوانداریە.

---

[1] بەچوارجۆردڵنیای کردەوەلەسەری: أ- وشەی ﴿إِنَّ﴾. ب- پیتی﴿ل﴾ لەوشەی﴿لَهُوَ﴾دا. ج- ڕاناوی جیاکـەرەوەی ﴿ضمير فصل﴾. د- دەست پێ‌کردن بە ناو ﴿الجملة الأسمية﴾. ئەمانە هەمووی گرنگ کردن بە وشەی ﴿ٱلْمُبِينُ﴾.

ئەم یادە گەورە تازە بکرێتەوە با گرۆی موسڵمان لە دڵیاندا تازە بێتەوە ئەو دەرسە گرنگەی ئیبراهیم دای دا بۆ پاش خۆی: دەرسی ڕاستی لەگەڵ خواو ملکەچی بۆی، فیداکاری لە ڕێگای ڕەزامەندی ئەودا، باش تێبگەن کە خوای گەورە نایەوێ ئازارو سزای ئەوانە بدات کە ڕاستن لەگەڵیدا، بەڵکو ئەیەوێ بەو جۆرە بەلاّیانە پاڵفتەیان بکات و هیچ چڵك و چەپەڵی و لەکەیان نەمێنێ، تا ببن بە شایانی پلەی بەرزی خواناسی و یادی خوا.

ئیبراهیم وەکو نوح –سەلامیان لێ بێت– خوا زیادە ڕێزێکی پێداون تەنها بەم دوانەی داوە لەبەرئەوە کە خۆی ئەیزانێ: ناوبانگ و سومعەیەکی لەناو هەموو میللەت و گەلەکانی پاش خۆیان لەبەرئەوە دەربارەی ئەمیش ئەفەرموێ: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾ هێشتوومانەتەوە بۆ ئیبراهیم ناوبانگی باش و باس کردنی بەچاکە لەناو گەلەکانی پاش خۆی. ئەوەتا ئەبینین لەناو موسڵمان و گاورو جولەکەدا، هەروەها ئایینەکانی تریش هەموو ڕێزوقەدری ئیبراهیم یان لایە، لەناوبەندەکانی خواداناوارێزی هەیە،خوای گەورەیش لە قورئانی هەتاهەتایی خۆیدا ئەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ﴾ سەلام لەلایەن خواوە بڕژێ بەسەر ئیبراهیم دا. لێرەش هەروەکو لەباسی (نوح) دا وترا لەم دوو شوێنەدا دوو جۆر هەڵئەگرێ و ئەگونجێ:

١- وەکو بەو جۆرە مانامان وت مفعولی ﴿وَتَرَكْنَا﴾ نەوترابێ و بریتی بێت لە ناوبانگ و ڕێزو سومعە.

٢- ئەم ڕستە ﴿سَلَامٌ﴾ مفعول بێت لەسەر ئەم بارە مەبەست ئەوەیە هێشتوومانەتەوە سەلام کردن لە ئیبراهیم لەلایەن گەلەکانی پاش خۆیەوە.

هەردوو بارەکە ئەگونجێ. ئینجا دووبارە ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەگونجێ مەبەستی بە هەردوو، لێرەو پێشووەکە هەر یەك بێ، ئەیشگونجێ مەبەست بەم دووەمە هەر ناوبانگی باش و سەلام بێت، واتە هەروەکو پاداشتی ئیبراهیممان داوە بە ناوبانگی باش پاش خۆی، بە سەلام لێ کردن لەلایەن خواوە یان لەلایەن بەندەکانی خواوە، هەروەها ئەو کەسانەی کردەوەیان شیرین و جوانە، بەگوێرەی فەرمان و ڕەزامەندی ئێمەیە پاداشتیان ئەدەینەوە بە باس کردنیان بە چاکەو بەناوبانگی شیرین و خۆشەویستی لەلایەن خەڵکەوە، بە ڕەحم و بەزەیی لە لایەن ئێمەوە.

إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ

**به هەردوو جۆر هۆی ئەم ڕێزو پاداشتە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ هۆی ئەم هەموو نیعمەتو ڕێزو پلە بەرز کردنەوەی ئیبراهیم ئەوەیە کە یەکێکە لە بەندە ئیماندارە تایبەتیەکانی ئێمە.**

**ئینجا زیاتر لوتفی خۆی پیشان ئەدا دەربارەی ئیبراهیم ئەفەرموێ: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ مژدەمان بە ئیبراهیم دا بەمەی کوڕێکی ئەدەینێ کە ناو ئەنرێ (ئیسحاق) بڕیارمان داوە کە ببێ بە پێغەمبەر، یەکێ ئەبێ لە بەندە صالحەکان.**

**ڕەحمو بەزەیی خوای گەورە هەموو کات بەسەر حەزرەتی ئیبراهیمەوە بووە، کاتێ کە زۆر پیر بووە، یەکەم خێزانی کە سارەی ناو بوو ئەویش پیر ببوبوو، هەرگیز مناڵی نەبووبوو بەهۆی ئەوەوە نائومێد بوو لە منداڵ لەوکاتەدا خوای گەورە ئەم کوڕەیشی پێ‌بەخشی، وەکو لە چەند شوێنی تردا باسی ئەفەرموێ.**

**ئەم موژدە گەورەیدا بە ئیبراهیم کە کوڕەکەی پێغەمبەر ئەبێو یەکێك ئەبێ لە بەندە صالحەکانی خوا. لوتفەکەی تەنها بەوەوە نەوەستاوە بەڵکو ئەفەرموێ: ﴿ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ﴾ پیتو بەرەکەتی خۆمان ڕشت بەسەر ئیبراهیمو ئیسحاقدا لە ڕۆڵەو نەوەکانی دا، ئوەتا لە ئیسحاق ئەو هەموو پێغەمبەرانەی نەوەی ئیسرائیل پەیدا بوون.**

**لە نەوەی ئیبراهیم وەك ئیسحاقو نەوەکانی بوون، ئیسماعیلیش بوو، لە نەوەی ئیسماعیل گەورەترین ئادەمی پەیدا بوو کە محمد بوو (ﷺ). پیتو بەرەکەتەکە بە جۆرێ بوو هەرچی پێغەمبەرانی پاش ئیبراهیم هەبوو ڕۆڵەو نەوەی ئەون ــ سەلامی خوای گەورە بڕژێ بەسەر هەموویاندا ــ.**

وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴿١١٣﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴿١١٤﴾
وَنَجَّيْنَـٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرْنَـٰهُمْ فَكَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيْنَـٰهُمَا
ٱلْكِتَـٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيْنَـٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١١٨﴾

---

بەڵام وەنەبێ هەموو نەوەکان لەسەر ڕێگەی ڕاست ڕۆیشتن وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ﴾ لە نەوەی هەردووکیاندا پیاو چاك هەیەو پیاو خراپی بێ ئایینی ئاشکرایش هەیە. واتە نەوەکانیان دوو جۆر بوون هەندێکیان پەیڕەوی خۆیانیان نەکرد. لەمەوە ڕوون ئەبێتەوە کە چاکیو خراپی بە میراتی وەرناگیرێ، هەرچۆنێ خراپی ڕۆڵە ناچێ بۆ باوکی کە هیچ دەسەڵاتی نەبێ لە خراپەکەیدا، هەروەها چاکی باوكو نەژادو تیرە پاکی سوودی نیە بۆ ئەو ڕۆڵەو نەوەی لە سەر ئیمانو باوەڕی چاکان نەبن وەکو پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (من بطأ به عمله لم یسرع به نسبه) هەرکەس سستی بکات لە ئیشی چاکە، وەچەپی (نسب) پێشی ناخات، هیچ سوودی پێناگەیەنێ.

هەندێ لە نەوە چاکەکانی ئیبراهیمو ئیسحاقو موساو هاورنە. وا بە کورتی باسیان ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ﴾ بێگومان نیعمەتی خۆمان ڕشت بەسەر موساو هاروندا بەمەی کە هەردووکمان کردن بە پێغەمبەر. منەتمان نان بەسەردا بەو نیعمەتە گەورەیە کە هەموو خێرو پیتو بەرەکەتێکی تێدایە. ﴿وَنَجَّيْنَـٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ﴾ خۆیانو گەلەکەیمان ڕزگار کرد لەو تەنگانە هەرە گەورە کە زاڵبوونی فیرعەون بوو بەسەریاندا، یان تەنگانەی خنکاندن بەو دەریای کە فیرعەونو کۆمەڵەکەی پێ خنکاندن.

﴿وَنَصَرْنَـٰهُمْ﴾ یارمەتیمان دان. ﴿فَكَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَـٰلِبِينَ﴾ کەواتە ئەمان سەرکەوتن بەسەر فیرعەونو گەلەکەی دا، خوای گەورە فیرعەونو گەلەکەی لەناو بردو ئەوانی شاد کرد بەو جێو شوێنەی بۆی بریار دابوون. ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُمَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ * وَهَدَيْنَـٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ پەڕاوی زۆر ڕوونو ئاشکرامان پێدان کە بریتیە لە تەورات، هەردووکیانمان خستە سەر ڕێگەی ڕاست کە ڕێگەی خوایە، هەرکەس بکەوێتە سەری ئەیگەیەنێ بە هەموو کۆگایەکی خێرو بەرەکەت.

وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ قَالَ
لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ
ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿١٢٨﴾

---

﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ * سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ * إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ * إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ **مەبەست بەم وشەو وتانە لە باسی نوح‌و ئیبراهیم دا وترا، کەواتە پێویست نیە بە ڕاڤەو ڕوون کردنەوەیان. باسی موساو هارون بە درێژیی بڵاو بووەتەوە لە گەڵێ سورەتەکانی قورئان دا لە هەر سورەتێکدا بە گوێرەی جێگەو شوێنەکە بە ئەندازەی پێویست لە بەسەرهات‌و سەرگوزەشتەیان باس کراوە. چونکە زۆر ڕووداوو بەسەرهاتی گرنگ بووە لە ژیانی خۆیان‌و گەلەکەیان‌و فیرعەونی زۆرداری بەدبەخت‌و گەلەکەی، لەو ڕووداوانەو بەسەرهاتانە پەندو ئامۆژگاری گرنگیان لێ وەرگیراوە، بەڵام لەم سورەتەدا هەر ئەم ئەندازە پەیوەندی بە مەبەستەکەوە هەیە، چونکە وەکو لە پێشەوە وترا مەبەست لەم چەند سەرگوزەشتەیە باسی یارمەتی دانی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەران‌و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، پاشەڕۆژی سەرکەوتن بۆ ئەوان‌و تۆڵە سەندن‌و پاشەڕۆژی بەدبەختی‌و بێ بەشی بۆ ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوەو بەربەرەکانێیان نەکرد. لەبەرئەوە ئاوا بە کورتی باسەکەیانی دوایی پێ‌هێنا وەکو ئەم سێ بەسەرهاتەی تر کە دێت، ئەفەرموێ:** ﴿وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ **بێگومان بەڕاستی إلیاس یەکێ بوو لەوانەی کە ڕەوانە کراون بە پێغەمبەرێتی.**

**دەربارەی ئەم پێغەمبەرە کە کێ بووە؟ لە کوێ بووەو؟ لە نەوەی کێیە؟ چەند ڕا هەیە. ئەو ڕایەی کە جێی بڕوا بێ ئەمەیە: کە لە نەوەی (هارون)ە، ڕەوانە کراوە بۆ سەر نەتەوەیە لە سوریە کە بتێکیان ئەپەرست ناوی ﴿بعل﴾ بوو، لەو شارەی کە ئێستا پێی ئەڵێن:**

(بعلبك)، تا ئێستاش چەند نیشانەو دروشمێك لەو شارەدا هەیە وا پیشان ئەدات ئەو بت پەرستیە لەو شوێنەدا بووە، ﴿إِلْيَاسَ﴾ وكو ئیبراهیمو ئەو پێغەمبەرانەی نەتەوەكانیان بت پەرست بوون، بانگی نەتەوەكەی كرد بۆ بەندایەتی خواو پەرستنی بە تەنیا، بێزاری دەربڕین دەربارەی پەرستنی بتەكەیان كە ناونرابوو ﴿بعل﴾. لە پاش دا ئیمانیان نەهێنا جگە لە چەند بەندەیەك لە بەندە پاكو خاوێنەكانی خوا.

وەكو ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ رەوانە كرا ئەو كاتەی بە نەتەوەكەی وت: ئایا ئێوە ناترسن لە عەزابو سزای خوا؟ واتە بترسن. ﴿أَتَدْعُونَ بَعْلًا﴾ ئایا ئێوە داواو هاوار ئەكەن لە ﴿بعل﴾ بە تەمای ئەوەن خێرو چاكەتان لێوە دەست كەوێو بتان پارێزێ لە سزاو ناخۆشی، ئەو ئەپەرستن؟ واتە شتی وا نەكەن زۆر بێ جێو ناڕەوایە، ئێوە شتی وا بێ نرخ ئەپەرستن. ﴿أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ * ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ واز ئەهێنن لە پەرستنی كەسێ كە لە هەموو بڕیاردەرێ چاكترو شیرنترە، واتە كەسێ كە هەموو كردەوەو كاروباری ڕێكو پێكەو هیچ كەمو كوڕیو ناتەواوی نیە، لە ڕادەیەكدا دەست نادات بۆ زیادو كەم. ئەوەیش ئەو كەسەیە كە ناوی ﴿الله﴾یە پەروەردگاری ئێوەشو هەموو باوكو باپیرە پێشووەكانتانە. بەم شێوە ڕوونو ئاسانە ئامۆژگاری كردن كە هەموو عەقڵێ وەری ئەگرێ. بەڵام ئەوانە نەفام بوون، دڵیان نەدایە ئامۆژگاریەكەی وەكو هەموو هاوڕێ نەزانە نەفامەكانی هەموو چەرخەكانی پێشو پاشیان. لەسەر باوەڕە ناڕەوا بێ جێكەی خۆیان مانەوەو باوەڕیان بە پێغەمبەرەكەیان نەكرد، خۆیان خستە ژێر باری سزاو عەزابی خوا جگە لە چەند كەسێكیان كەلە كۆمەڵی بەندە پاكو خاوێن كراوەكانی خوا بوون وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ * إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ دوای ئەو هەموو ئامۆژگاریو ڕێگە پیشان دانە گەلەكەی باوەڕیان پێ نەهێنا، وتیان تۆ درۆ ئەكەیت.

وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ
عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِي
ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْآخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ
﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾

---

**ئینجا خوای گەورە هەڕەشەی لێ کردن بەمە کە بێگومان ئەو بێباوەڕانە ئامادە ئەکرێن و ڕائەکێشرێن بۆ ناو عەزاب و سزای خوا، ئەو کەلە باوەڕیان نەهێنا جگە لەو ئەندازە بەندە تایبەتە خاوێن کراوانەی خوا، ئینجا دوایی باسەکە ئەهێنێ وەکو باسی پێشووەکانی ئەم سورەتە بەم فەرمودانە:** ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْآخِرِينَ * سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ * إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ * إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ **وشەی** ﴿إِلْ يَاسِينَ﴾ **چەند ڕوویەکی بۆ باس کراوە، ئەوەی زیاتر دڵ بۆی ئەڕوا ئەمەیە ئەم دوو وشە مەبەست پێیان هەر یەکەو ئەم ناوە بە هەردوو جۆر هاتووە:** ﴿إِلْيَاسَ﴾، ﴿إِلْ يَاسِينَ﴾ **لەو زمانەدا کە ئەم ناوەی پێ هاتووە.**

**هەڵبژاردنی ئەم شێوەیان لەم شوێنەدا لەبەرئەوەیە ڕێک بێت لەگەڵ دوا دوایی ئایەتەکانی تر، کە پێی ئەوترێ (فاصلە). ئینجا زۆر بە کورتی هەندێ لە سەرگوزەشتەی (لوط) باس ئەکا. لە شوێنێکی تردا بە پێی پێویست و جێگا کە درێژ تر لە سەرگوزەشتەی باسکراوە. کەواتە لێرەدا کورتەیەکی لێ باس ئەکا بە وێنەی سەرگوزەشتەی نوح کەلە شوێنی تردا بە درێژیی باسی فەرمووەو لێرەدا بە کورتی بەسەری دا تێ ئەپەڕێ.**

**پێغەمبەرێتی (لوط) نیشان ئەدات لەگەڵ ڕزگاریی خۆیی و ماڵ و منداڵەکەی جگە لە ژنەکەی کە لەگەڵ بێبڕواکان دا بەرباد کران، ئەفەرموێ:** ﴿وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ **بێگومان (لوط) یەکێکە لەوانەی بە پێغەمبەری ڕەوانە کراون.** ﴿إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ * إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ * ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْآخَرِينَ﴾ **ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە (لوط)و ماڵ و منداڵەکەیمان هەموو ڕزگار کرد لە دەست ئەو کەلە بێباوەڕە بەد کردارو بەد خووە، لە عەزاب و سزایە کە لە لایەن خواوە هاتە سەر ئەو نەتەوە، (لوط) خۆی و هەموو خاوخێزانیمان ڕزگار کرد تەنیا**

پیرەژنی نەبێ - کە ژنی (لوط) بووە - باوەڕی پێنەهێنا کە ئەویش یەکێ بوو لە کۆمەڵی بەرباد کراوان.

ئینجائەدالەدڵی نەتەوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە بە بەیانی و ئێوارەو شەوو ڕۆژ ڕائەبوردن بە لای جێ و شوێنەوارەکەیاندا، کەواتە با فام بگرن و تەمێ خوار ببن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ۝١٣٧ وَبِالَّيْلِ﴾ ئێوە ئەی کۆمەڵی قورەیش ڕائەبوون بە لای شوێنەکەیاندا لە بەیانی و ئێوارەدا. ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ کەواتە عەقڵ ناگرن؟ واتە عەقڵ بگرن و تەمێ خوار ببن بەوانەی کە خوای گەورە پێش ئێوە بەربادی کردن لە تۆڵەی ئەوەی باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکەیان، واتە ئێوەش باوەڕتان ببێ و بترسن لە پاشەڕۆژێکی وەها خراپ و سامناك.

ئینجا سەرگوزەشتەکانی ئەم سورەتە دوایی پێ ئەهێنێ بە کورتەیەك لە دەنگ و باسی یونس ئەم سەرگوزەشتەیەش لە چەند شوێنێکی تردا باس کراوە بە کورتی وبە درێژتر، لەم سورەتەشدا بە گوێرەی شوێنەکە ئەوەی پەیوەندی پێوە هەبێ وتراوە. ئەوەی کە زۆرتر جێگای باوەڕە لەم بەسەرهاتەدا ئەمەیە: ئەم پێغەمبەرە بێزارو دڵ تەنگ بوو بەبێ باوەڕیی نەتەوەکەی، ئینجا ترساندنی بە عەزابێکی نزیك و لە لایان هەڵهات و بە جێی هێشتن بە داخ و رقەوە، تا گەیشتە قەراغی بەحرێك کە لەو دەورەدا بوو، سواری کەشتیەکی پڕ لە بارو زەلام بوو، بایەکی بەهێز هەڵی کرد، شەپۆلێکی سامناك پەیدا بوو، ئەوە لای ئەو کۆمەڵە نیشانەی ئەوە بوو کە کەسێکی ڕاکردوو تاوانێکی کردووەو ئەبێ لە کەشتیەکەدا نەمێنێ و بخرێتە ناو دەریاکەوە تا کەشتیەکە چی تیایە ڕزگار ببن، بۆ ئەو مەبەستە قورعەیان خست و بەرحەزرەتی یونس کەوت، هەرچەند بە پیاو چاك ناسرابوو بەڵام قورعەکە بە شێوەیەك هات، کە دڵنیا بوون کە ئەو پیاوە ئەوە، ئینجا خستیانە ناو ئەوەکە، نەهەنگێ هەڵی لوشی.

ئینجا خوای میهرەبان ڕزگاری کرد بە هۆی زۆری یادو سەنای خوا کە ئەیکرد لە سکی ماسیەکەدا. نەتەوەکەی تێگەیشتبوون، کە نیشانەی عەزابەکە ڕووی تێکردن باوەڕیان هێنا لەو ماوەدا کە یونس بەجێی هێشتن.

ئینجا هاتەوە بۆ ناویان و ئیمانیان تازە کردەوە، خوای گەورە ژیاندنی تا کاتی تەواو بوونی ماوەیان. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومان یونس یەکێکە لەوانەی ڕەوانە کراون بە پێغەمبەری،

إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾
فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ۞ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ
سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾
فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾

**ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿إِذْ أَبَقَ[1] إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ﴾ باسی ئەوکاتەبکەو بیرلەوە بکەرەوە کەهەڵهات بەداخ و ڕقەوە لە دەست نەتەوەکەی کە باوەڕیان پێنەهێنا، ڕۆیشت تا چووە ناو کەشتیەکی پڕ. ﴿فَسَاهَمَ﴾ لە پاش دا بەشداری ئەو کۆمەڵەی کرد لە قورعە خستندا ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ﴾ ئینجا بوو بە یەکێ لەوانەی لە قورعە خستندا سەرنەکەوتن، واتە سەرنەکەوت قورعەی بۆ دەرچوو کە بخرێتە دەریاکەوەو خرایە ناو دەریاکەو ﴿فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ ئینجا نەهەنگێك هەڵی لووشی.**

**لەکاتێکدا کە شایانی گلەیی و سەرزەنشت بوو، چونکە وازی هێنا لەو کارە گرنگە کە خوا پێی سپارد بەمەی کە نەتەوەکەی بەجێ هێشت بە ڕقەوە بێ ئەمەی خوا فەرمانی پێبدات. هەرچەند ڕق هەڵسانی لەبەر خوا بوو، بەڵام ئەو کردەوە بێئارامی و خۆنەگرتنی تێدایە، ئەویش شایانی پلەی بەرزی پێغەمبەران نیە ـ سەلامیان لێ بێت ـ دوای ئەوە نەهەنگەکە هەڵی لووشی، لە سکی نەهەنگەکەدا هەستی بە دڵ تەنگی و ناڕەحەتی کرد، زانی ئەو کردەوەیە ناڕەوابوو کردی، لەبەرئەوە دەستی کرد بە نزاو هاوار لای خوا وەکو لە سورەتی ﴿الأنبياء﴾دا ئەفەرموێ: ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[2] خوای گەورە نزاکەی وەرگرت و نەهەنگەکە دەمی کردەوە بە فەرمانی خوا خستیە کەناری ئاوەکەوە وەکو لەمەو دوا باسی**

---

[1] وشەی ﴿أَبَقَ﴾ هەڵهاتن و ڕاکردنی بەندەیە لە گەورەو خاوەنەکەی لێرەدا بەکار هاتووە بۆ یونس کەلە دەست نەتەوەکەی هەڵهات، بەڵام ئەبوایە چاوەڕوانی فەرمانی خوای بکردایە، کە نەیکرد ئەم وشەی بۆ بەکار هێنرا.

[2] واتە یونس هاواری لێ کردین لەناو ئەو هەموو تاریکیەدا بەمەی کە هیچ خوایەك نیە جگە لە تۆ، بێگەردی تۆ لە هەموو لەکەیەك خوایە. بێگومان من یەکێك بووم لەوانەی کە تاوانیارن و تاوانیان لە خۆیان کردووە.

ئەفـــەرموێ: ﴿فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ * لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ ئەگـــەر یـــونس زیکـــرو تەسبیحی خوای نەکردایە بێگومـان ئەمایەوە لـە سـکی ئـەو نەهەنگـەدا تـا ڕۆژی دوایـی، بەزیندوویی یان بە مردوویی، بەڵام یونس دەستی کرد بە زیکرو تەسبیح و یادی خواو نزاو پاڕانەوە. ﴿فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ﴾ بەهۆی ئەوەوە فڕێمان دایە زەیەکی بێ دارو درەخت، واتە خاڵی لـە شـتێ کـە ڕووی داپۆشـیبێ. ﴿وَهُوَ سَقِيمٌ﴾ لەکاتێکـدا کـە ناسـاغ و نـەخۆش بـوو لـەو بەسەرهاتە، لەشی ناسك بـوو بوو، لەوانە بوو بەرگەی مێش و مەگەز نەگرێ، خوای گەورە چارەسـەری ئەوەیـشی بـۆ کـرد وەکـو ئەفـەرموێ: ﴿وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ﴾ بەسـەریەوە ڕواندمان درەختێك لـە کولەکە، بە گەڵا پانەکانی سێبەر بکات بۆی و بەرگریشی بکات لە مێش و مەگەز، وەکو ئەڵێن مێش و مەگەز نزیکی ئەو دارە ناکەوێتەوە.

ئینجا دوای ئەوە حەسایەوە و تەندروستی هاتەوە سەر خۆی، بە فەرمانی خوا نێررایەوە نـاو نەتەوەکـەی خـۆی وەکـو ئەفـەرموێ: ﴿وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾ ڕەوانـەمان کـرد بۆلای سەد هەزار کەس بەڵکو زیاتر، واتە ژمارەیان لە ڕادەیەکدا بوو ئەگەر کەسێ لێیان ورد ببوایەتەوە لە سـەد هـەزار کەسـی کـەمتر دانەئەنان. ﴿فَـَٔامَنُوا۟﴾ ئـەوانیش لـە پـێش گەڕانـەوەی لـەو ماوەیـەدا ئیمانیـان هێنـابوو وەکـو باسـکرا، یـان مەبەسـتی ئەوەیـە دووبـارە ئیمانیـان هێنایەوە لـە پـێش چاوی ئـەویش. ﴿فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ بەهۆی ئیمانەکـەیان عـەزابمان لەسـەر لابردن و ژیانمانن تا ماوەیەك کە کاتی دوایی هاتنی ژیانیان بوو.

ئینجـا دوای گێڕانـەوەی ئـەم سەرگوزەشـتانە ڕوون کردنـەوەی پەیوەنـدی ڕاسـتەقینەی نێوان خواو بەندەکانی، تۆڵە سەندنی خوا لەوانەی کە باوەڕیان بەم شتە ڕێکە نەبوو. دوای ئەمانە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بکۆڵێتەوە لەگەڵ بـێ باوەڕەکانی نەتەوەکـەی لـەو بیروباوەڕە پڕووپووچەی کە باو بوو لە ناویاندا، لەسەرەتای ئەم سورەتەوە باسمان کرد. کە بریتی بوو لـەوەی مەلائیکە کچی خوایە، خوا ژنی خواستووە لـە تیرەی شـەیتان ـــ هـەموو پاکی و بێگەردیە بۆ خوای تاك و تەنیاـــ هـەروەها بیداتـەوە بە ناوچاویاندا کە پێش ڕەوانە کردنی پێغەمبـەر (ﷺ) ئاواتیـان بـوو کـە خـوا پێغەمبـەرێکیان بۆ بنێرێ و ئـەوان ئامادەن بۆ شوێن کەوتنی، کەواتە بۆچی ئێستا کە هاتووە باوەڕی پێناهێنن؟!!!

فَٱسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ
شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى
ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾

---

**ئاوا بەم شێوەیە ئامۆژگاری پێغەمبەر (ﷺ) ئەکات کە لەگەڵ ئەو بێبڕوانە بدوێ‌و بە جۆرێ ئامۆژگاریان بکات لە ڕادەی تێگەیشتنی خۆیاندا بێت بۆئەوەی بەریان لێ ببڕێتەوەو تەك‌و جمیان نەمێنێ بۆ ئەو بیروباوەڕە پڕوپووچەی کە دژی هەموو بیرو ژیرییەکە. ئەوان هەر ڕۆڵەی نێرینەیان ئەویست، زۆر دژی مێینە بوون، پەیدا بوونی زۆر بە عەیب‌و سەرشۆڕیان دائەنا، لایان وابوو مێینە پلەی زۆر پەست ترە لە نێرینە، لەبەرئەوە ئەو کەسەی کچی ببوایە وای ئەزانی هەتك بووەو نەگبەتی سەر شانی گرتووە.**

**ئەوانە کە لەم بارەوە فامیان گەیشتبووە ئەو ڕادەیە شتێ ــ کە بۆ خۆیان ڕەوایان نەئەبینی‌و بە عارێکی گەورەیان سەیر ئەکرد ــ دایان ئەنا بۆ خوا!! ئەیان وت: مەلائیکە کچی خوایە. خولیش بە گوێرەی تێگەیشتنەکەی خۆیان بەریان لێ ئەبڕێتەوەو ئەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَفْتِهِمْ﴾ پرسیار بکە لە خۆیان: ﴿أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ﴾ ئایا بۆ پەروەردگارت کچ ڕەوا ئەدەن کە بە لایانەوە عارۆ سەرشۆڕیە، بۆ خۆیان کوڕ ڕەوا ئەدەن کە هۆی سەربەرزیە بە لایانەوە؟ یان فامیان وایەو وا تێگەیشتوون ئەوەی سەرشۆڕی تیایە خوا بۆ خۆی داناوەو هۆی سەربەرزی بە بەندەکان داوە؟**

**پرسیاریان لێ بکە لەم باوەڕە لارو چەوتە: لەو لاوە باوەڕیان واە کە خوا ئاسمان‌و زەوی‌و ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە، ئەو ئەیانژیەنێ‌و ڕۆزییان ئەدات، لەم لایشەوە شان‌و پلەی خۆیانیان بەرز کردووەتەوە بەسەر خوای گەورەدا، جگە لەمەی کە ڕەوادانی ڕۆڵە بۆ خوا ئەوپەڕی پلەی نەفامیە، چونکە دژی خوایەتیە، لەبەرئەوە خاوەن ڕۆڵە ئەبێ هاوسەری ببێ، ئەبێ دەست بدات بۆ مردن‌و نەمان، لەبەرئەوە قورئان لە چەند شوێنێکدا بە توندی بێزاری ئەم باوەڕە پووچەیان دەرئەبڕێ وەکو ئەفەرموێ:** ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا * لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا * تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا * أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ

وَلَدًا﴾[1] هەروەها بە کوێرەی تێگەیشتنی خۆیان مەلائیکەیان بێنرخ کردووە کە بە مێینەیان ئەزانن و نیشانیان ئەدەن، نەفامیەکی تریان ئەمەیە: لە خۆیانەوە دەم ئەکوتن لە شتێ کە بێئاگان لێی.

لەبەرئەوە ئەفەرموێ بە بێزاریەوە بە شێوەی لاقرتی: ﴿ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِنَـٰثًا وَهُمْ شَـٰهِدُونَ ﴾ پرسیاریان لێ بکە ئایا بە دیاریەوە بوون، چاویان لێ بووە کە مەلائیکەمان بە مێینە دروست کردووە، واتە ئەوە شتێ نیە بە ژیریی ڕووت بزانرێ، بە چاویش نەیان دیوە، ئیتر لە کوێوەو لە چیەوە ئەوەیان زانی؟ کەواتە لە خۆیانەوە دەم ئەکوتن. ئەوەیش نیشانەی زۆر نەفامیانە، لەبەرئەوە بە شێوەی لاقرتی پێکردن پرسیارەکەیان ڕوو تێئەکرێ، وەکو ڕستەی ﴿ وَهُمْ شَـٰهِدُونَ ﴾ نیشانی ئەدات.

ئینجا جاڕی دەست هەڵبەستی و درۆزنیان لێ ئەدات لە قسەو باوەڕە پڕوپووچەکانیاندا، ئەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ * وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴾ ئەمانە لە درۆو دەلەسەو هەڵبەستی خۆیانەوە ئەڵێن: خوا ڕۆڵەی داهێناوە، بێگومان ئەمانە درۆ ئەکەن، (خوا پاک و بێگەردە لەوەی ئەوان ئەیڵێن) تەنانەت بۆ هەڵبژاردنی مێینە هەر بە کوێرەی بیروباوەڕی خۆیان و تێگەیشتنی خۆیان بە درۆزن دەرئەچن. وەکو ئەفەرموێ بە شێوەی پرسیارێك کە لێرەدا بۆ بێزاری و سەسام کردن ئەکرێ: ﴿ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴾ ئایا ئێوە ئەڵێن کچانی هەڵبژاردووە بۆ خۆی بەسەر کوڕاندا.

﴿مَا لَكُمْ﴾ ئایا ئێوە چیتانەو چیتان لێ قەوماوە ئاوا سەرتان لێ تێك چووە؟ ﴿ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ ئایا ئێوە چۆن بڕیاری وا ئەدەن؟ بێ هیچ بەڵگەو نیشانەیەك. ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ کەواتە ئایا بیر ناکەنەوە لەم شتە پڕوپووچانە کە لەگەڵ فام و تێگەیشتنی خۆیشتان ڕێك ناکەوێ، واتە هۆشێ بێننەوە بەسەر خۆتانداو بیر بکەنەوە. ئەمەی ئەوان وتویانە شتێ نیە بە ژیریی ڕووت بزانرێ و بە چاویش نەیان دیوە، کەواتە هیچ نەماوەتەوە بۆ گونجاندنی بڕیارەکەیان جگەلەبەڵگەیەکی ڕوونی ئاسمانی کە هاتبێتە خوارەوە لەسەر ئەوە کە مەلائیکە کچی خوان.

[1] وتویانەو ئەیڵێن: کە خوا ڕۆڵەی بۆ خۆی بڕیارداوە، ئینجا ڕووی فەرمودەیان تێئەکات و ئەفەرموێ: شتێکی زۆر خراپی گەورەتان داهێناوە، لەوانەیە هەموو ئاسمانەکان پارچە پارچە ببن بەهۆی ئەوەوە، زەوی شەق ببێ و هەموو کێوەکان بکەون بە ڕوودا بەکوتە کوتەیی، لەبەرئەوەی ڕەوایان داوە بۆ خوا کە ڕۆڵەی هەبێ. سورەتی ﴿مريم﴾.

أَمۡ لَكُمۡ سُلۡطَٰنٞ مُّبِينٞ ﴿١٥٦﴾ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبٗاۚ وَلَقَدۡ عَلِمَتِ ٱلۡجِنَّةُ إِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾

---

زانینی ئەم شتە لەم سێ ڕێگەیە ئەبێ، دوانە پێشووەکە وترا کە نیە، ماوەتەوە سێیەم، ئەوا بۆ ئەمیش بەرهەڵستیان ئەوەستێ کە ئەگەر هەیە بیهێنن. تەماشاکەن قورئان چونکە ڕێك و ڕاستە، بێباك و بێترس پیشانی هەموو ئەدرێ بە هەموو قسەو باس و بڕیارەکانیەوە، ئەوانیش ئەگەر ڕاست ئەکەن بەڵگەی وایان هەیە بیهێنن وەکو ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَكُمۡ سُلۡطَٰنٞ مُّبِينٞ * فَأۡتُواْ بِكِتَٰبِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ ئایا بەڵگەو نیشانەیەکی ئاسمانیتان هەیە: پەڕاوێکی وەکو قورئان لەسەر باوەڕەکەتان، دەی ئەگەر ڕاست ئەکەن و ئەو بەڵگەتان هەیە بیهێنن؟ ئا بەو جۆرە قورئان چوار دەوری باوەڕە چەوتەکەی گرتن و کون و قوژبنێکی بۆ نەهێشتنەوە کە خۆیان تێدا بشارنەوە، ڕوونی کردەوە پڕوپووچی ئەو باوەڕە.

ئینجا نۆبەی باوەڕە پووچەکەی ترە کە باسمان کرد و بریتیە لە خزمایەتی و ژن خوازی خوا لەگەڵ تیرەی شەتیاندا، ئەوا ئەویش ئەهێنێ و بەدرۆی ئەخاتەوە، بێجگە لەوەی بە درۆ ئەکەوێتەوە هەر بەو بەڵگەیانەی کە باوەڕەکەی تری لە ڕیشە دەرهێنان، ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبٗاۚ﴾ بڕیاری خزمایەتی وهۆزو بەرەییان داوە لەنێوان تیرەی جنۆکەو شەیتاندا، لەبەرئەوە باوەڕە پیسەی کە بوویان و باسکرا. ﴿وَلَقَدۡ عَلِمَتِ ٱلۡجِنَّةُ إِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ﴾ بێگومان تیرەی جنۆکەو شەتیان ئەزانن کە خۆیان لە دروست کراوەکانی خوان، لە ڕۆژی دوایی دا ئامادەی عەزاب و سزای خوا ئەکرێن. کەواتە ئەو پەیوەندیە کە وترا ڕاست نەبوو، ئەگینا بەو شێوە ڕەفتاریان لەگەڵ نەئەکرا بەڵکو ڕێز ئەگیران. ئەو وتەو باوەڕی ئەوان درۆیەو خوا شیاوی

ئەوە نیە. ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ خوا پاكو بێگەردە لەو بیروباوەڕو قسەو باسانەی كە ئەو نەفامو نەزانانە دەربارەی خوا ئەیكەن. بەكورتی خوا بێگەردە لە ڕۆڵەو هاوتیرەیی.

تیرەی جنۆكەدووبەشن: موسڵمانوكافر، وەكولە سورەتی ﴿الجن﴾دا ئەفەرموێ بە زمانی جنۆكەوە: ﴿وَأَنَّا مِنَّا ٱلۡمُسۡلِمُونَ وَمِنَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ﴾[1] كەواتە لەم تیرەیە بەس كافرەكانیان ئامادەی عەزاب ئەكرێن. لەبەرئەوە موسڵمانەكان بەدەر ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ هەموو تیرەی جنۆكە كە شەیتانیشیان بەرئەكەوێ ئامادەی عەزاب ئەكرێن جگە لە بەندە تایبەتیەخاوێن كراوەكانی خوا، ئینجالەزمانی مەلائیكەوەئەم قسانەڕووئەكاتەبت پەرستەكان و ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ * مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ * إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ﴾ بێگومان ئێوەو بتەكانیشتان ناتوانن كەس لە خوا هەڵگێڕنەوەو لە پەرستنی خوا لای بدەنو ڕێی لێ ون بكەن، جگە لەوانەی كە خوا زانیویەتی هەرگیز ڕێی ڕاست ناگرن، بەهۆی ئەوەوە بڕواتەوە لای خوا كە ئەوانە جێگەیان ئاگرەو داخ ئەكرێن بە ئاگر ـ خوا پەنامان بدات ـ واتە خەڵكی دووجۆرن، ئەوانەی كەوالەسەر سروشتێكی پاكن ئەوانە ئێوە ناتوانن هەڵیانگێڕنەوە لە خوا.

جۆرەكەی تر لە سروشتی ئادەمی لایان داوەو ئامادەن بۆ لادان تەنیا ئەوانە بە گوێتان ئەكەنو بەس، بەسەر ئەواندا زاڵن، ئینجا ئەدەن لەو باوەڕە كۆنو چەوتە كە باسكرا بەمەی كەخۆیان بەباشی دائەنێن، بەمەی كە هەر یەكێكیان پلەو ڕادەیەكی تایبەتیان هەیە لە ناسین و پەرستنی خوادا، لە فەرمان بەرداریدا، لەو پلەو ڕادەی خۆیانە تێناپەڕن. كەواتە تەنیا خوایەو ئەوان بەندەن وەكو هەموو بەندەكانی تر. ئەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ * وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ * وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ﴾ هەریەكە لە ئێمە پلەو شوێنێكی تایبەتی هەیە، دیاریی كراوە لەوە تێناپەڕێ، ئێمە خۆمان ڕێز ئەدەین لەنوێژو خواپەرستی دا، ئامادەینو گوێڕایەڵین بۆ جێبەجێكردنی هەر فەرمانێ پێمان سپێررابێت، ئێمە زیكرو تەسبیحی خوا ئەكەین.

---

[1] واتە ئێمە كۆمەڵی موسڵمانمان هەیەو كۆمەڵی بێ بڕوەڕانیش، چەند ڕایەكی تریش هەیە ئەویش ئەگونجێ: أ- مەبەست لە وشەی ﴿هم﴾ كافرەكانە یان هەموو ئادەمیو وشەی ﴿إِلَّا﴾ بۆ (استثناء منقطع) بێت. ب- ئەگەر (استثناء متصل) بێت. لێ دەركراو وشەی ﴿و﴾ ضمیر لە ﴿يَصِفُونَ﴾دا مەبەست هەموو جنۆكەو مەلائیكەو ئادەمیە.

وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾

ئینجا ئەگەڕێنەوە بۆ سەر بت پەرستەکان کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، ئەیداتەوە بە ناوچاویاندا ئەو پەیمان و بەڵێنەی کە لەکاتی خۆی دا پێش ڕەوانە کردنی پێغەمبەر (ﷺ) دایان، ئاواتیان ئەخواست کە پێغەمبەرێکیان بۆ بێت و بەکەونە شوێنی. کەوابوو بۆچی پەیمان و بەڵێنی خۆیان نابەنە سەر. ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ * لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ * لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ بێگومان ئەوانە ئەیانوت: هەر بەمەرجێ پەراوێکی ئامۆژگاری کەرمان بۆ بهاتایە بە وێنەی ئەو پەراوەی کە هاتە خوارەوە لە ئاسمانەوە بۆ سەر میللەت و پێشووەکان، بێگومان شوێنی ئەو پەراوە ئەکەوین و ئەبووین بە بەندە پاک و خاوێنەکانی خواو دژی نەئەجولاینەوە.

ئەمانە ئەمە بڕیاریان بوو تا پەراوێکیان بۆ هات کە گەورەترین پەڕاوی خوایە بۆ سەر زەوی، کاتێ هات ئەمانە پێچەوانەی پەیمان و بەڵێنەکەیان جولانەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ﴾ کەچی دوای هاتنی باوەڕیان پێنەهێناو کافر بوون پێی، لەبەرئەوە هەڕەشەیان لێ ئەکاو ئەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لەمەو پاش ئەزانن پاشەڕۆژی ئەم بێبڕوایی و کافریەیان چۆن ئەبێ.

دوای ئەوە بەبۆنەی ئەم هەڕەشەوە لەوان و بەڵێن شکاندنیان، خوای گەورە بەڵێنی تەواو ئەدات بە هەموو پێغەمبەران و بەڵێن ئەدات بە یارمەتی دان و زاڵکردن و سەرخستنی لەشکری خۆی: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ سوێند بە خوا پێش کەوتووە لە لایەن ئێمەوە بڕیارمان بۆ بەندە ڕەوانە کراوەکانمان و بڕیارەکەیشمان ئەمەیە: ﴿إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ * وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ بێگومان و بە هەموو دڵنیاییەوە تەنیا ئەو بەندەیانەی ئێمە یارمەتی دراون لە لایەن ئێمەوە، تەنیا لەشکری ئێمە زاڵ و سەرکەوتوون. دیارە بەڵێنی خوا ڕاست و ڕێکە و

هەرکەس گومانی تێدا ببێ ـ خوا نەخواستە ـ کافر ئەبێ، بەڵام بۆ ئەمەی ئەزان دڵنیا ببێ ئەختێ ڕوونی ئەکەینەوە، بەدی هاتنی ئەوەی خوا بەڵێنی پێداوە:

١- پێشەواو سەرۆکی لەشکری خوا پێغەمبەرانن- سەلامیان لێ بێت - بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزاد هەر پێغەمبەرێ ڕەوانە کرابێ بۆ سەر هەر گەل و قەومێ. هەرچەند بە دیمەن هۆی سەرکەوتنیان نەبووە، دوژمنیان زۆر بەهێز بووە، بەڵام زۆری پێ چوو بێ یان کەم، پاشە ڕۆژی سەرکەوتن بۆ ئەوان بووەو دوژمنەکانیان بەرباد بوون، یان مل کەچ بۆ فەرمانی خوا.

لە پاش پێغەمبەران هەر لەشکرێ شوێنی ئەوان کەوتبێ، ڕەوشت و ڕێبازی ئەوانی گرتبێ ئەوانیش هەر سەرکەوتوو بوون، هەر شکاندن و شکستەیە ڕووی تێ کردبن لە چەرخی ئەوان یان لەپاش ئەوان، هۆکەی لادانی لەشکرەکە بووە لە ڕێبازی ئەوان، یان ئەو شکانە بووەتە هۆی سەرکەوتنێکی گەورە. چونکە بەو شکان و تەنگاوەیە هەر هەڵەیە بووبێ نەماوەو پاڵفتە بوون، وەکو ئاڵتوونی لە بۆتە دەرهاتبێ، بە جۆرێکیان لێ هاتووە کەشایانی ئەوەبن ببن بە سەربازو لەشکری خوا. چونکە سەربازو لەشکری خوا ئەوانەن کە خۆیان داڕنیبێ لە هەموو شت بۆ خواو مەبەستی تریان نەبێ جگە لە ڕەزامەندی خوای گەورە.

٢- سەرکەوتنی لەشکری خوابەسەرکەوتنی ئەوبیروباوەڕوبەرنامەیەکەلەلایەن خواوە هات.

دەبا تەماشا بکەین لەسەر تا بە خواری ئادەمیزاد، هەر لە بەرەوە بیروباوەڕی کوفرو بت پەرستی بەو هەموو شێوەو جۆر بە جۆریەوە یەك بەیەك ئەهات و ئەڕۆیشت، لەو هەمووە یەکێکیان نەبوو بمێنێتەوەو نەگۆڕێ، جێگیر ببێ لە دڵ و دەروونی مەردومدا، بەڵێ ئەگەر شێوەیە بووبێ، یان هەبێ و مابێتەوە ئەویش لە بنەڕەتەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئایینی خواو لەو سەرچاوەوە هاتووە جگە لەوەیش ئەگەر هەبێ بە شێوەیەکی گشتی لە جیهاندا نیە، بەڵکو تەنیا لە چەند لاو چمکێکی زەوی دا شتی وا هەیە، بەڵام بیروباوەڕو بەرنامەی خوا هاتوو جێگیر بوو بڵاوەی کرد. بە تایبەتی دواترین شێوەی کە هاتە سەر زەوی بۆ سەر گەورەترینی ئادەمی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) ئەوەتە ئەبینرێ بڵاوەی کرد لە هەموو وڵاتاندا، ڕووی کردە هەموو لایەك، تابێت پەرە ئەسێنێ و ڕاستی و بە نرخی ئەم ڕوون ئەبێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا لە هاتنیەوە تا ئێستا بە هەموو توانا لە لایەن هەموو هێزی کوفرو شەڕەوە لە ناوخۆو لە دەرەوەدا بەرگری ئەکرێ و پیلانی بۆ فەراهەم ئەهێنرێ، بە تایبەتی لە دوای ڕووخاندنی خەلافەتی ئیسلامی کە ئیتر بە دیمەنیش لەشکرو یارمەتی دەرێکی بەهێزو بە توانای نەما.

فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿١٧٤﴾ وَأَبۡصِرۡهُمۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمۡ
فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿١٧٨﴾ وَأَبۡصِرۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ
رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾

---

بەڵام هەرچی بیروباوەڕو فەلسەفەکانی تر هەیە تا بێت چەوتی و بێ کەڵکیان ڕوون ئەبێتەوە، خاوەنەکانی بەرە بەرە چنگی تێئەخەن و تەتەڵەی ئەکەن و بژارەی ئەکەن کەچی هیچ سوودی نیەو هەر بەکار نایەت. لەبەرئەوە هەر لەو شوێنانەی لێی هەڵقوڵاوە بەو هەموو یارمەتی دانەوە تابێت ئەتوێتەوەو لە دڵدا نامێنێ.

لەم بابەتەوە لەمەوپاش بە درێژ ترو باشتر ئەدوێن، بە یارمەتی خوای گەورە. تەنیا خوای گەورە ڕاست ئەفەرموێ، ئەبێ بەڵێنی خوا بێتە جێ. ئینجا پاش جاڕدانی ئەم بەڵێنە بەهێزە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە گوێنەدا بەو بێبڕوانەو پشتیان لێ هەڵبکاو وازیان لێ بێنێ بۆ کاتی هاتنە جێی بەڵێنی خوا. چاوەڕوانی بکات، ئەفەرموێ: ﴿فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ * وَأَبۡصِرۡهُمۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ﴾ کەواتە گوێیان مەدەرێ و پشتیان لێ هەڵکە تا ماوەیەك، بیان بینە بەو سزایەوە کە تووشیان دێت لەو کاتەدا، مەبەست ئەوەیە کە ئەمە شتێکی ڕاستەو دێتە دی بەم زووانە، چاوەڕوان بە ئینجا ئەوانیش ئەبینن کە ئێمە یارمەتی تۆ ئەدەین و پاداشتمان چۆنە لە ڕۆژی دوایی دا؟ واتە ئەبینن بەڵێنی خوا چۆن ئەبێت بۆ تۆ، بۆ ئەوانیش هەڕەشەی خوا چۆن بەدی دێت؟

ئەو بێبڕوانە کە ئەم هەڕەشەیان ئەبیست گاڵتەیان لێ ئەهات ئەیان وت: کەی ئەمە ئەبێ؟ خوایش ئەفەرموێ: ﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ * فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمۡ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلۡمُنذَرِينَ﴾ ئایا ئەوانە پەلە پەل ئەبنەوە بە سزای ئێمەوە وا نیشان ئەدەن کە ئەیانەوێ زوو بێتە دی چونکە بەڕاستی

نازانن و گاڵتەیان لێ دێ. دەی کاتێ عەزابی ئێمە هاتە سەریان، ئای هاوار بۆ ئەو مردن و ماڵ ویرانی ئەوانە!! کاتێ عەزابمان وەکو لەشکری دابەزیو خستی بەدەورو بەری ئەوانەدا ئای چ ڕۆژێکی تەنگ و خراپیان بەسەر دێنێ؟ ئای چ گران و سەختە ڕۆژو بەسەرهاتی ئەوانەی کە ترسێنراون و گوێیان نەبێ لەو ترساندنە؟!

﴿ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ * وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴾ بەڵێن و هەڕەشەکە دووبارە ئەکاتەوە، بەلام بە جۆریکی بەهێزتر وەکو وەرئەگیرێ لەلابردنی وشەی ﴿هم﴾ چونکە وا نیشان ئەدات بە گوێرەی ڕێزمانی عیلمی بەلاغە خۆشی بۆ پاکان و چاکان و تەنگی بۆ ناپاکان و خراپان ئەگاتە ڕادەیەك کە باسی ناکرێ، باس پیای دا ناگات، ئەو خۆشی و ناخۆشیە ئەوەندە فراوانە کە چاو بکرێتەوە جگە لەوە هیچ نابینرێ.

ئینجاسورەتەکە دوایی ئەهێنێ بەو وتەیە زۆر ڕێك و پێکە لەگەڵ مەبەستەکانی سورەتەکەدا، موناسەبەتی لە ڕادەیەکدایە وەکو کورتەیەك وایە بۆ ئەو مەبەستانە، ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿ سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ * وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ * وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ پاك و بێگەردی و بێ لەکەیی بۆ پەروەردگاری تۆ لەوەی کە بێبڕوان ئەیڵێن دەرباری خوا کە خاوەنی سەرکەوتن و توانا و تۆڵە سەندنە. سەلام لە لایەن خواوە بۆ سەر هەموو پێغەمبەران، هەموو سوپاس و ستایشی بۆ خوا کە پەروەردگاری هەموو عالەمە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾

## سورەتی ﴿ص﴾
## مەككەییەو ٨٨ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە لە سێ شت ئەدوێ کە بنەڕەتێکی زۆر گرنگن بۆ تەواوی ئەو بیروباوەڕو بەرنامەیەی کە قورئان هێنای، بێ هەر یەکێ لەو سیانە هیچ شتێك بوون نرخی نیە:

١- تاك‌و تەنیایی خوا.

٢- پێغەمبەرێتی محمد (ﷺ).

٣- لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی.

بەپێی پەیوەندی بەم سێ مەبەستەوە باسی هەندێ لە پێغەمبەران لەم سورەتەدا دێت‌و ناو بەناو مژدەو هەڕەشە ئەهێنێ‌و تەمێ‌ی پێغەمبەر (ﷺ) ئەدا لە گەیاندنی فەرمانەكەی داو لەگەڵ ئەمانەیشدا بەرباد بوونی سەكەشان‌و یارمەتی دانی خوا بۆ بەندە گوێڕایەڵەكانی ئەخاتە پێش چاو، بەو شێوە جوانە خۆ ئاساییەی قورئان. کە بێگومان هەركەسێ‌و هەر دڵێ زیندوو بێت بە تەواوی سوودی لێ وەرئەگرێ، وەكو لەمەودوا بە دوورو درێژیی بە یارمەتی خوای گەورە ئەخرێتە پێش چاو. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ص﴾ بەم تەنها پیتە دەرگای ئەم سورەتە ئەكاتەوە كە یەكێكە لەو چواردە پیتەی كە باسمان كردن لە سەرەتای سورەتی ﴿یس﴾دا، كە ئیتر پێویست نیە لەو بابەتەوە لێرەدا هیچ بڵێین، چونكە ئەوەی لەوێ وترا بەسە بۆ ئێرەو بۆ هەموو ئەو سورەتانەی كە ئەم پیتانە خراوەتە پێشیانەوە. ئینجا سوێند ئەخوا بە قورئان، سوێند لەسەر خوراوەكە باس ناكات‌و دەست ئەكات بەوتەیەكی تر

که بریتیە لە ڕۆچوونە خوارەوەی بت پەرستەکان لەسەرکێشیو جوڵانەوەیان بە پێچەوانەی فەرمانی خواو قورئان، بەوشەی ﴿بل﴾ دەست پێ ئەکات کەلە زمانی عەرەبی دا لەم شوێنانەدا لەسەر سەربەخۆیی ئەو مەبەستە کە لە پاشەوە دێتو پچڕانی لەوتەی پێشەوە، بەڵام ئەم پچڕانە لێرەدا ڕواڵەتیە، چونکە وتەی پێش ﴿بل﴾ سوێند خواردنە بە قورئان، کە ئەوەیش گەورەیی قورئان ئەگەیەنێ، ئەوەی پاشەوەی باسی سەرکەشیە لە قورئان، کەوابوو پەیوەندی تەواو هەیە لە دیوی ناوەوە. ئەم پچڕانە ڕواڵەتیە زیادە بایەخو گرنگی ئەدا بەو مەبەستەی کە لە دواوە دێت، کە بریتیە لەسەرنج ڕاکێشانی مەردوم بۆ ئەو جیاوازیەی کە هەیە لەنێوان قەدرو ڕێزگرتنی خوا بۆ قورئانو سەرکەشیو لوت بەرزیی بت پەرستەکان لە ئاستی قورئان، کەواتە بەم شێوەیەو بەم جۆرە کە قورئان کردوویەتی گەورەیی تاوانەکەیان زۆر ڕوون ئەبێتەوەو سوێند لەسەر خوراوەکەش ئەناسرێ کە بریتیە لە حەقو ڕاستی قورئان، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە. ئیتر هەرچەندە زانایانی تەفسیر بە پێنج تا شەش جۆر باسیان کردووە، هەریەکە بە جۆرێك بڕیاریان داوە، بەڵام زۆربەی ئەبنەوە بە یەكو هەر ئەوە ئەگرێتەوە کە قورئان حەقەو ڕاستەو لای خواوە هاتووە. بە گوێرەی دەستووری (عیلمی بەلاغە) نەوتنی ئەم جۆرە شتانە ڕێکترە، چونکە کە نەوترا دڵی گوێگران ئەڕوا بۆ هەموو شتێك کە بگونجێ بکرێ بە سوێند لەسەر خوراو، ئەو کاتە زیادە گەورەییو گرنگی قورئان نیشان ئەدات[1].

کەواتە ئەوەی نایزانێ با بزانێ کە زۆر بەجێیە کە هەر سوێندەکە ئەخوا بەبێ سوێند لەسەر خوراوەکە بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿صٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِی ٱلذِّكۡرِ﴾ سوێند بە قورئان کە خاوەنی زیکرو یادی خوایە، واتە مەردوم فێری زیکرو یادی خوا ئەکاو ڕووی دڵی ئەکاتە ئامۆژگاری ئەکات بۆ ئەمەی بە گوێرەی ڕەزامەندی خوا ڕەفتار بکات.[2] قورئان هەرچەندە

---

[1] هەندێ لە تەفسیرەکان تاکو تەنیایی خوا ئەکەن بە سوێند لەسەر خوراو، هەندێ تر شتی تر بڕیار ئەدەن کە بە شێوەیەکی گشتی هەمووی ئەگرێتەوە کە بریتیە لەوە: ئەوەی کە بێ باوەڕان باوەڕیان پێی هەیە ڕاست نیە.

[2] دوو ڕاڤەی ترهەیەبۆوشەی ﴿ٱلذِّكۡرِ﴾. ١- شەرەفو ناوبانگی بەرز. ٢- باسکردنی ئەوەی پێویستی ئادەمی پێی هەیە.

شتی تری تێدایه بێجگه له یادی خواو فێرکردنی یادی خوا، وەکو خووڕەوشتی بەرزو سەرگوزەشتەو شتی تر، بەڵام مەبەستی یەکەمو گرنگترینی هەموو یادو زیکری خوایه. بەڵکو ئەتوانین بڵێین هەمووی هەر زیکرو یادە، چونکە هەمووی هی خوایه، کەواتە هەمووی هەر ڕووی دڵ ئەکاتە خوا، قورئان سیفەتی خوایه، وەکو خوا بێ لەکەیە، هەرکەس بە قورئان نەیەتە سەر ڕێگای ڕاست گلەیی لە خۆیەتیو خۆی خراپه. وەکو ئەفەرموێ: ﴿بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ﴾ ئەوانەی کە کافرو بێبڕوان هۆی بێبڕوایەکەیان ئەوەیە خۆیان زۆر بە زل سەیر ئەکەن لەبەرئەوە سەر شۆڕ ناکەن بۆ حەقو غیرەت کەشێکی نەفامانە بەکار ئەهێنن، ئەیانەوێ بە پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەر بجوڵێنەوە، ڕۆچوونە خوارەوەیانو زیادە ڕەویان لەو سیفەتە خراپانەدا[1] بووەتە هۆی باوەڕ نەهێنانیان، نەوەکو بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت یان ڕەخنەیەکیان دۆزیبێتەوە لە قورئان.

ئینجا هەڕەشە ئەکات لەو سەرکەشانە کە خۆیان بە زلو زۆردار ئەزانن و پێچەوانەی قورئان ئەجوڵێنەوە بەمەی ئەیخاتە پێش چاویان بەرباد کردنی وێنەی ئەمان لە میللەتو قەومەکانی ڕابردوو، پێشانی ئەدا کە کاتێ عەزابی خوایان هاتە سەر هەواریان لێ هەڵساو سەرکەشیان نەما، بەڵام هیچ سوودیش نەبوو، چونکە هەلیان لەدەست خۆیان دەرکردبوو، ئەفەرموێ: ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ﴾ زۆرمان بە هیلاك بردو بەربادمان کردن لەوانەی وێنەی ئەمان بوون لە چەرخەکانی ڕابردوودا ئەوانیش وەکو ئەمان سەرکەشیان ئەکردو لوتیان دانەنەواند تا هەزابی خوا ڕووی تێکردن. ﴿فَنَادَوا﴾ ئینجا بە گورجی هاواریان لێ هەڵئەسا، بە پەنا هێنانو تۆبەو داوای لێ بووردن، بەڵام تازە هیچ سوودی نەبوو، چونکە: ﴿وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾ ئەو کاتە کاتی پەنادانو نزاو لاڵەوەرگرتن نیه.

---

ئەم دوو ڕایەش باشو ڕێکە.

[1] وەکو حەرفی ﴿فِي﴾ نیشانی ئەدات لەگەڵ بە دوا هاتنی دوو وشەی ﴿عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ﴾ بە (نکرە) واتە بە نەناسراوی: وا نیشان ئەدات کە ئەو سیفەتانە بوون بە شوێنو جێگایەك کە ئەوانە تێیدا ئەژینو وان لەناوی دا. حاڵەتی (نکرە)یش بەتینیو نامەمواری ئەو سیفەتانە ئەگەیەنێ.

﴿وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ۝٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ
هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ۝٥﴾

خوای گەورە بەم جۆرە هەڕەشەیان لێ ئەکات‌و ئەو شێوە سەختە ئەخاتە پێش چاویان بۆ ئەمەی هەندێ سەر دانەوێنن‌و بگەڕێنەوە لە جووڵانەوەیان بە پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) ئەم هەڕەشەیەی دا بە گوێیاندا، ئینجا بە درێژیی باسی لوت بەرزیان ئەکات دەربارەی خواو پێغەمبەر (ﷺ)و ئەفەرموێ: ﴿وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ﴾ سەریان سوڕ ئەما لەمەی ترسێنەرێ لە تیرەی خۆیان‌و وێنەی خۆیان بۆ هاتبێ. واتە ئەمانیش وەکو هەموو نەفام‌و نەزانەکانی هەموو میللەتەکانی ڕابردوو سەریان سوڕ ئەمێنێ لەمەی کە پێغەمبەر لە گرۆی ئادەمی بێت‌و بە تێگەیشتنی ئەمان‌و ئەوان ئەبێ پێغەمبەر لە تیرەی مەلائیکە بێت، چونکە تێنەگەیشتوون لەوەی کە پێغەمبەرێتی چیە، مەبەست لە ڕەوانە کردنی پێغەمبەراندا چیە؟ ئەگەر لەو دوو شتە بگەیشتنیایە ئەیانزانی بە هەموو دڵنیاییەوە کە پێغەمبەران ئەبێ لە گرۆی ئادەمی بن، وا نەبی ناگونجێ‌و فەرمانەکەی ناڕوا.[1]

پێغەمبەرێتی بریتیە لە فروستادەیی لە لایەن خواوە بۆ سەر بەندەکانی خواو هێنانی بەرنامەو ڕژێمی لە لایەن خواوە بۆئەوەی بەندەکانی خوا بە گوێرەی ئەو بەرنامەو ڕژێمی خوا ژیان بەرنە سەر. پێغەمبەران ئەو فروستادانەن، ئەو کەسانەن کە ئەو بەرنامەو ڕژێمی ژیانە ئەگەیەنن بە مەردوم، ئەبێ ئەو پێغەمبەرانە یەکەم کەس بن بۆ گوێڕایەڵی‌و بەجێ‌هێنانی ئەوەی کە خوای گەورە بەهۆی ئەوانەوە ناردوویەتی بۆ بەندەیانی بە جۆرێك ژیانیان ببێت بە چاولێکەری بۆ باوەڕدارەکان‌و ئەوان بتوانن پەیڕەوی پێشەواکانیان بکەن. کەواتە ئەم کارە گرنگە ناڕواو ئەو مامۆستاییە ناکرێ بە یەکێ نەبێ کە پەیوەندی تەواوی هەبێت بە بەندەکانی خواوە لە هەموو سروشتی ژیان‌و هاوبەشیان بێت: هەست بکات بەهۆی خۆشی‌و ناخۆشیان لە وزەو هێزو تواناداا ئەوەندە ڕادەی بەرز نەبێت کە باوەڕدار توانای

---

[1] تیرەی جن کراون بە تابیعی ئادەمی‌و پەیڕەوی پێغەمبەرانی ئادەمی بکەن‌و نەکراون بە سەربەخۆ ئەگەر نا ئەوانیش پێغەمبەریان لە تیرەی خۆیان ئەبوو.

پەیڕەوی ئەوی ئەبێ لە یەکتر بکەن‌و سۆزو خۆشەویستی لە نێوانیاندا هەبێت، نەك تاراندن‌و سڵەمینەوە، بێگومان ئەمەی کەوترا زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە کە بۆ پێك هێنانی ئەو فروستادەییە، ئەو سەرسامسە کە بێبڕوان بوویانە، زۆر بێ جێیەو جێگای سەرسوڕمانە لە لایەن هەموو تێگەیشتوویەکەوە، بەڵام نەفامێتی‌و تێنەگەیشتن وایە سەر ئەشێوێنێ‌و شتی ڕووناك لە پێش چاو تاریك ئەکات‌و نزیك زۆر دوور ئەخاتەوە.

بەهۆی ئەو نەفامی‌و تێنەگەیشتنەوە لە لایەن زۆربەی ئەو بێبڕوانەوە بەو هۆی سەرکەشیی‌و لوت بەرزیی‌و غیرەت کەشیی ئەوانەی کە ئەیانزانی لەبەرئەوە دوو هۆیە بە هەموو لایەك ئەیان ویست بە هەموو هێزو هەموو جۆر بەرگریی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە(ﷺ) بکەن، بە هەر فڕو فێڵ‌و پڕوپاگەندەیە بووە خەڵکی لێ دوور بخەنەوە، یەکێ لەو پڕو پاگەندانە ئەمە بوو کە ئەیان وت: ئەمە جادووبازە پێی ئەخەڵەتێن، درۆ ئەکات، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ﴾ کافرەکان‌و تیان‌و ئەڵێن دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە سیحربازێکی زۆر درۆزنە، ئەمانە ناچار بوون ئەم فێڵە بەکار بێنن، چونکە بە هیچ جۆرێ بەرگریی خۆی‌و یارانی نەئەکرا، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لە زیادیی بوون‌و پەرەیان ئەسەند، هەرکەس ئەکەوتە سەر ئەو ڕێگایە بە هیچ جۆرێك لای نەئەداو ئامادە بوو بۆ فیداکاری بە هەموو شتێك، ئینجا ئەمانیش ئەیان وت: ئەمە سیحربازەو سیحریان لێ ئەکات، خۆ گەورەو سەرۆکەکان ئەیانزانی کە پێغەمبەر ڕاستەو ئەوەی هێناویەتی لە توانای ئادەمیزاددا نیە، بەس ئەوە چەکێك بوو بەکاریان ئەهێنا بۆئەوەی ژێر دەستەکات هەر بەندەی ئەڵقە لە گوێی خۆیان بن‌و با ئەو سەرۆکیە ناڕەواییەیان بەو هەموو عەنعەنەو کەشخەییەوە هەر بەردەوام بێت‌و بمێنێتەوە، چونکە باش ئەیانزانی ئەم ئایین‌و باوەڕەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی ئەگەر سەر بگرێ ماوەی زوڵم‌و ناڕەوایی نادات.

بۆ بەڵگە ئەم ڕووداوە ئەگێڕێنەوە کەلە سەرچاوەی باوەڕ پێکراودا هەیە: (ئیبن‌و ئیسحاق) ئەفەرموێ: کۆمەڵێ لە پیاوانی قورەیش لای وەلیدی کوڕی موغەیرە بوون کەلە پیاو ماقووڵانی قورەیش بوو، ڕیش سپی بوو، کاتەکە کاتی حەج بوو وتی پێیان: کاتی حەج کردنەو لە هەموو لایەکەوە نوێنەری عەرەبەکان دێن‌و دەنگ‌و باسی محمد بڵاوبووتەوە پرسیارتان لێ ئەکەن بڕیار بدەن کە هەموو یەك قسە بن با هەندێ هەندێ تر نەخەنەوە

بەدرۆوە، ئەوانیش وتیان: دەی تۆ شتێ بڵێ با هەموو ئەو بڵێین، ئەویش وتی: نەخێر ئێوە بڵێن من گوێ ئەگرم، ئەوانیش وتیان با هەموو بڵێین: (کاهین)ە، واتە ئەوەی کە ئەڵێ لە جنۆکەوە هەواڵم بۆ دێت و غەیب ئەزانم، وەلیدیش لە قسەی کاهین ناچێت، وتیان دەبا بڵێین شێتە، ئەویش وتی: هەموو شێت ئەناسێن، شێت قرخە قرخی پێ ئەکەوێ و کەف ئەچەرێنی، ئەم کەی وایە؟! وتیان دەبا بڵێین شاعیرە. وتی ئەمیش نیە! ئێمە هەموو جۆرو بەشەکانی شیعر ئەناسین هیچی لەشیعر ناکات، وتیان باڵێین جادووبازە. وتی جادووبازیش نیە! ئێمە جادوبازیشمان دیوە، کەی وەکو ئەوان شت گرێ ئەداو فوو ئەکات بە شتدا، وتی بە خوا ئەمەی کە محمد ئەیڵێت شیرینەو تام و مەزەی هەیەو قسەکانی ـ واتە قورئان ـ چەند ڕێکەو شیوو دۆڵی لێ ئەبێتەوە، چەند پەل و پۆی لێ ئەبێتەوە، لە هەموو پەل و پۆکانیدا بەرو میوەی لێ ئەچنرێ، ئێوە هەر یەکێ لەم شتانە بڵێن خەڵکی ئەزانێ درۆو دەلەسەیە، بەڵێ نزکترین شت بۆ خەڵەتاندنی خەڵك ئەمەیە بڵێن: سیحربازە، ئەوەتا وتارێکی هێناوە کوڕ لە باوك ئەکا، برا لە برا، ژن لە مێرد، کەس و کار لە یەکتر، لەسەر ئەو بڕیارە لە لای هەڵسان، سەرە ڕێگایان ئەگرت لە وەفدەکان هەرکەسێکیان ئەبینی پێیان ئەوت: دەخیلە وریای خۆت بە، ئەو پیاوەی کە داوای پێغەمبەرایەتی ئەکات، نەتخەڵەتێنێ، ئەوە سحربازە.

ئەمە بوو بنەڕەتی قسەی کۆمەڵی قورەیش، ئەیان وت: سحربازەو درۆزن. خۆیان باش ئەیانزانی کە درۆ ئەکەن و پڕو پاڵانتە ئەکەن بۆ ئەمەی کۆڕی خەڵکی لێ دوور بخەنەوە.

ئەمانە لەبەر نەفامیان سەریان سوڕمابوو لەمەی کە بانگیان ئەکات بۆ پەرستنی تەنها خوایەك ـ کە قسە لەوە ڕاستتر نیەو هەر ئەوە شایانە بۆ گوێ لێ گرتن ـ زۆر بە بێزاریی و سەرسامیەوە ئەیان وت: ﴿أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا﴾ ئایا ئەم هەموو خواوەندە ئەکا بە تەنها خوایەك؟ واتە دان نانێ بە خوایەتی و پەرستراوی ئەم هەموو بتانەی ئێمەدا، ئەیەوێ هەر تەنها خوایەك بێ و هەر ئەو بپەرسترێ. ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ﴾ بێگومان ئەمە شتێکە زۆر جێگای سەرسوڕمانە. چونکە پێچەوانەی ئەوەیە کە باب و باپیرمان بە یەکجار بڕیاریان لەسەریەتی. جگە لەوەش زانین و دەسەلات و توانایی تەنها خوایەك ناگات بە کاروباری ئەم هەموو جیهانەدا.

وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ ﴿٧﴾

**ئەمانە بە هەموو جۆر هەوڵیان ئەدا بۆ بەرگریی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەتی گەورەکانی قورەیش، چونکە مەترسیان ئەکرد لێیان تێك چێ. لەبەرئەوە تێکۆشانو هەوڵی گرنگ ئەوان ئەیاندا، بە کۆمەڵ ئەگەڕان بەناو کۆڕو جەماوەری خەڵکی دا ئەیانبردە مێشکیانەوە کە ئەمەی محمد ئەیڵێ مەبەستی ئاینو بیروباوەڕ نیە. ئەمە مەبەستی تری هەیە لە پەنای ئەمەدا، ئێمە باش لێی ئەزانینو ئاگادارین، نەخەڵەتێن پێی؟! لەسەر بیروباوەڕی خۆتان لانەدەن، ئەیەوێ بەناوی ئایینەوە گەورەیی و سەرۆکی بپچڕێ بۆ خۆی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ﴾ کۆمەڵی پیاوماقوڵیان دەرئەچوونو ئەگەڕان بە ناو کۆڕی خەڵکی داو پێیان ئەوتن بڕۆن دوورکەون لە محمد، گوێ مەدەن بە قسەی، سوودی نیە قسە کردن لەگەڵیدا، خۆتان بگرنو دامەزراو بن لەسەر ڕێگای خۆتان لەسەر پەرستنی خواکانتان. نەخەڵەتێن بە هەموو هەوڵو تەقەلای محمد، چونکە ئەو مەبەستی ئەوەیە ببێتە گەورەی عەرەبو عەجەم، ئەوەیش شتێکە کە هەوڵو تێکۆشانی بۆ ئەکرێ، واتە حەقی خۆیەتی هەرچی بۆ بکا، چونکە بۆ خۆی هەوڵ ئەدا، بە ئێوەچی[1]؟**

**لە دەورو بەری ئەو بت پەرستانەدا دوو ئایین هەبوو، جوولەکەیی و نەسرانێتی، ئەم دوو ئایینە ئەگەرچی لە یەکمجاردا ئایینێکی ئاسمانیی بوون، تەنها خوایان ئەپەرستو تا ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە هاتن، بەڵام لە دواییدا ئایینەکەیان گۆڕی، هاوبەشیان بۆ خوای تاکو تەنها بڕیاردا، جوولەکە دوو خواو، نەسرانیش سێ خوا، ئینجا گاورەکانی قورەیش ئەو دوو ئایینەیان ئەکرد بە بەڵگە لەسەر قسەکەی خۆیان کە یەك خوا ناگونجێ. ئەیان وت بە کۆمەڵی ژێر دەستە: ﴿مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ﴾ ئەمەی کە محمد ئەیڵێ ــ واتە پەرستنی تەنها خوایەك ــ ئەمان بیستووە لە هیچ ئایینو میللەتێکی تردا، ئەمە هەر شتێکە محمد خۆی هەڵی ئەبەستێ. یەکەم شتێك کەلە ئایینی ئیسلام دا زۆر بە گرنگیی گیرابێت، باوەڕە بە تاكو تەنهایی خوا، ئیسلام ویستی و ئەیەوێ ئەو باوەڕە بە پاكو**

---

[1] هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە: ئەمە بەسەرهاتو نەگبەتیەکە کەلە بەسەرهاتەکانی چەرخو ڕۆژ ڕووی کراوەتە ئێمە ئەبێ خۆمان بگرینو نەگۆڕێین، هەندێ تر ئەڵێن مەبەست ئەمەیە ئەم ئایینی ئێمە شتێکی بەنرخە ناحەز ئەیەوێ لێمان بسێنێ.

پوختـەیی ڕاگیریّ، ڕووت بکریّ لـە هـەموو لەکـەو چڵکو چـەپەڵیەك کـە ڕووی تـیّکرد لـەو ئایینانـەی پێش ئیسلامو بەهۆی لادانیان لەو ڕێگە ڕاستە کە لە پێشەوە لەسەری بوون، ئیسلام بۆ ئەو مەبەستە لـە هـەموو شت زیاتر هـەوڵو تیّکۆشانی کردووە، بەڵکو هـەموو کاروبارێك ئەگێڕێتەوە بۆ تاكو تەنیایی خوا، لەسەر ئەو بنەڕەتە هـەموو شتی دامەزراندووە لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: تاكو تەنهایی خوا شتێکی ڕاستە، بوونو مانەوەی ئەم بوونـەوەرە لەسـەر ئەوە دامـەزراوەو ڕاوەسـتاوە، ڕێـكو پێکـی ئـەم بوونـەوەرە بەڵگەیـەکی زۆر بـەهێزەو شـایەتێکی ڕاستو ڕەوانە لەسەر ئەو تاكو تەنهاییە.

دووەم: ژیـانی ئـادەمیزاد بـیّ بـاوەڕ بـە تـاكو تـەنهایی خـوا، بـە ڕێکـی نـاڕواو نرخێکـی ئەوتۆی نیە.

بۆ ڕوونکردنـەوەی ئـەم دوو هۆیـە بـە جوانی ئـەزانم ئەندازەیـەك درێـژە پێدان بـەم باسـە، دەربارەی هۆی یەکەم: ئەم ڕژێمە ڕێكو نەگۆڕاوە کە هەیە لـەنێوان ئـەم خـۆرو مـانگو زەویو ئەستێرانەدا، پێکهێنـانی شـەوو ڕۆژو بـە دواهاتنیـانو بـەناو یەکـدا چوونیـان بـیّ بـەرگریی هـەرکام لـە یـەکتر، ئـەم ڕژێمـە نایابـە هـەموو خـاوەن بیرو ژیرییـەك ئـەزانیّ بـیّ تـەنها خوایـەك ناڕواو هەڵناسووڕیّ. ئەم کاروبارە ئەگەر بە دەست زیاتر لە یـەك خـواوە بووایـە هـەر لـە ڕێـوە نەئەبوو، ئەگەر بیش بوایە تێك ئەشێوا وەك خوا ئەفەرمویّ: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾[1] هەموو سروشتێکی پاكو خاوێنو ساغ بە هـەموو دڵنیاییەکەوە بـاوەڕی هەیـە بـەو بەڵگەیـەی کەلەم ئایەتەدایە. لەبەرئەوە زانایانی ئیسلام هەر لە کۆنەوە لە پەڕاوەکانیاندا زۆر بە گرنگی ئەم بەڵگەو دەلیلە تێرو تـەواوەیان هێناوەتـەوە لەسـەر تـاكو تـەنهایی خـوا، بـە چـەند جـۆرو شێوەیەك دایانڕشتووە، کە پێویست نامێنیّ بە هیـچی تـرو تۆپـەڵیّ قـوڕ ئـەدات بـە دەمـی کـە سـانێکدا کـە هاوبـەش بـۆ خـوای تـاكو تـەنها ڕەوا ئـەبینن، پێویـست ناکـات بـە هێنـانی ئـەو شتانەی کـە لـەو پەراوانەدایە، چونکە خـوای تـاكو تـەنها کارێکـی وای کـردووە وەکـو خـۆی بەڵێنیدا[2] مەسەلەکەی ڕوون کردەوە بە دەرخستنی زۆر لەو نهێنیانەی کە شاراوە بوون لـەناو

---

[1] واتە: ئەگەر بێجگە لە خوای تاكو خوای تر کاربەدەست ببوایە لە ئاسمانو زەوی دا ئەشـێوان بـە مـل یەکدا، چـونکە یەك جۆر ڕژێم هەیە ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر بوونی یەك خوا.

[2] مەبەسـت لـەوە ئیـشارەتە بـۆ ئـەو ئایەتـە کـە ئەفـەرمویّ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ وەکو لەمەوپێش بە یارمەتی خوا لە سورەتی ﴿فصلت﴾دا شەرحی دەکەین.

بوونەوەرەکەیدا، ئەوەتا بەگوێرەی ئەوەی ڕوون بووەتەوە لە زانیاری تازەدا، هەرکەس ڕێزی ژیریی خۆی بەلاوە بێت ناتوانێت باوەڕی بەتەنها خوایەك نەبێت، چونکە بە گوێرەی ئەم زانیاریە ڕوونە کە بوونەوەر هەمووی وەکو یەك لە چەند پارچەیەك‌و شتێکی جۆر بە جۆری جیاواز پێکهاتوون کە هەموو ئەوانیش لە ﴿ذرة﴾ پێك هاتوون، کەواتە هەمووی یەکن لەوەی کە لێی پێکهاتوون‌و دروست بوون، هەروەها ڕوون بووەتەوە کە ئەم بوونەوەرە بەم هەموو فراوانیەوە، بەم هەموو زۆریی پارچەکانی کە نایەتە ژمارە، بەم هەموو دووریە لە نێوانی خۆر و مانگ‌و ئەستێرەکان، دووریەکی وا کەبەسالەهای ڕووناکی(السنة الضوئية)بەراوردئەکرێن.

ئەم بوونەوەرە گەورەیە بە یەکجار بێ‌وەستان بە هەموو پارچەکانیەوە لە سێ بەش: (ئەلیکترۆن، نیوترۆن، پرۆتۆن) وەکو بۆ زانایان ڕوون بووەوە لە تەقینی ﴿ذرة﴾ لەناو بۆمبای (نیوترۆنی)یەدا، ئەم ﴿ذرة﴾یە کە بچووك ترین پارچەیەو هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا لەو پێکهاتووە بێ‌وەستان هەموو کات ئەلیکترۆنی هەموو ﴿ذرة﴾یەك وا لە خولانەوەو گەردشدا بە دەوری پرۆتۆنەکاندا، وەکو خولانەوەی ئەو ئەستێرانەی کە دوای خۆر کەوتوون لە کۆمەڵەی خۆردا، وەکو سووڕانەوەو خولانەوەی مەجەڕەکان. کە هەر مەجەڕەیەك پێکهاتووە لە چەند کۆمەڵەیەك لەو کۆمەڵە خۆرانە... ئیتر هەروەها! ئەم هەموو گەردش‌و جووڵانەوەو خولانەوە بە ڕژێمێکی ڕێك‌و پێك هەموو لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات بە پێچەوانەی گەردشی سەعات، ئینجا ئەم هەمووە بە ڕێك‌و ڕاستی، بێ‌ئەوەی گۆڕان‌و شێوان‌و بێ‌بەرگریی‌و لە یەك کەوتنی یەکێ لە یەکێکی تر، کەواتە بە گوێرەی زانیاری تازە، بوونەوەر هەمووی یەکە لە پێکهاتن‌و ئەوەی لێی پێکهاتووە، هەموو یەکن لە ڕژێمدا وەکو باس کرا, کەوابوو زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە کە ئەوەی ئەم گەردشە ئەکات بەم هەمووە، بەو جۆرە کە باس کرا، کە هەموو ژیریی‌و بیرێکی تێدا سەرسام‌و سەرگەردانە، ئەو کەسەی کە نایەڵێ ئەم ڕژێمە بشێوێ، ئەو کەسەی کە ئەم مانگ‌و ڕۆژ‌و ئەستێرەو مەجەڕانەی لە ئەندازێکی دیاری کراودا دوور خستۆتەوە لە یەکتر، ماوە نادات‌و نایەڵێ هیچ بەرو دواو تێکەڵی‌و پێکەڵی‌و هەڵکەوتنێ ڕووبدات، ئەو کەسە ئەبێ تاك‌و تەنها بێت‌و ئەبێ ئاگادار بێت بەسەر سروشتی ئەم هەمووەدا، بەسەر جوڵانەوەو خولانەوەیاندا، ئەبێ بە دەسەڵات‌و توانای ئەو کەسە ئەمانە ببێ، کەواتە شتێکی زۆر ڕاستە کە ئەم بوونەوەرە شایەتێکی ڕاست‌و ڕەوانە لەسەر تاك‌و تەنیایی خوای گەورە، هەرکەس گومانی لە شتی وادا ببێ بە ڕاستی ئەو کەسە پێچەوانەی سروشتی ژیریی‌و بیرو فام ئەجوڵێتەوە، چ جای

ئەوانەی ئەوەندە نەفامن کە بە تەواوی لە سنووری ئادەمی دەرچوون گومانیان وایە کە ئەم بوونەوەرە لە خۆیەوە بێ خوا پەیدا بووەو کاروباری ئەڕوا.

ئینجا لە بابەت هۆی دووەمەوە کە بریتی بوو لەوەی ژیانی ئادەمیی سوودو نرخێکی ئەوتۆی نیە، بێباوەڕ بە خوایەکی تاکو تەنها لەو بابەتەوە ئەڵێن:

١- ڕوون بوونەوەو جێگیر بوونی باوەڕ بە تاکو تەنهایی خوا لە دڵو دەروونا زۆر گرنگە بۆ ئەمەی کە خاوەن باوەڕەکە تێبگات لەو بوونەوەرەی کەوا لەناویداو لە ڕادەو پلەی خۆی لەناویدا، لە پەیوەندی بەو هەموو شتەوە، ئینجا بۆ تێگەیشتنی دەربارەی خواو ناسینی، پەیوەندی پێوە، ئەو تێگەیشتنە بەو جۆرە زۆر گرنگو پڕ سوودە بۆ پاکو خاوێنی هەستی ئادەمی لە هەموو کاروباری ژیانیدا.

٢- باوەڕ بەو تاکو تەنیاییە بە شێوەی ڕاستەقینە، ئادەمی تێئەگەیەنێ کە ئەبێ پەیوەندی بە هەموو شتێکەوە لە سنووری خۆیدا بێت، ئەو کاتە لە سنوورێکی ڕاستدا پەیوەندی ئەبێ بە هەموو دروست کراوانی خواوە جگە لە خوا کەسی تر بە زاڵو توانادار دانانێ بەسەر هەستو دڵو دەروونیا، کەواتە هەستو توانای خۆی بەش بەش نابێ، هەمووی هەر سەرشۆڕو گەردن کەچ ئەبێت بۆ تەنها خوایەك.

٣- ئەو باوەڕە پاکە بڕوادار تەمێ ئەکات کە لەگەڵ دروست کراوەکانی خوادا حەق وایە ناسراویو کۆمەکیو خۆشەویستیی هەبێ، ئەو کاتە ژیانەکەی تامو بۆنو لەزەتی تری هەیە کە بۆ بێباوەڕان نیە، تاریکیو تەمو ماتەمییو بێئارامی دوور ئەبێ لێیەوە بە پێچەوانەی بێباوەڕ.

٤- ئەو باوەڕە شیرینە خاوەن باوەڕەکە وا لێ ئەکات کە تەمێو ئامۆژگاری هەر لە خواوە وەربگرێ، هەموو کاروباری ژیانی بە گوێرەی فەرمانی ئەو جێبەجێ ئەکات بۆ ئەمەی جوڵانەوەی خۆی ڕێكو پێك بێت، لەگەڵ جوڵانەوەی خۆی ڕێكو پێك بێت، لەگەڵ جوڵانەوەی بوونەوەردا بە شێوەیەکی گشتی، ئەو کاتە دوور ئەبێ لە هەموو خراپەو ناڕەواییەکەوە، بەکورتی خاوەنی ئەو باوەڕە وەکو خوای خۆی ئەناسێ تێئەگات لە بوونەوەرو ژیانو ئادەمی.

﴿ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ٨ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ٩ ﴾

---

پاش بێزاریان دەربارەی تاك و تەنیایی خوا ئینجا دەربارەی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) بە بێزاریەوە سەرسوڕمانی خۆیانیان دەرئەبڕی، کە چۆن لەناو ئەم هەموو پیاو ماقوڵانەدا ئەو بکرێ بە پێغەمبەر، ئەیان وت: ﴿ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ ﴾ ئایا چۆن لەناو ئێمەدا بەتایبەتی (محمد) جیا کراوەتەوەو وەحی بۆ هاتووەتە خوارەوە لە ئاسمانەوە؟ ئەبوایە بۆ یەکێ لە پیاوە سەرۆکەکان بهاتایە، وەکو لە سورەتی ﴿زخرف﴾دا ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴾[1] ئەمانەلەهەناسەو قسەکانیانەوە دەرئەکەوێ کە دووچاری حەسادەت و بەرچاو تەنگی بوون، ئەوە بوو بە هۆی باوەڕ نەهێنانیان وەکو لە پەڕاوەکانی ژیان نامەی پێغەمبەردا لێیانەوە ئەگێڕنەوە کە بە دەمی خۆیان دانیان بەوەدا ناوە.

(ئیبن و ئیسحاق) لە محمدی کوڕی مسلمەوە ئەگێڕێتەوە: کە شەوێ لە شەوان ئەبو سوفیان و ئەبو جەهل و ئەخنەسی کوڕی شورەیق لە ماڵ دەرچوون بۆ ئەمەی گوێ بگرن لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی شەونوێژی دا ئەم سیانە هیچیان بە یەکتریان نەئەزانی. گوێیان گرت هەتا ڕۆژ بووەوە، کە گەڕانەوە لە ڕێگەدا گەیشتن بە یەك، کاتێ بە یەکتریان زانی کەوتنە تانەو لۆمەی یەکترو وتیان: ئەگەر نەفامەکان بە شتی وا بزانن دڵیان ئەگۆڕێ و لائەدەن لە ئایینی باوو باپیرەیان، بۆ شەوی دووەم خۆیان پێ نەگیرا، چوونەوە بۆ گوێگرتن، هەروەك شەوی یەکەم گەیشتن بە یەك و هەمان قسەو باس ڕووی دا لە نێوانیاندا، بۆ شەوی سێیەم هەمان دەستوور چوونەوەو گەیشتن بەیەك، ئینجا پەیمانیاندا بە یەکتر کە جارێکی تر ئیشی وا نەکەن. ئینجا بۆ بەیانی ئەخنەس چوو بۆ ماڵی ئەبوسوفیان وتی: ڕاست پێم بڵێ: ڕات چۆنە دەربارەی ئەوەی بیستت لە محمد؟ ئەبو سوفیان وتی: بەڕاستی

---

[1] با ئەم قورئانە بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەر پیاوێکی گەورە لە یەکێ لەم دوو دێیەدا، واتە مەککەو تائیف.

هەندێ شتم ئەبیست تێئەگەیشتم لێی، هەندێ ترم ئەبیست نەم ئەزانی مەبەستی چیە؟ ئەخنەس وتی: بە خوا قەسەم منیش هەروا، لە پاش دا چوو بۆ ماڵی ئەبوجەهل و ئەو پرسیارەی لەویش کرد، لەوەڵامداوتی: چیم لێ بیستووە؟ ئێمەو خێڵی ئەوان بەربەرەکانێمانە لە کۆنەوەو لە شەرەف و گەورەیی ئەوان چیان کردووە کردوومانە، نانیان داوە بە خەڵقی نانمان داوە، وڵاخی سوارییان داوە بە خەڵك ئێمەش داومانە، بەخشش و خەڵاتیان داوە، داومانە، تا وامان لێ هاتووە بەرامبەر وەستاوینەتەوە، ئێستا ئەوان ئەڵێن: پێغەمبەرێکیان لێ هەڵکەوتووەو وەحی لە ئاسمانەوە بۆ دێت، دەی ئێمە ئەوە لە کوێ بێنین؟!

سوێند بێ بە خوا هەرگیز باوەڕی پێ ناهێنین، ناڵێین ڕاست ئەکەیت. ئەوا ڕوونی کردەوە کە هۆی باوەڕ نەهێنانی ئەو نەخۆشی حەسادەت بووە، ئینجا خوای گەورە بەرپەرچی ئەو قسە ناڕەوایانە ئەداتەوە بە وتەیەك کە بە جارێ بۆنی لاقرتی و ترساندن و هەڕەشەی لێ دێت، ئەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّن ذِكْرِي ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا عَذَابِ﴾ واز بێنە لەو قسەی پێشووە، ئەمانە باوەڕی تەواویان نیە. دوو دڵ و دوو شکن لە قورئانەکەی من دا. لێیان گەڕێ، ئەمانە هێشتا عەزاب و سزای منیان نەچەشتووە بۆیە ئاوا بێباوەڕن، کاتێ کە چەشتیان ناچار ئەبن باوەڕی ڕێك و ڕاست ئەهێنن، ئەگەر چی سوودیشی نیە باوەڕی وا، ئەم بێبڕوانە لایان وابوو کە کردنی محمد (ﷺ) بە پێغەمبەر ئیشێکی بێ جێیە، حەق وابوو یەکێ لەو گەورە پیاوانە بکرایە بە پێغەمبەر، ئەمەش دەم درێژییەکی ئێجگار بێئەندازەو دەست خستنە کاری خوایە، لەبەرئەوە ئەیانباتەوە بە حۆیان دا بەمەی کە ئەوان هیچیان بە دەست نیەو هەموو شت بە دەست خوایە. ﴿أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ الْعَزِيزِ الْوَهَّابِ﴾ ئەمانە کە ئاوا دەم درێژیی ئەکەن ئەیانەوێ بەخششی خوا دابەش بکەن بەسەر ئاوانەی ئارەزوویان لێی هەیە. ئایا ئەمانە خاوەنی غەزەنەکانی ڕەحمەتی نەبڕاوەی پەروەردگاری تۆن، تا بە ئارەزووی خۆیان دەستی تێ بخەن، واتە پێغەمبەرێتی خەڵاتێکەلەلایەن خواوە بە هەرکەسی بدا کەس ناتوانێ بەرگریی بکات، چونکە پەروەردگاری تۆ زاڵە بەسەر هەموو کەس و هەموو شتدا، بەخشندەیەکی وا مافی خۆیەتی هەرچی بدات بە هەرکەس.

أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ
مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ
لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾

---

ئینجا باش ئەوە کە تەریقیان ئەکاتەوە بەوەی کەوترا، دووبارە تەریقیان ئەکاتەوە کە ئەوانە دەسەڵاتیان بەسەر ئەم بوونەوەرەیشدا نیە، کە بەشێکی کەمە لە غەزنەی ڕەحمەتی نەبڕاوەی خوا، کەواتە چۆن دەم ئەکوتن لە بەشدار کردن و بێبەش کردنی مەردوم، واتە کەسێ خاوەنی ئاسمان و زەوی و نێوانیان نەبێ ڕێگەی ئەو جۆرە دەست پێخستنەی نیە، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ بەڵکو ئایا ئاسمانان و زەوی و نێوانیان لە ژێر دەسەڵاتی ئەوان دایە؟ ئینجا بە شێوەی دەم کوتی و لاقرتیانەوە ئەفەرموێ: ﴿فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ﴾ ئەگەر ئاسمانان و زەوی و ئەوەی نێوانیان موڵکی ئەوانە دەبا بە پێ پلەدا سەرکەون و بچن بۆلای سەرووی هەموانەوە و لەسەر تەخت دانیشن و هەموو کاروبار بگرنە دەست و ئەو کاتە هەرکەسیان ویست وەحی بۆ بنێرن و بیکەن بە پێغەمبەر، ئەمە ئەوپەڕی گاڵتە پێکردنە بەوانەی کە بەبێ شەرمی ڕەخنەیان لە خوا ئەگرت لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر (ﷺ).

ئینجا ئەم جۆرە ڕەویشتە لە بەرامبەر بەرپەرچ دانەوە و دەم کوتی زۆر بلێ و دەم درێژانەوە زۆر گرنگە، زۆر کاریگەرە و کار ئەکات لەوانەی کە بە نەزانینی دەم درێژی ئەکەن، هەر یەکێ لەمانە هەست و فامی هەبێ ئەگەڕێتەوە بۆ ڕێگەی ڕاست، ئەوەیشی کە مردوویێ با هەر مردوویێ، ئەو کاتە وەکو شاعیر ئەڵێ وەهان:

من يهن يسهل عليه الهوان     مالجرح بميت إيلام.[1]

---

[1] ئەوکەسەی بێئابروو بێت لەڕیسوا کردن نیە، چونکە ئەوکەسە وەکو مردوو وایە مردوو هەرچەند بریندار بکرێ ئازاری نیە.

ئینجا باقریان دەرئەخا کە ئەمانە هیچ نرخێکیان نیە، کۆمەڵێکی بێ نرخن وەکو ئەو کۆمەڵانەی کەلە هەموو کاتێکدا هەڵساون لە پێغەمبەران، لە پاش دا کە هەر شکست خواردووبوونو هەر سەر شۆڕیان بۆ ماوەتەوە، ئەفەرموێ: ﴿جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ﴾ ئەمانە هەرچەند خۆیان بە شت بزانن، نرخ بۆ خۆیان دابنێن لەشکرو کۆمەڵێکی بێ نرخنو لەو کۆمەڵانەن کە دژی پێغەمبەران هەڵساون، وەکو ئەوان بەرباد بوون، ئەمانیش بەم نزیکانە ئەشکێنو سەرشۆڕ ئەبن، واتە ئەمان ئەوپەڕی کۆمەڵێکن لەو کۆمەڵانەو زیاتر نین، کەواتە چیانە بەسەر تەگبیرو ڕاوێژەوە لە کاروباری خوادا.

ئینجا وێنەیەك لەو کۆمەڵە ستەمکارانە ئەهێنێتەوە بە درێژایی چەرخو ڕۆژگار، کە ئەنجامی هەموو بەربەرەکانیەکان ئاخریی هەر تێکیشکانو خەجاڵەتیو تیاچوون بوو، ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ * وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ۚ أُولَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ﴾ پێش ئەمانە قەومی نوح هەڵسان لە نوحو کۆمەڵێکیان لێ کردو باوەڕیان پێنەهێنا، هەروەها تایەفەی عاد دەربارەی هود پێغەمبەرو فیرعەونی خاوەن هێزو دەسەڵاتو موڵك دامەزراو بەرامبەر موساو هارونی برای، تایفەی سەمود بۆ صالح پێغەمبەرو قەومی لوط بۆ لوط پێغەمبەروقەومی شوعەیب بۆ شوعەیب پێغەمبەر کە پێیان ئەوترا ﴿وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ﴾ واتە وڵاتێکی چڕو دارستانو باخ دار، ئەوانە بوون کە هەموو کۆمەڵیان کرد لە دژی پێغەمبەرەکانیان.

﴿إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ﴾ هەموو یەکێ لەوانە باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیانو تاوانو سزایان دەربارە کردن بە هۆی ئەوەوە شایانی ئەوە بوون تۆڵەیان لێ بسێنرێو تۆڵەم لێ سەندن، بەو جۆرە وایان لێ هات کە هیچ دروشمو نیشانەکیان نەما جگە لە دەنگو باسی داڕزانو بەرباد بوونیان، ئەوانەی پێشوو وایان بەسەرهات، بەڵام بێ بڕوانی ئەم ئوممەتە وای لێ نەکردنو وایان لێ ناکات، واتە ئەمان ئەهێلرێنەوە بە شێوەیەکی گشتی تا فوو ئەکرێ بە (صور)داو ژیان لەسەر زەوی دوایی دێت،

وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ ﴿١٥﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ
ٱلۡحِسَابِ ﴿١٦﴾ ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾

---

وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ﴾[1] ئەمانە تەنها چاوەڕوانی یەك دەنگی گەورە ئەكەن وەكو پیا هەڵشاخان كە ئەوە بوو ئیتر ماوە نادرێن نە زۆر نەكەم، تەنانەت بە قەدەر ماوەی نێوانی دووجار دۆشینی حوشتر، ئەو كاتە لە ڕەگو ڕیشە ئەهێنرێن، ئەم ماوە دانە بەم درێژییە بۆ گرۆو تاقمی بێبڕوانی ئەم ئوممەتە لەبەر زیادە ڕەحمێكە بەم ئوممەتە لەبەر خاتری پێغەمبەر (ﷺ) لەبەرئەوەی ئەم ئوممەتە دواترین ئوممەتە تا دنیا دنیایە. خوای گەورە ئاوا ڕەحمی كردووە ماوە ئەدات بەڵام تاوانباران قەدری ئەو نیعمەتە نازانن‌و سوپاسی ناكەن، بەڵكو دڵ ڕەق تر ئەبن‌و گاڵتەو لاقرتیان بە عەزاب‌و سزاو تۆڵەی خواو پاداشت‌و ڕەحمی ئەو دنیا دێت، وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾ ئەیانوت: خوایە بەشە عەزاب‌و سزای خۆمانمان پێش بخە بۆ ئەم دنیاو پێش ڕۆژی دوایی لەوەی كە هەڕەشەمان لێ ئەكەی پێی، یاخود خوایە بەشە بەهەشتی خۆمان لە دنیا بدەرێ لەوێ نامانەوێ، ئەم دوو جۆرە زۆر جار ئەبیسترێ لە پیاوخراپان لەم وێنەیە زۆر بووەو زۆریش هەیە، هەموو ئەوانە مەبەستیان گاڵتە كردنە بە هەڕەشەو مژدەكانی خوا.

ئینجا پاش باسكردنی ئەم هەموو دەم درێژییە كە ئەو بێبڕوایانە ئەیانكرد، خوای گەورە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) كە دان بگرێ بە خۆی داو خۆی بگرێ، هەندێ لە سەرگوزەشتەی كۆمەڵێ لە پێغەمبەرانی بۆ باس ئەفەرموێ: بۆئەوەی بیریان لێ بكاتەوەو گوێ نەدات بەو سزاو ناخۆشیەی كە دووچاری ئەبوو لە لایەن ئەو قەومەوە، هەروەها ئەو سەرگوزەشتانە ئەیخاتە پێش چاوی لەو هەموو نازو نیعمەت‌و دەسەڵات‌و توانایەی كە خوا داوێتی بە پێغەمبەرانی لەوەوبەر، بەتایبەتی داودو سولەیمان - سەلامیان لێ بێت - كە خوا لەگەڵ پێغەمبەرێتی دا شتی وای پێدان كە بە پێغەمبەر (ﷺ) هەروەها ئەیخاتە پێش چاوی

---

[1] وشەی ﴿فَوَاقٖ﴾ بە دوو جۆر مانای كراوە: ١- ماوەی نێوان دووجار دۆشینی حوشتر. ٢- ماوەی گەڕانەوەی شیر بۆ گوان. بە هەردوو بار، ئەمە بە گوێرەی باوی عەرەبەو مەسەلی ئەوانە.

چاودێریی و پاراستن و سەرپەرشتی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکانی پێش کەلە خۆشی و ناخۆشی دا هەموو کات دەستی ڕەحم و بەزەیی پێیانەوە بووە ئەوەیش دڵ نەوایی تێدایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەبێتە هۆی ئارامی دڵی. لە یەکەمجارەوە ئەفەرموێ: ﴿ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ خۆت بگرەو ورە بەرمەدە لەسەر ئەو قسە نارەوایانەو ئەو دەم درێژیانەی کە ئەمانە ئەیکەن، چ ئەو قسانەی کە باسکران لەمەوپێش و هەرچی قسەیەکی تریان، دان بە خۆدا گرتن ڕێگای هەموو پێغەمبەران بووە، هەموو بەو ڕێگەدا چوون و هەموویش سزایان چەشتووە، هەموو دووچاری بەڵا و تاقی کردنەوە بوون و هەر خۆگرتن توێشوویان بووە، هەرکام بە گوێرەی پلەو پایەی خۆی.

ئەو کەسەی تەماشای ژیانی پێغەمبەران بکات ــ سەلامی خوایان لێ بێت ــ بەو شێوەیەی کە قورئان باسی ئەکات ئەبینێ هەمووی پڕ لە ئێش و ئازار بووەو دەرمانی ئەو هەموو ئێش و ئازارەو یەکەم چەکی دەستیان بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو هەموو نارەحەتیەدا سەبر کردن بووە، بۆیە خوای گەورە فەرمان ئەداو تەمێی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکات کە سەبر بکات و بیربکاتەوە لە پێغەمبەرەکانی پێش خۆی و بە دڵ لەگەڵیان بژی، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ باسی بەندەی ئێمە بکە کە (داود)ە کە خاوەنی هێزو دەسەڵات بووە لە کاروباری دنیادا، یان لە ئاین و خواپەرستی دا، چونکە بەندەیەك بووە هەمیشە ئەگەڕایەوە بە لای ڕەزامەندی ئێمەوە، داود پێغەمبەر وەکو لە سورەتی ﴿البقرة﴾دا باسی ئەفەرموێ لەیەکەم جارەوە سەربازی بوو لە لەشکری (طالوت) پاشادا، لە کاتی جەنگدا خوا بۆی ڕێکخشت کە (جالوت)ی کافرو ستەمکار ئەکوژێ، جا لەو کاتەوە ئیتر ناوی ئەکەوێتە ناو ناوانەوە هەتا ئاخریی کە ئەکرێ بە پاشا، لەگەڵ ئەمەدا کە پێغەمبەر بوو پادشاش بوو، خوای گەورە دڵێکی دابوویە کە هەمیشە ئاوەدان بووە بە یادی خواو دەنگ و ئاوازێکی ئێجگار خۆشیشی پێدابوو کە هەموو دەمێ سروودی خوایی پێ ئەوت، جا کە هەر دەستی بەوتنی ئەو سرودانە ئەکرد کێوو کەژو باڵداران و پەلەوەران هەموو بە یەك دەنگ لەگەڵی دا ئەیانووتەوەو بۆیان ئەسەندەوە، لەگەڵی دا ئەوانیش سوپاس و ستایشی خوایان ئەکرد،

إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾

---

**وەكو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِشْرَاقِ * وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ ئێمە كەژو كێوەكانمان هێنابووە ژێر بارو لەگەڵ (داود)دا سەرگەرمی زیکرو یادی خوا ئەبوون لە ئێوارەو چێشتەنگاودا، هەروەها باڵندەو پەلەوەریش کەلە هەموو لایەکەوە ئەهاتن و کۆئەبوونەوەو دەوریان لە (داود)ئەدا، هەموو یەکێ لەمانە هەموو کاتێ زیکرو سروودی خوایان ئەسەندەوە بۆ (داود)و کە لێیش ئەبوونەوە دووبارە ئەگەڕانەوە سەری. بێگومان زۆر کەس هەیە سەرسام ئەبێ لەوە کە کەژو باڵندەو پەلەوەر بێنە زمان، چونکە ئەمە شتێکە نەبیستراوە، بەڵام ئایا لە چی سەرسام ئەبن؟! ئایا ئەبێ ئەو دەسەڵاتەی کە ئادەمی لە تەنها (خلیة)یەك کردووەو کردی بەم شتە نایابە کە هەموو خاوەن فامێ سەرگەردانە لە هێنانەدی و چۆنێتی هێنانەدییدا، ئەو کەسە کە شتی وای کردبێ ئەبێ چۆن سەر بکرێتەوە لە دەسەڵاتی بەسەر ئەوەدا کە دارو بەرد بهێنێتە زمان، هیچ کات هیچ هاوەن ژیرییەك شایانی ئەوەی نیە سەری سوڕبمێنێ لە شتی وا، ئەم دروست کراوانەی خوا بە دیمەن جیاوازیان هەیە لە بەرامبەر خواوە، پەردەو پەرژین نامێنێ لە نێوان ئەم هەموو شتەداو ئەگەن بە یەك و لە یەکتر ئەگەن.**

**﴿وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴾ پادشایەتی (داود)مان بەهێز کردبوو ئەویش بە سام و هەیبەت و شکۆو زاڵکردن و لەشکری زۆرمان دابوویە، هەروەها زانست و داناییمان دابووێ لەگەڵ کردەوەی چاك بە گوێرەی زانینەکەی، هەروەها دەم و زمان و قسەو گفتوگۆیەکی وەهایشمان پێدابوو هەتا حەق و ناحەقی پێ جیا بکاتەوە، بتوانێ مەبەستی خۆی بەباشیی بگەیەنێ و لەگەڵ ئەوەیشدا دووچاری بەلاو تاقی کردنەوە بوو بەڵام چاوی بەزەیی خوای لەسەر بوو، هەموو کات چاودێریی ئەکرد، دەستی ئەگرت لە هەموو بەسەرهات و تەنگانەیەکدا، ئەیپاراست لە ڕێگای مەترسی و تەمێشی ئەکرد کە چۆن خۆی بپارێزێ.**

**دەربارەی ئەم بەسەرهاتی (داود) پێغەمبەرە زۆر شتی نارێك و ناڕەوا لە زۆر لە پەراوەکاندا بڵاو بووەتەوەو باسکراوەو ناگونجێ لەگەڵ سروشتی پێغەمبەرێتی دا، ئەوانە**

هیچیان لە پەڕاوە باوەڕ پێکراوەکانی ئیسلام نین، هەموو ئەمانەو وێنەی ئەمانە لەو ئیسرالیاتانەن کە بوونەتە چڵکو چەپەڵییەکی وا کە شێوەی زۆر لە پەڕاوەکانیان ناشیرین کردووە، بوونەتە هۆی چەواشە کردنی موسڵمانە نەشارەزاکانو جێگای تانەو تەشەری دوژمنەکانی ئیسلام، بەڵام بەم جۆرە شتانە کەچ ئەکاری ناکەویٚ، چونکە:

یەکەم: قورئانەکەی ترازوویەکی ڕێكو ڕاستەو بە هیچ جۆرێ ئەم سەرو ئەو سەر ناکات. بەوترازووە هەموو سەنگو سووکیەك ڕوون ئەبێتەوە.

دووەم: پێشەوایانی ئیسلام ــ خوا پاداشتیان بداتەوەــ خوای گەورە یارمەتیی دانو توانیان هەر لە چەرخی یەکەمی ئیسلامەوە هەموو ئەو درۆو دەلەسەو ئیسرائیلیاتانە جویٚ بکەنەوەو دیاریی بکەن، تەنانەت کتێبی تایبەتیشیان بۆ داناون، ئەو زانایانەش کە شارەزان هەرگیز لێیان ناشێویٚو هەموو ئەو درۆو ئیسرائیلیاتانە ئەناسن.

لێرەدا هیچ پێویست نیە باسی هیچ لەو ئیسرائیلیاتانە بەکەین کەلە مەسەلەی (داود) پێغەمبەردا وتراون، هەروەکو ڕاست نین، با هەر سەر نگونیان بکەین، ڕەوا نیە هەر باسیش بکریٚ. عەلی -خوای لیٚ ڕازی بێت- ئەفەرمویٚ: هەرکەس ئەو بەسەرهاتەی (داود) پێغەمبەرە بگێڕێتەوە بەو جۆرەی حیکایەت خوانەکان ئەیلێن، سەدوشەست داری لیٚ ئەدەم، چونکە بوختان ئەکات بۆ یەکیٚ لە پێغەمبەران، کەواتە تۆڵەی دووقاتی بوختانی موسڵمانانی ترە کە هەشتا دارە. ئەم بەسەرهاتەیش پوختەکەی ئەمەیە: (داود) پێغەمبەر کاتی خۆی بەش کرد بوو بەم شێوەیە: ڕۆژیٚ بۆ کاروباری پادشایەتیو رامیاری ولات، ڕۆژیٚ بۆ داد پرسینو بڕینەوەی ئاژاوەو ڕۆژیٚ بۆ ئامۆژگارییو ڕۆژیٚ تەنها بۆ عیبادەتو پەرستنی خوا بەوە کە ئەچووە خەڵوەخانەو خەریکی زیکرو یادی خوا ئەبوو، لەو ڕۆژەدا کە ئەچووە خەڵوەخانە، دەرگا دائەخراو ماوە نەئەدرا کەس هاتوچۆی بکات، ڕۆژیٚ کەلە خەڵوەتگادا بوو لە ناکاودا دووان یان دوو کۆمەڵ لە فریشتە لەوێنەی ئادەمی دا لە دیوارەوە سەرکەوتن چوونە سەر خەڵوەتگاکە بۆ تاقی کردنەوەی، ئایا چۆن داد ئەپرسیٚو ئاژاوەو دووبەرەکی خۆش ئەکات، بۆ ئەو مەبەستە یەکێکیان خۆی کرد بە داواچیو پێشنیارەکەی خستە ڕوو، ئەویش واتە (داود) پێغەمبەر بیٚئەوەی پرسیار لە داوا لیٚ کراو بکات بڕیاری بۆ داواچی دا، کە ئەوەش حەق نیە، ئیتر ئەوان هەڵسانو ڕۆیشتن، (داود) پێغەمبەر دوای هەڵسانی ئەوان بۆی ڕوون بووەوە کە ئەمە تاقی کردنەوە بوو، بیری کردەوە کە ئەو بڕیارەی دای تەواو نەبوو، لەبەرئەوە داوای لیٚ بووردنی کرد لە خواو کەوت بە ڕوودا بە سوژدە بردن بۆ خوا.

﴿ وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ ٢١ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ
خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ٢٢ إِنَّ هَٰذَآ
أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ ٢٣

**ئینجا با باش گوێبگرین لە قورئان ئەم بەسەرهاتەمان بۆ باس ئەکا کە خوای گەورە بە پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەفەرموێ:** ﴿ وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ ٢١ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ﴾ **ئایا پێت گەیشتووە دەنگو باسو هەواڵی ئەوانەی داواچی بوون لەسەر یەکتر[1] هەواڵی مەحکەمەیان ئەو کاتەی کەلە دیواری خەڵوەتگاکەوە سەرکەوتنو لە ناکاودا چوونە لای داود، ئینجا لەبەرئەوەی نەناسراو بوونو لە ناکاودا چوونو لە دەرگایشەوە نەچوون، لەو ڕۆژانەیش دا هاتوچۆکردن قەدەغە بوو، لەبەرئەو هۆیانە (داود) پێغەمبەر گومانی برد کە ئەوانە پیاو خراپن:** ﴿فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ﴾ **لەبەرئەوە داچڵەکی لێیانو ترسا لێیان، ئەوانیش بۆ دڵنیا کردنی ئەو کە ئەمان پیاو خراپ نین:** ﴿قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ﴾ **وتیان: مەترسە، ئێمە نیازی خراپەمان نیە، بەڵکو ئێمە:** ﴿خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ﴾ **دوو داواچین، ناکۆکیمان هەیە، هەندێکمان دەست درێژیو[2] ناهەقیمان کردووە لەوی ترمان، هاتووین مەحکەمەمان بکەیت:** ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ﴾ **جا تۆیش بە حەقیانەت بڕیار بدە لە نێوانمانداو جەورو ستەمکاری مەکە لە بڕیارەکەتدا، ڕێنموونیمان بکە بۆ ناوەندی ئەو ڕێگە کە بریتیە لە ڕێگای عەدلو دادپەروەریی، ئینجا ئەوەی کە خۆی بە زوڵم لێ کراو نیشان ئەدا شکاتی کردو وتی:** ﴿إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ﴾ **ئەمە برامە نەوەدو نۆ سەر مەڕی هەیە، من تاقە مەڕێکم هەیە.** ﴿فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا﴾ **کەچی تەماعی کردووەتە ئەو تاقە مەڕەی منو پێم ئەڵێ ئەبێ بمدەیتێ بۆ خۆم.** ﴿وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ﴾ **لە قسە کردندا زۆری پێ هێناوم چاری دەمی ناکەم، ئینجا (داود) پێغەمبەر بێ‌ئەوەی پرسیار بکات لەوی تر تا ڕوون ببێتەوە ئایا ئەوەی داواچی ئەیڵێ ڕاستە یان نەء واتە بێ سەر لێکردنەوە بڕیاری دا بۆ شکات کەر.**

---

[1] ئەم وتەیە بە دیمەن پرسیارە، بەڵام مەبەست سەرسام کردنو خستنە شەوقی گوێگرە، چونکە هەواڵێکی گرنگە.

[2] واتە وەکو داواچی واینو شێوەمان داواچیە، کەواتە ڕەخنە ناگیرێ بەمەی کە چۆن ئەو مەلائیکانە شتێکیان وتوە ڕاست نەبێ؟

قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ

---

ئەوی تری تاوانبار کردو فەرموی: ﴿قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ﴾ وتی: بێگومان براکەت زوڵم‌و ناحەقی لێ کردوویت کە داوای ئەو تاقە مەڕەی لێ کردوویت بۆ خۆی، ئینجا دیسان ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ﴾ ئەمە هەر بەسەر تۆ نەهاتووە، بەڵکو ئەوانەی کە خزم‌و خوێش‌و هاوشەریکن لە ماڵدا، هەروا هەندێکیان دەست درێژیی لە هەندێکی تریان ئەکەن، مەگەر ئەوانەی کە ئیمان‌و باوەڕیان هەیە بە خواو کردەوەی چاکیشیان بە پێی ئیمان‌و باوەڕەکەیان هەیە، ئەوانەش زۆر کەمن.

ئینجا وا دەرئەکەوێ ئەوانەی کە هاتنە خزمەتی خۆیان گوم کردبێ لە بەرچاوی، چونکە وەکو وترا فریشتە بوون، هاتبوون بۆ تاقی کردنەوەی (داود) پێغەمبەر، جا لەو کاتەدا بێدار بووەو تێگەیشت کە ئەمە تاقی کردنەوە بوو لە لایەن خواوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ﴾ داود وا گومانی برد کە ئێمە تاقیمان کردووەتەوە، ئینجا داود بۆی ڕوون بووەوە کە محاکمەکەی بە ڕێکی نەکرد، چونکە پرسیاری نەکرد لە شکات لێ کراو، بەڵکو هەر بە قسەی شکات کەر بڕیاری داو، شکات لێکراوی تاوانبار کرد، حاکمیش نابێ وا حوکم بکات، چونکە پێچەوانەی حەق‌و عەدالەتە. بەڵکو ئەبێ پرسیار بکات لەو لایش ـ لای شکات لێکراو، با بە دیمەن وەکو لێرەدا ـ شکات کەر زۆر زوڵم‌و ناحەقی دەربارە کرابێ. لەم بارەیەوە ئیمامی عەلی –خوای لێ ڕازی بێت– وتەیەکی جوانی هەیە، ئەفەرموێ: ئەگەر حاکم بوویت یەکێ هات بۆ شکات‌و چاوێکی دەرهاتبێ‌و بەسەر دەستیەوە بێت بڕیاری بۆ مەدە، چونکە ئەگونجێ ئەم هەردوو چاوی شکات لێکراوی دەرهێنابێت.

جا داود پێغەمبەر بە گوێرەی سروشتی پاکی خۆی پەشیمان بووەوە لەوەی کە کردی‌و گەڕایەوە بۆلای خواوپەنای بۆهێنا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ﴾ لەبەرئەوە داوای لێ بووردنی کرد لە خواو کەوت بە ڕوودا بۆ سوجدە بردن بۆ خواو گەڕایەوە بۆلای

ئێمە، ﴿فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ﴾ ئێمەیش لێی خۆش بووین لەوەی کە داوای لێ خۆش بوونی بۆ کرد. ﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ﴾ بێگومـان داود قـەدرو ڕێـزی لای ئێمـە هەیـەو نزیکـە لـە ئێمەوە، پاشەڕۆژی جوانو شیرینی هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا.

لێرەدا باسـی ئـەو بەسـەرهاتە دوایـی هـات، بـەو شـێوەی کـە باسـکرا ئـەگونجێ لەگـەڵ سروشتی پێغەمبەرێتی داو لەگەڵ ئەو هەموو سەناو مەدحەی کە خوای گەورە فەرموویەتی دەربـارەی داود پێغەمبـەر لـەپاشو باسـەکەوە، زۆر ڕێـكو پێکـە لەگـەڵ شـێوەو دیمـەنی ئایەتەکاندا، چونکە ئەم ئایەتانە ئەوە نیشان ئەدەن کە مەبەست تاقی کردنەوەو فێرکردنی داود بوو لە مەحکەمە کردن دا وەکو وشەی ﴿فَتَنَّٰهُ﴾ ڕوونی ئەکاتەوە، هەروەها ئەو مەبەستە بە تـەواوی ڕوون ئەبێتـەوە بەوە کە ئەفەرموێ: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ ئەی داود ئێمە تۆمان کردووە بە جێنشین لـەزەوی دا، کردوومانیت بە پادشاو حوکمدار، کوابوو تـۆش بەڕاستی حوکمڕانی بکە لەناوەردومدا، شوێن هەوەسو ئارەزووی خۆت نەکەوی تا ونت بکاتو لات بدات لـە ڕێگای خوا. مەبەست لە شوێن کەوتنی هـەواو هـەوەس بۆ پێغەمبـەران ئەوەیە هـەر شتێك کەوتـە دڵیانـەوە هـەر لـە یەکەم جارەوە بێبیر لێ کردنەوەو چاوەڕوانی فەرمانی خوا بڕیاری لەسـەر بدەنو گوێرەی ئـەوە ڕەفتـار بکـەن، وەکـو ئـەوەی کـە داود پێغەمبـەر کـردی لـەو محاکەمەیـەدا، ئـەگینا خـوا نەخواستە مەبەست شتی خراپەو شتی بێ شەرعی بێ، پێغەمبەران ـ درودی خوایان لێ بێت ـ وا دروست کراون کە ئارەزووی خراپەو خراپەکارییان نیە چ جای کردنیشی، بەڵام چونکە پلەو پایەیان بەرزە، شـتی وا بچووك بۆ ئـەوان بە گـەورە سـەیر ئەکرێ، بەڵام خـوا ئەوەنـدە میهرەبانە لەگەڵیان، هـەرکاتێ ـ بە گوێرەی سروشـتی ئـادەمی ـ هـەر شتێکی ئـاوا بچووك لێیانـەوە ڕووی دابـێ، دەسـت بـەجێ ئاگـاداری کـردوونو بێـداری کردوونەتـەوە بـە وێنـەی ئاگادار کردنەوەی داود لەو مەسەلە بچکۆلەیەدا.

زانـای مـەزن (ئیبنو کەسیر) لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا ئەفـەرموێ: ئەمـە ڕاسپاردەیەکە لەلایەن خواوە بۆ هـەموو کاربەدەسـتان کـە حوکمڕانیی بکـەن لـەناو ئادەمیدا بەگوێرەی ئـەو ئایینە ڕاستەی کە لە لایەن خواوە هاتووەتە خوارەوەو لێی لانەدەن، با ڕێگـەی خوایـان لێ ون نەبێو لانەدەن لێی، چونکە خوای گەورە هەڕەشە ئەکات لەوانـەی لـە ڕێگـەی لائـەدەنو ڕۆژی لێپرسینەوە لە بیر خۆیان ئەبەنەوە بە هەڕەشەیەکی بەتینو سزایەکی بەسۆ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ
وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾

---

ئینجا بە شێوەی گشتی هەڕەشە ئەکات بە بڕیاری سزای بەتین لە ڕۆژی دواییدا دەربارەی ئەوانەی کە لە ڕێگای خوا لائەدەن، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾ بێگومان عەزابی سەخت و بەتین هەیە لەو دونیا، لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا، بۆ هەموو ئەوانەی کە لائەدەن لە ڕێگای خوا بە هۆی ئەوەوە خوایان لەبیر چووە لە دنیادا، گومڕایی و لادانەکەیان بریتیە لەم بیرو بۆچوونە، چونکە هەرکەس یادی خوای لە دڵدا بێت هەموو کات ڕێگەی ڕاست ئەگرێت و خۆی لائەدا لە شوێنکەوتنی هەواو هەوەس.

پاش ئەوەی ئەو بیرو باوەڕە پیرۆزەی جێگیر کردو دایمەزراند، باوەڕی ڕاستی پەروەری لە حوکمڕانیدا، ئینجا ڕادەو پلەی ڕاستی ڕوون ئەکاتەوە. کە شتێکە ئاسمان و زەوی و هەموو بوونەوەر لەبەرئەوە دروست کراوەو لەسەر ئەو ڕاگیربووە، پێغەمبەرێتی هەر بۆ ئەو هاتووەو قورئان هاتووە بۆ دەرخستنی حەق و ڕاستی لە هەموو شتێکدا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا﴾ ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان دروست نەکردووە هەروا بە خۆڕایی و بێ حیکمەت، بەڵکو لەبەر شتێکی حەق و ڕاست دروستمان کردووە کە بریتیە لە خواناسین بە تاک و تەنهایی و پەیڕەوی فەرمان و بەرنامەکەی کە ئەویش تاقانە سەرچاوەیە بۆ هەموو حەق و ڕاستیەك لەم جیهانەو ئەو جیهان، ئینجا لە ڕۆژی دواییدا هەموو کۆئەکرێنەوە بۆ پاداشت دانەوەی چاکان و، تۆڵە لەوانە کە شایانی تۆڵەن.

ئەوانەی کە مەبەستیان هەر پێکیهێنانی ئارەزوو هەوەسیانەوە بیری ناکەنەوە لە مەبەستی دروست کردنی خۆیان و ئەو بوونەوەرەی کە تێیدا ئەژین، لایان وایە هەر بێهودە ئەمانە پەیدا بوون، ئەوانە دوورن لە ژیری و لەسروشتی ئادەمی و کافرن و خوا هەڕەشەیان لێ ئەکا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ گومان بردن بەوەی کە ئاسمان و زەوی و نێوانیان دروست کراون هەروا بە بە تاڵ و بێهودە، ئەو گومان بردنە گومان بردنی کەسانێکە کە کافرو بێباوەڕن. ئینجا عەزابی سەخت بەو ئاگرەی کە تاو دراوەو ئامادە کراوە بۆ هەموو کەسانێ کە کافرن و گومانی وەها ناڕەوا ئەبەن.

له ئایەتی پێشوودا فەرمووی ئاسمان و زەوی و نێوانمان دروست نەکردووە بە بەتاڵ، لێرەدا شتێ ئەفەرموێ کە ئەبێتە دەلیل و بەڵگە لەسەری، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ﴾ ئایا ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان کردووە لە دنیادا وەکو ئەوانەن کە ئیمانیان نیە خراپە ئەکەن لە وڵاتداو ئاژاوە ئەنێنەوە لە زەوی دا؟ بەڵکو ئایا ئەوانەی لە خوا ترسن بەهۆی ئەوەوە خۆیان ئەپارێزن لە کردەوەی خراپ و ناڕەوا، ئێمە وەکو لە خوا نەترسەکان و بەد کردارەکان سەیریان ئەکەین و ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکەین؟ نەخێر شتی وا ناکەین، نەخێر نە ئەو دووکۆمەڵەی پێشووە یەکسانن لای خواو لە پاشەڕۆژدا، نە ئەم دوو کۆمەڵە وەکو یەك ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەین، واتە ئەگەر دروست کردنی زەوی و ئاسمان و ئەوەی نێوانیان لەسەر ڕاستی و حەق و نەبوایەو بە بەتاڵ دروست بکرانایە، ئەبوایە ئەم کۆمەڵانە یەکسان دەرچوونایە ـ چۆن ئەو کاتە زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوەو تۆڵەو پاداشت نەئەبوون ـ یەکسانیی ئەوانەش پێچەوانەی عەدل و دادپەروەرییە، پێچەوانەی گشت بیرو ژیرییەکە کە ساغ بێت، هەموو سروشتێکی ڕێك و ڕاست باوەڕی هەیە کە پێویستە زیندوو بوونەوەو پاداشت و تۆڵە ببێ، چونکە ئەبینرێ لە دنیادا زۆرداری سەرکەشی وا هەیە بە ئارەزووی خۆی ڕائەبوێرێ، ماڵ و منداڵ و ئەوەی زۆرو سامانی بێژمارو دەسەڵاتی تێرو تەواو بەو هەموو کەشخەیی و خۆ بادانەوە، ناڕەوایی و ستەمکاری ئەنوێنێ لەگەڵ هەژارو بێ دەسەڵات و بێکەس و بێ دەرەکاندا، هەر بەو جۆرە دونیا دوایی ئەهێنن، ئەو لەسەر نازو نیعمەتی خۆی و ئەمیش بەم هەموو داخ و دەردەوە هەردوو سەر ئەنێنەوە، ئایا ئەگەر دنیایەکی تر نەیەت بۆ پاداشتی ئەم لێ قەوماوو ماڵ وێرانانەو تۆڵە سەندن لەو سەرکەش و بەدکارانە، ئایا ئەگەر ڕۆژێکی وا نەیەت ئاخۆ دژو پێچەوانەی عەدل و حیکمەت ڕوو نادات؟!

بێگومان ئەبێ هەموو زانایەك لە وەڵامدا بڵێت: بەڵێ.

جالەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە ڕاستە، قورئان ڕێنموونی ئەکات بۆ هەموو مەبەستێکی ڕێك‌و ڕاست، بۆ ئەو شتانەی کە نرخدارو گرنگن لای خوای گەورە، لەبەرئەوە هەموو حەق‌و ناحەق ڕوون ئەکاتەوەو پیشانمان ئەدات بەنرخی ئەم قورئانەو ئەو مەبەستەی کە بۆی هاتووتە خوارەوە، دەربارەی بەنرخیی قورئان ئەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ﴾ ئەم قورئانە کتێبێکە لە ئاسمانەوە هێناومانەتە خوارەوە بۆ لای تۆ کە زۆر پیرۆزە بە پیت‌و فەڕە، ئایا چۆنە پلەو پایەی شتێ کە خوای گەورە ئاوا سەناو مەدحی بکات؟! ئایا چ نرخێ لەمە بەرزترو بەڕێزترە؟ ئینجا دەربارەی ئەو مەبەستەی کە بۆی هاتووە ئەفەرموێ: ﴿لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ هێناومانەتە خوارەوە بۆئەوەی بەندەکان بیر لە ئایەتەکانی بکەنەوە، تا هەموو حەق‌و ناحەقیەکیان بۆ ڕوون ببێتەوە، دوای ئەوەی کە خاوەن عەقڵ‌و فامە ئامۆژگاری وەرگرێ. واتە پەیڕەوی بکەن، جا ئەو کاتە ئەبن لە هەموو ناڕەواییەك‌و ئازادیی ڕاستەقینە وەرئەگرن لە هەموو ڕوویەکەوەو لە هەموو تاریکیەك دەرباز ئەبن بەرەو ڕووناکی، ئاسایش‌و ئارامی ماڵ‌و خێزانتان ڕائەگرێ، کەواتە لەبەر کردنی قورئان‌و لەبەر هەڵسانی ڕووت‌و مانا لێکدانەوەو زانینی ماناکەی بێ پەیڕەوی، ئەمانە هیچیان مەبەست لە هێنانی قورئان پێك ناهێنن‌و نرخ پێدانی قورئان ناگەیەنێ. مەبەست پێکهێنان‌و نرخ پێدانی قورئان بریتیە لە پەیڕەوی‌و گوێڕایەڵی کردنی، بەڵکو ڕاست ئەوەیە کە هەر ئایەتێ هەتا پەیڕەوی نەکرێ نەخوێندرێ، خوێندنی بێ‌پەیڕەوی ــ ئەگەر میهرەبانی خوای لەگەڵ دا نەبێ ــ مەترسیی ڕق‌و قینی خوای لێ ئەکرێ، چ جای پاداشت دانەوە! ئەوەتا ئەگەر کاربەدەستێکی گەورە نووسراوێك بنووسێ لە ژێر دەستەکانی، چەند فەرمانێکیان لێ داوا بکات، مەبەستی لەو نووسراوە بەجێ هێنانی ئەو فەرمانە بێت، ئینجا ئەگەر ژێر دەستەکە هیچ فەرمانێك بەجێ نەهێنێ، بەڵکو شەوو ڕۆژ چەند جار ئەو نووسراوە بخوێنێتەوە ئایا کاربەدەستکە بەو خوێندنەوەی ڕووتە ڕازی ئەبێ؟ نەخێر بێ‌گومان دڵی ئەیەشێ‌و وا ئەزانێ ئەو خوێندنەوەیە گاڵتە پێ کردنە. بەڕاستی زۆر پێویستە هۆش بکەینەوەو بزانین قورئان بۆچی هاتووە؟ یارانی پێغەمبەر (ﷺ) هەروەها پیاوچاکانی کۆمەڵی ئیسلام چۆن بوون لەگەڵ قورئان دا، با ئێمەش واین.

﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾﴾

**ئینجا پاش دەرخستنی ئەم چەند ڕاستانە کە پاش باسی بەسەرهاتەکەی داود پێغەمبەری فەرموو، ئەچێتەوە سەر باسی ئەو نیعمەتە گەورانەی کە خوای گەورە دای بە داود پێغەمبەر، باسی ئەو کوڕەی کە پێی بەخشی و کردی بە پێغەمبەرو پادشایەکی وا کە هیچ کەس نەیگەیشتووەتێ لە پادشایەتیدا، ئەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَۚ﴾ بەخشیمان بە داود کوڕێك کە ناوی سولەیمان بوو، ئینجا مەدح و سەنای ئەم کوڕە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿نِعْمَ ٱلْعَبْدُۖ﴾ ئای کە بەندەیەکی چاك بوو، هۆی چاکیەکەشی ئەوەبوو: ﴿إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ زۆر ئەگەڕایەوە بۆ لای خوا بە تۆبە کردن و یادی خواو تەسبیح کردن، ئاشکرایە کە گەڕانەوە بۆ لای خوا سەرچاوەی هەموو چاکیەکە.**

**ئینجا ئیشارەت ئەکات بۆ دوو بەسەرهاتی سولەیمان پێغەمبەر، کە هەرچەند لە بابەت ئەم دوو بەسەرهاتەوە شتی زۆر بڵاو بووتەوە لە ناو کتێبە تەفسیرەکاندا، هیچیان ئەوە نیە کە بەڕاستی جێگای دڵنیایی بن، چونکە زۆربەی ئیسرائیلیاتن، لە هیچ کتێبێکی باوەڕ پێکراوی حەدیسیشدا نین، کەواتە حەق وایە بەسەر ئایەتەکاندا بە سووکی تێپەڕین و هووڵ و درێژ بۆیان دانەچین، زانینی ڕێك و ڕاستیان حەواڵەی خوای گەورە بکەین، ئەوەی ئاشکرابێ و بێترس بیڵێین ئەمەیە کە دوو بەڵا و تاقی کردنەوە ڕوویان کردە سولەیمان پێغەمبەر کە پەیوەندی بە کردارو فەرمانی خۆیەوە بوو لە بابەت پادشایەکەیەوە، ئەوەیش بە گوێرەی باوی خوا کە بەو جۆرە شتانە تەمێی پێغەمبەرانی کردووە، ڕێنموونی کردوون و نەیهێشتووە دووچاری هیچ هەڵە و تێکەوتنی بێن، جا سولەیمان پێغەمبەر لەم دوو بەسەرهاتەدا گەڕایەوە بۆ لای خواو داوای لێ بووردنی لێ کردو ڕووی کردەوە خوا بە لاڵانەوە و نزا کردن و پاڕانەوە، خواش نزاو پاڕانەوەکەی لێ وەرگرت و لێی بورد.**

**پێویستی سەرشانی هەموو کەسێکە کە لەم جۆرە شتانەدا ئەوپەڕی ڕادە بترسێ و بێ بەڵگەیەکی تێرو تەواو دەم نەکوتێ، پێشەوایانی موسڵمان وایان کردووە، بەڵکو لە شتی زۆر سووك و ئاسانیش کە نەیانزانیبێ بە دڵنیاییەوە دەمیان گرتۆتەوە و وایان لێ هێناوە، بۆ**

وێنە: عومەری کوڕی خەتتاب -خوای لێ ڕازی بێت- لە سورەتی ﴿عبس﴾دا وشەی ﴿وَأَبًّا﴾ی نەئەزانی کە مەبەست چیە، بیری کردەوەو لەپاشدا بە خۆی فەرموو: عمر، دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، تۆ ئەتەوێ لە خۆتەوە دەم بکوتی لە فەرمایشتی خوادا؟ ئیتر لێی بێدەنگ بوو. بەڵێ لەم دوو ڕووداوەدا دوو حەدیس هەیە لەبەرئەوەی ئەگونجێ پەیوەندیان هەبێ، ئەتوانێ بیانکەین بە تەفسیری ئەو دوو بەسەرهاتە، بەڵام نەك بە دڵنیایی تەواو.

حەدیسی یەکەم: لە بابەت بەسەرهاتی یەکەمەوە حەزرەتی سولەیمان چەند وڵاخێکی سواریی هەبوو ژمارەیەکی زۆر ئامادە کرابوون بۆ غەزا کردن، جارێکیان ویستی بەسەریان بکات، لەپاش نیوەڕۆ هەتا خۆرئاوا پێیانەوە خەریك بووو نوێژی عەسری لە بیرچوو بەهۆی ئەوەوە زۆر خەمی خوارد، لە کەفارەتدا هەموو وڵاخەکانی کرد بە قوربانی.

ئینجا با بەو گوێرەیە تەفسیری ئایەتەکان بکەین کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴾ سولەیمان بەندەیەکی چاك بوو زوو گەڕایەوە بۆلای خوا ئەو کاتەی تاقمێ وڵاخیان هێنایە پێش چاوی بۆ سەیر کردنیان، ئەو تاقمە کە ئامادە کرابوون بۆ غەزاکردن بەسەری ئەکردن و پێیانەوە خەریك بوو هەتا خۆر ئاوا بوو نوێژی عەسری لە بیرچوو، داخ و خەمی زۆری خوارد. ﴿فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴾ ئینجا وتی من خۆشەویستی ماڵی دنیاو خەریك بوونم پێیەوە نامە شوێن زیکرو عیبادەتی پەروەردگارم هەتا خۆر ئاوا بوو، واتە بەهۆی خۆشەویستیی ئەو وڵاخانەو خەریك بوونم بە کاروباریانەوە هۆشم بە لای نوێژەکەمەوە نەما هەتا خۆر ئاوا بوو نوێژەکەم ڕۆیشت، فەرموی: ﴿رُدُّوهَا عَلَيَّ﴾ وتی ئەو وڵاخانەم بۆ بگێڕنەوە. ﴿فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴾ ئینجا کە گێڕایانەوە دەستی کرد بە سەر بڕین و پەل پەل کردنیان، کردنی بە قوربانی تا ببێتە کە فارەتی ئەو نوێژەی کە بەهۆی ئەمانەوە چوو ڕۆیشت.

حەدیسی دووەم: لە بابەت بەسەرهاتی دووەمەوە، ئەمەیە کە حەزرەتی سولەیمان حەفتا حەرەمی هەبوو، جارێك فەرموی ئیمشەو ئەگەڕێم بەسەر ئەم ژنانەدا کە هەموو ژنێك کوڕێ ئەهێنێ سوارچاك بۆ غەزا کردن لە ڕێی خوادا، نەیفەرموو ﴿إن شاء الله﴾ بەهۆی ئەوەوە لەو حەفتایە یەکێکیان منداڵی بوو ئەویش لەتە کوڕێك بوو، ئینجا لە حەدیسەکەدا ئەفەرموێ: سوێند بێ بەکەسێ کە گیانی محمدی بەدەستە، ئەگەر لەو کاتەدا بیوتایە ﴿إن شاء الله﴾ حەفتا کوڕی ئەبوو، گەورە ئەبوون و غەزایان ئەکرد لە ڕێگای خوادا.

ئەم حەدیسە ئیمامی بوخاری لە کتێبی خۆیدا هێناویەتی، کەواتە جێگای باوەڕە کە ئەم حەدیسە ڕاستەو صەحیحە، ئەگونجێ بکرێ بە تەفسیر بۆ ئەم بەسەرهاتە، هەندێ لە زانایانیش کردوویانە بە تەفسیری، کەواتە مەترسی تێدا نیە، بەڵام وەکو وترا بە شێوەی دڵنیایی تەواو نایڵێین، بەڵکو ئەڵێین ئەمە باشترە لەوانەی تر کە وتراون، چونکە ئەوانەی تر تێکەڵاوی ئیسرائیلیات بوون، جا بە گوێرەی ئەم حەدیسە ئەڵێین: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ﴾ بێگومان سولەیمانمان تاقی کردەوە بەو جۆرە، لە باتی ئەو حەفتا کوڕەدا کە ئەو بە دڵنیاییەوە بە تەمایان بوو، لە بیری چوو بڵێ ﴿إن شاء الله﴾ لە باتی ئەوانەدا ئێمە ئەو لەتە کوڕەمان دایێ. ئەڵێن: مامانەکە بردی لەسەر تەختەکەی حەزرەتی سولەیمان داینا، ناوبردنی بە ﴿جَسَدًا﴾ واتە لەشی بێ ڕۆح لەبەرئەوەیە بە مردوویی بووە، یان ئەگەر گیانیشی تێدابووبێ، چونکە لەت بووە هەروەکو بێگیان وابووە، ئینجا پاش ئەوە حەزرەتی سولەیمان بیری کردەوەو گەڕایەوە بۆلای خوا بە تۆبەو ئامانەوەلەوهەڵەیەی کردی. بۆئەو شتە گرنگە نادیارییە کە هەر خوا ئەزانێ ﴿إن شاء الله﴾ی نەکردو شتی وا بۆ پێغەمبەران ـ سەلامیان لەسەر بێت ـ هەڵەیەکی گەورەیە. لە بابەت ئەو حەدیسەوە کە ئەفەرموێ حەزرەتی سولەیمان حەفتا حەرەمی بووە نابێ جێگای سەرسوڕمان بێت، چونکە بە پێی ئەو شەریعەتە سنوور نەبووە بۆ ژمارەی ژن هێنان، بەڵکو بە گوێرەی دەسەڵات و ئارەزوو بووە، لە شەریعەتی ئێمەش دا ـ کە دوایین شەریعەتی خوایە ـ تا ماوەیەك هەروابووە تا سنووری بۆ دیاریی کرا بە چوار. ئەم باسە شوێنی تایبەتی هەیە لە قورئاندا لەوێدا بە تێرو تەواوی جێگەی لێکۆڵینەوەیە بە شێوەی گشتیو بە جۆرێ ئەم باسە بە درێژیی ڕوون کراوەتەوە، ماوە نەماوە بۆ دەم درێژیی هیچ نەزانێ، لێرەدا هەر ئەوەندە ئەڵێین کە: پێغەمبەران ـ سەلامییان لێ بێت ـ ئادەمین، لە هەموو سیفەت و نیشانەی پیاوەتیدا لە هەموو پیاوێ تێرو تەواو ترن، کەواتە لە سنووری پێویست و دەسەڵات دا هیچ ڕەخنەیەك نیە لە ژن هێنان و ژن زۆری دا، بە گوێرەی ڕەوادانی خواو ڕەزامەندی ئەو ژنانەی کە شوویان پێکردوون و بێگومان پلەو پایەیان ئەوەندە بەرز بووە کە پێغەمبەران بیانخوازن بەتایبەت یەکێکی وەکوحەزرەتی سولەیمان کەپادشایەتیەکی وای بووەهەرگیز نەبووەو ناشبێ.

قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرۡنَا لَهُ ٱلرِّيحَ
تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦ رُخَآءً حَيۡثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ
﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمۡنُنۡ أَوۡ أَمۡسِكۡ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴿٤٠﴾

---

حەزرەتی سولەیمان گەڕایەوە بۆلای خواو ئینجا ڕووی دڵی کردە خواو داوای لێ بووردنی کردو هەروەها داوای دەسەڵاتو پادشاییەکی تایبەتی لێ کرد بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ﴾ وتی ئەی پەروەردگارم، گوناهم بپۆشەو دەسەڵاتو پادشاییەکم بدەرێ کە دەست نەدات بۆ کەسی تر پاش منو بێجگە لە من واتە جۆرێکی تایبەتی بێ بە منەوە بە شێوەی موعجیزەو بەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتیم. داوای ئەمەت لێ ئەکەم چونکە بێگومان تەنها بەخشندەیەکی وای هەرچی مەیل بکەیت ئەیدەیت بە هەرکەس خۆت بتەوێ.

بەو جۆرە کەوتمان ڕێگە نامێنێ بۆ هیچ ڕەخنەیەك لەم مەسەلەیەدا، چونکە وتراوە ئەم داوایە وەکو بەربەرەکانی وایە لە پاشایەتیدا، ئەوەیش شایانی پێغەمبەران نیە، یان وتراوە ئەمە حەسادەتە، ئەم دوو ڕەخنەیە بێ جێگەن، یەکەمیان بەرپەرچ درایەوە بەوە کە وتمان مەبەستی شێوە دەسەڵاتێکی تایبەتی بووە کە ببێتە موعجیزە بۆی، بۆ ڕەخنەی دووەم ئەڵێین هەرکەس مانای حەسادەت بزانێ، ڕەخنەی دووەم ناگرێ، چونکە حەسادەت بریتیە لە ئاواتی نەمانی نیعمەتی خوا لەلای خەڵکی، دەی ئەمە کە حەزرەتی سولەیمان فەرمویەتی کەی ئەوەی تێدایە؟

خوای گەورە نزاکەی وەرگرتو گیرای کرد، دەسەڵاتێکی دایە کە تەنها تایبەتە بەوەوە، دووشتی خستە ژێر دەستی، یەکەم (با) وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَسَخَّرۡنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦ رُخَآءً حَيۡثُ أَصَابَ﴾ دوای نزاکەی (با)مان بۆ مل شۆڕ کردو خستمانە ژێر دەستی کە بە فەرمانی ئەو بڕوا بێتاسەو لەنگەرە بۆ هەر شوێنێ ویستی.

ئەوەی کە زانا بێت نابێ سەرسام ببێت لە شتی وا، چونکە هەموو زانایەك ئەبێ باوەڕی بێ کە (با) وەکو هەموو شتێکی تر ژێر بارو گەردن کەچە بۆ ئیرادەو خواستی خوا، ئەی ئایا خاوەن ئەو ئیرادەو خواستە بیەوێ لە ماوەیەکدا جڵەوەکەی بداتە دەست بەندەیەك لە بەندەکانی، ئەبێ ئاخۆ ئەمە بۆ جێگەی سەرسوڕمان بێت.؟! هەموو کارێك بە دەست خوایە، لەگەڵ ئەمەشدا زۆر لە کارەکانی لەسەر دەستی بەندەکانیدا فەراهەمی ئەهێنێ، وەکو ئەم هەموو شتەی کە ژیانی لەسەر ڕاگیرەو بە هۆی کردەوەی بەندەیەوە فەراهەم ئەبێت، بەڵام چونکە دەقی پێوە گیراوە، هیچ سەرسوڕمانی تێدا نیە.

دووەم دەسەڵات لەو دەسەڵاتە تایبەتیەی حەزرەتی سولەیمان بریتی بوو لە زاڵکردنی بەسەر جنۆکەو شەیاتیندا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱلشَّيَـٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ * وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ﴾ شەیاتینمان ژێر بار کردووە بۆ سولەیمان، تاقمێ بۆ ئیش‌و کار، خانوو ماڵکردن‌و شتی تر، تاقمێ خۆیان بکەن بە قووتا لەناو بەحرەکاندا شتی عەنتیکەو نایاب دەربهێنن، ئەوانەیان کە پێچەوانەی فەرمان بجووڵێنەوە یا خراپە ئەکەن‌و بەد ڕەفتارن کۆت‌و زنجیریان بکات‌و دەست‌و قاچیان ببەستێ‌و جڵەویان بکات.

ئینجا سەر باقی ئەم هەموو دەسەڵات‌و سەڵتەنەت‌و سامانە زۆرەی کە دای بە حەزرەتی سولەیمان بەریشی مەرەخەس کردو بەرگری نەکرد کە بە ئارەزووی خۆی بکوژو بیڕ هەر خۆی بێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿هَـٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ وتمان بە سولەیمان ئەم هەموو زۆرو دەسەڵات‌و سامانە بەخشینی ئێمەیە دامان بە تۆو بەرگری ناکرێت چی ئەدەی بە هەرکەس بیدە، کێ بێ بەش ئەکەیت بێکە، بێئەمەی پرسیارت لێ بکرێ لە لایەن ئێمەوە، خوای گەورە بۆ زیادە ڕێز گرتنی ئەوەی لەگەڵ دا کرد لە دنیادا، بۆ ڕۆژی قیامەتیش ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ بێگومان بۆ سولەیمان هەیە نزیکیی لە ئێمەوە، واتە پلەو پایەی بەرزی هەیە لای ئێمەو پاشەڕۆژی شیرین‌و جوانی هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا.

﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ٤١﴾

ئینجا دێته سەر باسی بەڵاو دەردو دای حەزرەتی ئەیوبو خۆگرتنیو لەپاشدا ڕەحمی خوا بۆ ئەو، ئەفەرمویٰ: ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ﴾ باسی بەندەی ئێمە ئەیوب بکە. دەنگو باسی بەڵای ئەیوبو سەبرکردنی داوەتەوە لە هەموو جیهاندا، بەڵام ئەم سەرگوزەشتەیە وەکو زۆربەی بەسەرهاتو سەرگوزەشتەی پێغەمبەرانی تر ـ سەلامیان لێ بێت ـ تێکەڵ بووە لە ئیسرائیلیات، پێویستە خۆپاراستن لە زیادو کەم، ئەوەی کە مەترسیی لێ نەکریٰ ئەمەیە کە ئەیوب پێغەمبەر بەندەیەکە لە بەندە چاکەکانی خواو پێغەمبەری خوا بووە، خوا بەڵاو ناڕەحەتیی دا بەسەری دا، ئەویش چاك خۆی ڕاگرتو سەبری کرد، بەڵاکەی بریتی بوو لە نەخۆشی گرانو نەمانی ماڵو سامانو خێزانی لەگەڵ ئەوەدا بەردەوام بوو لەسەر یادی خواو ڕەزامەندی دڵی بەو بەشەی خوا دابیٰ.

کاتیٰ نەخۆشیەکەی درێژەیی کێشاو زۆر سەخت بوو، خزمو دۆستەکانی لێی دوورکەوتنەوە جگە لە چەند کەسێکی کەم لەوانەی کە بەوەفا بوون، یەکیٰ لەوانە حەرەمی بوو، ئینجا شەیتان خەتەرەی ئەخستە دڵی ئەمانیش ئەگەر خوا ئەیوبی خۆش بویستایە ئاوا دووچاری نەئەکرد، ئەم خەتەرە لە دڵیان دا وا بەهێز بوو تا ئاخری دەرکاندیشیان، حەزرەتی ئەیوب بەو قسانە زۆر دڵی بریندار ئەبوو ئازاری زۆری پێئەگەیشتو تا ئەهات نەخۆشیەکەی زیاتر گران ئەبوو، کار گەیشتە ئەو ڕادەە کە خێزانەکەیشی هەمان قسەی دا لە ڕووی ئەیوبو ئەیوبیش بەوە زۆر تێکچوو سوێندی خوارد ئەگەر خوا ڕزگاری کردو ناساغی لەسەر هەڵگیرا ئەبیٰ چەند داریٰ ـ سەد یان هەرچەند ـ بدا لە خێزانەکەیو پاڕایەوە لە خوای گەورە کە ڕزگاری بکات لە دەست ئەو نەخۆشیە، وەکو ئەفەرمویٰ: ﴿إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ئەیوب هاوارو دەنگی بەرز کردەوە بۆ لای خوای گەورە پەروەردگاری وتی: شەیتان بە هیلاکی بردوومو ئازاری پێگەیاندووم.

کتێبەکانی تەفسیری قورئان زۆر شتیان وتووە دەربارەی مەبەست لەم ئێشو ئازارەی شەیتانە، هەروەها هۆی ئەو سوێندەی کە خواردی لە خێزانی، لە نێوان ئەو هەموو قسانەدا ئەوەی لە دڵدا جێگیر بیٰ ئەو خەتەرە بوو کە شەیتان خستیە دڵی دۆستو کەسانی خێزانیەوە کەلە ڕووی دا کردیان وەکو باسمان کرد.

ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى
ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾
وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى
ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾

---

ئینجا خوا نزاکەی وەرگرت‌و تەندروستی پێدایەوە بە جۆرێ وەکو موعجیزە، پێی فەرموو: ﴿ارْكُضْ بِرِجْلِكَ﴾ پێ بکوتە بە زەوی دا، ئەویش کە ئەوەی کرد، ئیتر بە فەرمانی خوای گەورە کانیاو هەڵقوڵا لە ژێر پێیەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾ ئەویش خۆی لێ شۆری‌و لێیشی خواردەوە، کە بەهۆی ئەوەوە دیوی دەرو ناوی لەشی بە جارێ بەو ئاوە بە فەرمانی خوا پاك‌و خاوێن‌و بێ دەردو دا بووەوەو تەندروستی تەواوی بۆ هاتەوە، لە بارەی کەس‌و کارو رۆڵەو وەچەی ئەبوویەوە، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ ئەو کەس‌و کارو خێزانەی کە نەمابوون پێماندایەوە لەگەڵ ئەوەندەی تریشدا، ئیتر ئەوانەی کە مردبوون ئاخۆ بۆی زیندوو کردوونەتەوەو ئەوەندەی تریشی پێدا؟! یان مەبەست ئەوەیە ئەو کەس‌و کارەی کە بەهۆی نەخۆشیەکە پرژو بڵاوبووبوونەوەو جوێ بووبوونەوە لێی، هەموو ئەوانە یەکیان گرتەوەو هاتنە لای، بێجگە لەوانەش ئەوەندەی تریشی پێدا، هەر جۆرێ بووبێ، خوا بەوە زیادە رەحم‌و رێزو دڵنەواییە بە ئەیوب پێغەمبەری کرد لەبەر میهرەبانی لە لایەن ئێمە بە ئەیوب، بوو بە پەندو ئامۆژگاری بۆ خاوەن ژیریی‌و هۆشمەندەکان.

لە بابەت سوێندەکەی دەربارەی خێزانەکەی، خوای گەورە چارەسەری ئەویشی بۆ کرد لەپاداشتی ئەو هەموو خزمەت‌و چاکەیە کە دەربارەی حەزرەتی ئەیوب کردی، هەروەکو رەحمی بە حەزرەتی ئەیوب کرد کە بە شێوەیەکی ناڕەوا ئەو سوێندەی نەباتە سەر، بەڵکو بەو شێوە کە سوێندەکەشی نەکەوێ‌و خێزانیشی دووچاری سزای ناڕەوا نەبێ، ئەوەیش بەم جۆرە: فەرمانی دا کە چەپکێ شووڵی بچووك ژمارەی بە گوێرەی سوێندەکەی بێ، ئینجا بە یەك جار لێی بدات، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ﴾ چەپکێ شووڵ بە دەستەوە بگرەو بە یەکجار لێدانی پێبکەو سوێندەکەت ئیتر ناکەوێ، ئا بەو جۆرە خوای

گەورە نازو نیعمەتو ڕێزی ڕژاند بەسەر حەزرەتی ئەیوبدا لە پاداشتی ئەو خۆگرتنو سەبرەی کە بووی لە ژێر باری گرانی ئەو هەموو بەلایەدا، ڕێزی گەورە ئەمەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ هەتا هەتایە سەنای ئەکاو جاڕی پیاوچاکی بۆ ئەداتو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ بێگومان ئەیوبمان دەست کەوت بە بەندەیەکی خۆگری بەسەبر، ئەیوب چ عەجەب چاك بەندەیەکە، چونکە بێگومان لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، ڕووی کردۆتەوە ئێمەو گەڕایەوە بۆ لای ئێمە.

پاش گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی ئەو سێ پێغەمبەرە ـ سەلامیان لێ بێت ـ کە ئەندازەیە بە درێژیی قورئان لێی دواوە، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) بیریان لێ بکاتەوە، تا باشتر خۆی بگرێو سەبر بکات لەسەر ناپیاوی بێبڕواکان، پاش ئەوە ئینجا باسی کۆمەڵێ لە پێغەمبەران ئەفەرموێ: کەلە بەسەرهاتو باسی کۆمەڵێ لەو پێغەمبەرانەدا بەلاو تاقی کردنەوەو سەبر کردن هەیە، بە وێنەی سەرگوزەشتەی حەزرەتی داودو سولەیمانو ئەیوب کە باس کرا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ﴾ باسی بەندەیانی ئێمە بکە، ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقوب، کە خاوەنی هێزو توانا بوون لە پەرستنو گوێڕایەڵی خواو کردەوەی باش دا، خاوەنی چاوو دڵی ڕووناكو بینایی بوون لە ناسینی خواو هەموو شتێکی حەقو ڕاستدا، واتە ئەوانەی کردەوەی چاکیان نیەو نەزانن وەکو شلە تەپەو کوێرو شێت وان. یەکێ تر لەو سیفەتانەی کە پلەو پایەیانی پێ بەرز بووەتەوە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ﴾ ئێمە ئەو سێ پێغەمبەرەمان گێڕاوە بە بەندەیەکی تایبەتی خۆمان بە هۆی سیفەتێکی پاكو خاوێن، کە شتی تری تێکەڵ نیە، ئەویش بریتیە لە بیرکردنەوەو یادی هەموو کاتیان بۆ ڕۆژی دواییو ماڵی ئەو دنیایان، بێگومان ئەم بیرو یادە ئەبێتە هۆی گوێڕایەڵی خوا، ئەبێتە هۆی دووركەوتنەوە لە هەموو شتێکی خراپو ناڕەوا، بە گوێرەی ڕادەی هێزو جێگریی ئەم یادە، یادی بەهێزترو جێگیر تر ئەبێ لە دڵو دەروونـدا، یادی خواش بەنرخترینو گەورەترین مەبەستو ئامانجە. بەرزترین ڕادەو پایەیە کە بەندەکانی خوا پێی ئەگەن، کەواتە بەهۆی ئەو یادەوە گەیشتنە ئەو ڕادە کەلە حەقیان ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ﴾ بێگومان ئەم سیانە لە بەندە چاکەکانو هەڵبژێرراوەکانن لای ئێمە.

وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴿٤٨﴾ هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴿٥١﴾

---

ئینجا باسی سیانی تر ئەفەرموێ، کە یەکێکیان ناسراوەو بە ناوبانگە، بەڵام ئەو دوانەکەیان وەها نین، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴾ باسی ئیسماعیلو ئەلیەسەعو ذا الکفل بکە، هەموو ئەمانە لە چاکترین کۆمەڵن، ئا بەم جۆرە خوای گەورە تەمێو ئامۆژگاری گەورەترینو خۆشەویست ترین پێغەمبەرانی ئەکات ـ سەلامی خوا لە هەموویان بێت ـ کە بیر بکاتەوە لە براکانی، دەرسو عیبرەت وەرگرێ لە بەسەرهاتەکانیانو بە دڵ لەگەڵ ئەوو دۆستانی خوادا بژی، خۆی بگرێ، پەلە نەکات هەردوو جیهان بۆ ئەو ئەبێ، وەکو برا پێغەمبەرەکانی ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ.

لەمەوپێش باسی ژیانی کۆمەڵێ لە بەندە هەڵبژێرراوەکانی خوا بوو، یادی ئەو هەموو بەڵاو سەبر کردنەیان بوو لەگەڵ پاداشتی خوای گەورەی میهرەبان دەربارەیانو ڕێز پێدانیان، باسی ئەو ژیانە بەرزە بەناوبانگە بوو، وەکو ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا ذِكۡرٞۚ﴾ ئەمەی کەلە پێشەوە باسکرا، لە بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانە شەرەفو ناوبانگی بەرز بوو بۆیان لەم زەویەدا، ئینجا ئەڕوا بۆ باسی پاشەڕۆژی ئەو دنیای هەموو لە خواترسەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ﴾ بێگومان پاشەڕۆژێکی جوانو شیرین هەیە بۆ هەموو لە خواترسەکان. ئینجائەم پاشەڕۆژە ڕوون ئەکاتەوە بە باسی هەندێ سیفەتو ناونیشانەکانی، ئەفەرموێ: ﴿جَنَّٰتِ عَدۡنٖ﴾ ئەو پاشە ڕۆژە بریتیە لە بەهەشتو باخاتو بارەگای خۆشو شوێنی مانەوەی بێبڕانەوە. ﴿مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ﴾ کە ئامادە کراوەو قاپیەکانیان کراوەتەوە بۆیان لە پێش چوونیان بۆئەوێ، چاوەڕوانیان ئەکرێ، ئەوەیش بۆ زیادە ڕێزگرتنە. ﴿مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ﴾ بە ئارامو خۆشیەوە لەسەر تەختی ڕازاوە پاڵ ئەدەنەوە لەو بەهەشتانەدا داوای میوەهاتی زۆرو خواردنەوەو ئەو شتانەی ئەکەن کە لەوێدا ئەخورێنەوە، لە ئاوی خۆش گەوارو شیری پاکو خاوێنو لە عەرەقو شەرابی خۆشی بەهەشتو هەنگوینی پاڵفتەی بێگەرد، هەرکاتو ویستیان دەست بەجێ بۆیان ئەهێنن،

﴿ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾

---

**﴿وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ﴾ حەڵاڵ وهاوسەرێکیان لامەیەکە چاویان بڕیوەتە مێردەکانیان، واتە هەر ئەوانیان خۆش ئەوێ و کەسی تریان ناوێ، هەموو گەنج و هاوتەمەنیشن، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ ئەمە شتێکە بەڵێنتان پێ ئەدرێ بۆ دوای زیندووبوونەوەتان و ڕزگاریتان لە ئاگر لە ڕۆژی دوایی دا، ڕۆژی پرسیارو حیساب، لە هەموو شت خۆشتر ئەمەیە ئەم هەموو خۆشی و نازو ڕێزە نەبڕاوەیەو دوایی نەهاتوو، خۆشیان ئەزانن وایە، بە خۆشی و شادمانیەوە ئەڵێن، وەکو ئەفەرموێ لە زمانی ئەوانەوە: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ﴾ بەهەشتیەکان ئەڵێن: ئەم نازو نیعمەتە بەش و ڕۆزیی ئێمەیەو بڕانەوەو نەمانی نیە.**

**ئینجا باسی پاشەڕۆژی سەرکەشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا﴾ بێگومان کار ئەمەیە کەوا باسکراوە: ﴿وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ﴾ بێگومان خراپترین و نالەبارترین پاشەڕۆژ هەیە بۆ سەرکەشان ﴿جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا﴾ ئەو پاشە ڕۆژە خراپەو ئەو شوێنە ناهەموارە کە ئەمانەی بۆ ئەڕۆن دۆزەخێکە کە پێی ئەسوتێنرێن و داگیریان ئەکات لە هەموو لاوەو داخ ئەکرێن پێی. ﴿فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ کەواتە ئای چ خراپترین جێگاو شوێنێ ئامادە کراو!! چ قەرارگایەکی خراپە ــ خوا پەنامان بداتێ ــ ﴿هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ﴾ عەزابی سەخت و سزای بەسۆ ئەمەیە، دەی با بیچەژن کە بریتیە لە ئاوێ گەیشتبێتە ئەوپەڕی پلەی گەرمی لەگەڵ کێم و زوخێ کەلە لەشی دۆزەخییانەوە هۆنە ئەکاو دێتە دەرەوە، واتە با ئەمە بخۆنەوە لە باتی ساردەمەنی و بیکەن بەسەر خۆراکی ناهەمواری جەهەنەمدا. ﴿وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ﴾ لە شێوەی ئەو سزاو عەزابەی کە باس کرا، چەند جۆرێ تر عەزابیان هەیە وەکو زەمهەریرو سەمووم و زەقوم و چەند شێوەیەکە نموونەی لە دنیادا دروست نەکراوە، هەر خوا ئەزانێ چۆنە.**

هَٰذَا فَوۡجٞ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡۚ إِنَّهُمۡ صَالُواْ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ بَلۡ أَنتُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِكُمۡۖ أَنتُمۡ
قَدَّمۡتُمُوهُ لَنَاۖ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾
وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالٗا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلۡأَشۡرَارِ ﴿٦٢﴾

**ئینجا شێوەی دۆزەخیەکان نیشان ئەدا کە پۆل پۆل ئەخرێنە ناو ئاگر هەرچەند لە دنیا دۆستو خۆشەویستیەك بوون، لەوێ ئەبن بە ناحەزو دوژمن، شەڕە قسەو شەڕە جوێن ئەکەنو ڕقو کینە دەرئەبڕن، دەربارەی یەك، ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا فَوۡجٞ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ﴾ ئەوترێ بە سەرۆکە سەرکەشەکان کاتێ ئەچنە ناو ئاگر، چەند پۆلو کۆمەڵێ لە ژێر دەستەکانیان لەگەڵدایە، ئەوترێ بەو سەرۆکانە ئەمە پۆلێکە بە سزاو نارەحەتی لەگەڵ ئێوەدا دێنە ناو ئاگر، سەرۆکەکانیش پێیان ئەڵێن: ﴿لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡۚ﴾ بەخێر نەیەن، مەرحەبایان لێ نەبێ. ﴿إِنَّهُمۡ صَالُواْ ٱلنَّارِ﴾ ئەوانەی بە هۆی کردەوەی خراپی خۆیانەوە بە وێنەی ئێمە ئەچنە ناو ئاگرەوە، لە وەڵامیاندا شوێن کەوتووەکان، ﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن: ﴿بَلۡ أَنتُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِكُمۡۖ﴾ نەخێر ئێوە بەخێر نەیەنو مەرحەباتان لێ نەبێ، چونکە: ﴿أَنتُمۡ قَدَّمۡتُمُوهُ لَنَاۖ﴾ ئێوە لە دنیادا هۆی ئەم عەزابەتان پێش خست بۆمان، فریوتان داین، هانە هانەیان ئەداین لەسەر پەیڕەوی ئێوە لەو بیروباوەڕە نارەواو کردەوە خراپانەدا. ﴿فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ﴾ جا بە هۆی ئەوەوە، ئای چ عەجەب خراپترین مەنزڵو قەرارگەو پاشەڕۆژێ بوو بۆ ئێمەتان بەرهەم هێنا، ئینجا دوعای شەڕیان لێ ئەکەن: ﴿قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ﴾ ئەڵێن ئەی پەروەردگاری ئێمە، هەرکەس هۆی ئەم عەزابەی بۆ پێشخستین لە دنیادا دوو چەندانەی عەزابی ئاگری بۆ زیاد بکە لە باتی گومڕایی خۆیانو گومڕاکردنی ئێمە.**

**ئینجا ئەو سەرکەشانە کەلە دنیادا ئەیان خوڕی بەسەر موسڵمانە هەژارەکانداو بە چاوی سووكو ڕیسوایی تەماشایان ئەکردن، بە پیاو خراپو سەر لێ تێکچوو بەد بەختیان ئەزانین، ئەو سەرکەشانە خۆیانو شوێن کەوتووەکانیان لە ئاگردا ئەسوتێنو موسڵمانە گاڵتە پێکراوەکان دیارنین لەو کاتەدا، ئەو سەرکەشانە پرسیار ئەکەن لێیان، ئایا لە کوێنو بۆ کوێ ڕۆیشتن، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالٗا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلۡأَشۡرَارِ﴾ سەرکەشەکان ئەڵێن: ئەوە چیەو چیمانە کە نابینین ئەو پیاوانەی کەلە دنیادا بە گومڕاو خراپمان دائەنان.**

أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾

**﴿ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا ﴾ گاڵتەمان پێئەکردن و کردبوومانن بە گاڵتەچی خۆمان، واتە ئایا ئەوانە لێرە نین؟ ﴿أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ یان لێرەن و پێش چاومان ناکەون و چاومان لێیان کەلا بووە[1] لە پاش ئەوە بۆیان دەرئەکەوێ کە ئەو گاڵتە پێکراوانە وان لە ناو ناز و نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشتدا، هەردوولا، هەرکەس لە شوێنی خۆیەوە ئەوی تر ئەبینێ و بانگی یەکتری ئەکەن، وەك وێنەمان لە سورەتی ﴿الصافات﴾دا باس کرد، ئەو ئاژاوەو شەڕە جنێوو قسەی دۆزەخییانە لە چەند شوێنی تردا باسی ئەفەرموێ و ئەیخاتە پێش چاو، بەڕاستی سەرباقی ئەو هەموو عەزاب و سزای دۆزەخە ئەو ڕق و کینەبەریی و شەڕە جنێوو قسەی ناشیرینە، سزاو عەزابێکی ئێجگار کاریگەرە لە دەروونی ئەو دۆزەخیانەدا، بە شێوەیەك کە شایانی ئەوەیە قورئان لە چەند شوێندا باسی بفەرموێ، شایانی ئەوەیە کە ئاوا دڵنیایی بکرێ لەسەری کە شتێکی ڕاستەو دێتە دی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴾ بێگومان ئەو ئاژاوەو شەڕە قسەی دۆزەخیانە حەق و ڕاستە، ڕوو ئەدات لە نێوانیاندا.**

**ئینجا لە دوا دوایی سورەتەکەوە ئەگەڕێنەوە بۆ باسکردنی ئەو سێ مەبەستەی کەلە سەرەتای سورەتەوە باسی کرد: تاك و تەنیایی خواو وەحی هاتن بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و پاداشت و تۆڵەی ڕۆژی قیامەت. ئەگەڕێنەوە بۆ ئەو سێ مەبەستە گرنگە، بۆ جێگیر کردنیان لە دڵ و دەروندا، باسی حەزرەتی ئادەم دێنێتە پێش چاو بۆ ئەمەی ببێتە بەڵگەو دەلیل لەسەر وەحی ناردنی خوا بۆی، دوژمنایەتی نەبڕاوەی شەیتان لەگەڵ ئادەمی دا پیشان**

---

[1] ئەمەی کە وترا بە گوێرەی خوێندنەوەی پیتی ﴿أ﴾ لە وشەی ﴿ أَتَّخَذْنَٰهُمْ﴾دا کە پیتی ئەلفەکە بە ژێر ئەخوێنرێتەوە، بەڵام بە گوێرەی خوێندنەوەی بەسەر ئەوەیش هەر ئەبێ بەڵام ماناکەی ئەگۆڕێ و ئەبێ بە پرسیار دەربارەی ئەو گاڵتەو لاقرتیەی کەلە دنیادا کردوویانە بە موسڵمانان، ئەو کاتە وشەی ﴿أَمْ﴾ هاوتای ﴿ أَتَّخَذْنَٰهُمْ﴾، یان سەربەخۆیە، جا بەو گوێرەی باسمان کرد، ئەبێ بڵێین، ئەگەر بە شێوەی: أ- ئایا ئەوان بوون کە گاڵتەمان پێئەکردن، یان هەر ئەوەندە بێ نرخ بوون لامان، هەر سەیریشمان نەئەکردن، چاومان بۆی نەئەڕوانی. ب- بە گوێرەی دووەم: واتە ئەزان و تێئەگەیشتوو بووین کە بەبێ نرخ تەماشای ئەوانمان ئەکرد.

ئەدات و تێكۆشانی هەموو كاتێ بۆئەوەی گەورەترین ژمارە لە نەوەكانی ئادەم بخاتە ناو چاڵی نەگبەتی، لەگەڵ خۆی دا بیانبات بۆ ناو ئاگری دۆزەخ. ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانەی كە باوەڕیان بە تاك و تەنیایی خوا نیە و هاوبەشی بۆ ڕەوا ئەبینن، بڵێ: من وەها نیم كە ئێوە گومان ئەبەن، من لەلایەن خواوە ئەتانترسێنم بەسزاو عەزابی سەختی خوا ئەگەر نەگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگای ئەو جگە لەوە هیچی ترم بە دەست نیە، هەر ئەوەشم لەسەرە پێتان ڕاگەیەنم، ئیتر هەموو كارێكیش بە دەست خوایە، ﴿وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ * رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ﴾ هیچ خوایەكی ترنیە، هیچ پەرستراوی بەحەقیانەت نیە جگە لەوەی كە ناوی ﴿الله﴾یە، كە تەنها و تاكە، زاڵە بەسەر هەموو شتێكدا، هیچ كەسێكی لێ یاخی نابێ، بیەوێ تۆڵە لەهەركەسێ بسێنێ ئەیسێنێ و بەرگری ناكرێ، پەروەردگاری هەموو ئاسمانەكان و زەوی نێوانیانە، كەواتە هیچ هاوبەشی نیە، هیچ سایە و پەنایەكی تر نیە پەنای پێ ببرێ ئەو نەبێ هەر ئەوە هێز و دەسەڵاتی نەبڕاوەی بێ‌سنووری هەیە،زۆرلێ بوردەیەلەگوناه وتاوانی بەندەكانی، تۆبەی تۆبەكارانی وەرئەگرێ وگوناهەكانیان ئەسڕێتەوە و دائەپۆشێ، هەرچەند ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە زۆرترە و پێشكەوتوو ترە لە غەزەب و قین و سزای، بەڵام لێرەدا دوو سیفەتی ئێجگار بە سام و ترسێنەری باس كرد ﴿قهار، عزیز﴾ و پێشی خستن، دوای ئەوانە سیفەتێكی ڕەحم و بەزەیی باس فەرموو، سیفەتی ئارامی و ئاسایش دەر، سیفەتی ﴿غفار﴾ لێ بووردەیی، چونكە شوێنەكەی شوێنی ترساندنە، ئەبێ ئەم بارە بەهێز بكرێ لە پێش چاو. ئەم قورئان گەورە، ئەم هەواڵە گرنگە كە پێغەمبەر(ﷺ) هێنای لای پەروەردگاری ئاسمانان و زەویەوە، ئێجگار گەورە و گرنگ و بەنرخە، ئەمە كارێكە لە كارە گرنگەكانی خوا لەم بوونەوەرەدا، ئەمە تەنها بۆ وڵات و گەل و چینێ نەهات، بەڵكو بۆ هەموو وڵات و گەل و چینەكان هات بۆ هەتا هەتا، وەكو هەر لە سەرەتای هاتنەوە ڕوونی كردەوە بێ پێچ و پەنا بە چەند ئایەتێ: ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾[1]

---

[1] دوایین ئایەتی سورەتی ﴿ن﴾ واتە: ئەم قورئانە پەندو ئامۆژگاریە بۆ هەموو عالەم.

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾[1] هات بۆئەوەی کە هەموو بارو ڕووی ژیان وەرگێڕێ‌و ڕەچەو ڕێگا دیاریی بکات، ڕادەو نرخی هەموو شتێك ڕوون بکاتەوە، ئەمانە هەمووی بە جۆرێ دانراوە کە تەواو ڕێك‌و گونجاوە لەگەڵ ڕژێمی کاروباری بوونەوەردا، ئەو مەبەست‌و ئامانجەی بۆی هات جێ بەجێبوو تا ماوەیەك ئەوە بوو چەند ماوەیەك جڵەوی ژیانی گرتە دەست لە زۆرترین ئاوەدانی زەوی دا، بە جۆرێ بردی بە ڕێوە کە هەموو مێژووی ئادەمی سەرسامە لێی، هەموو خێرو بێرو چاکیەکی ڕژاند بەسەر زەوی دا، نەك تەنها بۆ باوەڕداران، بەڵکو بۆ ئەوانەیش کە دوژمن‌و دژی بوون‌و لە ژێر دەستی دا بوون، هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو وەکو خۆر وا بە ئاسمانی ئادەمێتیەوە لەو کاتەوە کە هاتووە، هەتا هەتایە تیشك‌و ڕووناکی ئەهاوێژێ بۆ دۆست‌و دوژمن، دوچمنەکان بە ئارەزووی خۆیان سوودیان لێ وەرگرت، بەڵگەی تەواویش لەسەر ڕاستیی ئەمە مێژووی چەرخەکانی ناوەڕاستی ئەورووپایە، ئەو کاتەی کە چەرخی موسڵمانەکان ناونرابوو بە چەرخی ئاڵتوونی، بەوانیش ئەوترا چەرخەکانی تاریکیی، لەو کاتانەدا بوو کە ئەورووپاییەکان بە دەست دامانەوە ئەهاتن‌و لە قوتابخانەو زانکۆو زانستگاکانی ئیسلامدا ئەبوون بە قوتابی‌و فێری زانیاری جۆر بە جۆر ئەبوون، ئەمە شتێکە کە دوژمنان خۆیان دانی پیا ئەنێن،کەچی زۆر لە نەفامەکانی کۆمەڵەی ئیسلام، ئەوانەی کەلە نەوەی موسڵمانانن بەڵام بەشیری بێگانە گۆش کراون، ئەوانە لەبەر نەفامی‌و نەزانینیان باوەڕیان بەم شتە ڕاستە نیە، بێ ئاگان لە گەورەیی ئەو قورئانە، وەکو بەدبەخت‌و بێبەشەکانی یەکەم چین کە ئەم قورئانەیان ئەچوو بە گوێچکەدا، بەڕاستی نەفامی‌و سەر لێ تێکچوونی ئەمانەی ناو گەلی موسڵمان ئێجگار لە سنوور دەرچووە، زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو تاقمی یەکەم جاری ئەو قورئانەدا، چونکە ئەوانەی یەکەمجار: کردەوەو بەرهەمی ئەم قورئانە لە جیهاندا پێش نەکەوتبوو تا بیانبیستایەو بیانبینیایە.

---

[1] ئایەتی یەکەمی سورەتی ﴿الفرقان﴾ واتە: پیرۆزەو بێ هاوتایی بۆ ئەو کەسەی کە قورئانی نازڵ کرد بۆ بەندەی خۆی کە (محمد)ە، بۆئەوەی ببێتە ترسێنەر بۆ هەموو عالەم.

قُلْ هُوَ نَبَؤٌا عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰٓ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾

به عاریان ئەزانی لادەن لە ئایین و بیروباوەڕی باوباپیرانیان. بەڵام ئەمانەی ئێستای ناو کۆمەڵەی ئیسلام سەر لێ تێکچوونەکەیان ئەوەندە بەهێزەو زیفی لێ سەندوون چاو ئەنووقێنن و گوێیان کەڕ ئەکەن لە ئاستی بینین و بیستنی بەرهەمەکانی قورئان، بە عاریشی نازانن، لادان لە ئایین و بیروباوەڕی باووباپیریان، هیچ نەبێ کوێرانە ناکەونە شوێن باووباپیریان بەڵام بە شانازیەوە کوێرانەو کەرانە ئەکەونە شوێن دوژمنەکانی خۆیان و خاک و وڵات و ئایین و شەرەفیان، کەواتە ئەمانەی ناوخۆ زیاتر شایانی بێدار کردنەوەو داچڵەکاندنن تا چینی یەکەمجار، بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ نَبَؤٌا عَظِيمٌ * أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: قورئان هەواڵ و دەنگ و باسێکی زۆر گەورەیە کەلە لایەن خواوە هاتووە ئێوە پشتتان تێکردووە، لەبەر نەفامی و نەزانی ڕووتان لێ وەرگێڕاوە، بەڵێ بەڕاستی زۆر گەورە بوو، هیچ شتێک و هیچ کەسێک نەیتوانی بەرگری بکات و لێ بگرێ، لە کاتی هاتنە خوارەوەی هەتا ئێستا و لە مەولاش هەموو دوژمنە داخ لە دڵەکانی بە هەموو جۆرو بە هەموو هێزو هەموو ئەو دەسەڵات و توانایەوە کە بوویانە، بەو زۆرییەی کەلە سنوور دەرچوو لەم هەموو ماوە درێژەدا نەوەستان و ناشوەستن، هەموو شتێکیان خستە کار بۆ بەرگریی ئەم قورئانە، بەڵام هیچ نرخی نەبوو نەتوانرا ڕەخنەیەک بدۆزنەوە لە ڕووی ڕاستیەوە بتوانن و بوێرن دەری بڕن مەگەر لە پەنهانی دا ئەویش لەگەڵ یەکێکی نەشارەزادا، بەڵێ لەناوخۆدا نەفام و نەزانی زۆریان فریوداو فەراهەمیان هێناو بەو هۆیەوە حوکمڕانی قورئانیان نەهێشت تا هەموو دووچاری بەد بەختی و بێ ئارامی و ناڕەوایی بوون. بەڵام بەهۆی ئەوەوە ناڕاستیی و ناڕەوایی هەموو فیکرو بیروباوەڕی تر دەرکەوت، سەری هەموو شتێ تر لە بۆشیەوە دەرچوو، ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەیی قورئان ڕوون ئەبێتەوە، بەهۆی ئەوەوە پشت بە خوا ئەبێ هەموو بگەڕێتەوە بۆ ژێر سایەو سەمەندی بێ وێنەی قورئان، ئەبێ زۆر ئاشکرا بێ کە ئەم قورئانە لای خواوە هاتووەو ئەوەی کە گەیاندنی بە بەندە، پێغەمبەری خوایە، ئەگەر نا پیاوێکی نەخوێندەوار لە قەومێکی نەخوێندەواری دوور لە دەنگ و باس، ئایا چۆن لە توانای دا بوو کە ئەم قورئانە بێنێ لە لایەن خۆیەوە کە ئەو لە کوێ و ئەم هەموو هەواڵە

غەریبیانە لە کوێ؟! ئەو لە کوێو ئەم هەموو هەواڵە لە کوێ کە پڕ بە پڕ لەگەڵ پەڕاوە ڕاستەکانی ئایینەکانی تردا دەرچوو، بەڵکو کاتێ چەندو چوونو ناکۆکیان بووایە لە نێوان یەکدا قورئان بە ڕێکی باسەکەی بۆ ئەکردن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾[1] یەکێ لەو هەواڵانە کە ڕێک لەگەڵ پەڕاوە ڕاستەکانی پێشوو، ڕێگە نیە بۆ زانینی جگە لە وەحی، دەنگو باسی وەدیهێنانی ئادەم قسەو باسی مەلائیکەکان لەو بابەتەوە، وەکو لێرەدا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ)، کە ئەو باسە بکاتو بیکات بە بەڵگەو نیشانە لەسەر پێغەمبەرێتی خۆی، ئەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ بڵێ: من هیچ لەمەو پێش نەمزانیوە، ئاگام نەبووە لە کۆمەڵی هەرە بەرز، لە کۆمەڵی مەلائیکەتەکان کە ئەکۆڵنەوە لە دروست کردنی حەزرەتی ئادەم، لە شایانی بوونی بە جێنشینی لە زەوی دا، سوجدە بردنی مەلائیکەت بۆی، سەرکەشیی شەیتان لەو فەرمانە ـ نەفرینی خوای لێ بێ ـ واتە: هۆی زانینم بۆ ئەم جۆرە شتانە ئەوەیە کە وەحیم بۆ هاتووە لە لای خواوە، ئاشکرایشە: ﴿إِنْ يُوحَىٰ إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ وەحیم کە بۆ دێت هەر بۆئەوەیە کە من ترسێنەرێکی ڕوونو ئاشکرابم، کەواتە ڕاست بوو کە من لەسەر فەرمانی خوام وەکو لەمەو پێش پێم وتن: ﴿أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ﴾ دوای ئەم مەبەستە، دێتە سەرباسی حەزرەتی ئادەم کە نەك لەم سورەتەدا، بەڵکو لە پێنج سورەتی تریشدا باسی هاتووە کە ئەوانەش سورەتی ﴿البقرة، الأعراف، الحجر، الإسراء، الكهف﴾ە، لە هەموو ئەو شوێنانەدا بە گوێرەی پێویستو پەیوەندی بە مەبەستی شوێنەکانەوە باس کراوە، لێرەدا بنەڕەتی باسکردنی ئەو مەبەستە بۆ ئەمەیە، بەڵگە بێت لەسەر پێغەمبەرێتی، وەکو وتراوە لەو دەنگو باسە، ئەوەی پەیوەندی ببێ باسی فەرمووە بۆ ترساندنی ئەوانەی کە لایان وابوو پێغەمبەر (ﷺ) شایانی پێغەمبەرێتی نیە، حەقی پیاو ماقوڵەکانی خۆیانە، وەکو ئەبوجەهلو ئەوانی تر، کە وەکو لەمەوپێش باس کرا. جالێرەدا ئەوانە ئەترسێنێ بەمەی کە شەیتانیش لای وابوو کە ئادەمی شایانی سوجدە بۆ بردن نیە، بەڵکو خۆی شایانی ئەوەیە، بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە نەفرینی لێ کردو تەوقی لەعنەتی کردە ملی. جا هەرکەس ئاوا ڕەخنە لەکاری خوا بگرێ، بترسێ لە خۆی کە وەك شەیتانی لێ بێ،

---

[1] واتە بێگومان ئەم قورئانە دەربارەی هەر شتێك کە بەنی ئیسرائیلیەکان تیای دا ناکۆك ئەبن، بۆیان باس ئەکاتو ڕوونی ئەکاتەوە بۆیان. النمل/٧٦.

إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ
﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا
مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ
وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾

**ئینجا با گوێ لە قورئان بگرین باسەکەمان بۆ بفەرموێ:** ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ﴾ ئەو لێکۆڵینەوە دەربارەی دروست کردنی ئادەمو جێنشینی ئەو لەو کاتەدا بوو کە پەروەردگاری تۆوتی بە فریشتەکان: من گیانلەبەرێك دروست ئەکەم لە قوڕ کە پێی ئەوترێ بەشەر، واتە پێستی لەشی بەموودانەپۆشراوە ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ﴾ ئینجاکاتێ کە شێوەکەییم ڕێك‌و پێك خست ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى﴾ گیانم تێکرد لەو گیانەی کە خاوەنی ڕێزو قەدەر لام ﴿فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ ئەو کاتە هەموو بکەون لە ڕوودا بۆی، سوجدەی بۆ بەرن بۆ ڕێزو قەدر پێدان.

خوای گەورە هەرچی گیانلەبەری زەوی هەیە هەمووی لە خاك دروست کردووە، هەموو شتێ لە خاکە جگە لەو شتە نهێنیە کە بریتیە لە گیانەکەی کە کەس نازانرێ چیەو لە چی پەیدا ئەبێ‌و لە کوێرەدێت، هەروەها ئادەمیش هەموو شتی هەر لە خاکە جگە لەو ڕۆحە تایبەتیە کە جیاوازی پێ پەیدا کردووە لە نێوان هەموو گیان لە بەراندا، پادەی بەرز کردۆتەوە لە هەمووان بە بیرو ژیریی، لەگەڵ ئادەمی دا چەند تیرەو جۆری تر گیانلەبەران بوون، لەم ماوە دوورو درێژەدا هەرگیز ڕێك نەکەوت تیرەیەك لەو تیرانە یان تەنها نەفەرێك لەوانە نزیکی پلەی ئادەمی ببێتەوە، تەنانەت لەسەر باوەڕی ئەوانیش کە ئەڵێن گیانلەبەر بە یەکجار بە هەموو ئەندامیەوە پەیدا نەبووە. بەڵکو تەنها ئەندامێك پەیدا بووەو بەرەبەرە گۆڕاوەو بەرزتر بووەتەوە ڕوو بە گیانلەبەری تەواو تا وای لێ هاتووە کە ئەبینرێ.

خوای گەورە ئادەمو ئادەمیی ئاوا جوێ کردەوە لە هەموو گیانلەبەران، چونکە خواهیش وابوو کە بیکات بە جێنشین بۆ خۆی لە زەوی دا، کاروباری ئاوەدان کردنەوەی بخاتە ژێر دەست بە هەموو پێویستیەکەوە لە سنوورێکدا کە بۆی داناون، لەبەرئەوە توانا و هێزی

داونەتێ بۆ بەرز بوونەوەیان لە زانینێو زانیاری دا، کەواتە هەموو ڕێزو قەدری ئادەمی ئەگەڕێتەوە بۆ ڕۆحە تایبەتیکەی، لە ڕۆژێکەوە کە پەیدا بووە هەتا ئێستاو لەمەولاش هەرکات پەیوەندی خۆی نەپچڕێنێ لەو خوایە کە ئەو ڕۆحەی داوەتێو بەگوێرەی فەرمانی ئەو جولاّبێتەوە پلەی ئادەمێتی بەرزتر بووەتەوە، لەسەر باری ڕاستی بووە، بەلاّم هەرکات لای دابێو لایەنو باری ڕۆحەکەی بەرەلاّکردبێ، جڵەوی خۆی خستبێتە دەست بەشە خاکەکەی، ئەو کاتە لە ئادەمێتی دوورکەوتووەتەوە، بەرەو ڕێو شوێنی گیانلەبەرەکانی تر ڕۆیشتووە تا بووەتە پیسترینو خراپترینی هەموو گیانلەبەرەکان. هیچ جۆرە نرخێکی نامێنێو ئەبێتە چڵۆسكو سووتەمەنی دۆزەخ. لەبەر ڕێزی ئەو بوو خوای گەورە فەرمانی دا کە سوجدە ببرێتە بەر ئادەم: ﴿فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ ئینجا لەبەر فەرمانی خوا هەموو مەلائیکەتەکان بە یەکجار پێکەوە سوجدەیان برد[1]. ﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ جگە بە شەیتان کە خۆی بەزل زانیو بێزار بوو لە فەرمانەکەی خواو سەرکەشی کرد لێی، بەهۆی ئەوەوە گەڕا بە یەکێ لە کافرەکان.

چەند نیشانە هەیە لەسەر ئەوە کە شەیتان لە ڕەگەزی مەلائیکە نیە، بەلاّم لەگەڵ ئەوان بووە، فەرمانەکەی خوا بۆ ئەویش بووە، واتە شەیتانیش مەبەست بووە بە تایبەتی، بەلاّم ناو نەبرا بە تایبەتی لەبەر بێنرخی بەلای خواوە، بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئەو فەرمانە بۆ ئەویش بوو ئەوەیە کە خوا تانەو لۆمەی ئەکا لەسەر سوجدە نەبردن[2]. ﴿قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ خوا فەرموی ئەی ئیبلیس چی بەرگری تۆی کرد لەمەی کە سوجدە نەبەی بۆ کەسێ کە من بە دەستی توانایی خۆم دروستم کردووە، بێهۆی دایكو باوكو شتی تر، واتە نەئەبوو وات بکردایە، پەشیمان بە لێی. هەموو شتێ خوای گەورە دروستی

---

[1] ئیتر زیاد لەمە نازانین ئەو سوجدە چۆن یان کەی یان لە کوێ بووە؟ ئەمانەو ئەمانەیان شتێکی غەیبینو زانینیان نرخێکی نیە چونکە مەبەست هەر ئەوەیە کە ئادەمی بەهۆی ڕۆحەکەیەوە ئەو ڕێزەی گیرا لە لایەن خواوە.

[2] ولیەتی ١٢ سورەتی ﴿الأعراف﴾ بە ڕێکی ڕوونی ئەکاتەوە کە شەیتان مەبەست بووە بەو فەرمانە: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾.

کردووە، کەواتە مەبەست بەم فەرموده ﴿خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ زیادە تایبەتی ئەم دروستکراوەیەو ڕێزو گرنگیەتی بەلای خواوە، ئەوەیش بەهۆی ڕۆحەکەیەتی،﴿أَسْتَكْبَرْتَ﴾ ئایاخۆتت بەگەورە زانی، لەبەر ئەوە سەرت شۆڕ نەکرد بۆ فەرمانی من، ﴿أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ﴾ یاخود لەوانەی بەرزو بڵندن، شایانی ئەوەی کە سەر بۆ کەس دانەخەیت، ئەویش لە وەڵام دا وتی: ﴿ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ ﴾ وتی: من چاکترم لەو، کەواتە ڕەوا نیە من سوجدە بۆ ئەو بەرم، بەڵگەشی ئەمە بوو ئەیوت: ﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ بەڵگە لەسەر چاکتریم ئەوەیە کە منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەوت لە قوڕ دروست کردووە، واتە من لەو بەرزترم، چونکە ئاگر لە قوڕ چاکترە، لە وەڵامەکەیەوە دەرئەکەوێ کە نەخۆشی حەسادەتی بووە، لەبەرئەوە باسی بەشە بەڕێزەکەی ئادەمی نەکرد کە بریتیە لە ڕۆحەکەی، باسی ئەو بەشەکەی تری کرد کە هەموو کیانلەبەرانی تر لە زەوی دا بەشدارن لەگەڵیدا، ئەو سەر لێ تێکچووە بەد بەختە لەو کاتە گرنگەدا ئەو وەڵامە ناشیرینە ناڕەوایەی دایەوە!

ئینجا بڕیاری بەرزی خوای گەورە دەرچوو بە دەرکردنی ئەو سەرکەشە خراپە: ﴿ قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾[1] وتی: دەرچۆ لە بەهەشت، چونکە بێگومان تۆ لە ڕەحمەتو خێرو ڕێز بێبەش‌و دەرکراوی. ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَىٰ يَوْمِ الدِّينِ﴾ نەفرینی من لەسەر تۆ جێگیر بووەو دەرکردنت لە ڕەحمەتم بەسەرتەوە هەمیشەییە هەتا ڕۆژی دوایی (ڕۆژی تۆڵە سەندن). لێرەدا پرسیارێك هەیە: بێگومان شەیتان بێبەشە لە ڕەحمی خوا هەتاهەتایە بێبڕانەوە، کەواتە بۆچی ئەفەرموێ تا ڕۆژی دوایی؟ لە وەڵامدا ئەگوترێ: کاتی دەرکردن‌و دەرنەکردن لە ڕەحمی خوا ئەم ماوەی دنیایە، هەرکەسێ لە دنیا گەڕاوە بۆ لای خواو لەسەر ئەو بارە بمرێ ئەو کەسە بەری ڕەحم‌و بەزەیی ئەکەوێ، هەرکەس لە تەواوی ماوەی دنیادا نەگەڕاوە تازە هیچی بۆ ناکرێ، چونکە لەو دنیادا گەڕانەوە سوودی نیە، کەواتە ئەم شێوەی کە ئەفەرموێ نائومێدی تەواو پیشان ئەدات بە جۆرێك دەلیل‌و بەڵگەشی لەگەڵدایە.

---

[1] لە مەبەستی وشەی ﴿ها﴾ چەند ڕایەکی تر هەیە: ڕەحمەت، ئاسمان، شێوەی مەلائیکە.

قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ قَالَ فَٱلْحَقُّ وَٱلْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾

---

**ئینجا حەسادەتەکەی بەهێزتر بوو، بوو بەهۆی کینەو ڕقێکی سەخت و هەوڵ و تێکۆشان بۆ تۆڵە سەندن، لەبەرئەوە: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ وتی: ئەی پەروەردگارم ماتوڵ تۆ من دەرئەکەیت و بێبەشم ئەکەیت لە ڕەحمی خۆت، دەی مۆڵەتم بدەو مەممرێنە تا دنیا دنیایە، لێم گەڕێ تا مردووان زیندو ئەکرێنەوە.[1] مەبەست ئەوە بوو لەم ماوە درێژەدا هەوڵ و تێکۆشان بکات بۆئەمەی زۆرکەس لە ڕێگای خوا لابدات، خوای گەورە خواهیشی وابوو ـ لەبەرئەو حیکمەتەی خۆی ئەزانێ ـ کە ماوەی بدات لەبەرئەوە: ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ * إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴾ فەرمووی: تۆ لەوانەی کە مۆڵەت دراون تا ڕۆژی دوایی ئەو کاتەی کە لای خوا دیاریی کراوە، ئەجەل و دواهاتنی ماوەی ژیانت ـ کە ئەویش لای کۆڕی زانایان ـ بریتیە لەو کاتەی کە ئەم دنیایە وێران ئەبێ و هەموو گیانلەبەرانی ئەمرن. وا دەرئەکەوێ کە شەیتانیش ئەو کاتە ئەمرێ، ئەو زیندووانەی کە هەموو ئەمرن لە پاشان پێکەوە زیندوو ئەکرێنەوە، بۆ پرسیارو تۆڵەو پاداشت.**

**ئینجا شەیتان ڕوونی کردەوەو مەبەستی لە داواکردنی ئەو مۆڵەتە: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ وتی: سوێند بە گەورەیی و دەسەڵات و سەڵتەنەتت هەموو**

---

[1] ڕۆژی زیندوو بوونەوەو ڕۆژی دوایی هەریەکە، لە وێران بوونی دنیاوە دەست پێ ئەکات بێبڕانەوە، کەواتە مۆڵەت دانی شەیتان بۆ ڕۆژی وێران بوون، مۆڵەت دانە بۆ ڕۆژی زیندووبوونەوە، تا ئەو ڕۆژە دێت شەیتان نامرێ، کە ئەو ڕۆژە هات ئەمرێو لە پاشان وەکو خەڵکی تر زیندوو ئەکرێتەوە.

ئادەمیزاد لە ڕێگای تۆ لائەدەم‌و گومڕایان ئەکەم، جگە لەوانەیان کە بەندە خاوێن کراوەکانی تۆن، واتە لەناو هەمووانیدا جگە لەوانەی کە خوای گەورە تایبەتی کردوون بۆ گوێڕایەڵی خۆی‌و پاراستوونی لە گومڕایی، یان جگە لەو بەندانەی کە دڵی خۆیان پاك‌و خاوێن کردووە بۆ خوا، ئەمەیان بە گوێرەی ﴿ل﴾ لە وشەی ﴿ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ بە ژێرە نەك بەسەرە، وەکو ئێستا باوەو پێشمان خست، ئا بەو شێوە بەرنامەو ڕێگای خۆی دیاریی کرد، ئەیەوێ: هەموو ئادەمی گومڕا بکات، هەرچی لێ بەدەر کردن بە پیاوەتی خۆی نەبوو، بەڵکو لەبەر بێ دەسەڵاتی بوو، چونکە بەرگری ئەکرێن لێی‌و پەنا دەریان هەیە کە بریتیە لە: گوێڕایەڵی خواو پەیوەندی ڕاستەقینەیان بە خواوە.

ئینجا خوای گەورەش بڕیاری خۆی دەکردو ڕێگای خۆی بەرامبەر شەیتان‌و شوێن کەوتووەکانی دیاریی کرد: ﴿قَالَ فَٱلْحَقُّ وَٱلْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئەفەرموێ: من حەقم‌و هەر حەقیش ئەڵێم: سوێند بە خوا دۆزەخ پڕ ئەکەم لە تۆو تیرەی تۆو ئەو کەسانەی شوێن تۆ ئەکەون، هەمووتا بە کۆمەڵ پێکەوە.[1]

خوای بە ڕەحم ویستی بەندەکانی بێ‌ئاگاو نەزان نەبن لەبەرئەوە ئەوا دوژمنایەتی شەیتان‌و جەنگی گەرم‌و گوڕی نەبڕاوەی لەگەڵ گرۆی ئادەمیدا ئاشکرا کردو پاشە ڕۆژیشی بە ڕێکی ڕوون کردەوە، پێغەمبەرانیشی ڕەوانە کرد، ئیتر لەپاش ئەمانە شوێن کەوتووەکانی شەیتان ئۆباڵیان بە ملی خۆیانەو ڕێگای هیچ ڕەخنەو گلەییەکیان نیە.

ئینجا لە کۆتایی سورەتەکەدا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بەبێ باوەڕەکان ڕابگەیەنێ‌و بۆیان ڕوون بکاتەوە کە بانگ کردنەکەی پاك‌و خاوێنە بۆ ڕێگای ڕزگاری‌و سەرفرازی، هیچ داوای پول‌و پارەیەکیان لێ ناکات‌و نایەوێ لە پەنای ئەم فەرمانەدا سوودو قازانجێکی دنیایی دەست بخات، بە دەست خۆی نیە زیادو کەم لەمەی کە ئەیگەیەنێ

[1] ئەم تەفسیرە بەگوێرەی خوێندنەوەی وشەی ﴿فَٱلْحَقُّ﴾ بە بۆر وشەی ﴿وَٱلْحَقَّ﴾ بەسەر وەکو ئێستا باوە.

پێیان، ئەمەی کە بەوانی ئەگەیەنێ تەنیا بۆ ئەوان نیەو بەڵکو ئامۆژگاریە بۆ هەموو عالەم، بەم نزیکانە بۆیان دەرئەکەوێ هەواڵی گرنگی ئەم قورئانەو ڕاستیەکەی، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ * إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَـٰلَمِينَ * وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ﴾ بەو بێبڕوایانە بڵێ: من داوای هیچ کرێو پارەو پولێکتان لێ ناکەم لەسەر گەیاندنی ئەم قورئانەو ئەم سروشەی بۆم دێت، من لەو کەسانە نیم کە بەزەحمەتو زۆر حاڵەتێ بەسەر خۆیاندا دێنن، واتە ئەم حاڵەتەی من هەمە پێغەمبەرێتیەو لای خواوەیەو شتێ نیە من بەسەر خۆما بیهێنمو ئەمەی پێتان ئەگەیەنم قورئانی خوایە خۆم هەڵی نابەستم، کەواتە ناتوانم لابدەم ــ نە زیادو نەکەم ــ لەوەی سروشم بۆ کراوە، ئەم قورئانە شتێ تر نیە جگە لە ئامۆژگاریو ڕێنموونی بۆ هەموو عالەم، لە پاش ماوەیەکی تر هەواڵو دەنگو باسی ئەزانن لەم دنیادا، لەکاتی دەرکەوتنو سەرکەوتندا، هەروەها لە ڕۆژی دوایی‌و پاش مردنیشتان ئەزانن کە بەڵێنو هەڕەشەکانی ڕاست بوون.

ئا بەم وتارە گرنگە شیرینە ڕاستە سورەتەکەی کۆتایی پێهێنا کە زۆر ڕێکیشە لەگەڵ ئەوەڵی سورەتەکەو هەموو مەبەستەکانی، بە تایبەتی شێوەی دواترین ڕستەی وەکو ئیمزاو مۆرو تامغە وایە بۆ هەموو سورەتەکە. ئەوەندەی پێ نەچوو بەشێکی ئەم ڕستە هاتە دی ئەوە بوو هەواڵی ئەم قورئانە بڵاو بووەوە بە زەوی دا بە جۆرێك تەختو بەختی پادشاکانو زۆردارەکانی پێ هاتە لەرزە، کۆشكو قەڵای داڕێژراوی چەند ساڵەی زوڵمو ناڕەوایی پێ لە بنجو بنچینە هات، پرشنگی ڕووناکیەکەی، تاریکیەکانی جیهانی ڕوون کردەوە، تەنیا ئەوە بەس بوو بۆ ڕوون کردنەوەی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر (ﷺ).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ

# سورەتی ﴿الزمر﴾
## مەككەییەو ٧٥ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە سەر تا بە خواری ئەگەڕێتەوە بۆ باسی تاك و تەنیایی خوا، لەگەڵ ئەوەدا ناو بەناو دڵ بێدار ئەكاتەوەو ئەیهێنێتە سۆزو جۆش بە چەند تەمێ و ئامۆژگاریەك بۆ گوێڕایەڵی، ئەوی زیاتر بۆ ئەم مەبەستە بەكاریێ ئەمەیە: كەلە زۆر شوێندا ناو بەناو شێوەی ڕۆژی دوایی نیشان ئەدات لەگەڵ گرنگی نازو نیعمەتەكەی و ناهەمواری تۆڵەو سزاكانی، وەك لەمەولا بەیارمەتی خوای گەورە بە درێژیی باسی ئەكەین.

خوای گەورە لە سەرەتای سورەتەكەوە هەواڵ ئەدات كە قورئان لەلایەن خۆیەوە نێرراوەتە خوارەوە، كەواتە هەمووی ڕاستەو شوێنی دوو دڵی و دڵە چركێ نیە، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ﴾ هێنانە خوارەوەی پەڕاوێك كە قورئانە لەلایەن خواوەیە كە ناوی ﴿الله﴾یە، ﴿ٱلْعَزِيزِ﴾ تواناو دەسەلاتی بەسەر هێنانە خوارەوەی دا هەیە، ﴿ٱلْحَكِيمِ﴾ لێزانە، هیچ كاری بێ سوودو بەرژەوەندی نیە، كەواتە گوفتارو كردارو بڕیارو ئایین و بەرنامەو شەریعەتی بەجێیەو ڕێك و ڕاستە، واتە ئەزانێ ئەم قورئانەی لە چیداو لە بەرچی هێنایە خوارەوە، هەموو پڕ لە سوودو حیكمەتەو بۆ چارەسەریە.

یەكەم شت و گرنگترین شتێ كە ئەم قورئانە بۆی هاتبێ تاك و تەنیایی خواو پەرستنی بێ هاوبەش و خاوێن كردنی ئایین بۆی و ڕوو تێكردنی بە تەنیاو لە ڕێوە بێ واسیتەیە، لەبەرئەوە ئەوا دەست بەوە ئەكات و ئەیكات بە یەكەم مەبەستی سورەتەكە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ بێگومان ئێمە لە ئاسمانەوە هێناومانەتە خوارەوە بۆ لای پەڕاوێ كە قورئانە كە شتی حەقی پێیە بۆ ڕوون كردنەوەو دەرخستنی شتی حەق و ڕاست هاتووە، بنەڕەتی هەموو شتێكی حەق و ڕاست تاك و تەنیایی خوایە لە هەموو بارو ڕوویەكەوە،

﴿فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ۝٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ﴾

**هەموو ئاسمان‌و زەوی‌و ئەم بوونەوەرە لەسەر ئەو تاك‌و تەنیاییە ڕاوەستاوە لەبەرئەوە: ﴿فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾ خواپەرستە بە جۆرێ کە پەرستن‌و گوێڕایەڵی‌و گەردن کەچیەکەی بۆ پاك‌و خاوێن بکەیت لە هەموو هاوبەشێ.**

**ڕووی فەرمودەکەی کردە پێغەمبەر (ﷺ) بەرنامەیە کە خۆی لەسەری بێ بانگی ئادەمیزادیشی بۆ بکا، بۆی ڕوون کردەوە کە بریتیە لە: پەرستنی خوا بە تاك‌و تەنیا‌و گوێڕایەڵیەکی پاك‌و خاوێن بۆی‌و دامەزراندن‌و ڕاگیر کردنی هەموو بارو ڕوویەکی تێروتەواوە لە زانین‌و تێگەیشتن‌و باوەڕی دڵ‌و دەروونەوە دەست پێ ئەکات تا ڕژێمێکی تەواو بۆ هەموو ژیانی گەل‌و هەموو ئەندامانی گەل. ئەو دڵەی کە بەڕاستی باوەڕی ببێ بە تاك‌و تەنیایی خوا گوێڕایەڵی تەنیا بۆ خوا ئەکات‌و سەر بۆ کەسی تر داناخات‌و داوای هەموو شتێ هەر لەو ئەکات‌و هەموو کاروبارێ هەر حەواڵەی ئەو ئەکات، ئومێدو چاوەڕوانی هەر لەوە، ئەزانێ هیچ کەسێ تر هیچی بە دەست نیە، لەبەرئەوە هەر لەو ئەترسێ، ئەگەر بەم جۆرە نەبوو ئەوە باوەڕەکەی ناتەواوو کەم هێزە.**

**ئەو دڵەی کە باوەڕی بە تاك‌و تەنیایی خوا هەیە، باوەڕی هەیە کە ئەم بوونەوەرە هەموو کاروباری تەنیا بە خواهیشی خوا ئەڕوات بە ڕێوە، ئەگەر زیاد لە یەك خواش ئیش‌و کاری تێدا بکردایە ئەشێوا بە ملی یەکدا، کەواتە باوەڕی هەیە کە ژیانی ئادەمی ڕاست نابێتەوەو بە ڕێکی بەڕوە ناچێت بەو ڕژێمە نەبێت کە خوای گەورە دیناوە بۆی، چونکە ئادەمی ــ کە بەشێکە لە بوونەوەرــ ئەبێ ڕژێمی ژیانەکەشی بەشێك بێت لە ڕژێمی گشتی بوونەوەرەکە، ئەگەر نا ئەبێت بە خواهیشێ تر پەیدا بووبێت جگە لە خواهیشی خاوەنی هەمووان ئەو کاتە ئەشێوێ‌و هەڵە ئەکات وەك بە چاو ئەیبینین کە هەموو جیهان لە چ گێژاوێك دایە بە هۆی لادانیان لە ڕژێمی ژیانێ کە خوا بۆی داناون. کەواتە ئەو کەسەی کە ئاوا باوەڕی بە تاك‌و بە تەنیایی خوا هەیە ناکەوێتە شوێن هیچ ڕژێم‌و یاسا‌و قانونێکی تر.**

**ئەو کەسەی کە باوەڕی ڕاستی هەیە بە تاك‌و تەنیایی خوا هەست ئەکا بە خۆشەویستی لە نێوان خۆی‌و ئەو بوونەوەرەی کە تێیدا ئەژی، چونکە ئەزانێ هەمووی لەسەر دەستی**

قودرەتی یەك كەس داو بە یەك خواهیش پەیدا بوون، كەواتە پەیوەندیەكی زۆر بەهێز هەیە لە نێوانیاندا، چاوی دڵی قودرەتی خوا ئەبینێ لە هەموو شتێدا، ئەو كاتە زۆر بە ئارامو لوتفەوە ئەڕژێ، دڵی پڕە لە یادی خوای گەورە كە خاوەنی هەموانەو دروستكەرو پێكەیەنەریانە، كە دڵیش ئاوەدان بووەوە بە یادی خوا ئیشی لارو نارێك ناكات، ئەگەر بەبێ ئاگایی جار بە جارێ پێی هەڵكەوێت دەست بەجێ ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بە كورتی باوەڕی ڕاستەقینە بە تاكو تەنیایی خوا شۆڕشێكی بەهێزی بەرگری نەكراوە دربارەی هەموو نەفامیو نەزانیو لاریو نالەباریەك، بنەڕەتی هەموو چاكەو ڕاستیەكە، لەبەرئەوە قورئان ئەوەندە بە گرنگ گرتوویەتیو ئەو هەموو بەڵگەو نیشانەیەی لەسەر دێنێتەوە، لەو هەموو شوێنەدا باسی ئەكات!!

پاش ئەوە فەرمانی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) بە پەرستنی پاكو خاوێنو گوێڕایەڵی خوا، ئینجا ئەو مەبەستە دووبارە ئەكاتەوە بە شێوەیەك كە زۆر دڵنایی لەسەر ئەكات، بە جۆرێ ئەبێتە هۆی ئەو فەرمان پیادانە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ﴾[1] ئاگادار بنو بێدار بن كە ئایینی خاوێن تەنیا بۆ خوایە، ئەویش بریتیە لە گوێڕایەڵی پاكو خاوێن بۆ خوا بەبێ هاوبەش، بەبێ ئەوەی بەشی كەسی تری تێكەڵ بكرێ، چونكە سیفەتی خوایەتی هەر لەودا هەیە، هەر ئەو ئاگادارە بەسەر هەموو نهێنیو پەنهانیەكدا، كەواتە هەر كردەوەیەك تەنیا بۆ ئەو نەبێت وەری ناگرێت!!

بت پەرستەكان هەرچەند باوەڕیان بە زۆندوو بوونەوە نەبوو، بەڵام باوەڕیان بەمە بوو كە ئەم زەویو ئاسمانە خوایەكی هەیە كە دروستی كردووەو ئەو خوایە ئەوانیشی دروست كردووەو ڕزقو ڕۆزیان ئەدات، بەس باوەڕیشیان تێكەڵ بە پڕوپووچی ناڕەوا كرابوو، لایان وابوو كە مەلائیكە كچی خوایە لەبەرئەوە هەیكەڵو وێنەیان بۆ دروست كردوونو ئەیان پەرستن بە نیازی ئەوە كە واسیتە بن لەنێوان ئەوانو خوادا، نزیكیان بكەنەوە لەو خواوە، تكاو نزایان بۆ بكەن لای خوا بۆ ئەمەی بیانپارێزێ لە ناخۆشیو سوودو قازانجیان دەست بخات، بەم باوەڕە پڕوپووچە بەرەنگاری باوەڕی خوا پەرستیان ئەكرد، ئەیانگوت: ئێمە مەبەستمان پەرستنی ئەمانە نیە لەبەر خۆیان، بەڵكو لەبەر ئەو نزیك خستنەوەو لاڵە بۆ

---

[1] لە چەند ڕوویەكەوە دڵنیایی لەسەر كرد: ١- وشەی ﴿أَلَا﴾. ٢- پێشخستنی خەبەر. ٣- ﴿لِ﴾ لختصاص. ٤- وشەی ﴿ٱلْخَالِصُ﴾. ٥- ﴿ال﴾ لەسەر وشەی ﴿ٱلدِّينُ﴾.

کردنەیە لای خوا!! لەبەرئەوە ئەوا باسی باوەڕە پڕوپووچەکەیان ئەکات و هەڕەشەیان لێ ئەکات و بە درۆیان ئەخاتەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ﴾ ئەوانەی جگە لە خوا پەرستراوانی تریان بڕیار داوە، ئەوانە ئەڵێن: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ﴾ ئێمە هیچ ئەمانە ناپەرستین بۆ ئەمە نەبێت کە نزیکمان بخەنەوە لە خوا، واتە لە بنەڕەتەوە مەبەستەکەیان هەر خوایە!! بەڵام خوای گەورە پەرستنێکی ئەوێ کە خۆی ڕێگاو ڕچەی بۆ داناوەبەهۆی هەموو پێغەمبەرانەوە – سەلامی خوایان لێ بێت – ڕوونی کردووەتەوە بێ‌گرێ، جگە لەوەی کە خوا دایناوە خواپەرستی نیە، هەڕەشە ئەکات لەو کەسانەی کە ئەوە ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بێ‌گومان خوا لەو دنیا جیاوازی ئەخاتە نێوان ئەوانەی کە لەم دنیادا ئیختیلافیان بووە لە کاروباری ئاییندا بەم جۆرە: ئەوانەی کە لەسەر ڕێگای خوا بوون ئەیانخاتە بەهەشت، ئەوانەی کە لایانداوە ئەیانخاتە دۆزەخ.[1]

باوەڕ بە تاک و تەنیایی خوا وەکو بنەڕەتێکە بۆ هەموو خێرو چاکەیەک زۆر زۆر ناسکە، پێویستە بە وردی ڕاگیربکرێ و ببرێ بە ڕێوە، ئەگەر نا شێوەیەک لە شێوەکانی بت پەرستی تێکەڵ ئەبێت و بە باوەڕی تاک و تەنیایی نامێنێتەوە!!

باوەڕ بە تاک و تەنیایی خوا لای خوارەکەی و یەکەم پلەی ئەوەیە: کە هاوبەش بۆ خوا ڕەوا نەدرێ نەلە زاتی داو نەلە سیفەت و کردەوەکانیداو نەلە بەرنامەو بڕیارەکانیدا. کەواتە هەرچۆنێ، هەرکات باوەڕ بە دوو خوا یان زیاتر بوو باوەڕ بە تاک و تەنیایی نامێنێ، خاوەن باوەڕ کافر ئەبێت، هەروەها باوەڕی وا بێ کە کەسێ تر هەیە لە زانیندا یان لە توانا و

---

[1] ئەگەر مەبەست بە وشەی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ بت پەرستەکان بێت بەو جۆرە ئەبێت کە لە تەفسیرەکەدایە، بەڵام ئەگەر مەبەست پەرستراوەکان بێت ئەبێ بڵێین: ئەو پەرستراوانەی کە بت پەرستەکان ئەیانپەرستن و ئەیان وت: ئێمە لەبەر هیچ ئەمانە ناپەرستین لەبەرئەوە نەبێت کە لە خوا نزیکمان بکەنەوە، بێ‌گومان ئەوانە هەموویان: پەرستراوو بت پەرستەکان خوا حوکم ئەکات لە نێوانیاندا، بەم جۆرە هەردوولا ئەخاتە ناو ئاگرەوە، جگە لەو پەرستراوانەی کە بەندەی تایبەتی خوای گەورەن وەکو مەلائیکەو عیساو هەر کەسێکی تر کە بانگی بۆ خواپەرستی کردووە، بەڵام شوێن کەوتووەکانیان لە ڕێگای ئەوان لایانداوە، جگە لەم بەندە ڕاستانە ئیتر هەرچی پەرستراو هەیە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پەرستوویانن پێکەوە لە دۆزەخدا ئەبن، بۆ زیادە سزاو عەزابی دەروونییان، لە ڕۆژی دواییدا پێش خستنە دۆزەخ و پاش خستنیان هەردوولا تفەو نەفرین ئەکەن لە یەکتر، خوا پەنامان بدات. لەسەر باری یەکەم خەبەر بۆ وشەی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ڕستەی ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ﴾ لەگەڵ وشەی ﴿يَقُولُونَ﴾ کە نەگوتراوە، لەسەر باری دووەم خەبەرەکەی ڕستەی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ﴾ەوە.

دەسەڵاتدا وەکو خوا وایە یان باوەڕی ببێ بە بەرنامەو ڕژێمو یاسایەکی تر بێجگە لەوەی خوا ناردوویەتی بۆ بەندەکانی، یان باوەڕی وابێ کە جگە لە خوا کەسێ تر ڕێگای هەیە کە ڕژێمو یاسا دابهێنێ بۆ بەندەکانی خوا، بە هەر باوەڕێك لەمانەو وێنەیان خاوەن باوەڕەکە ئەچێتە ڕیزی ئەوانەی کە دوو خوا یان زیاتر ڕەوا ئەدەن بێ جیاوازی لە ڕیزی خواپەرستان دەرئەچێ، ئیتر با بە دەم خۆی بە موسڵمان دابنێو نوێژو ڕۆژوو فەرزەکانیش بەجێ بهێنێ، هەروەها زۆر جێگای مترسیە زیادە ڕەوی کردن لە شانی هەر بەندەیەك لە بەندەکانی خوادا، با گەورەترینی هەموو دروست کراوەکانی خوا بێت، وەکو پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەبێ بەرامبەر بە خوا لە سنووری بەندەیی دەرنەکرێ، وەکو خۆی ئەفەرموێ: (لا تطروني كما أطرت النصارى المسيح إنما أنا عبدالله ورسوله)[1] لە کۆنو تازەوە زیادە ڕەوی زۆر کراوە کە سەریشی لە خراپەوە دەرچووە، لێرەدا ئەو هەموو زیادە ڕەویانە باس ناکرێت چونکە زۆر درێژە. بەڵام بە وێنە هەندێکیان باس ئەکەین کە زۆریش بڵاوبووەتەوە، پێویستە لەسەر موسڵمانان خۆیانی لێ بگێڕنەوە:

١- سوێند خواردن بە خواو بە سیفەتەکانی خوا: بۆ قەدەغە کردنی ئەمە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆرە، زۆریش سامناکن، هەموو پێشەواکانو زاناکانی ئیسلام هەموو بێجیاوازی ئەفەرمون: قەدەغەو حەرامە. بەڵێ هەندێ لە زانایانی مەزهەبی شافیعی فەرمویانە: ئەگەر مەبەست قەدرو بە گەورە گرتنی سوێند پێ خراوەکە نەبێت کەراهەتی هەیە، ئەمیش وەکو دوو هاوڕێ کە باوە بە یەکتر ئەڵێن: بەسەری تۆ، بە گیانی تۆ، جگە لەمە بێگومان قەدەغەیە، کەسێ کە لەمە زیاتر بڵێ بێگومان لە خۆیەوە قسە ئەکاتو شوێن هەوای خۆی ئەکەوێ، ئەگەر نا بە چ بەڵگەیەك ئەڵێ؟ ئەگەر هەرکەس بەڵگەیەکی شەرعی هەیە دەری بخا، ئەمە کە بووە بە باو لەناو خوێندەوارانی ئاینیشدا ئەوە نابێتە هیچ بەڵگەیەك، ئەویش وەکو ئەم هەموو گوناهە کە بوون بە باو، ئایا بەوە حەڵاڵ ئەبن؟!!

٢- هاوار کردن جگە لە خوا بۆ یارمەتی دانو فریاد ڕەسی بە شێوەی نیهێنیو غەیبی: ئەمەیش یەکێکە لەو زیادە ڕەویانە کە زۆر جێگای مەترسیەو لە ئاینی ئیسلامدا قەدەغەیە، دەلیلو بەڵگە لەسەر ئەوە ئێجگار بەهێزو زۆرە:

---

[1] واتە زیادە ڕەوی مەکەن لە شانی مندا وەکو نەسرانیەکان زیادە ڕەویان لە شانی عیسادا کردو وتیان: (کوڕی خوایە). من بەندەی خوامو پێغەمبەری ئەوم، واتە لە سنووری بەندەییو پێغەمبەرێتی دەرم نەکەن.

ا- له هەموو نوێژێکدا ئێمە چەند جار ئەبێ بڵێین: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خوایە تەنیا لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین. واتە بە شێوەی نهێنی.

ب- حەدیس زۆرە لەو بابەتەوە، یەکێك لەوانە حەدیسی ئیبن و عەباسە -خوایان لێ ڕازی بێت- کە هەموو پەڕاوە صەحیحەکان ئەیفەرمون، ئەڵێ: لە پاشکۆی پێغەمبەرەوە بووم فەرموی: کوڕە بچکۆلەکە چەند شتێکت فێر ئەکەم، یەکێ لەوانە ئەوە بوو: (وإذا سألت فسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله) هەر کات داوات کرد لە خوا داوا بکە، یارمەتیت داواکرد لە خوا داوا بکە، هیچ نەیفەرمو خۆم ئامۆزاتم و گەورەترینی هەموو بەندەیەکم، هەرکات تەنگاوت بوو، هاوار بکە لە خۆم، دێم بە هاوارتەوە.

ت- بڕیاری هەموو صەحابەو تابعین و هەموو ئیمامان و سەر مەزهەبەکان لەسەر ئەوەیە سەرجەم کە ئەو هاوار کردنە ئەبێ تەنها لە خوا بکرێ.

پ- هاتن بە هاوارەوە بە شێوەی نهێنی تایبەتیە بە خواوە، وەکو دروست کردنی زەوی و ئاسمان، باراندنی باران و دروست کردنی چیاکان و ئەو هەموو شتەی تر کە تایبەتین بە خواوە. دەلیلی ئاشکرا لەسەر ئەوە ئەمەیە خوای گەورە لە ڕیزی ئەوانەدا بێ جیاوازی ئەفەرموێ: ﴿أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾[1] کەواتە ئەو کەسەی داوای یارمەتی ئەکات جگە لە خوا، ئەگەر سەربەخۆ داوای لێ ئەکات ئەوە ئەبێتە بت پەرست و هاوبەش بۆ خوا ڕەوادەر، هیچ جیاوازی نیە لە سوژدە بردن بۆ لات و عوزای قوڕەیشیەکان، ئەگەر مەبەست ئەوەیە کە تکا بکات لای خوا بۆی کە بێت بە هاواریەوە بەم جۆرەش هەر نابێ، چونکە شێوەی هاوارەکە ناوو باسی خوای تێدا نیە، بەڵکو یەکسەر کابرا داواکە لە پیاوەکە ئەکات کەواتە شێوەی داواکە ناڕەوایە و نیازی ڕووت سوودێکی وای نیە، ئەگەر سوودیشی ببێ، تا یەکێ ئەو نیازەی ببێ چەند کەس لەو کاتە تەنگاوانەدا ئەو نیازەی هەر بە خەیاڵیشدا نایەت، زیاد لەوە ماوەدان بۆ ئەوە سەری لە خراپەوە

---

[1] ئایا ئەو کەسە کێیە ئەچێ بە هاواری ناچار لە تەنگانەدا کاتێ کە هاواری لێ بکات، بەرگری ناڕەحەتی ئەکا، تاقم لە پاش تاقم ئەتان هێنێت بە دوای یەکداو ئەتان کات بە جێنشینی یەکتر لە زەوی دا؟ ئایا لەگەڵ خوادا خوای تر هەیە؟ زۆر کەم ئێوە بیرئەکەنەوەو تەمێ وەرئەگرن!! واتە هیچ کەسی تر نیە جگە لە خوا ئەو شتانە پێك بهێنێت. ﴿النمل﴾ ئایەتی: ٦٢.

دەرئەچێ، ئەوەی کە نەشارەزایە ماڵ وێران ئەبێت و تیادا ئەچێت. نابێ هیچ کەس بڵێ ئەمە تازە بوو بە باو، چەند زەمانە هەر باو بووە بێبەرگری، چونکە باوو عادەت شتی خراپ چاك ناکات، ئەگەر نا هەر گوناهێ بوو بە باو ئەبێ دەستی لێ نەدرێ، وەکو وتمان، مەبەست لەم قسانە ئەمە نیە کە پیاوچاکان و دۆستەکانی خوا نرخیان نیە، زۆر رێزیان نیە لای خوا، بێگومان هەرکەس قسەی وا بکات ئەوە چاوی دڵی کوێرەو لەسەر رێگای ڕاست لای داوە.

ئاشکرایە کە دۆستەکانی خوا زۆر بە نرخن و نازو رێزیان هەیە لای خوا، هاوڕێیەتیان سوودی هەیە، خۆشەویستن و رێزیان لەسەر ئیمانداران پێویستە، لە لایە خواوە کارو فەرمانیان پێسپێراوە، بە وێنە: هاوڕێ لاوەکەی حەزرەتی موسا کەلە سورەتی ﴿الکهف﴾دا باسی ئەفەرموێ، بەڵام ئەمانە هەموو شتێکەو هاوار لێ کردن بۆ یارمەتی دان و فریاد رەسی بە شێوەی نهێنی شتێکی ترە، ئەو شتەی کە شەرع ڕەوای نەدا ئەبێ ڕەوا نەدرێ، با هەموو ئادەمی باوەڕی پێی ببێ، کردبێتی بە باو.

٣- لەو زیادە ڕەوی کردنەیە باوەڕ بەوەی کە هیچ کەس جگە لە خوا قازانج و زیانی خەڵکانی بە دەستە: ئەم باوەڕەیش زۆر جێگای مەترسیە، بە هیچ جۆر ماوە نیە بۆ باوەڕی وەها لە ئایینی پاکی هەبێ، هەرگیز ناتوانێ باوەڕی وای هەبێ: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾[1] دەی لەجێیە پێغەمبەر (ﷺ) کە گەورەترین و خۆشەویست ترینی هەموانە بە دەستی نەبێ قازانج و زیانی خۆی، ئیتر ئەبێ کەسانی تر چۆن هیچیان بە دەست بێ؟! بەڵێ ئەمە قەیناکات، چاوەڕوانی خێرو سوود بکرێت لە خوا بەهۆی تکاو نزای یەکێکەوە، یان مەترسی بکرێت لە دوعای شەڕی کەسێك.

٤- یەکێتر لەو زیادە ڕەویانە بڕیاردانی واسیتەیە لە نێوان خواو بەندەدا: بەم بۆنەوە کە ئەم بەندە گوناهبارەو دوورە لە خواوە، نابێ یەکسەر پەیوەندی بکات بە خواوە، بەڵکو

---

[1] واتە: بڵێ من خاوەنی ئەوە نیم هیچ سوودێك بگەیەنم بە خۆم و بەرگری هیچ زیانێك لە خۆم بکەم، جگە لەوەی خوا ویستوویەتی ئەگەر لە شەرتێکدا من غەیبم بزانیبایە خێرو چاکەی زۆرم بۆ خۆم فەراهەم ئەهێناو هەرگیز خراپەو ناڕەحەتی دووچارم نەدەبوو، من هیچ نیم جگە لە ترسێنەرو مژدە دەر بۆ گەل و کۆمەڵێ کە ئیمان ئەهێنن. ﴿الأعراف﴾ ئایەتی ١٨٨.

واسیتەکەی ئەبێ بیگەیەنێت بە خوا، هەروەکو چۆن کەسێك ناتوانێ سەربەخۆ لەگەڵ سەرۆك میریدا بدوێ، بەڵکو پێویستە لە ڕێگای کاربەدەستی بچووکەوە هەوڵ بدات.

ئەم باوەڕە بەم شێوەیە لە ئایینی ئیسلام دا قەدەغەیە، جیا ناکرێتەوە لە پەرستنی بت پەرستەکان، کە ئەم ئایەتەی ئێستا لەگەڵی دا ئەژین ئەفەرموێ. ئەم باوەڕە ناڕەوایە زۆر بڵاوەی کردووە لە دڵو دەروونی خەڵکدا، بە تایبەتی زۆر لەوانەی کە ئەهلی تەریقەن، بێگومان ئەوە دوورە لە تەریقەوە بە ئەندازەی ئاسمانو زەوی، چونکە تەریقە ـ ئەگەر شتێکی ڕاستەو بۆ ئەوە هاتووە کە بە موو لانەدرێ لە قورئانو ڕەوشتی پاکی پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکی پەروەردە بکرێو پێ بگەیەنرێ لەسەر ئەو ڕێگە شیرینە ڕاستە. ئەو پیاوە هەڵکەوتووانەو ئەو هەموو دۆستانی خوا هەوڵیان ئەوە بووە کە خەڵکی فێری خواناسی بکەن لەسەر ئەو ڕێگایە کە پێغەمبەرمان (ﷺ) هێناویەتی، کەواتە ئەو دۆستانی خوا مامۆستان.. مامۆستای فێرکردنو پەروەردەکردنن، هەموو موسڵمانێ پێویستە بزانێ کە هەرچۆن درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە کراوە زۆرو زەبەندە، هەروەها درۆی زۆر کراوە بە دەم ئەو پیاوە گەورانەی بەسەر تێکدانی موسڵمانان لە زۆر بابەتەوە، ئێمە خوا ترازوویەکی ڕاستی بۆ داناوین، وەکو پێغەمبەریش (ﷺ) وەسیەتی پێکرد:

١- قورئان.

٢- ڕەوشتی خۆی.

هەرشتێ بە گوێرەی ئەوە بوو چاکەو هەرچیش بە گوێرەی نەبوو تا دەستمان بگرێ فڕێی ئەدەین!

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ٣ لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾

ئادەمی وا دروست کراوە ــ ئەگەر لەسەر سروشتی خۆی لانەدا ــ جگە خواپەرستی پاك و خاوێن لە تاك و تەنیا باوەڕی بەشتی تر نابێت، بەڵام کاتێ لە سروشتی خۆی ترازا، لەو ڕێگا ڕاستە وێڵ ئەبێ و ئەکەوێتە سەر ڕێگای ئارەزووی نەفس و شەیتانی بە هەر بارێکدا بای بدەن، ئەو کاتە ئەگەر باوەڕیشی بمێنێ بە خوا، بە جۆرێك ئەبێت کە خوا نایەوێت، چونکە ئەو کاتە بەندەیەکی بەدنمەکی درۆزنە، بە هۆی ئەوەوە خوا ڕێگای ڕاستی نیشان داوە لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە، ئەو نەفامە ڕێگاکەی ئەو ناگرێ و شوێنی درۆ و پڕوپووچ ئەکەوێت، کەواتە خوایش ڕێنموونی ئەو ناکات و نایخاتە سەر ڕێگای ڕاست، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ﴾ ئەوکەسەی کە مەبەستی ئەوەیە لە خۆیەوە شتێ بۆ خوا بڕیار بدات و باوەڕی بە ئایینەکانی خوا نیەو ناکەوێتە شوێنیان بێگومان خوا یارمەتی و ڕێنموونی ئەو کەس ناکات بۆ کەوتنە سەر ڕێگای ڕاست.

یەکێ لە درۆکانی بت پەرستەکان ئەمە بوو کە مەلائیکەیان بە ڕۆڵەی خوا دائەنا لەبەرئەوە وێنەو هەیکەلیان بۆ دروست ئەکردن و ئەیان پەرستن. ئەوا خوای گەورە ئەکۆڵێتەوە لە بێ جێیی ئەو گومانە و ئەفەرموێ: ﴿لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾ ڕۆڵە و منداڵ بۆ خوا هەرگیز ناگونجێ و یەك ناکەوێ لەگەڵ خوایەتیدا، چونکە ئەو کاتە ئەبێ هاو وێنەو هاوتیرەی ببێ، ئەبێ خۆی دەست بدات بۆ ئەمان و ڕۆڵەکە لە جێگەیدا بمێنێتەوە، ئەو کاتە نابێ تاك و تەنیا بێت، ئەگەر تاك و تەنیاش نەبێ ئەم بوونەوەرە تێك ئەچێت. کەواتە بە هیچ جۆرێك منداڵ و ڕۆڵە لەگەڵ خوایەتیدا ناگونجێ و یەك ناکەوێت، ئەگەر لە مەرجێکدا بگونجایە ــ وەك ئەو نەزان و نەفامانە گومان ئەبەن ــ خوا بیویستایەو ڕۆڵەی بۆ خۆی بڕیار بدایە، خۆی لە ناو هەموو دروست کراوەکانیدا ویستی لەسەر کێ بوایە ئەوەی هەڵئەبژارد بۆ خۆی، نەك ئەوەی ئێوە بە نەفامی خۆتان بڕیاری بۆ بدەن، مەبەست لەم جۆرە لێکۆڵینەوانە ڕوون کردنەوەی نەفامی و نەزانی ئەوانەیە کە هەر بە گوێرەی فامی خۆیشیان باوەڕەکەیان بێ جێیە،

نەك مەبەست ئەوە بێت كە شتی وا بە هیچ جۆر ڕێگای هەیە، چونكە وەك خۆی ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥۖ﴾ خوا پاكو بێگەردە لەوەی ڕۆڵە بۆ خۆی بڕیار بدات، چونكە ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ هەر تەنها ئەوە تاكو تەنیایەو زاڵە بەسەر هەموو شتێكداو هەموو شتێ گەردن كەچە بۆی، واتە ئەگەر منداڵو ڕۆڵەی ببوایە، تاكو تەنیا نەئەبوو، هەر ئەو زاڵ نەئەبوو بەسەر هەموو شتێكدا، خۆ بەڵگەو نیشانەی ئاشكرایش هەیە لەسەر تاكو تەنیایی و دەسەڵاتو توانـاو زاڵیەكـەی وەك ئەفـەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ﴾ ئاسمانەكانو زەوی دروست كردووە بە حەقو ڕاستی پڕ لە حیكمەتو بەرژەوەندیو سوودە، ڕژێمێكی ڕێكو پێكی دامەزراوی نەگۆڕاوی بێ لەكەیان هەیە.

بەڵگەو نیشانەی زۆر بەهێز لەسەر تاكو تەنیایی و توانای بێ سنووری خوا زۆر ڕوون ئاشكرایە لە ئاسمانەكانو زەوی دا بە جۆرێ هەر تەماشا كردنی سادەی ڕۆیشتنیان بەسە بۆ دڵنیایی هەموو خاوەن فامێ بەمەی كە یەك ویستو خواهیش ئیش ئەكا تیایاندا، تەنیا كەسێ كاروباریان ئەبات بەڕێوە، چ جای چەند نیشانەی تر كە تا ئێستا دەركەوتووە بۆ زانایان بە گوێرەی زانیاری تازە، ئەوەتا ڕوون بووەتەوە كە ئەم بوونەوەرە لە زەڕە پێك هاتووە، زەڕەكانیش هەموو یەك سروشتیان هەیە، هەموو لە چەند ڕووناكی پێك هاتوون، هەروەها ڕوون بووتەوە كە هەموو زەڕەكان لەگەڵ ئەم هەموو شتەی كە ئەبینرێ لە ئاسمانو زەوی دا بە جارێ یەكسەر هەموو لە گەردش دایە بێ وەستان بە یاسایەكی دامەزراو لە هەموو شتداو بە یەك ڕژێمو یەك شێوە. دە ئایا چ نایشانەیەك لەمە بەهێزتر ئەبێت لەسەر تاكو تەنیاییو زۆرو دەسەڵاتی نەبڕاوەی ئەو كەسەی كە ئەم گەڕانو گەردشە ڕێكو پێكو

یەك یاساو یەك ڕژێمە ئەكا بەم هەموو شتە بێ سنوورو ژمارانە؟ ئیتر چونكە پێویستی هەیە بە بەڵگەو نیشانەی تر؟ لەگەڵ ئەمەدا خوای گەورەی بە ڕەحم هەتا بێت نیشانە بۆ بەندەكانی زۆرترو ڕوون تر ئەكاتەوە، ئەوەتا ڕائیدەكانی فەزا كە ئەڕۆن و چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشكرایان بۆ دەرئەكەوێ ئەگەڕێنەوە بە باوەڕێكی بەهێزەوە بە خوای گەورە، تەنانەت ئەوانەشیان كە بێباوەڕ بوون و لە وڵاتێكی بێباوەڕیش دا پێگەیوون.

لەم ماوە نزیكەدا ڕائیدێكی سۆڤیەت كە هاتە خوارەوەو پرسیاری لێ كرا وتی: (آمنت بالله وبالعقل الإنساني) بە ڕێكی بڕی كە باوەڕی بەم دوو شتە نهێنیە هێناوە كە بەجارێ باوەڕی مادییەت لە ڕیشە ئەهێنێ، وا دەرئەكەوێ بە گوێرەی بەڵێنی خوا شتی زۆر ڕوون تر دەرئەكەوێ، لەمەودوا بە درێژتر لەم باسە ئەدوێین بە یارمەتی خوا.

لە پێشەوە وتمان تەماشا كردنی ڕووت بە شێوەی بەسە بۆ هەموو فامدارێ، چونكە ئەو كەسەی كە خوێندەواریشی نەدیبێ، بە هیچ جۆرێ ئاگای زانیاری هەر نەزانێ، لە ئاوەدانیشدا نەژیابێ، هەر بە مەرجێك ئادەمی بێت سەرنجێكی شەوو ڕۆژو مانگو خۆر بدات كە بەم جۆرە ڕێكو نەگۆڕاوە بێ وەستان بە دوای یەكدا دێن و ئەم گەڕان و گەردشەیان هەیە بێ تێك چوون و هەڵەو شێوان، ئایا ئەبێ ئەو كەسە چۆن باوەڕی نەبێت بەو خوایەی كە ئەم كارە گرنگانەیان پێ ئەكات؟ بەڕاستی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە بێ باوەڕی، چونكە ئاشكرایە ئەم مانگو خۆرو ئەستێرانە گیانلەبەر نین، خۆیان هیچ ئاگایان لە كاروباری خۆیان نیە، بێگومان هەركەسێ ڕێزی ژیریی خۆی بگرێ نالێ بەڕێكەوت كاروباریان ئەڕوات، چونكە هیچ نەبێت ئەبێ بزانێ شتێ بە ڕێكەوت بێهیچ ڕژێمی نیە، ڕێكەوت ناوی خۆی وا بە خۆیەوە. كەواتە هیچ چاری نیە باوەڕی ببێ بەوەی یەكێ هەیە كاروباریان ئەبات بە ڕێوە، ئەبێ ئەو كەسەش خاوەنی زانین و توانا و حیكمەتی نەبڕاوەی بێ سنوور بێت.

﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلٌّ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ٥﴾

خوای گەورەی بە ڕەحم لە چەند شوێن لە قورئاندا ئەم بەڵگەو نیشانە ڕوونانە ئەخاتە پێش چاو، لە هەر شوێنێکدا بە جۆرێ شێوەیەکی جیاواز لە پێش چاوی ئینسان تەڕو تازەیە، وەك نەیبیستبێ وایە، با مەبەستەکە هەر یەك بێ وەك لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلٌّ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ﴾ شەو ئەهێنێ بە ملی ڕۆژداو ڕۆژ ئەهێنێ بە ملی شەودا، بەم جۆرە تاریکی شەو ئەهێنێ بەسەر شوێنە ڕووناکەکانی ڕۆژداو ئەیپێچێ لە دەوریان و ڕووناکی ڕۆژ ئەهێنێ بە دەوری شوێنە تاریکەکانی شەودا، پێچ لە دوای پێچ وەکو لفی مێزەر بە دەوری سەردا.[1] خۆرو مانگی سەر شۆڕو موسەخەر کردووە بێ وەستان وان لە گەڕان و گەردشدا، بە موو لانادەن لەو بارو شێوەی کە بۆیان دانراوە، بەردەوامن لەسەر کاری خۆیان هەتا کاتێ کە دیاریی کراوە لای خوا بۆ لە کارخستنیان: ﴿أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ﴾ بێدار ببنەوە هەر تەنیا خوایە کە توانای تەواوی هەیەو زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێ ناتوانێ سەرکەشی لێ بکات، لەگەڵ ئەوەدا زۆر لێ بووردەیە، تاوانی تاوانباران ئەسڕێتەوە هەرچەند تاوانەکەیان گەورە بێت، کاتێ کە بگەڕێنەوە بۆ لای و تۆبە بکەن.

لە پاش ئەمەی چەند بەڵگەو نیشانەیەکی جیهانی بەرزی نیشاندا، ئینجا دێتە سەر ئەم جیهانە نزمەی ئێمەو چەند بەڵگەو نیشانەیەکی گرنگمان لێی نیشان ئەدات، جا بۆ ئەمەی لە دروست کردنی ئادەمیەوە دەست پێ ئەکات، چونکە نزیکترەو زیاتر نیشانەی ڕوونی تیایەو نایاب ترین دروست کراوەکانی خوایە، لە سێ بارەوە ئەیهێنێتە پێش چاو:

١- دروست کردنی یەکەم ئینسان بێ باوك و دایك.

٢- دروست کردنی هاوسەرەکەی دایکی هەمووان (حەووا).

دروست کردن و فەراهەم هێنانی ئەم هەموو ڕۆڵەو نەوە بێ ژمارانە لەو تاقە نەفسە.

---

[1] وشەی ﴿يُكَوِّرُ﴾ خڕی زەوی لێوە وەرئەگیرێ و شێوەو بارو خولاندنەوەو گەردشەکەی ئەخاتە پێش چاو، چونکە ﴿تكوير﴾ لە زمانی عەرەبدا مەبەست پێچانەوەیە بە دەوری شتێکی خڕدا.

خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾

ئەفەرموێ: ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ دروست كردووە لە تاقە نەفسێك كە لە یەكەم جارەوە تەنیا بووە، ئینجا لەو تاقە نەفسە هاوسەرەكەی بۆ فەراهەم هێنا. ئادەمی كاتێ بیر لە خۆی بكاتەوە كەوا هەیەو دروستكراوە بێ ئەمەی كە خۆی هیچ ئاگای لە چۆنێتی دروست كردنی خۆی ببێ، جگە لەوەی خوای گەورە بۆی باس كردووە، دروست كراوە بە جۆرێك هەموو یەك سروشتی هەیە، هەموو بە چەند شتێكی تایبەتی جوێ بووتەوە لە هەموو دروست كراوەكانی تر، هەموو كۆبووەتەوە یەكسەر ئادەمی هاوبەشە لەو شتە تایبەتیانەدا، بە جۆرێ بە بلیۆنەها بڵاو بوونەتەوە لە زەوی دا بێ ئەمەی یەكێ لەوانە جوێ ببێتەوە لەوانی تر، نێرومێ هاوبەشن لەو سیفەتە تایبەتیانەدا جگە لە هەندێ شت كە نێرومێ جیاوازیان هەیە تێدا، كە ئەو جیاوازیەش پێویستە، كاتێ كە بیر بكاتەوە لەم بارەو ئیتر بەس بێگومان دڵنیا ئەبێ كە تەنها خواهیش‌و مەیلێ ئیشی تێدا كردووە، ئەگەر نا نەئەبوو. ئینجا ئەیخاتە پێش چاو نێرومێ لە ماڵاتو وڵاخ‌و حوشتردا كە بۆ ئادەمی دروستكراون، لەمانەوەی تێ‌ئەگەین كە ئەمە یاسای هەموو گیانلەبەرانە ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ﴾ دروستی كردووە بۆ ئێوە نێرومێ لەو چوار تیرە: مەڕ، بزن، ڕەشەوڵاخ، حوشتر[1] ئەم باسی چۆنێتی دروست كردنی ئادەمی‌و ئەم گیانلەبەرانە ئەكات بۆ

---

[1] مەبەست لە وشەی ﴿وَأَنزَلَ﴾ هێنانە خوارەوەی ئەو گیانلەبەرانە نیە، بەڵكو مەبەستی بڕیاری دروست كردنیانە كە لە ئاسمانەوە دەرئەچێت، یان مەبەستی هۆی دروست بوونیانە وەك: تیشك، ڕووناكی خۆرو مانگو ئەستێرەكانی تر، باران، كە ئەمانە هەموو لای سەرەوە دێنە خوارەوە بۆیان، هەروەها لەم وشەیەوە وەرئەگیرێ كە ئەمانە نیعمەتێكی تایبەتین لە لایەن خواوە بۆ بەندەكانی، سەرشۆڕو موسەخەر كراون بۆیان.

ئەمەی هەندێ لە بەرهەمەکانی قودرەتی خۆی دەربخا کە زۆر جێگای سەرسوڕمانە، ئەفەرموێ: ﴿يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖ﴾ هەمووتان، خۆتانو ئەو گیانلەبەرانەتان دروست ئەکات لەناو سکی دایکەکانتاندا، دروست کردن لەپاش دروست کردن، واتە بە چەند قۆناغێك دروستی کردوون، یەکەم جار ئەو نوختە ئاوە، ئینجا کردنی بە خوێنێکی پنر وەکو جگەر، ئینجا وەك پارچە گۆشتێکی ئەندازەی ئەوەی کە بجوێت، ئینجا کردوونی بە ئێسك، دوای ئەوە گۆشتی کردووە بەبەردا، ئینجا گیانی بەبەردا کردووە، بوونی بەو ئادەمیە یان بەو حەیوانە ڕێكو پێکە، ئەم هەموو قۆناغ پێبڕینەش لەناو سێ تاریکیدا: تاریکی ئەوکیسەی کەبێچووەکەی تێدایە، تاریکی منداڵدان، تاریکی ناو سك.

ئەو تەنیا نوختە ئاوە لەو ماوە کەمەدا ئەو هەموو گۆڕانەی بەسەردا دێت، ئەو هەموو قۆناغە دوور دوورانە ئەبڕێت، لەو شوێنە تاریکەدا، بێدەسەڵاتو زانینو بینینی هیچ ئادەمیو گیانلەبەرێکی تر، بێگومان ئەوە شتێکە بیر لێ کردنەوەی هەموو دڵێکی زیندوو پڕئەکات لە ئیمانو باوەڕ بە زانینو دەسەڵاتی بێسنوورو حیکمەتی تەواوو تاكو تەنیایی خوای گەورە، هیچ تێگەیشتوویەك ڕێگای تەكو جمی نامێنێ، ئەوەیش نەفامو نەزانە با لەبەری خۆیەوە بەبێ هۆش هەر وڕێنە بکات، لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ ئا ئەوە کە هەموو ئاسمانو زەوی دروست کردووەو شەوو ڕۆژ ئەهێنێ بە دوای یەکداو خۆرو مانگی موسەخەر کردووەو ئێوەی لە تاقە نەفسێ دروست کردووەو ئێوەو ئەو گیان لەبەرانەی کردووە بە نێرو مێو بەو جۆرەی کە گوترا دروستیان ئەکات، ئا ئەو کەسەی ئەمانە ئەکات ﴿الله﴾یە کە پەروەردگارتانە، تەنیا زۆرو دەسەڵات بۆ ئەو هەیە، هەر ئەو خاوەنی هەموو شتە، هیچ پەرستراوێکی تر حەقو ڕاست نیە. ﴿فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ﴾ کەواتە ئایا چۆن لادراون لە پەرستنو گوێڕایەڵی خوا؟ بۆ پەرستنی جگە لە ئەو، بڕیاردانی هاوبەش بۆی، واتە لادانتان جێگای سەرسووڕمانە، بەڵێ بە ڕاستی جێگای سەرسوڕمانە، چونکە شتەکە زۆر ڕوونە، خوا پەنامان بداتو سەرمان لێ تێك نەدات.

إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾

---

**دوای ئەوەی ئابەو شێوە ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانەی خستە پێش چاو، ئینجا هەموو لە نێوان دوو ڕێگادا ڕائەوەستێ، هەرکەس دەین و هەواڵی بە ملی خۆیەتی کام ڕێگا بۆ خۆی هەڵئەبژێرێ، ئەفەرموێ: ﴿إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕ ناهێنن، ڕێگای کوفر بەڵام ۆخۆتان هەڵئەبژێرن، بەوە هیچ کەم و کورییەك ڕوو ناکاتە موڵکی خوا، چونکە بێگومان خوا هیچ پێویستی بە ئێوە نیە، نە بە ئیمان و باوەڕتان موڵکی خوا زیاد ئەکات و نە کوفرو بێبڕواییتان موڵکی خوا کەم و ناتەواو ئەکات، بەڵام لەبەرئەوە بەڕەحم و بەزەییە بە بەندەکانی، کوفرو بێباوەڕیش ئەبێتە هۆی زیانیان، خوا ڕازی نیە بە کوفری بەندەکانی و پێی ناخۆشە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ﴾ خوا ڕازی نیە بە کوفرو بێبڕوایی بەندەکانی، ﴿وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ ئەگەر باوەڕ ئەهێنن سەری بەندایەتی شۆڕ ئەکەن بۆ خواو سوپاسی ئەکەن خوا ئەوەی پێخۆشە بۆتان، چونکە ئەوە هۆی ڕزگاریتانەو پاداشتیشتان ئەداتەوە.**

**هەموو کەس بەگوێرەی کردەوەی خۆی ڕەفتاری لەگەڵدا ئەکرێت لەو دنیا، هیچ کەس باری لەکۆڵی هیچ کەس ناخات وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ نەفسێکی گوناهبار گوناهی نەفسی تر هەڵناگرێت. کەواتە با هەموو کەس فریای خۆی بکەوێ، چونکە پاشەڕۆژ گەڕانەوە بۆلای خوایە، هەرچی کراوە لەم دنیا ئەخرێتەوە پێش چاوی خاوەنی، ئەوەیش خۆی لە بیری نەمابێ خوا ئاگادارە لێی وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ دوای ئەوە گەڕانەوەتان هەر بۆلای خوایە، ئینجا دوای گەڕانەوەو زیندوو بوونەوەتان پرسیارتان لێ ئەکرێ، خوا هەواڵتان ئەداتێ بە هەموو کردەوەکانتان کە لە دنیا کردووتانەو هیچی لێ گوم نابێ. ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ چونکە خوا ئاگادارە بەو خەتەرەو خەیاڵانەش کە بە دڵ دا دێت.**

﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُوٓاْ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾

---

پاشەڕۆژی هەموو ئەوەتە دیاریی کراوەو ئەویش هەردوو ڕێگایە، ئەوانەیش هەموو بەڵگەو نیشانەن، ئینجا هەرکەس بە ئارەزووی خۆی کام ڕێگایە بۆ خۆی هەڵئەبژێرێ هەڵیبژێرێ، ئەگەرڕێگای ڕاست‌وباشی گرت ئەوەخۆی قازانج ئەکات، ئەگەرلەوڕێگەش خۆی ترازاندخۆی زیاندارئەکات، دەبن‌وەهەواڵی بەملی خۆیەتی ڕێگەی گلەیی نیەلەهیچ کەس.

ئینجا شێوەی ئادەمی ئەمێنێتە پێش چاو کاتێ دووچاری بەڵاو سزا دەبن، شێوەیان لە کاتی خۆشی‌و نازو نیعمەتدا کە چۆن ئەگۆڕێن هەردەم بە بارێکدا، بەرگە ناگرن‌و دامەزراو نین، کاتێ نەبێ کە دڵیان لەگەڵ خوادایەو چاوەڕوانی ڕەحمی ئەو دەکەن، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُوٓاْ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ﴾ئادەمی ـ ئەوانەی کە دڵیان لەگەڵ خوادا نیە ـ کاتێ تەنگانە ڕووی تێ‌کردو زەرەرو زیانێکی لێ کەوت، هاوار ئەکاتە خوای پەروەردگاری بە ئامان‌و تەوبەو گەڕانەوە بۆلای، دوای ئەوە خوا نازو نیعمەتێکی دایەو خستیە خۆشی‌و تەنگانەو زیانەکەی لە بیر ئەچێ کە چۆن بە هاوارو لاڵە داوای لە خوا ئەکرد بە تاک‌و تەنیا، ئەو بارەی کە پێش هاتنی نیعمەتەکە لەسەری بوو لە بیری ئەچێ.

﴿وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ چەند هاوبەش‌و وێنە بۆ خوا بڕیار ئەدا، بەرهەمی پاشەڕۆژی ئەو بڕیارەش ئەوەیە کە خۆی گومڕا بووەو خەڵکیشی گومڕا کردووە لە ڕێگەی ڕاست لای دان، وەکو هەر ئەوە مەبەستی بووبێ وایە.

ڕێگای خوا تەنها یەکێکە دەست نادات بۆ زیاد لە یەك، هۆی گەیشتن بەو ڕێگە ئەمەیە کە تەنیا خوا بپەرسترێ، هەر بۆ ئەو گوێڕایەڵی بکرێ، خوا لە هەموو کەس‌و شتێ تر خۆشەویست تر بێت، عەقیدەو باوەڕ بە خوا کاتێ تەواوە کە هاوبەشی نەبێت بە هیچ جۆرو شێوەیەك، نە ماڵ‌و منداڵ، نە خاك‌و نیشتمان، نە دۆست‌و خزم، هەر کام لە مانەو جگە لەمانە هەرکات لە دڵدا کرا بە هاوبەشی خوا ئەوە بت پەرستیەو لادان‌و ترازانە لە ڕێگای خوا، لە پاش ماوەیەکی کەم گەیشتنە بە ئاگر، خوای گەورە دەربارەی ئەو تەرزە ئادەمیە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە هەڕەشەی بەمێزیان لێ بکات،

قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًاۖ إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا
يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ
ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٩﴾ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ

---

ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًاۖ﴾ بلێ: بە كوفرو بێباوەڕیەكەتەوە ماوەی كەمی ئەم ژیانە ڕابوێرە ئیتر خۆشی نابینی، ﴿إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾ چونكە تۆ لەو كەسانەی كە هەموو كات وان لە ئاگرداو هەرگیز لێی جوێ نابنەوە خوا پەنامان بدات.

هەموو خۆشی و ڕابواردنی ئەم دنیا هەرچەندە درێژیی كەمو بێنرخە، بەڵكو ژیان و عومری هەموو ئادەمی هەر كەمو بێنرخە بەرامبەر بە نەبڕاوەیی ڕۆژی دوایی، كەواتە هەرچەند بژی لەم جیهاندا هەر كەمو بێنرخە. دوای پیشاندانی شێوەی ناشیرینی ئەو جۆرە ئادەمیە، ئینجا شێوەیەكی ڕووناكی پاكو خاوێنی جۆرێ تر ئادەمی نیشان ئەدات، شێوەی دڵێكی لە خواترس كە خوای هەمیشە لە بیرە لە خۆشی و ناخۆشی دا، هەل لە دەست خۆی دەرناكات، لە ئێستاوە سزای ڕۆژی دوایی لە پێش چاوە، لەبەرئەوە خۆی ئەپارێزێ لەو ڕەوشت و كردەوە خراپانەی كە هۆی سزاو عەزابی ڕۆژی دوایین، بە تەمای ڕەحم و لوتفی خوایە، ئەفەرموێ: ﴿أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ﴾ ئایا كافری بێباوەڕ باشە یان كەسێ كە گوێڕایەڵ و گەردن كەچی خوای خۆیەتی و ئەیپەرستێ لە ئەیپەرستێ لە كاتەكانی شەوداو حاڵی وایە سوژدە ئەبات بۆ خواو ئەوەستێ لە شەو نوێژداو ئەترسێ و خۆی ئەپارێزێ لە سزای ڕۆژی دوایی و بە تەمای ڕەحم و بەزەیی پەروەردگارێتی.[1]

بەم جۆرە وەكو وترا ئەگەر وشەی ﴿أم﴾ بكرێت بە (متصلة) بە مانای ﴿أ﴾ی پرسیار، بەڵام ئەگەر بكرێ بە (منقطعة) كە بە مانای ﴿أ﴾ی پرسیارە لەگەڵ وشەی ﴿بل﴾ كە لێرە مەبەست گواستنەوەیە لە مەبەستێكەوە بۆ مەبەستێ تر. ئەو كاتە ماناكەی ئاوایە: ئایا كەسێ بەم جۆرە بێت و سیفەت و نیشانەكانی ئەمانە بێت كە گوترا وەكو كەسێ وایە كە

---

[1] ئەم وشەیە ﴿أَمَّنۡ﴾ خوێنراوەتەوە، ﴿أ﴾ی پرسیارە لەگەڵ ﴿من﴾ی موصولە، ئەو كاتەیش هەر یەك مەبەستە لەگەڵ ئەم خوێندنەوەی كە باوە.

سیفەت و نیشانەکانی دژی ئەمە بێت، کە وەرگیراوە لە شێوە پێشووەکە. بێگومان ئەو دوو شێوە وەکو لە کردەوەدا جیاوازن، لە فام و زانینیش دا وەکو یەك نین. شێوەی یەکەم شێوەی نەفامی و نەزانیە و شێوەی دووەم شێوەی فامداری و زانایییە، وەکو بۆمان ڕوون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بڵێ ئایا ئەوانەی کە زانان یەکسانن لەگەڵ نەزانەکاندا؟ واتە ڕوون و ئاشکرایە یەکسان نین.

زانینی ڕاستەقینە ناسینی شتی حەق و ڕاستە و گەیشتنە بە حەق و ڕاستی، کرانەوەی چاوی دڵە تا بگات بە شتە ڕاستە دامەزراوەکان لەم بوونەوەرەدا، زانین بریتی نیە لە تەنها ناسینی دیوی دەرو توێکڵی ئەو شتانەی کە بە ئاشکرا هەستیان پێئەکرێ و تەنها تاقی کردنەوە ئیشیان تێدا ئەکات، ئیتر بوەستێ و نەڕوا بۆ دیوی ناو و ئەو شتانەی کە بە ژیریی ڕووت ئەناسرێن، ئەو کەسانەی کە لەو سنوورانەدا ئەوەستن، بەڵام لە چوار چێوەی تاقی کردنەوەدا زۆر وریان، ئەوانە ڕاست و ڕەوا نیە پێیان بگوترێ زانا، ئەوانە ئەبێ پێیان بگوترێ کۆکەرەوەی زانراوان (معلومات)، واتە ئەوانە خۆیان زانا نین، بەڵکو زانراو و مەعلوماتی خەڵك ئەناسن، ئا بەم شێوە خوای گەورە ڕێگەی ڕاست و چەوتمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، بەو شێوە نایابە تەمێ و ئامۆژگاری ئەکات،بەڵام هەموو کەس ئامۆژگاری وەرناگرێ و تەمێ خوار نابێ: ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ ئامۆژگاری وەرناگرێ جگە لەو کەسانەی کە خاوەن عەقڵ و ژیریین.

پاش نیشان دانی ئەو دوو شێوە ئادەمیە، ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگەیەنێ بە بەندە ئیماندارەکان کە لەم ماوە کورتەی ژیانی ئەم زەویەدا هۆی دەستکەوتی نەبڕاوەی ئەو دنیا فەراهەم بێنن، ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾ بڵێ، خوا ئەفەرموێ: ئەی بەندە ئیماندارەکانم بترسن و خۆتان بپارێزن لە غەزەب و سزای پەروەردگارتان بەمەی بەردەوام بن لەسەر گوێڕایەڵی بۆی، وشەی ﴿تقوی﴾ بریتیە لە هەستی دڵ و ڕوانینی بۆلای خوا بەترس و لەرزەوە لە سزاو تۆڵەی، بە ئومێدی ڕەحم و چاوەڕوانی بەزەییەوە. ئینجا مژدە ئەدات بەم پاداشتە گەورە، ئەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ پاداشتی جوان و شیرین هەیە لە ڕۆژی دوایی دا بۆ ئەو کەسانەی کە لەم دنیادا چاکە ئەکەن، دیارە چاکە ئەوەیە کە بە گوێرەی ئایینی خوا بێت.

ئای چ پاداشتێکی گەورەیە... لە باتی ئەم چاکە کەمە لەم ماوە کورتەدا بکرێت، ئەو هەموو نازو ڕێزە نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی ئەدات، ئەمە هەر لە دەستی خاوەن بەخششو بەزەیی بێسنوور دێت، کەواتە هەرکەس فامو بەهێزتر بیت زیاتر کۆشش ئەکاتو ئەم هەلەی خوا داوێتی بە خۆڕایی لە دەستی خۆی دەرناکات، هەرچی خۆشەویستی ئەم دنیایە هەیە دەستی پێوە ئەنێ لە پێناوی ڕەزای بەرزترینو گەورەترینو خۆشەویستدا کە خوایە.
ئەو کەسە ئەگەر لە شوێنو وڵاتی خۆی بەرگری ئەکرا لە چاکە کردن، بەجێی ئەهێڵێو فیرار ئەکات بۆ شوێنێك کە جێ دەستی ببێ، وەکو لێرەدا ڕێنموونی ئەفەرموێ: ﴿وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ﴾ وڵاتو زەوی خوا زۆر فراوانە، کەواتە هەرکەس چاکەی زۆری بۆ نەئەکرا لە خاكو وڵاتی خۆی دا کۆچ بکات بۆ لایەکی تر.

خوای دروست کەرو پەروەردگار ئەزانێ کە کۆچ کردن زەحمەتەو ئەرکی قورسە لەسەر بەندەکانی، خۆ ڕووت کردنو داڕنین لەو شتانەی پەیوەندی دڵی پێوە هەیە یەکجار گرانە.
لەبەرئەوە ئیشارەت بە سەبرو خۆگرتن، بە پاداشتی بە لێشاوی بێسنوور، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەوانەی کە خۆگرن لە ژێر باری زەحمەتی گوێڕایەڵیو بەڵاو توشهاتو وازهێنان لەو شتانەی کە پەیوەندی دڵیان پێوە هەیە، ئەو خۆگرە خاوەن سەبرانە ئەجرو پاداشت ئەدرێنەوە لەو دنیا بەجۆرێ کە ژمارەو حیساب پیادا ناگات.

ئا بەم جۆرە نەرمو ناسکە تیماری ئەو هەموو ئێشو ئازارە ئەکات کە ڕووی کردە ئەو دڵانەی کە لەم دنیادا دووچاری سزا ئەبن لە ڕێگەی ڕەزامەندی پەروەردگاریاندا.ئینجا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە جاڕی چەند شتێك بدات لە لایەن خۆیەوە.

یەکەم: پەرستنی خوا بە تاكو تەنیایی پەرستنێکی پاكو خاوێن لە هەموو لەکەیەك.

دووەم: ترسانی لە تۆڵە، ئەگەر لابدات لە ڕێگەی خوا.

سێیەم: بڕیار دانی لەسەر دامەزراندنو مانەوەی لەسەر ڕێگەو بەرنامەیە کەلە لایەن خواوە بۆی هاتووە لەگەڵ باسی پاشەڕۆژی هەردوو ڕێگاکە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾ بلێ بێگومان من فەرمانم پێدراوە کە خوا بپەرستم بە جۆرێ ئایینەکەی بۆپاكوخاوێن بکەم، تێکەڵی هیچی تری نەکەم، تەنهاگوێڕایەڵیم بۆ ئەوبێ.

وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ
مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ

---

﴿وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ فەرمانم پێدراوە کە من یەکەمی هەموو موسڵمانەکانی ئەم ئوممەتە بم، واتە: یەکەم کەس بم لە گەردن کەچی بۆ خواو گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی.

پێغەمبەر (ﷺ) وەکو هەموو پێغەمبەرانی تر ـ سەلامیان لێ بێت ـ هەرچەندە پلەو پایەیان بەرزبێ لای خوا لە هەموو بەندەکانی تر گوێڕایەڵترو گەردن کەچ ترن، چونکە ئەوان خوا باشتر ئەناسن، خوا هەتا باشتر بناسرێ، گەردن کەچیو سەرشۆڕی بۆی بەهێزترو بەتین تر ئەبێ، پێغەمبەران ـ سەلامیان لەسەر بێت ـ هەرچەندە خوا وای دروست کردن کە ئارەزووی گوناهو سەرکەشیان نیە، بەڵام ئەگەر لە فەرزێکدا ئەوانیش بێتو سەرکەشی بکەن، مەترسی سزاو عەزابی خوایان لێ ئەکرێ، وەکو ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ). ﴿قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بڵێ بێگومان من ترسم هەیە لە سزاو عەزابی ڕۆژێکی گەورە کە ڕۆژی دواییە ـ ئەگەر سەرکەشی بکەم لە پەروەردگارم، گوێڕایەڵی بۆ نەکەم ـ.

ئەم جارانە لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) نرخێکی زۆر گرنگی هەیە بۆ ڕوون کردنەوەی چۆنیەتی باوەڕ بە تاکو تەنیایی خوا، پاکو خاوێن کردنی لە هەموو هاوبەشێك، چونکە کاتێ پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ کە هەڵبژێراوی خوان، بە تایبەتی گەورەترینی هەمووان کە محمد (ﷺ)، ئەمانە هەموو بەندەیەکی بن لە ڕیزی بەندەکانی تردا، ئیتر ئەبێ کێ بتوانێ سەر بەرز بکاتەوە؟ بە باشی ڕوون ئەبێتەوە کە تەنیا خوا خوایە جگە لەو هەموو بەندەیەکی زەلیلو سەرشۆڕە، تەنها ئەبێ ئەو بپەرسترێو مل کەچی بۆ ئەو ئەبێ.

ئەوا هەم فەرمان ئەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم جاڕ دووبارە بکاتەوە بە جۆرێکی بەتین تر، هەڕەشە بکات لە بت پەرستەکانو لێیان گەڕێ بۆ بەسەرهاتی سەختوسامناکیان، ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي * فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ﴾ بەبێ باوەڕەکان بڵێ: من تەنیا خوا ئەپەرستم بە جۆرێ ئاینو گەردن کەچیو سەرشۆڕیمی بۆ پاکو خاوێن ئەکەم، ئێوەش جگە لە خوا چی ئارەزوو ئەکەن بیپەرستن، واتە ڕاوەستن، تۆڵەو سزای سەرکەشیان ئەبینن.

له یەکەم جاردا خوا فەرمانی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە هەواڵ بگەیەنێ و جاڕ بدات کە فەرمانی پیا دراوە، کە تەنها خوا بپەرستێ بە پاك و خاوێنی، مەترسی هەیە لە تۆڵەو سزا ئەگەر سەرپێچی بکات. لەم جاڕی دووەمەدا فەرمانی دا کە هەواڵ بگەیەنێ و جاڕ بدات کە وەکو فەرمانی پیا دراوە گوێڕایەڵی ئەکات، هەر تەنها خوا ئەپەرستێ بە پاك و خاوێنی بێ تێکەڵ و پێکەڵی شتی تر، بەم جۆرە فەرمانی دا کە هیچ تەماو ئومێدێکیان نەمێنێ لە کۆتایی هێنانی پێغەمبەر (ﷺ) و لادانی لەو ڕێگەی کە لە سەریەتی.

ئینجا فەرمان ئەدات کە شێوەی هەڕەشەکە بەهێزترو ڕوونترو درێژتر بکات، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ بڵێ بێگومان زەرەرمەندو ڕەنجەڕۆیانی ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کە لە ڕۆژی دوایی دا خۆیشیان و ماڵ و خێزان و کەس و کاریان لە دەست چوو، چونکە پاشەڕۆژیان ئاگری نەبڕاوەی دۆزەخە، بە هەر جۆر بێ وەکو خۆیان لە دەست ئەچێ، هەروەها کەس و کاریشیان، چونکە ئەگەر هەموو دۆزەخێ ئەوا دیارەو ئەگەر کەس و کار بەهەشتێ ئیتر جارێ تر بە یەك ناگەنەوە، کەواتە حەقی خۆیەتی کە ئەفەرموێ: ﴿أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ بێدار بنەوە تەنها ئەوەی کە گوترا زەرەرمەندی و خەسارەتی ئاشکرایە، هیچ زیان و زەرەرێ نایگاتێ.[1]

ئینجا شێوەی ئەو زەرەرمەندیەی ئاشکرا پیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾ لە لای سەریانەوە چەند تەبەقێ لە ئاگر هەیە بۆیان هەموو تەبەقێ وەك هەورێکی ڕەش لاسەری تەبەقی ژێری ئەگرێ، لەلای ژێریانەوە چەند تەبەقێ وایان هەیە ــ پەنا بە خوا ـ کەواتە ئەوان وان لەناو ئەو تەبەقانەدا ئەسوتێن، بەڕاستی شێوەیەکی یەکجار سامناکە تا بیرێ لێ بکرێتەوە هەر کەمەو سامناکیەکەی بەهێزتر ئەبێ. ئەم شێوە سامناکەیان نیشان ئەدات لە دنیا کە هێشتا پێی نەگەیشتوون و لە توانایاندا هەیە خۆیانی لێ بپارێزن،

[1] بۆیە ئەو هەموو موبالەغە کرا لەو ڕستەدا: بە وشەی ﴿أَلَا﴾و سەربەخۆیی ڕستەکەو بە وشەی ﴿هُوَ﴾و ﴿ال﴾ لە وشەی ﴿الْخُسْرَانُ﴾داو سیفەتی ﴿الْمُبِينُ﴾.

ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ
ٱلۡبُشۡرَىٰۚ فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ

---

**لـه ئێستاوه ئەیانترسێنێ لێـی وەك ئەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥۚ﴾ ئـا بـەو عەزابـە سەختە خوا بەندەکانی ئەترسێنێ لەم دنیادا بۆ ئەمـەی دوورکەونەوە لـەو شتانەی کە هـۆی دووچاری ئەو عەزابەن، ئەوەندە خاوەنی ڕەحم و بەزەییە بانگیشتیان ئەکات بۆ خۆپاراستن لێـی، ئەفـەرموێ: ﴿يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ﴾ بەنـدەکانم خۆتـان بپارێزن لـە غـەزەب و عـەزابی مـن، شتێ مەکەن کە ببێتە هۆی غەزەب و عەزابی من.**

**ئینجا بەرامبەری کۆمەڵی دۆزەخیەکان باسی کۆمەڵی ڕزگاربووان ئەکات، ئەوانەی لەو دوا ڕۆژە بەدبەختیـە ئەترسـن، ئەفـەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ[1] أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ﴾ ئەو کەسانەی کە خۆیان دوور ئەخەنەوە لەپەرستن و گوێڕایەڵی فـەرمانی هـەموو ئەوانەی کە زۆر سەرکەشن لە خوا، واتە جگە لە خوا هیچ شتێ تر ناپەرستن، بە هەموو جۆر ئەگەڕێنەوە بۆ لای خـوا، ڕووی دڵیـان ئەکەنـە ئـەو و لـە غـەیری ئـەو وەری ئـەگێڕن، هـەر بۆ ئـەو کەسـانە مـژدەی زۆر گـەورە هەیـە لـە لایـەن خـواوە، ئینجـا فـەرمانی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە مژدەی خوایـان پێڕاگەیـەنێ: ﴿فَبَشِّرۡ عِبَادِ * ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ﴾ کەواتـە مـژدە بـدە بـەو بەندانـەم ــ کـە بـاس کـران ــ ئەوانـە کەسـانێکی ئـەوتۆن کـە سیفەت و نیشانەیان ئەوەیـە گوێ ئـەگرن لـە قسـەو وتـار، بـەڵام کوێرانـە ناکـەونـە شـوێن هـیچ قسـەیەك تـا پـاك و خاوێنی نەکەن، ئەو کاتـە خـراپ و بەکار نـەهاتووی فڕێ ئـەدەن و ئەکـەونـە شـوێن باشتر و شیرینتری: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ﴾ ئەوانـەی کـە بـاس کـران، ئەوانـە کەسـانێکن کـە خـوا ڕێنمـوونی کـردوون، خـوای گـەورە زانـی کـە دڵیـان خێر و چاکەی تێدایـە، لەبەرئـەوە ڕێنمـوونی کـردن بۆگوێگرتن و شوێن کەوتنی شیرینترین قسە،**

---

[1] ئەم وشەیە بۆ کۆبەکار ئەهێنرێ، بۆ چەند شتی تر بەکار هێنرا وەکو: کاهین، شەیتان، هەرکەسێ کە سـەرۆك بێت لـە گومڕاییداو لە بنەڕەتەوە سەرچاوەیە (مصدر) بۆ موبالەغەیە لە زیادە ڕەوی و سەرکەشی و تاوان و ناحەقیدا.

﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٨ أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ١٩ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ ٢٠﴾

---

﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ تەنها ئەوانەن خاوەنی عەقڵی ساغو سوود بەخش، عەقڵو ژیریی ڕاستەقینە دەستی خاوەنی ئەگرێ بۆ ڕێگەی ڕاستو ڕزگاری، ئەو کەسەی کە نەکەوێتە سەر ڕێگەی ڕاست وەکو فامو ژیریی لێ داڕنرابێ وایە، چونکە بێبەشە لە سوودو فائیدەی ئەو نیعمەتە گەورەیە.

ئینجا پێش ئەوەی کە شێوەو نازو نیعمەتی ڕۆژی دوایی ئەم بەندە پاکانە باس بکات، باسی لە خوا یاخیەکان بە جۆرێ ئەکات وەکو ئێستا لەناو ئاگری دۆزەخدا بن، لە توانای هیچ کەس دا نیە ڕزگاریان بکات، ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ﴾[1] هەرکەسێ لەلایەن خواوە بڕیاری عەزابی جێگیر بووبێ، ئایا تۆ هیچ کاروباری ئەوانت بە دەستە؟ واتە نەخێر، چونکە ئەو بڕیار لەسەر دراوانە وەکو ئێستا لەناو ئاگردا بن وایە، دەی ئایا ئەو کەسەی وا لەناو ئاگردا تۆ تازە ئەتوانیت ڕزگاری بکەیت؟ نەخێر تۆ ناتوانی دەست بخەیتە کاری خواو هیچ بڕیارێکی تێك بدەیت، دیارە کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) کە خۆشەویست ترینو گەورە ترینی هەموانە ئەم جۆرە شتەی بە دەست نەبێ، باشتر هیچ کەسی تر هیچی بە دەست نیە.

پاش ئەوەی شێوازی لە خوا یاخیەکانو لە خوا نەترساوەکانی وا نیشان دا کە وەکو ئێستا لەناو ئاگردا بن لەبەرئەوە بڕیاری خوایان لەسەر دەرچووە، بڕیارەکانی ئەویش بۆ گۆڕان دەست نادەن، پاش نیشاندانی شێوەی خوا پەرستو لە خوا ترسەکان نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ئەوانەی کە باس

---

[1] ئەم دوو پرسیارە بۆ نینکارن، بۆیە پاش هەردووکیان وتمان: نەخێر.

کران وان لەناو ئاگردا ئەسوتێن، بەڵام ئەوانەی کە لە خوای خۆیان ترساون‌و خۆیان پاراستووە لەو شتانەی هۆی عەزاب‌و سزای خوان بۆیان هەیە چەند هۆدەی ڕازاوە لەو کۆشکە کەس نەدیوانەی کە لەسەریانەوە چەند قات‌و هۆدە دروست کراوە، لە ژێریانەوە چەند قات‌و هۆدەی تر، لە ژێریی هەموویانەوە ڕووبارەکان دێن‌و دەڕۆن، وەك لە ئایەتی تردا ڕوون کراوەتەوە چوار ڕووبار هەیە:

١- ئاوی بێگەردو ساف.

٢- شیری پاك‌و خاوێن.

٣- عەرەق‌و شەرابی خۆش‌و بە لەزەت.

٤- هەنگوینی پاڵفتە.

شێوەی ئەم تاقانە لەو کۆشکە کەس نەدیوانە کە بۆ ئەمان هەیە بەرامبەر بەو تەبەقانەی کە باس کران بۆ لە خوا یاخیەکان لەلای سەروویان‌و لای خوارووویانەوە، ئەوانیش –پەنا بە خوا – لە نێوان ئەو تەبەقانەدا ئەسووتێنن.

ئینجا بۆ زیادە دڵنیایی ئەفەرموێ: ﴿وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ﴾ ئەمە شتێکە خوا بەڵێنی پێداوە، خوایش بەڵێنی خۆی ئەباتە سەر، خیلافی وادە ناکات. حەقی هەموو ئیماندارەکان وایە کە هەموو شێوە سزاو نازو نیعمەتەکانی قورئان بە شێوەی حازرو ئامادە تەماشا بکەن، وەکو یەکەم کۆمەڵ کە ئەم قورئانەیان چوو بە گوێدا، ئەو کۆمەڵە خوا پێداوە بەختیارە وا بوون بۆیە خۆیان لە هەموو بارو ڕوویەکەوە گۆڕی تا بوون بە نوێنەری هەموو حەق‌و ڕاستیەك، لە سایەی ئەم قورئانەدا ڕووی مێژوو ژیانیان وەرگێڕا.

ئەم قورئانە هەر کات لەهەر گەل‌و وڵات‌و چەرخێکدا بەو جۆرەی ئەوانە وەرگیرێ هەمان ئیشی خۆی ئەکا، بەڵام ئەگەر تەنها بۆ پیرۆزی خوێنرا، بێ ئەمەی مەبەست‌و مانای بزانرێ، یان با مەبەست‌و مانایشی بزانرێ، بەڵام بەڵێن‌و هەڕەشەکانی بە خوا کەریمەو خوا بەڕەحمە وەڵام درایەوە، دیارە ئەو کاتە ئەو سوودەی نابێ، بەڵکو ئەو کاتە حەق وایە مەترسی ئەوە بکرێ ببێتە هۆی غەزەبی خواو نەفرینی قورئانەکە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَـٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَـٰمًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٢١﴾

**ئینجا هەندێ لە بەرهەمی دەسەڵاتو توانای نەبڕاوەی خۆیمان نیشان ئەدات، بۆئەوەی خاوەن ژیریی و عەقڵ بیربکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾ ئایا نەتبینیوە کە خوا باران لە ئاسمانەوە ئەهێنێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی؟ ﴿فَسَلَكَهُۥ يَنَـٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئینجا ئەیخاتە ناو چەند سەرچاوەیەکەوە لە زەوی دا بە کانیاو یان هەڵقوڵاو دێتە دەرەوەو بە ڕووی زەوی دا ئەڕوا.**

**ئەم شتە ئاشکرا کە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە، بەهۆی ئەوەوە کە زۆر ئەبینرێ و ئولفەتو دەقی پێوە گیراوە، بووە بە شتێکی عادەتی و سەر لێ سوڕمانی نەماوە، وەکو هەموو شتێکی نایابی تر، لەبەرئەوە خەبەرمان بێتەوەو بیری لێ بکەینەوە، کەواتە بابیری لێ بکەینەوە: ئەم ئاوە لەبنەڕەتەوە چیەو چۆن پەیدا بووە؟ ئەم ئاوە کە ژیانی سەر زەوی پێوە بەستراوە، زانیاری ئەڵێ: ئاو پێك هاتووە لە یەکگرتنی دوو زەڕە هایدرۆجین لەگەڵ یەك زەڕە ئۆکسجین $H_2O$ بە هۆی چەند شتێکی تایبەتیەوە.**

**ئەم ناسین و زانینە ئەبێ باشتر دڵ بێدار بکاتەوە بۆ بینینی ئەو دەستە نهێنیە کە ئەم بوونەوەرەی بە جۆرێ دروستکردووە کە هایدرۆجین و ئۆکسجینی تێدا بێ، وای سازاندوون کە یەك بگرن بەو ڕادە تایبەتی و دیارییەو ئاویان لێ پێك بێت، ئینجا هاتنە خوارەوەی بۆ سەر زەوی ئەویش بە ڕژێمێکی تایبەتی پێك هاتووە، بوونی ئاو بە هەڵم بەهۆی گەرماوەو بەرز بوونەوەی هەڵمەکە بۆ سەرەوەرو وەستانی لە ڕادەیەکی دیاریی کراوداو دووبارە هێنانە خوارەوەی بۆ سەر زەوی بە ڕژێمێکی نایاب، ئەمانە هەمووی کردەوەو فەراهەم هێنانێکە بێ زانین و حیکمەتی تەواوو خواهیشی ڕێك و پێك و دەسەڵاتو توانای بێسنوور ناگونجێ، ئەو کەسەی ئەم کردەوانە بە ڕێکەوت دائەنێ ئەوە شایانی ئەوە نیە لە تیرەو گرۆی ئادەمیدا دابنرێ، چونکە بێبەشە لەوەی کە ئادەمی پێ جوێ ئەبێتەوە لە چوارپێ!!**

ئـاو هەرچـەند هـۆی پەیـدا بـوون و ژیـان و گیانلەبەرانـە، هـۆی پەیـدابوون و مانـەوەی دارو درەخـت و کـشتوكاڵە وەكـو لێـرەدا ئەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ﴾ خـوا بـەو ئـاوە كشتوكاڵ دەردەهێنێ و ئەیڕوێنێ لـە زەوی دا، لـە هـەموو چەشن و بابـەتێك كە ڕەنگەكانیان جیاوازە!!

بەڕاستی ژیـان و گیـانی كـشتوكاڵ و هـەموو شـتێ كەلـە زەوی دەڕوێ زۆر زۆر جێگـەی سەرسوڕمانە، بەڵگەیەكی زۆر ئاشكراو نیشانەیەكی زۆر ڕوونە لەسەر ئەو دەستە نیهێنیـەی كـە ئەو تۆمـەو دانەوێڵـە لـەت ئـەكا، ئـەو چـەكەرە زۆر ناسـكەی لێ دەرئـەهێنێ كـە بەرگـەی فوویەك ناگرێ، ئەو هەموو خاكە بەهێزە قورسـەی بۆ شـەق ئـەكا، بـەرە بـەرە گـەورەو بـەرزی ئەكاتـەوەو پـەڵ و پـۆی لێ ئـەخاو بـەرو بـوومی لێ فەراهـەم ئـەهێنێ، بـەم هـەموو ڕەنگـی جیا جیایەوە لە یەك پارچەو شوێندا، بەڵكو لە یەك بنجداو لە یەك پەلاو لە یـەك گوڵدا جیـاوازی هەیە. بێگومان هەركەس دڵی نەمردبێ شێوەی ئەم پێشانگایە ببینێتە پێش چاوی خۆی، لە هەموو ناوچەو كون و قوژبنی زەوی دا بە یەك جۆر، بە یەك شێوە، بێگۆڕانی هـیچ نـەوعێ لەو بارو شێوەیە كە بوویەتی، هەر دڵێكی زیندوو ئاوا بیر بكاتەوە پڕ ئەبێ لـە ئیمـان و بـاوەڕ بەو كەسەی كە ئەم كاروبارە فەراهەم ئەهێنێ.

﴿ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا﴾ ئەم جارە ئـەم هـەموو سـەوزی و كشتوكاڵە ناسكە كە ئاوی لێ ئەتكێ پاش ماوەیەكی كەم پێئەگات.. ئینجا بـەرەو وشـك بـوون ئـەڕوات، تـا لـە وشـكیدا بـە زەردی ئەیبینی و ئامادە ئەبێت بۆ دروێنەو هـەموو قۆناغـەكانی ژیـانی دوایـی ئـەهێنێ: ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا﴾ لـە پـاش ئـەوە لـەت لـەت و پارچـە پارچـەی ئـەكات. ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بێگومان لەو شتانەی كە باسكران بیرخستنەوە هەیە بۆ ئەوانەی كە خاوەن عەقڵن، ئەوانـەی كـە بیر ئەكەنـەوەو سـوود وەرئـەگرن لـەو عـەقڵ و ژیریـی و فامـەی خـوا پـێی داون، كەواتە ئیمانیان بەهێز ئەبێ بەو خوایەی كە ئەم شتە نایابانە فەراهەم ئـەهێنێ، كەلـە ئاسـتی هـەریەكەیان ئادەمی هەموو بێ دەسـەڵات و پـەك كـەوتوون لە فەراهەم هێنانی.

أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَـٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾

**باران ئەبارێ، کشتوکاڵی پێ ئەڕوێ لە زەویەکدا کە گیانو تەڕیی تێدا بێ، ئەو شوێنەی کە بەردێکی ڕەق بێتو تەڕیی تێدا نەبێ هەرچەند بارانی بەسەردا ببارێ هیچی لێ ناڕوێ، هەر بە وێنە دڵێك کە گیانی تێدا بێت بە قورئان دێتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەو دڵەی کە وەکو بەرد ڕەقو مردووبێت بێ بەشە لە پیتو بەرەکەتی قورئان، ئەو دوو جۆرە دڵە زۆر جیاوازن، ئەوی کە زیندووە بەرو بەرەکەتی قورئانی تیا ئەڕوێ، ئەوە دڵێکی خاوەن نوورو ڕووناکیە، ئەو دڵەکەی تری تاریكو ڕەقو بەدبەختەو گومڕایە وەکو ئەفەرموێ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ﴾ ئەو کەسەی کە خوا دڵی ڕێكو پێك کردبێ بۆ ئایینی ئیسلام تا بە ئاسانی لە دڵی دا جێگیر ئەبێ، کەواتە ئەو کەسە دامەزراوە لەسەر ڕووناکیەکی گرنگ لە لایەن پەروەردگاریەوە، واتە لەسەر ناسینی حەقو پەیڕەوی حەق. ئایا ئەو کەسە وەك کەسێك وایە کە دڵی وەك بەرد ڕەق بێتو پڕ بێت لە تەمو تاریکی، بە هیچ جۆر ئەو ئایینە ڕوونە وەرنەگرێ؟ ئاشکرایە ئەم دوو کەسە وەکو یەك نین، جا ڕادەو پلەی یەکەمی باس کردووە، دەربارەی دووەم ئەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْقَـٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ﴾ کەواتە بە هیلاکدا چوونو مردن، یا عەزابی سەخت بۆ ئەو کەسانەی کە دڵیان ڕەقە بەرامبەر خوا یان قورئانی خوا، ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ ئا ئەو خاوەن دڵە ڕەقانە وان لەناو گومڕاییەکی ئاشکرادا بە کەمترین سەرنج دان دەرئەکەوێ بۆ هەرکەسێ تێگەیشتوو بێت.**

لەو ئایەتە پێشووەدا باسی ئەو دوو جۆرە کەسەو ئەو دووجۆرە دڵەی فەرمو، ئینجا نیشانی ئەدا کە ئیماندارەکان ئەبێ چۆن بن لەگەڵ قورئان‌و بە چ جۆری وەری گرن‌و بچن بە پێشوازیەوە، ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ خوا جوانترین‌و شیرین ترین قسەو وتاری هێناوەتە خوارەوە، ئەویش پەڕاوێکە کە قورئانە هەموو پارچەو بەشەکانی وەك یەك وان لەمەدا کە هۆنینەوەیان بە جۆرێکە لە توانای کەسی تردا نیە جگە لە خوا، هەموو وەکو یەك ماناو مەبەستیان ڕێك‌و ڕاستە، هەموو بۆ سوودو بەرژەوەندی گشتیە، وتارو مەبەستەکانی چەند بارە کراوەتەوە، بەڵام دژو پێچەوانەی یەکتر نین، بەڵکو لە هەموو شوێنێکدا بە گوێرەی خۆی بە جۆرێ دووبارە کراوەتەوە وەکو شتێ تر بێت، تەڕو تازەی تا ئێستا نەبیسترابێ، ئەو کەسانەی کەلە خواترسن بە هەڕەشەکانی قورئان پێستی لە شیان قرچ هەڵدێت لە ترسان، چونکە باوەڕیان ئەوەندە بەهێزە بەو هەڕەشانە خورپەو لەرزە ئەکەوێتە دڵیان، بەهۆی ئەوەوە هەموو لەشیان دەکەوێتە جومبوش، پێست‌و موویان گرژ دەبێت.

ئینجا پاش ئەوە بەهۆی چاوەڕوانی‌و ئومێدیان بە ڕەحم‌و لێ بوردنی خوا ئارام ئەکەوێتە دڵیان، پێست‌و دڵیان خاو ئەبێتەوەو ئەو ترسەیان نامێنێ، ئارام‌و ئومێد پەیدا ئەکەن بەو یادی ڕەحم‌و لێ بوردنە، ئەدەب‌و شەرم‌و گەردن کەچی‌و چاولەبەری داگیریان ئەکات. بەڵام نایکەن بە هاوارو گاڵە وەك زۆر کەس کە شەیتان هەڵیان ئەخەڵەتێنێ‌و دووچاری ڕیایان ئەکات. ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ﴾ ئا ئەو قورئانە گەورە کە ئاوا کار ئەکاتە دڵی لە خوا ترسەکان ڕێنموونی خوایە، ئیرادەی هەرکەسی کردبێ ڕێنموونی پێ‌ئەکات‌و ئەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، خۆی بەندەکانی خۆی ئەناسێ، ئەزانێ کێ شایانی ئەوەیە ڕێنموونی بکات‌و کام ڕێنموونی وەرناگرێ: ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ﴾ هەرکەسێ خوا ڕێگەی لێ ون بکات‌و لەسەر ڕێگەی ڕاست لایدا هیچ کەسێ نیە بیخاتە سەر ڕێگەو لە چاڵی گومرایی دەری بێنێ ـ خوا پەنامان بدات ـ.

أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ

---

ئینجا شێوەیەکی بێبەشی و نائومێدیو عەزابێکی سامناکی ڕۆژی دوایی گومڕاکان نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۚ﴾ ئایا کەسێ کە دەمو چاوی ئەکا بە قەڵغان، بەوە ئەیەوێ بەرگری عەزابو سزایەکی سەخت بکات کە دووچاری ئەبێت لە ڕۆژی دواییا، واتە باوو عادەت وایە شتێکی خراپ بەرەو ڕووی هەرکەسێ بێت، دەستی ئەبا بەرەو ڕووی ئەو شتە خراپەو بە دەست ئەیەوێ بەرگری بکات، بەڵام تاوانباران ڕۆژی دوایی دەستو قاچیان لە کۆتایە، کەواتە کاتێ عەزابو سزای ئاگر دووچاریان ئەبێت، ناچارن دەمو چاویان بخەنەکار بۆ بەرگری، جا ئەم شێوە سامناکە نیشان ئەداتو ئەفەرموێ: ئایا ئەمانە وەك ئەوانە وان؟ واتە: وەکو لە خوا ترسەکان کە بە ئارام ئاسایشو بێترسن. لێرە تاقمی دووەم باس نەکراوە چونکە ئەزانرێ، وەکو لە ئایەتی تردا باس کراوە.[1] قورئان هەندێکی ڕاڤەیە بۆئەوی تری. ئینجا لەم کاتە تەنگە ناهەموارەدا ئازاری دەروونیش ئەدرێن بە تانەو تەشەر لێدان: ﴿وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ بە زاڵمەکان ئەگوترێ ـ لەو کاتە سەختەدا ـ بچەژن تۆڵەی ئەوەی لە دنیادا کردوتانە. ئینجا دێتەوە سەر بێبڕواکانی چەرخی پێغەمبەر (ﷺ) بە هەڕەشە لێ کردنیان بە سزاو عەزابێ کە ڕووی کردە بێبڕواکانی پێش چەرخی ئەوان، بەڵکو بگەڕێنەوەو فریای خۆیان بکەون تا هەڵیان لە دەست نەچووە، ئەفەرموێ: ﴿كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ﴾ ئەوانەی پێش ئەوان لە ئوممەتەکانی ڕابردوو باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان، بەهۆی ئەوەوە عەزابیان بۆ هات لە لایەکەوە کە هەستیان پێ نەئەکرد، بە خەتەرەیش بەدڵیاندا نەئەهات، ﴿ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ﴾ ئینجا خوای گەورە سەرشۆڕیی و ڕیسوایی لە ژیانی دنیادا دەرخوارد دان، بەوەش وازی لێ نەهێنان عەزابی سەختی هێشتەوە بۆ ڕۆژی دوایی،

---

[1] ﴿أفمن يلقى في النار خير أم يأتي آمنا يوم القيامة﴾.

وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾

---

وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَكْبَرُ﴾ بێگومان عەزابی ڕۆژی دوایی گەورەترە، چونكە بەتینترەو نەبڕاوەیە، ﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾[1] ئەوانە ئەگەر زاناو خاوەن تێفكران بوونایە، ئەوەیان ئەزانی و تەمێیان پێ وەرئەگرت. ئینجادوو وێنەوەك چیرۆك ئەهێنێتەوە بۆ كەسێ كە هاوبەش و شەریك بۆ خوا بڕیارئەدا، ئەوەی كە باوەڕی تەنها بە خوای تاك و تەنیا هەیە، لە پێشەوە مەبەست لە چیرۆك و پەندو وێنەكانی قورئان بە شێوەیەكی گشتی باس ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەم قورئاندا گەلێك چیرۆك و وێنەو پەندمان بۆ ئادەمیزاد باس كردووە، بەڵكو بیر بكەنەوەو پەندو ئامۆژگاری وەرگرن، ﴿قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ باسمان كردووە لەم قورئانەدا، كە قورئانێكە بە زمانی عەرەبی، ئاشكراو ڕوونەو هیچ لاری و لادان و شێوانێكی تێدا نیە، خوای گەورە بۆیە وای كردووە بەڵكو ئادەمیزاد بترسن و خۆیان بپارێزن لە هەڕەشەكانی، كردەوەیان بە گوێرەی فەرمانی خوا بێت، ئەوەی بەڵێنی پێداوە دەستیان كەوێت.

ئینجا دێتە سەر وێنەو پەندەكە ئەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ﴾ خوا باسی ئەكات و بە وێنە ئەیهێنێتەوە بۆ بت پەرستەكان، پیاوێكی بەندە كە چەند كەسێ تیایدا شەریك بن، ئەو شەریكانەش ئاژاوەو بەربەرەكانیان ببێ لەو تەنیا پیاوەدا، هەریەكە بە جۆرێ تەمێی دائەداو هەریەكە جۆرە داوایەكی هەیە لێی، هەریەكە ئەركێكی ئەخاتە سەرشان و ئەیەوێ ئەوە بەجێ بێنێ، ئەو بەندەیەش مات و سەرگەردان نازانێ ڕووی بەلای كێوە بكات، بە قسەی كام هەڵسوڕێ و فەرمانی كێ بەجێبێنێ، توانای

---

[1] ئەگونجێ مەبەست لە ﴿و﴾ لە وشەی ﴿يَعْلَمُونَ﴾ەدا گەلە بێبڕواكانی پێشوو بێت، یان بێبڕواكانی دوایی.

نیە ئارەزووی هەمووی بەجێ بێنێ، کەواتە دووچاری بێئارامیەکی ناڕەوا ئەبێت، ئەمە وێنەی ئەوانەیە کە شەریكو هاوبەش بڕیار ئەدەن، وێنە بۆئەوەی خوا تاكو تەنیا ئەپەرستێ، وێنەی پیاوێك ئەهێنێتەوە کە بەندەیەکی تایبەتی بێت بۆ تەنیا کەسێ بێهاوبەش دیارە ئەمە هێزو هەستو وزەی بەش بەش نابێ، ئەزانێ چی لێ داوا ئەکات، کەواتە ئەمەیان بە ئاسانیو دڵو دەروون دامەزراوی لەسەر بارو بەرنامەیەك دامەزراوە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ﴾ ئایا ئەم دوو وێنە وەکو یەك وان؟ ئایا سیفەتو بارو وەزعی ئەم دووانە یەکسانە؟ ئاشکرایە ئەم دووانە وەك یەك نین، یەکەمیان وا لە سزاو بێئارامیو دانەمەزراوی لەسەر هیچ بارێك، بەڵام دووەم دڵئارامو دامەزراوو یەك ئامانجو یەك ڕێگەیە، بێگومان ئەم دوو وێنە زۆر بەنرخن بۆ ڕوون کردنەوەی سوودی خواپەرستی بە تاكو تەنیا لەگەڵ زیانی بت پەرستیو شەریك بڕیاردان: ئەو کەسەی کە تەنها خواپەرستە ڕێگەی لێ تێك ناچێت، چونکە سەرچاوەیەك ئەناسێ بۆ ژیانو هێزو ڕۆزیو سوودو زیانی، هەروەها هەموو کاروباری یەك ئامانجو یەك بارە، هێزو وزەو هەستی کۆیەو دابەش نابێ، ئەمانە هەموو بە پێچەوانەی ئەوە کە خوا بە تەنیا ناپەستێ.

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ﴾ هەموو سەناو سوپاسێ بۆ خوایە بە تەنیا، کەواتە ئارامو ئاسایشو دامەزراوییو بێترسی پێخۆشە بۆ بەندەکانی. ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ﴾ کەوا وێنەو نموونەیەکی ئاوا ڕوونی هێنایەوە، کە ڕێگەی قسەی نەهێشتەوە بۆ ئەوانەی کە شەریك بۆ خوا ڕەوا ئەدەن، کەواتە ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ﴾ هیچ کەسی تر شایانی پەرستن نیە، ئەمجارە هۆی بت پەرستیو شەریك بڕیاردان باس ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾[1] ئەوانە باوەڕ ناهێنن بە تاكو تەنیایی خوا نەزانن، واتە هۆی ئەو باوەڕە ناڕێکەیان نەزانینو نەفامیو دەلیلو بەڵگە بەهێزانە کە بە جوانی حەقو ناحەقی پێڕوون بووەوە بۆ هەموو زاناو فامدارێك،

---

[1] وشەی ﴿أكثر﴾ بەمانازۆریەیە، بەڵام لەزۆرشوێندا بەمانای هەموویەکار ئەهێنرێ، جالێرەدا ئەگەر وشەی ﴿هم﴾ بریتی بێت لە هەموو کافرەکان ئەوکاتە بە مانای زۆریەیە، چونکە هەندێ باوەڕیان هێناوە، کەواتە ئەوانە نەزان نەبوون، بەڵام ئەگەرمەبەست لە﴿هم﴾ ئەوانەبێ کە بەردەوام بوون لەسەر کافری هەتا مردن، ئەوکاتە مەبەست لە ﴿أكثر﴾ هەموانە.

**ئینجا ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ * ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ بێگومان ئەی پێغەمبەر تۆ ئەمریو ئەوانیش هەموو ئەمرن، کۆتاییو ئەنجامی هەموو زیندوویەك مردنە، تەنیا خوا هەرمانەو مردن ڕووی تێناکات، بەڵام مردن دواچۆڕی هەموو کارێ نیە، بەڵکو مردن قۆناغێکە لەنێوان ژیانو زیندوویی دنیاو زیندوو بوونەوەی یەکجاری ڕۆژی دواییدا کە نابڕێتەوە.

دوای ئەم مردنە هەموو زیندوو ئەکرێنەوە ئینجا ئێوە لە ڕۆژی زیندوو بوونەوەدا لە لای خوا داواچی ئەبن لە یەکتر. لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر (ﷺ) دێت هەموو ئەوەستێنرێن بۆ ئەمەی بێباوەڕان داواچی بن لە یەك لەوەی کە گوتوویانەو کردوویانەو بەرەنگاری ئەو ئایینە پاکەیان کردووە کە خوا ناردیە خوارەوە بۆیان، واتە تۆ داواچی ئەبی بەمەی تۆ لەسەر حەق بوویتو ئەوان لەسەر ناحەق، تۆ کۆششت کرد لە ڕاگەیاندنو ڕێنموونیو ئەوان زۆر سەرکەشو بێباوەڕ بوون، بڕو بەهانەی بێ جێگەی بە تاڵیان ئەهێنایەوە.[1]

---

[1] زۆر لە زانایانی تەفسیر ئەفەرموون مەبەست ئاژاوەو داواچێتی گشتیە لە هەموو ئەوەی ڕووی داوە لەنێوان هەمووانـدا، بە هەموو چینو تیرەو بەرەیەکەوە، تەنانەت ڕۆح لە لەشو لەش لە ڕۆح داواچین.

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾

**ئینجا ڕادەو پلەی تاوانەکەیان باس ئەفەرموێ: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ﴾ ئایا کێ ستەمکارو زاڵم ترە لەوەی کە شتی ناحەق و درۆی بۆ خوا بڕیار دابێ، وەکو ڕەوادانی ڕۆڵەو هاوبەش بۆ خواو باوەڕ نەهێنان بەو ئایینە ڕاستەی ـ بێ ئەمەی تێفکرێ ـ بە درۆ دانایی، واتە هیچ کەسێ لەو کەسە زاڵم تر نیە، چونکە خۆیان شتی بەتاڵیان تووەو پاڵیان بەو شتە حەقەوە ناوە کە بۆیان هاتووە، دیارە ئەمەیە کوفری تەواو جێگەو ماوای ئەوانە دۆزەخە، دۆزەخ مەڵبەندو جێگەی هەتا هەتاییە بۆیان بێبڕانەوە، ئەوەیش بەسە بۆ تۆڵەیان، بۆیە هەڕەشەیان لێ ئەکات بەوە ئەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ﴾[1] ئایا دۆزەخ جێگەو ماواو نیشتەجێیی نیە بۆ کافرەکان؟ بەڵێ هەیە، کەواتە ئیتر بەسیانە چونکە هیچ تۆڵەو سزایەك ناگاتە ئاگری دۆزەخ.**

**ئەمە تاقم و کۆمەڵی تاوانباران و خراپان لە لایەکەوە، لە بەرامبەریانەوە تاقم و کۆمەڵی چاکان و پاکان و باس ئەکات بە خۆیان و کردەوەو پاداشت و پاشەڕۆژیانەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾[2] ئەو کەسەی کە لە لایەن خواوە ئایین و بەرنامەی ڕاستی هێناوەو باوەڕی پێی هەیە، کەواتە بە هەموو دڵ و بە دڵنیایی ئەیگەیەنێ وەکو هەموو پێغەمبەران ـ درودی خوایان لەسەر بێ ـ هەروەها هەرکەسێ تر کە شوێنی پێغەمبەران کەوتبێ بەشدارە لەو باوەڕو بانگ کردنەدا، ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ تەنها ئەوانە لە خواترسی ڕاستەقینەن، خۆیان ئەپارێزن لەو شتانەی هۆی ناڕەزایی خوایە.**

---

[1] ئەم پرسیارە بۆ تەقریرە واتە دان پیانان.

[2] هەندێ ئەفەرموێ: مەبەست بە ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ﴾ پێغەمبەرە (ﷺ)و مەبەست ﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾ ئیماندارانە، بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە باشتر ئەچێتە دڵەوەو زانین لای خوایە.

لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ أَسۡوَأَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٣٥﴾

---

**﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لە بەهەشتدا، لای پەروەردگاریان هەرچی داوا بکەن و ئارەزووی بکەن، ئەفەرموێ: بۆیان هەیە، واتە مافی خۆیانەو بە شێوەی چاولەبەری و منەت پێیان نادرێ، بۆ ئەمەی دڵیان گەردنەگرێ، چونکە هەر شتێك بدرێ بەهەرکەس بە شێوەی منەت و خێر پێکردن بێت، ئەو خۆشی و لەزەتەی نیە، ﴿ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾[1] ئا ئەوە پاداشتی ئەوانەیە کەلە دنیادا چاکەیان کردووەو بە شوێن ڕەزامەندی خوادا گەڕاون، ئەو پاداشتەیان بەو جۆرە ئەدرێتەوە، ﴿لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ أَسۡوَأَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾[2] لەبەرئەوەی خوا خراپەکانیان ـ تەنانەت خراپترین شتێ کە کردوویانە ـ بسڕێتەوەو دایپۆشێ لێیان، بە گوێرەی باشترین و گەورەترین کردەوە کەلە دنیا کردوویانە ئەجرو پاداشتیان بداتەوە. چونکە لە دنیادا شوێنی پێغەمبەران کەوتوون بەهۆی ئەوەوە لە خواترس بوون و کردەوەی چاکیان کردووە بەڕاستی گەڕاونەتەوە بۆ لای خوا، ئەوانە لەو دنیا خوا ئەیانخاتە بەهەشتی نەبڕاوەو چی ئارەزوو بکەن ئەیان درێتێ بێ منەت و چاولەبەری، بێجگە لەوەیش ـ لەبەرئەوە بەڕاستی دڵیان پاك و خاوێن کردووە بۆ پەروەردگاریان ـ لوتفێ تریان لەگەڵ ئەکات: هەرکام لە کردەوە چاکەکانیان بچووك بێ ڕادەی بەرز ئەکاتەوە، پاداشتی هەموو بە گوێرەی گەورەترین کردەوەیان ئەداتەوە ـ پەنا بە ڕەحم و فەزڵ و لوتفی ـ.**

---

[1] وشەی ﴿ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بە چەند جۆرێك تەفسیر ئەکرێ، ئەو شێوەی کە گوترا هەمووی ئەگرێتەوە.

[2] ئەم پاداشتە بۆ ئەو کۆمەڵەیەو لازم ناکات کە هەموو کردەوەی خراپیان هەبێ بەڵکو لەناو کۆمەڵەدا هەندێ تاوانبار بن بەسە بۆ بەدی هاتنی ئەو بەڵێنە، یان مەبەست بە وشەی ﴿أَسۡوَأَ﴾ تاوان بێشەرعی نیە بە نەزەر هەموانەوە کەواتە ڕەخنە ناگیرێ بە پێغەمبەران و ئەو کەسانەی کە بێ تاوانن لەو نیماندارە ڕاستانەی کە دوور بوون لە گوناهو تاوان.

أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ
هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم
مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ
بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ

---

**کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بەو هەموو گرنگیە هەوڵی ئەدا بۆ جێگیر کردنی باوەڕ بە تاك و تەنیایی خواو خاوێن کردنی پەرستن و گوێڕایەڵی بۆی، دژی بت پەرستی ئەدوێ، ئینجا بت پەرستەکانی قورەیش هیچیان بۆ نەمابووەوە ئەمە نەبێ ئەیان ترساند بە بتەکانیان، ئەیان گوت: ئەگەر کۆتایی نەهێنی ئەم بتانەی ئێمە غەزەبی لێ ئەگرن، ئینجا خوایش ئەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ﴾ ئایا خوا چارەسەری هەموو کاروبارێکی بەندەی خۆی کە پێغەمبەرە(ﷺ) نەکردووەو تەنها خوا بەس نیە بۆ ئەوە؟ واتە: بەڵێ چارەسەری هەموو شتێکی پێغەمبەری کردووەو ئەو کە خوای لەگەڵە ئیتر پێویستی بە هیچ کەس نیە، هەموو هێزی بوونەوەر تواناى نیە دەست بخاتە هیچ کارێکی.**

**لە ڕێوە ئەمە ئەدا بە گوێیاندا، ئینجا دێتە سەر باسی نەفامی ئەوان کە ئەیانەوێ پێغەمبەر (ﷺ) بترسێنن بەو شتانەی کە دەست نادەن و هەڵناگرن بۆ زیان گەیاندن، ئەفەرموێ: ﴿وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ﴾ بت پەرستەکان تۆ ئەترسێنن و هەڕەشەت لێ ئەکەن بەو شتانەی کە ئەیان پەرستن بێجگە لە خوا، ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾ ئەوانە خوا ڕێگەی لێ ون کردوون تا ئاوا بێئاگان لەوە کە تۆ خوات لەگەڵ دایە، تۆ ئەترسێنن بە شتێ کە ناتوانی هیچ زیان بگەیەنێ، هەرکەسیش خوا ڕێگەی لێ ون کرد ئیتر هیچ کەسێ نیە هیچ کەسێ نیە ڕێگەی نیشان بداو بیخاتە سەر ڕێگا، ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ﴾ هەرکەسیش خوا ڕێنموونی کردبێ و خستبێتیە سەر ڕێگا، هیچ کەس نیە ڕێگای لێ ون بکات و لەسەر ڕێگا لای بدات، خۆی ئەزانێ کێ شایان و موستەحەقە بۆ چ شتێ، هەر**

بڕیارێکی دا تێك دەری نیەو هیچ کەس ناتوانێ بیگۆڕێ. ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ﴾ ئای خوا زاڵ نیە بەسەر هەموو شتێکدا بە جۆرێك هیچ کەس ناتوانێ دەست بخات کاری، زاڵێکی وا کە تۆڵە سێن بێ لەو کەسەی کە موستەحەقە بۆ تۆڵە لێ سەندن؟ واتە بەڵێ زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو دەسەڵاتی تۆڵسەندنی هەیە لە هەرکەس موستەحەق بێت، کەواتە هەرکەسێ هەڵسێ بە بەندایەتی پاك و خاوێن بۆی و ئەویش کاروباری گرتبێتە ژێر دەستی خۆی، ئایا ئەبێ کێ بتوانێ بەندەی وا بترسێنێ؟!!

ئەو بت پەرستانە وەکو قورئان بۆمان ڕوون ئەکاتەوە باوەڕیان بوو کە خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چونکە چار نیە هەرکەس ڕێزی ژیریی خۆی بەلاوە ببێ، ئەبێ هەر ئەو قسە بکات، کە ئەم بوونەوەرە ڕاناوەستێ بەو خوایە نەبێ کە خاوەنی توانا و زانین و خواهیشێکی بەرزە، زاڵە بەسەر هەمووداا. جا بە گوێرەی ئەو باوەڕی خۆیانە ـ کە شتێکی ڕاستیشە ـ بەریان لێ ئەبڕێتەوە بەمەی کاتێ باوەڕیان هەیە بە خوا، ئیتر چۆن باوەڕیان هەیە کە هیچ کەس یان هیچ شتێ ئەتوانێ بە پێچەوانەی بڕیارو خواهیشی ئەو بجولێتەوە؟ کەواتە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئەترسێنن بەو بتانە؟ ئەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ﴾ سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار بکەیت لەو بت پەرستانە، ئایا کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ لە وەڵامدا بێگومان ئەڵێ ﴿الله﴾ دروستی کردووە، ئینجا تۆش پێیان بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر خوا ئیرادەو خواهیشی زیانێکی منی ببێ، ئایا ئەوانەی کە ئێوە ئەیان پەرستن ئەو زیانە لە لائەدەن؟ یان ئەگەر بیەوێ سوودو نیعمەتێکم بداتێ، ئایا ئەوانە ئەو نیعمەت و ڕەحمەتی خوا لە من ئەگرنەوەو بەرگری ئەکەن؟ بێگومان وەڵام هەر ئەمەیە: نەخێر توانای ئەوەیان نیە، کەواتە ئەبێ ئەوانەی کە بانگی مەردوم ئەکەن بۆلای خوا لە کێ بترسن و ئومێدیان بە کێ ببێ جگە لە خوا؟ ئایا کێ بتوانێ بیانترسێنێ هەرکات ئەو باوەڕە ڕێکە جێگیر بوو لە دڵی هەر ئیماندارێکدا ئیتر ترس چاوەڕوانی نامێنێ لەهیچ کەس و لەهیچ شتێ جگەلەخوا، پشت بە هیچ کەس هیچ شتێ نابەستێ جگە لە خوا.

قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي
عَٰمِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّآ
أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ
وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾

---

لەبەرئەوەی ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾ بڵێ خوام بەسە، چارەسەری هەموو شتێکی ئەکات، تەنها پشت بەونەبەستن ئەوانەی کە بەڕێکی کاروباریان حەواڵەی خوا ئەکەن، چونکە ئەزانن هەرچی ئەو بیەوێ هەر ئەوە ئەبێت هەموو شت لای ئەوەوە دێت.

دوای ئەوەی کە پشت بەسترا بە خوا، ئیتر باوەڕو دڵنیایی و ئارام و دڵ بە تەواوی دائەگرێ، ئیتر خاوەنی ئەو دڵە بێباك لەسەر ڕێگەی خۆی ئەڕوات، وەکو لێرەدا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ) کە گەورەترینی ئەوانەیە پشیتان بە خوا بەستووە: ﴿ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ *مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ﴾ لە هەڕەشەوە بڵێ: قەومەکەم ئێوە لەسەر ڕێگەو بارو حاڵەتی خۆتان بڕۆن و بەردەوام بن، بێگومان من لەسەر ڕێگەو حاڵەتی خۆم ئەڕۆم و لانادەم بێ ترس و بێ دڵەچرکێ، ئینجا بۆتان ئاشکرا ئەبێ و لەمەوپاش ئەزانن کە کێ لەم دنیا عەزابێکی بۆ دێت کە ڕیسوای ئەکات و لە ڕۆژی دواییشدا عەزابێکی نیشتەجێی دێتە سەر بێبڕانەوە.

ئینجا ئیش و فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دیاریی ئەکات و ڕوونی ئەکاتەوە کە خوا هیچ پێویستیەکی بەو بێبڕوانە و بە کەسی تریش نیە، هەرکەس گوێڕایەڵی ئەکات سوودی بۆ

خۆیەتی و هەرکەس نایکات خۆی زیانی پێئەگات، هەموو وان لە چنگی قودرەتی خوادا لە هەموو کات و بارێکدا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ﴾ بێگومان ئێمە ئەم پەڕاوە کە قورئانە هێناومانەتە خوارەوە بۆ سەر تۆو بۆ گرۆی ئادەمیزاد بەکسەر[1] بۆئەمەی پێی بکەونە سەر رێگەی ڕاست، بە گوێرەی ڕێنموونی ئەو ژیان ببەنە سەر، توێشوو لێرە هەڵگرن بۆ ژیانی دنیا، لەگەڵ حەقدا هێناومانەتە خوارەوە، لە هەموو بارو ڕوویەکەوە حەق و ڕاستی بۆ هێناون، ئینجا هەرکەس پێی ئەکەوێتە سەر ڕێگە ڕاست ئەو کەسە بۆ خۆی هەوڵ ئەدات و سوودو قازانجی بۆ خۆیەتی، هەرکەس لێی لائەداو بە ڕێبازی ئەمدا ناڕوا، ئەوە زیان و پاشەڕۆژی خراپی ئەو لادانە بۆسەر خۆی ئەگەڕێتەوە، تۆ ئەی پێغەمبەر نەکراوی بە فەرماندەو کاربەدەست بەسەر ئەوانەوە بە زۆر ئیمان و باوەڕیان پێ بێنێ، ئیش و فەرمانی تۆ ئەوەیە کە ئەوەی خوا پێی سپاردوی پێیانی ڕاگەیەنی و لە تۆ پرسیار ناکرێت کە بۆچی ئیمانیان نەهێنا؟ ئەو کەسەی کە کاروباری ئەمانەی بە دەستە تەنها خوایە، ئەمانە لە بێداری و خەوا وان لە ژێر دەستی قودرەتی خوادا، بەگوێرەی ویستی خۆی چی بۆی ئەوەیان لەگەڵ ئەکات،

---

[1] هەرچەند پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان (ﷺ) گشتیە و بۆ سەر جنۆکە و مەلائیکەیشە، ئەم پەڕاوەیش بۆ هەمووە، بەڵام لەبەر ئادەمی ڕەوانە کراوە و هاتووتە خوارەوە، جگە لە ئادەمی تابیع و شوێن کەوتووە، کەواتە لێرەدا باس نەکردنی جگە لە ئادەمی ئەوە پیشان ئەدات و ئەو مەبەستە ئەگەیەنێ.

ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾

---

**وەکو لێرەدا نیشانی ئەدات:** ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ **خوا گیانەکان ئەکێشێ و دەریان ئەکات لە کاتی مردن و کۆتایی هاتنی ژیانیدا، هەروەها لەکاتی خەوتنیاندا، ئینجا گیان کێشانی کاتی خەوتن هەموو یەکجاری نیە، بەڵکو ئەوانەی بڕیاری مردنی ڕاگیریان ئەکات و نایان داتەوە، ئیتر خەبەریان نابێتەوە و یەکجاری ئەمرن، ئەوانی تر بەرەڵا ئەکا تا ماوەیەکی دیاریی کراو لای خوا، ئا بەم شێوە هەموو کات هەموو وان لە ژێر چنگی قودرەتی خوادا، هەر ئەو کاربەدەستیانەو وا بەسەریانەوە و زیندوویان ئەکاتەوە و پرسیاریان لێ ئەکات.** ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ **لەو مراندن و ڕاگیر کردن و بەرەڵا کردنی گیانانەدا چەند بەڵگەو نیشانەیەک هەیە لەسەرزانین و توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە و لەسەر ئەمەی کە هەموو وان لە ژێر چنگی قودرەتی خوادا و هەموو کاروبار هەر بە دەست ئەوە، بەڵام ئەم نیشانانە بۆ هەموو کەس سوودی نیە، بەڵکو بۆ ئەوانەی کە بیرو هۆش و تێفکرانیان هەیە و بیر ئەکەنەوە لە چۆنێتی پەیدا بوونی گیان بە لەش و بەدەنەوە و مراندنی یەکجاری و ڕاگیر کردن و بەرەڵاکردنی، بە هۆی ئەمەوە ڕوون ئەبێتەوە کە زیندوو بوونەوە و پرسیارو حیساب شتێکی ڕێکی گونجاوە. دوای ئەمە ڕوونی کردەوە کە هەموو کاروباری هەر بە دەست خوایە، ئینجا بە شێوەی گاڵتە و لاقرتی پێکردن پرسیاری ئەکات لە بارەی ئەوەوە ەك بت پەرستەکان واسیتە بڕیار ئەدەن و ئەیپەرستن بۆ نزیك خستنەوەیان و نزا بۆ کردنیان،**

أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٤٥﴾

---

ئەفـــــــەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ ﴾[1] ئایائەمانە چەند واسیتەیە بڕیار ئەدەن لە نێوان خۆیانو خوادا ئەیان پەرستن بۆ ئەمەی نزایان بۆ بکەن لای خواو نزیکیان بکەنەوە لێی؟ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ئایا ئەمانە ئەکەن بە واسیتە با خاوەنی هیچ شتێك نەبنو هیچیشیان بە دەست نەبێو هیچیش نەزاننو فامو ژیرییشیان نەبێ؟ واتە ئایا ئەوەندە نەفامن هێشتا بەم شێوەش بڕیاریان ئەدەن بە واسیتە؟ ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ﴾ بڵێ هەموو شەفاعەتو لاڵەو نزاکردنێ تەنها عائدی خوایە، بێ ویستی خوایش هیچ کەسێ ناتوانێ شەفاعەتو لاڵە بکات، چونکە: ﴿لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ هەموو ئاسمانەکانو زەوی تەنها موڵکی ئەوەو هەر ئەو خاوەنی هەمووە، کەواتە هیچ کەس ناتوانێ قسە لە هیچ کارێکدا بکات بێ‌ویستو ڕای ئەو، ﴿ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ دوای ئەوە هەر تەنها بۆلای ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، کەواتە لە هەدوو دنیادا هەموو شت تەنها لە ڕێوە بە دەست خوایە، ئیتر واسیتە چیە؟

دوای ئەوە ڕوون کرایەوە کە خوا خاوەنی هەموو شتێکە، هەموو کاروبارێك تەنها بە دەستی ئەوە، ئینجا لێرەدا شوێنی ئەوەیە کە نەفامی بت پەرستەکان پیشان بدرێت، کە چۆن دڵ ئازار ئەبوون لە باسی تاكو تەنیایی خواو کەیفو دڵخۆش ئەبوون لە باسی شەریكو هاوبەش بۆی: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴾ کاتێ کە باسی خوا بکرێت بە تاكو تەنیا، ئەوانەی کە باوەڕیان نیە بە ڕۆژی دوایی دڵ تەنگو دڵ قەبزو ڕوو گرژ ئەبن لەوە، بەڵام کاتێ کە باسی

---

[1] وشەی ﴿ أَمِ ﴾ لەم شوێنەدا مەبەست کۆتایی هێنانە لە مەبەستی پێشوو لەگەڵ پرسیار لەوەی لە دواوەیە.

پەرستراوە ناحەقەکانیان بکرێ دەست بەجێ زۆر دڵخۆش‌و موژدە بەخش ئەبن، تا ئەو ڕادە سروشتی ئادەمیان ناتەواوە، چاکیان بە لاوە خراپ‌و خراپیان بە لاوە چاکە. ﴿سبحان الله﴾ زۆر ڕاستە کە قورئان تەڕو تازەیە بۆ هەموو کات، ئەم نەخۆشیە دەروونیە، ئەم تێك چوون‌و شێوانی میزاجە زۆر بە زیادەوە ئێستا هەیە لەناو زۆربەی ئادەمیدا، تەنانەت لەناو زۆربەی ئەوانەدا کە بەناو بە موسڵمان دائەنرێن، پشتاوپشت بە موسڵمانی هاتوون، تەماشا ئەکەیت کاتێ باسی ئەوەیان لابکرێت کە خوا خوای هەمووانەو ئەبێ بە گوێرەی فەرمانی خۆی هەر گوێڕایەڵی ئەو بکرێ‌و تەنها پەیڕەوی شەریعەتی ئەو بکرێ‌و تەنها بەرنامەکەی ئەو بکرێ بە ڕژێمی ژیان، کاتێ ئەم ئامۆژگاریە ڕاستە شیرینەیان بکرێ، ئەبینی سەر دائەخەن، هەست بە قورسی قسەکە ئەکرێت لەسەر دڵیان ڕوو گرژو ناوچاو تاڵ ئەبن، چاکترو ئەهوەن تریان ئەوەیانە کە دمە دەمێ ناکات‌و ملی دائەخات‌و ئەڵێ: ڕاستە، بەڵام ناکرێ، چی بکەین؟ زەمانەکە خراپ بووە، بێگومان باوەڕی وایە کە ناگونجێ بۆ ئەم چەرخە، کاتی خۆی بۆ چەرخێکی تایبەتی هاتووەو ئێستا ناکرێ. ئەم باوەڕەی هەرچەند لە دڵەوە هەیە، بەڵام نایڵێ، تەقێ ئەکات، لەبارەی ئیسلامەوە بەو جۆرەن، بەڵام لەگەڵ باسی هەر مەبدە و بیرو باوەڕێکی تر بکرێت، بە تایبەتی ئەوانەی تازە داهاتوون، بە نەفامی خەڵکی دوایان کەوتووە، کە باسی یەکێ لەمانە ئەکرێ زۆر لایان خۆشەو بە فراوانی دڵەوە لێی ئەدوێن‌و ئەچن بە پیرو پێشوازیەوە، لەگەڵ ئەمەدا ئەبینرێ ئەم هەموو بیروباوەڕە هەر قسەی ڕووتن، لە هیچ کاتێکدا هیچیان بە ڕێکی جێبەجێ نەکراون، زیاد لەوە لەبەرئەوە بە پێچەوانەی سروشتی ئادەمین بە هەموو هەوڵ‌و تەقەلا و ئاگرو ئاسن بیروباوەڕانە جێگیر ناکرێن. تەنانەت لەو شوێنانەش کە لێی هەڵقولاون، ساڵ بە ساڵ بژارەو گێژو تەتەڵە ئەکرێن، هەر سوودی نیەو فاشلن، هەرچی شتێکیان هەبێ کە خەڵکی پێ بخەڵەتێنن لە ئیسلامەوە وەرگیراوەو ئیسلام بە ڕێکی ئەوانەی پێش چواردە چەرخ پێك هێناوە، ئەمانە ئێستا بە قسەی ڕووت ئەڵێن: مافی مرۆڤایەتی، یەکسانی هەموو بەبێ جیاوازی ڕەنگ‌و تیرە، نەهێشتنی ڕەگەزایەتی، ئازادی‌و بەرگری زوڵم‌و ناڕەوایی، چارەسەری کاروباری داماوان‌و پەك کەوتووان...هتد.

قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا۟
فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن
سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا
كَسَبُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾

---

**ئەمانە كەوا هەست و تێگەیشتنیان تێك چووە، ئەمانە كە كوێرانە كەوتوونەتە شوێن بێگانەو دوژمنەكانی ئیسلام، ئەمانە كەوا سورشتیان گۆڕاوەو فام و ژیریی ئادەمییان نەماوە، ئەمانە بە جێگای ئومێد نەماون، حەق وایە لە وەڵامیاندا ئەمە بگوترێ كە خوای گەورە تەمێی پێغەمبەری (ﷺ) كرد، كە بیدات بە گوێی یەكەم چیندا كە پێشەوای ئەمانن، كە ئەمانیش جێگرو نیشتە جێی ئەوانن و لەسەر ڕێبازە نەفامیەكەی ئەوان ئەڕۆن:** ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ **بڵێ ئەی خوایە، ئەی كەسێ كەوا ئاسمانەكان و زەویت لە نەبووەوە دروست كردووەو دات هێناوە بێئەوەی وێنەیەكی لە پێشەوە بووبێ، ئەی كەسێ كە ئاگاداری بەسەر هەموو نهێنی و ئاشكرایەكدا، تۆ بڕیار ئەدەیت لە نێوان بەندەكانتدا لەو ئایین و حەق و ناهەقەی كە ئەوان نیزاع و ئاژاوەیان هەیە تێیدا لە دنیادا، واتە تۆ كۆمەڵی حەق و ناحەق لە یەك جیا ئەكیتەوە لە ڕۆژی دواییدا، بەم جۆرە كۆمەڵی حەق سەربەرز ئەكەیت و پاداشتی كەس نەدیوی نەبراوەیان ئەدەیتەوە، كۆمەڵی ناحەق سەرشۆڕ ئەكەیت و سزاو عەزابی دوا نەهاتوویان ئەدەیت، كەواتە تەنیا تۆ حوكم ئەكەیت لە نێوان من ئەماندا.**

**خوای گەورە فەرمانی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) كە پەنا ببا بە خوای خۆی كاتی كە بێ تاقەت و دڵگران بوو لە سەركەشی و دڵ ڕەقی بێباوەڕكان، كەواتە پێویستە لەسەر ئەو كەسانەی كە شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) ئەكەون و بانگی خەڵكی ئەكەن بۆ سەر ڕێگەی خوا، ئەو**

پێداوانەش کاتی کە ماندوویی و دڵگرانی ڕووی تێکردن ئەوانە پەنا ببەن بە خوای گەورە، ئەو پەنای یادی خوایە تیماری هەموو دەردو داخو دوویەکە.

ئینجا حاڵەتی سامناکی بێبڕواکان نیشان ئەدات لەو ڕۆژەدا کە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، بۆئەو مەحکەمەو بڕیارو جیا کردنەوەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ مِن سُوءِ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ سەختی و ناهەمواری عەزابی ئەم زاڵمانە لە ڕۆژی دواییدا لە ڕادەیەك دایە ئەگەر مەرجێكدا هەرچی وا لەزەویداو ئەوەندەی تریشی لەگەڵ دا بێت، هی ئەوانە بێگومان ئەیدەن لە فیداکاری دا، دەست ئەنێن بەو هەموو سامان و ماڵەوە ــ كە نەبێ كەس نازانێ چەندە ــ لە پێناوی ڕزگاریان لەو عەزابە سەختە لە ڕۆژی دواییدا، ئەوانە كە زۆربەیان كەشخەو شادمانیان بە سامانەوە بوو، ئەوە بەرگری ئەكرد لە ئیمان لە دنیادا، بەڕاستی هەڕەشەیەكی ئێجگار بەهێزو بەتین و سامناكە بیری لێ بكەیتەوە، هەر حەقی خۆیەتی، عەجەب بەردێكی ڕەشی نائومێدیە كە ئەیدا بە بەنۆكەی دڵدا ــ خوا پەنامان بدات ــ.

ئینجا بە شێوەو جۆری تر ناهەمواری و سامناكی پیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾ لەلایەن خواوە شتی وایان لێ دەرئەكەوێ كە بە هیچ ڕەنگ گومانیان نەبووەو چاوەڕوانیان نەئەكرد، شتی وا بەدڵیشیاندا نەئەهات، واتە سزاو عەزابەكەیان وێنەی لە دنیادا نەبووە، كەواتە بە دڵیشیاندا گوزەری نەكردووەو ناهەمواریيەكەی لە ڕادەیەك دایە بە زمان باسی ناكرێت و زمان پیادا ناگات، وەك دەربارەی خوا پێداوەكان ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾[1] ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئەو كردەوە خراپانەی كە لەم جیهانەدا كردبوویان بۆیە دەرئەكەوێ و لێیان ئاشكرا ئەبێ، تۆڵەو سزای ئەو كردەوانە چوار دەوریان ئەگرێ، ئەو تۆڵەو سزاكە هەڕەشەی لێ ئەكردن پێی، ئەوان گاڵتەیان پێ ئەكرد!!

---

[1] واتە هیچ نەفسێك نازانێ ڕادەی ئەو نازو نیعمەتەی چەندە، كە هۆی خۆشی و دڵو ڕووناكی چاوە، پەنهانی دوور بۆ ئەو بەندانەی خوا كە شەو نوێژ ئەكەن و بەشی موستەحەقان ئەدەن لەو ڕزقەی كە خوا پێی داون.

فَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلۡنَٰهُ نِعۡمَةٗ مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمِۭۚ بَلۡ هِيَ فِتۡنَةٞ
وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدۡ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٥٠﴾
فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ وَمَا هُم
بِمُعۡجِزِينَ ﴿٥١﴾

**ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆسەر ئەو سەر لێ تێك چووانە كە دڵ تەنگو گرژئەبوون لە لەناوبردنی خوا بە تەنیا، كەیف خۆشو مژدە بەخش ئەبوون كاتێ كە باسی بتەكانیان ئەكرا، ئەگەڕێتەوەە بۆ سەریان بەمەی كە پێچەوانەی باوەڕەكەی خۆیان ئەجولێنەوە، بەم جۆرە لە كاتی تەنگاوەدا نزاو لاڵەو پەنا ئەهێنن بە خوا بە تەنیا، هیچ باسی بتەكانیان ناكەن، واتە لەكاتی تەنگی دا تەمو دوكەڵ نامێنێ بەسەر دڵیانەوەو ئەگەڕێنەوە بەسەر سروشتی ئادەمی خۆیان، بەڵام لەسەر ئەو بارە ڕاستە بەردەوام نابن، هەركات ئەو ناڕەحەتیو تەنگاوە نەماو خوا خۆشی هێناو دەرووی كردەوە هەڵئەگەڕێنەوە سەر بارە لارەكەی خۆیان، ئەمەیش نیشانەیەكی تری خراپیو بەد ڕەفتاریانە، ئەفەرموێ:** ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلۡنَٰهُ نِعۡمَةٗ مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمِۭۚ﴾[1] **ئادەمی كاتێ كە زیانێكی لێ كەوت هاواریان لێ ئەكات بە نزاو لاڵە، دوای ئەوە كاتێ كە نیعمەتو خۆشیەكمان پێدا ـ ئەویش بە فەزڵی خۆمان بێئەوەی ئەو لایەقو شایانی ئەوە بێت ـ ئەو ئادەمیە خراپە ئەوەی كەلە كاتی تەنگانەو زیانەكەدا ئەیوت لە بیر ئەچێ، سروشتی ئەشێوێو لە كار ئەكەوێ، بە هۆی ئەوەوە دەربارەی ئەو نیعمەتو فەزڵە ئەڵێ: ئەمە بە زانینو لێ هاتنی خۆم دەستم كەوتووە، واتە زیانەكە پەردەی چڵكو چەپەڵیەك بەسەر سورشتیەوە نامێڵێو پاكی ئەكاتەوە، هەركات سروشتی پاكو خاوێن بوو ئەوە هەموو شت لە خواوە ئەناسێ، بەڵام دوای ئەو ژەنگ**

---

[1] مەبەست خراپەكانی ئادەمیە، بەڵام ئەمە باوە لە هەموو زمانێكدا حاڵەتی بۆ ئەندامی هەر تیرەیە ببێ ئەبڕێ بەسەر تیرەكەدا، بەڵام مەبەست ئەوانەیە كە ئەو حاڵەتەیان هەیە.

داگیری ئەکاتەوەو سروشتەکەی تێك ئەچێتەوەو لەکار ئەکەوێ‌و خۆی لێ ئەگۆڕێ ئەڵێ: دەست کەوتم لە لایەن خۆمەوەیە، خوای گەورەش ئەیخاتەوە بە درۆوەو ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ هِیَ فِتۡنَةࣱ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا یَعۡلَمُونَ﴾ نەخێر وانیە، واتەلە لایەن خواوە دەستکەوتی بووەو بۆ تاقی کردنەوەیە تا ئەوەی خوا ئەیزانێ دەرکەوێ: ئایا سوپاسی ئەکات یان سەرکەش ئەبێت؟ چاکە ئەکات یان خراپە؟ ڕێگەی ڕاست ئەگرێت یان لائەدات؟ شتەکە ئاوایە نەك بەو جۆرەی ئەوان بیری لێ ئەکەنەوەو تێی گەیشتوون، بەڵام ئەوەندە نەفام‌و نەزانن، خوای گەورە ئەوەندە بەڕەحم‌و بەزەییە بە بەندەکانی سڕو نهێنیەکەیشیان بۆ دەرئەبڕێ‌و ئاگاداریان ئەکات لەوەی کە مەترسی لێ ئەکرێ، کەواتە هیچ بەڵگەو بەهانەیە نامێنێ بۆ هیچ کەسێ کە ئەم ئایینە گەورەی پێگەیشتبێ. ڕەحمەکەی ئەوەندە فراوانە هەر بەوە نەوەستاوە، بەڵکو ڕوونتری ئەکاتەوەو ئەیخاتە پێش چاو کەلە پێش ئەمانەوە هەندێ لە سەرکەشان ئەو وشەیان بەدەمدا هات، بەهۆی ئەوەوە خوا بەربادی کردن، ئەمانەش دووچاری دەردی خۆیان ئەبن، ئەفەرموێ: ﴿قَدۡ قَالَهَا ٱلَّذِینَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَمَاۤ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُوا۟ یَكۡسِبُونَ﴾ بێ‌گومان ئەوانەی پێش ئەمان لە سەرکەشان ئەم وشەیان گوت، گوتیان: ئەمەی کە هەمانەو پێمان دراوە لەسەر زانین‌و لێ هاتنی خۆمانە، کەچی هەرچیان فەراهەم هێنابوو هیچ سوودی پێ‌نەگەیاندن، ﴿فَأَصَابَهُمۡ سَیِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ۚ﴾ چونکە تۆڵەی ئەو تاوان‌و سزایەی کە کردوویانە دووچاریان بوو، نەزانین‌و نە ماڵ‌و سامان نەهێزو دەسەڵات هیچ فریایان نەکەوت. ﴿وَٱلَّذِینَ ظَلَمُوا۟ مِنۡ هَٰۤؤُلَاۤءِ سَیُصِیبُهُمۡ سَیِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟﴾ لەسەر هەمان ڕێباز ئەوانەی زاڵم‌و تاوانبارن لەم ئوممەتەدا لەمەوپاش تۆڵەو عەزابی کردەوە خراپەکانیان دووچاریان ئەبێ، ﴿وَمَا هُم بِمُعۡجِزِینَ﴾ ئەمانە لە دەستی قودرەتی خوا دەرناچن‌و یاخی نابن لە خوا. ئەم سەرکەش‌و تاوانبارانە ئەنازین بەو نازو نیعمەت‌و سامان‌و ماڵە کە خوا پێی دابوون، ئەوەیان ئەکرد بە نیشانە لەسەر ئەوە کە سزاو عەزاب نادرێن، خوا ئەمانی ئەوێ، ئەوا قورئان ئەم باوەڕە بە درۆ ئەخاتەوە بەمەی زۆری سامان‌و ڕۆزی، یان کەمی بەڵگەی چاکی‌و خراپی نیە، ئەوە شتێکە بە گوێرەی ویست‌و خواهیشی خوایە،

أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾
قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ
هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾

**ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ ئایا ئەوانە نەیان ئەزانی کە خوا بۆ هەرکەس کە مەیلی ببێ ڕۆزی بۆ فراوان ئەکات، لەسەر هەرکەسێ مەیلی ببێ ئەیگرێتەوەو تەنگی ئەکات، بە گوێرەی زانین و حیکمەتی خۆی؟ ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان لەوەدا چەند بەڵگەو دەلیل هەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو شت لە دەست خوادایەو لای ئەوەوە دێت، بەڵام ئەو دەلیل و بەڵگانە بۆ ئەوانەیە کە ئیمان و باوەڕیان هەیە، چونکە بەهۆی ئیمانەکەیانەوە سروشتێکی پاکو خاوێنیان هەیە، چڵك و چەپەڵی دڵی داگیر نەکردوون، کەواتە هەست ئەکەن بەو دەلیل و نیشانانە، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان نیە هەست ناکەن. کاتێ کە شێوەی سامناك و ناهەمواری سزاو عەزابی ڕۆژی دوایی زاڵمەکان و تاوانبارەکانی باس کرد، ئینجا دەروازەی پان و فراوانی ڕەحم و بەزەیی ئەکاتەوەو ئەیخاتە سەرپشت بۆ بەندە تاوانبارەکانی کە بگەڕێنەوە هەرچەندو هەر ئەندازەیە زیادە ڕەویان کردبێ لە ناڕەوایی و تاواندا، چونکە بەندەکانی خۆی ئەناسێ، ئەزانێ کە زۆریان دەستەپاچەن بەرامبەر ئەوشتانەی کە هۆی تاوانن، چوار دەوری داون لە دەرو ناوەوە، ئەزانێ کە شەیتان بەو هەموو لێهاتن و لێزانینی خۆیەوە هەموو کات لە کەمین دایە بۆیان، بەسەر هیچ هەڵێکدا ڕانابورێ دەربارەیان، کەواتە دووچاری گوناهو تاوانیان ئەکات بەزۆری، جا بۆئەمەی نائومێدی دڵیان دانەگرێ ئەوان خوای بە ڕەحم ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (ﷺ):**

﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ **بڵێ خوا ئەفەرموێ: ئەی بەندەیانی ئەو تۆم کە زیادە ڕەویان کردووە لە تاوان کردنداو گوناهی زۆریان خستووەتە سەر شانی خۆیان هیچ نائومێد نەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوا، چونکە خوا لە هەموو گوناهەکان خۆش ئەبێ، بێگومان ئەو خاوەنی ڕەحم و بەزەیی زۆرەو زۆر لێ بووردەیە، بۆ گەیشتن بەو ڕەحم و لێ بووردنە هیچ شتێکی ناوێ جگە لە تۆبە کردن و گەڕانەوە بۆ قاپیە دانەخراوەکەی خوا،**

﴿وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ٥٤ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم﴾

---

ئەو قاپیە فراوان و گەورەیە کە ئەگەر بە یەکجار هەموو تاوانباران بە هەموو باری گوناهیانەوە بیانەوێ پێیدا بڕۆن ئەڕۆن بێئەمەی یەکێ لە یەکێ تریکەوێ: هیچ پرسیشی ناوێ، بەس تەنها گەڕانەوە بە ڕاستی وەکو بۆمان دەرئەکەوێ لەم فەرموودەیەوە: ﴿وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان و گەردن کەچ و گوێڕایەڵی بن پێش ئەمەی عەزابتان بۆبێت، دوای ئەوە ئیتر هیچ ناکرێ و بارمەتی نادرێن و ڕزگار ناکرێن. ڕێگەی ئەو لێ بووردن و ڕەحمە ئەم گەڕانەوە و گەردن کەچی و گوێڕایەڵیەیە لەگەڵ خوادا یەکسەر لە ڕێوە بێ واسیتە و تکاکاری بە پێی بەڵێنی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾[1] خوای بەڕەحم یەکجار لوتف و ڕەحمەکەی فراوانە، بۆئەوانەی کە کافری ئەسڵین تەنها ئیسلام بوونەکەیان کردووە بە کەفارەت و هۆی لێ بووردنی هەرچی تاوان و خراپەی لەوە و پێشیانە، هەر جۆرە گوناهێکیان کردبێ و هەرچەند ماوە و زەمان بەردەوام بووبن لەسەری، هەر لەگەڵ موسڵمان بن هەرکات تا نەگەنە حاڵەتی نائومێدی و غەرغەرە هەموو تاوانەکانیان ئەسڕێتەوە. هەروەها بۆ ئەوانەی کە موسڵمانن تۆبەی ڕێك و ڕاست ئەبێتە کەفارەت و هۆی سڕینەوەی هەموو گوناهی تا ئەگاتە نائومێدیی و غەرغەرە — وەکو گوترا — بە مەرجێ تۆبە و گەڕانەوە ڕاست و تەواو بێت بە گوێرەی فەرمانی شەریعەت.

ئینجا شێوەی گەڕانەوەی ڕاستەقینە و ڕێگەی بەختەوەری تەواو نیشان ئەدا، ئەیانترسێنێ لەوەی کە ئەم هەلە لە دەست خۆیان دەرکەن، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم﴾ بکەونە شوێن شیرنترو جوانترین شتێ کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆلای ئێوە هێنراوەتە خوارەوە — کە ئەویش ئەم قورئانەیە وا لە بەردەستاندا —

---

[1] واتە: وەرگرتنی تۆبە شتێکە خوا بڕیاری داوە لەسەر خۆی بۆ ئەو کەسانەی کە بە نەفامی و نەزانی خراپە ئەکەن و دوای ئەوە ئەگەڕێنەوە لای خوا بە زوویی پێش ئەمەی بگەنە کاتی مردن، ئەوانە خوا بە گوێرەی بەڵێنی خۆی تۆبەکەیان لێ وەرئەگرێ. سورەتی ﴿النساء﴾.

مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ بَغۡتَةٗ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ
عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي
لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوۡ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةٗ فَأَكُونَ مِنَ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٨﴾

---

**﴿مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ بَغۡتَةٗ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾ شوێنی شیرینترین پەیامو بەرنامەی خوا بکەون پێش ئەمەی لەناکاو عەزابتان بۆ بێت، لەکاتێکدا کە هەست ناکەن بە هاتنی، تا فریای خۆتان بکەون، کەواتە وەرن پەلامار بدەن، با ئەم هەلەتان لە دەست نەچێ لە دنیادا، ئەوکاتە داخو حەسرەت بچەژن لەو دنیا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوۡ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةٗ فَأَكُونَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ با هیچ کەسێ ئەوسا نەڵێ لە رۆژی دوایی دا: ئای داخی سەختم لەسەر ئەوەی کە قوسورم کرد لە بەجێ هێنانی مافی خوا بەسەرمەوەو گوێڕایەڵی بۆی، بێگومان بێبڕوا بووم، گاڵتەم ئەکرد بە بڕواداران، ئەوانەی کە بەندەیەکی تایبەتی بوون بۆ خوا، یان بڵێت: ئەگەر خوا ڕێنموونی منی بکردایە، منیش یەکێ ئەبووم لە خواترسەکان، خۆم ئەپاراست لە کوفرو گوناهو تاوان، واتە بەهانە ئەهێنێتەوەو هیچ سوودیشی نیە، یان بڵێت: لەو کاتەدا کە عەزابە سەختەکە ئەبینێ، ئاخ جارێ تر بگەڕامایەتەوە بۆ دنیا، ئەمجارە وام بکردایە تا ئەچوومە ڕیزی ئەوانەی کە لە باوەڕو کردەوەدا چاکن. واتە ئەوانەی شوێنی ئەم قورئانە نەکەون لەو دنیا دووچاری بەسەرهاتێکی سەخت دێن، لەسەرگەردانیدا نازانن چی بکەن؟ چی بڵێن؟ دەمێ داخو حەسرەت دەرئەبڕن، دەمێ عوزرو بەهانە ئەهێننەوە، دەمێ ئاواتی هاتنەوە بۆ دنیا ئەخوازن، بەڵام نەبێزاریو داخو خەفەت سوودی هەیەو نە عوزرو بەهانە هیچ پەرۆیە ئەکاو نە ئەو ئاواتە دێتەجێ، ئەو کەسەی ئەو بەهانە ئەهێنێتەوە ئەخرێتەوە بە درۆوە، ئەوەی ئەو ئاواتە ئەخوازێ نائومێدی پیشان ئەدرێ،**

بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ

---

**پێی ئەگوترێ:** ﴿بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾ **ئەوەی ئەڵێت خوا ڕێنموونی نەکردووم، پێی ئەگوترێت: درۆ ئەکەیت، ئاواتەکەیشت نایەتە جێ، چونکە بێگومان ئەیەتەکانی منت بۆ هات، ئینجا باوەڕت پێنەهێنا، بە درۆت ئەزانین، سەرکەشیت کردو خۆت بە زل زانی، چوویتە ڕیزی کافران، واتە خوا هەلی بۆ هەڵخستی و ماوەی دایت، فەرمانی خوات پێ گەیەنرا، تازە ئیتر گەڕانەوە نیە.**

**ئینجا شێوەی دیاری بێبڕواکان و لە خوا ترسەکان نیشان ئەدات لەو ڕۆژە سەختەدا، ئەفەرموێ:** ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ﴾ **ئەوانەی کەلە دنیادا شتی درۆیان بڕیوە بەسەر خوادا ـ ئەو شتانەی کە شایان نین بڕیاریان داوە بۆ خوا وەکو هاوبەش و ڕۆڵە ـ ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا بە ڕوو ڕەشی ئەیان بینی بە هۆی داخ و ناهەمواری ئەو ڕۆژە سەختەوە. ئەم کۆمەڵە بەد بەختە کە ئاوا دیارن کۆمەڵی سەرکەشەکانن کەلە دنیادا سەریان داناخەن بۆ حەق و خۆیان زۆر بە زل سەیر ئەکەن و خراپە بڵاو ئەکەنەوە لە زەویدا، وەکو ئەفەرموێ:** ﴿أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ **ئایا لە دۆزەخدا شوێن نیە بۆ ئەو سەرکەشانە کە ببێتە بەندیخانەو جێ و ماوایان، واتە: بەڵێ هەیە. ئەمە کۆمەڵی تاوانباران، بەڵام کۆمەڵەی تۆ کە کۆمەڵی چاکانە پاشەڕۆژیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ:** ﴿وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ﴾ **ئەو کەسانەی کەلە دنیادا لە خواترس بوون، بەهۆی ئەوەوە خۆیان لە تاوان پاراست و گوێڕایەڵ بوون، ئەوانە خوا ڕزگاریان ئەکات بە هۆی ئەوەی خێرو چاکەیان دەست کەوت و دەستیان چوو بوو بەخێرو چاکەدا لە دنیادا، یان بە هۆی ئەو بەختیاریی و گەیشتن بە ئامانجەی کە بۆیان بڕیار درابوو لەلای خوا،**

لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ
﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ
﴿٦٣﴾ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ
لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾

---

**ڕزگاریان ئەکات بە جۆرێ: ﴿لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ کە هیچ ناخۆشیو خراپەیەك دووچاریان نابێ، بە هیچ جۆر دڵ غەمگین نابن لە ڕۆژی دواییدا.**

**دوای ئەوەی ئاوا هەموو شت ڕوون کرایەوە، پاشەڕۆژی هەموو کۆمەڵێ دیاریی کرا، قاپی گەڕانەوە کرایەوە بۆ هەرکەس ئەگەڕێتەوە. دوای ئەمانە هەرکەس ئەچێ بە دەم بانگەوازی گەڕانەوە، بۆ ژێر سێبەرو سایەی ڕەحمو لێ بووردن با بچێ، هەل لە دەست خۆی دەرنەکات، هەرکەس لە تاوانو سەرکەشی دا ئەمێنێتەوە با بمێنێتەوە تا بە خۆی نەزانێ لەناکاو عەزابی سەخت داگیری ئەکات، دەینو هەوڵی بە ملی خۆی.**

**ئینجا لە دوا دوایی سورەتەکەدا یەکەم مەبەستەکەی ـ کە تاكو تەنیایی خوایە ـ پیشان ئەداتەوە وەکو چەند جاری تر پیشانی دا، ئەمجارە پیشان ئەدات لەم ڕووەوە کە خوا دروست کەرو خاوەنو کاربەدەستی هەموو شتە، هەموو بوونەوەر لە چنگی قودرەتی دایە هەردوو جیهاندا، بەو بۆنەیەوە شێوەیەکی نایابی ڕۆژی دواییش نیشان ئەدات. یەکەم جار ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ * لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ خوا دروستکەرو پەروەردگاری هەموو شتێکە، بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە، هەموو کاروبارێ بە دەست ئەوە، هەموو شتێ ئەو فەراهەمی ئەهێنێ، هەموو کلیلو غەزنەکانی ئاسمانەکانو زەوی هی ئەوە، واتە جڵەوی هەموو کاروبارێك بە دەست قودرەتی خوایە.**

**ئەمەی کە گوترا شتێکی حەقیقەتو ڕاستە، چارە نیە نەبێ هەموو تێگەیشتوو فامدارێ بیڵێو بڕوای پێی ببێ، چونکە هیچ کەس ناتوانێ بڵێ زەڕەیە لەم بوونەوەرەم فەراهەم هێناوە، لەبەر ئەمەی هەموو کاروباری بوونەوەرەکە بە ڕژێمێکی ڕێكو ڕاست ئەڕوا، هیچ عەقڵێ ڕەوا نادات کە بە ڕێکەوت بووەو ئیشو کاری ئەڕوا، ئەگەر زیاد لە یەك دەسەڵاتو خواهیش کاری تێدا بکردایە ئەشێواو ڕژێمی تێك ئەچوو، کەواتە حەقی خۆیەتی کە**

ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایەت‌و لیل‌و بەڵگەکانی خوا نیە تەنها ئەوانە خەسارەت مەندو ڕەنجەڕۆی ڕاستەقینەن، چونکە شەوکەت‌و جوانی بڕواو ڕەحمەتی هیدایەتیان لە دەست چووەو بێبەشن لە ئارامی یادی خواو لەزەت‌و شیرینی ئیمان، دیارە لە ڕۆژی دوایی دا خۆیان‌و کەس‌و کاریان ئەگەر هاوبڕوای خۆیان ئەوا ئەوانیش سوتەمەنی ئاگرن، پیاو چاکیش بن ئەوا ئیتر بە یەکتر ناگەن. ـ خوا پەنامان بدات‌و بڕوامان بە ئایەتەکانی جێگیرتر بکات ـ.

بت پەرستەکان زۆر هەوڵی ئەوەیان ئەدا کە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) یەك کەون‌و موساڵەحە بکەن، ئەوان خوای گەورە بپەرستن‌و پێغەمبەریش (ﷺ) هاوبەشی ئەوان بکات لە پەرستنی بتەکانی ئەوندا، جالێرەدا بە بۆنەی ئەوەوە باسی تاك‌و تەنیایی خوا کرا کە هەر ئەوە ڕاستەو هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا بەڵگەو شایەتە لەسەر ئەوە، بەم بۆنەیەوە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بێزاری دەربڕێ دەربارەی نەفامی‌و نەزانی ئەو بت پەرستانە، کە ئەیانەوی بەو شێوە یەك کەون‌و موساڵەحە بکەن، ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ﴾ بڵێ ئایا دوای ئەم هەموو نیشانە لەسەر تاك‌و تەنیایی خوا، ئەم هەموو ترساندن‌و هەڕەشە لەوانەی کە شەریك بۆ خوا ڕەوا ئەدەن، ئایا نەفام‌و نەزانەکان دوای ئەمانە ئێوە لە من داوا ئەکەن جگە لە خوا شتی تر بپەرستم؟! واتە ئەمە شتێکە زۆر بێ‌جێیە، نەفامیی تێرو تەواویی ئێوە دەئەخات.

ئینجا بۆئەوەی بە تەواوی نائومێدیان بکات لەو یەك کەوتنە کە هەوڵیان بۆ دا، بە دوای ئەو بێزاری دەربڕینەدا ئەمە ئەهێنێ: ﴿وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ بێ‌گومان وەحی وەتە لای تۆ، بۆلای هەموو پێغەمبەرانی پێش تۆ، گوتراوە بە تۆو بە هەموو یەکێ لەوان: ئەگەر شەرێك بۆ خوا دانێیت‌و جگە لە خوا یەکێ تر بپەرستی هەموو کردەوەت لەگەڵ ئەبێتەوەو ئەبی بەیەکێ لەوانەی کە خەسارەتمەندو ڕەنجەڕۆن، ئەچیتە ڕیزی نەوە.

هەرچەندە پێغەمبەران ـ درودی خوایان لەسەر بێت ـ ئارمزەووی هیچ گوناهێکیان نیە، چ جای کوفرو بت پەرستی، بەڵام لێرەدا ئەم ترساندنی ئەوانە جارێکی تر ئاگادار ئەکاتەوەو زیاتر بیمیان پێ‌پەیدا ئەکا، ڕوونی ئەکاتەوە کە ئادەمی هەموو یەکسەر بە پێغەمبەرانیشەوە لە پلەی بەندایەتی بۆ خواو پەرستنی ئەودا یەکسانن‌و تەنیا خوا خوایە.

بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾

**ئینجا ئەو ترساندنە دوایی پێ‌ئەهێنێ بە فەرمان دان بە پەرستنی خوا بە تەنیاو سوپاس کردنی لەسەر ئەو ڕێنموونی ئیمان‌و باوەڕە ڕێکە، لەسەر هەموو نیعمەتەکانی تری کە ژمارە ناکرێن، ئەفەرموێ:** ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ **نەخێر، کەواتە بە گوێیان نەکەیت هەر تەنیا خوا بپەرستە، یەکێ بە لەوانەی کە سوپاس‌و ستایشی خوا ئەکەن بەسەر نیعمەتەکانی، واتە بەردەوام بە لەسەر ئەو پەرستن‌و سوپاسە.** ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ﴾ **ئەو بت پەرستانە ڕێزو قەدری خوایان نەگرتووە بەو ڕێزو قەدرەی کە شایانی ئەو بێت، نەیانناسیوە بەو ناسینەی لایەقی ئەو بێت، لەبەرئەوە هاوبەشی بۆ خوا ڕەوا ئەدەن بە تاک‌و تەنیا ئەو ناپەرستن، شتێ کە شایانی ئەو نیە بۆی بڕیار ئەدەن، هەست ناکەن بەبێ‌سنووری دەسەلات‌و توانای.**

**ئینجا وێنەیەك لەسەر هەموو ئاسارو بەرهەمی گەورەیی‌و توانای نیشان ئەدات بۆ ئەمەی بەندەکانی بە فام‌و تێگەیشتنی کەم‌و کوڕی دیاریی کراویان ئەندازەیە تێبگەن لە گەورەیی‌و توانایی بێ‌سنوورو نەبڕاوەیی ئەو، ئەفەرموێ:** ﴿وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ﴾ **هەموو زەوی لە ڕۆژی دواییدا وا لە چنگی قودرەتی خوادا، ئاسمانەکان بە توانا‌و قودرەتی ئەو ئەپێچرێنەوە‌و لائەبرێن.**

**هەموو ئەم وێنەو شێوانەی کەلە قورئاندا یان لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) نیشان ئەدرێن، مەبەست تێگەیاندنی ئێمەیە‌و نزیك خستنەوەی ئەو شتە ڕاستانە لە فامی ئێمەوە، چونکە بەو جۆرە نەبێ ئێمە تێناگەین لە سیفەتە بێ وێنەو بێ‌سنوورەکانی خوا** ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ **خوا پاك‌و بێگەردە لە هەموو لەکە‌و عەیبێ، بەرزو بڵندە لەوەی هاوبەشی بۆ ڕەوا ئەدەن، لە هەموو ئەوانە کە کراون بە شەریك‌و هاوبەشی!!**

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾

---

ئینجا شێوەیەك لە شێوەكانی ڕۆژی دوایی نیشان ئەدات، لە وێران كردنی ئەم جیهانەوە دەست پێ ئەكات، بە وەستان بۆ پرسیارو موحاسەبەو ڕەوانە كردنی دۆزەخیەكان بۆ دۆزەخ و بەهەشتیەكان بۆ بەهەشت دوایی ئەهێنێت، ئەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ فوو ئەكرێ بە سوورا، ئینجا بێ تەفرە هەرچی زیندوو هەیە لە ئاسمانەكان و زەوی دا هەموو ئەمرن، جگە لەوانەی كە خوای گەورە ئەیەوێ نەمرن، ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ ماوەیەك دوای یەكەمجار ـ نازانێ چەندی پێ ئەچێ ـ جارێ تر فوو ئەكرێتەوە پێ ی دا ئیتر دەست بەجێ هەرچی مردوو بووە لەم جیهانەدا هەموو ڕاست ئەبێتەوە، لە گۆڕ دێنە دەرەوەو زرت و زیندوو ئەڕوانن، لە سەرسامی دا ئەم لا و ئەولالا خۆیان ئەكەن، یان چاوەڕوانی ئەكەن بزانن چیان بەسەر دێ، ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾ زەوی ڕووناك ئەبێتەوە بە نورێ كە پەروەردگار فەراهەمی ئەهێنێ بۆ هۆی شتی تر وەكو مانگ و خۆر. یان مەبەست لەوشەی ﴿نور﴾ عەدل و دادپەروەریە، واتە عەدل و دادپەروەری خوای گەورە زەوی دائەگرێت و تۆوی زوڵم و ناڕەوایی نامێنێ، ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ﴾ دەفتەرێ كە كردەوەی تێدا نووسراوە دائەنرێ بۆئەمەی بدرێ بە خاوەنەكانی، ﴿وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ﴾ پێغەمبەران و ئەو مەلائیكانەی كە شایەتن لەسەر كردەوەی بەندەكان ئەهێنرێن بۆئەمەی هەر قسەیەكی حەق و ڕاستیان لا هەیە بیڵێن: ﴿وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ بە حەقیانەت بڕیاری ئەدرێ لەنێوان بەندەكانی خوادا، هیچیان زوڵمیان لێ ناكرێ، بە هیچ جۆرێك نە بە كەم كردنەوەی پاداشت و نەبە زۆر كردنی تۆڵەو سزا،

وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ
جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ
يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ
كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾

**﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ هەموو نەفسێ جەزاو پاداشت و تۆڵەی خۆی ئەدرێتەوە هەرکەس شایانی هەرچی بێت وای لەگەڵ ئەکرێ، خوای گەورە لە هەموو ئاگادار ترە بە هەموو کردەوەی بەندەکانی، کەواتە هیچی لەدەست دەرناچێ و هیچی لێ ون نابێ. بێگومان لە ڕۆژی دوایی دا هەموو بەندەکانی خوا ئەکرێن بە دوو کۆمەڵ: دۆزەخی و بەهەشتی، جالێرەدا بە کورتی شێوەی ناردنی هەر یەکێ لەو دوو کۆمەڵە بۆ مەڵبەندی هەمیشەییان باس ئەکات... ئەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ﴾ هەموو کافرەکان ڕەوانە ئەکرێن و ئەنێررێن بۆ دۆزەخ پۆل پۆل، جیا جیا تاقم لە دوای تاقم بە گوێرەی ڕادەیان لە گومڕایی و خراپیدا، سەوق ئەکرێن لە ساحەی مەحکەمەوە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا﴾ تا ئەگەنە لای دۆزەخ، کاتێ ئەگەنە بەرەوە قاپیەکانی ئەکرێنەوە بۆیان ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ﴾ لەو کاتەدا کلیل بە دەست و فەرمانبەرەکانی دۆزەخ بە تانە و تەشەرەوە پێیان ئەڵێن: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَاۚ﴾ ئایالەخۆتان پێغەمبەرانتان بۆ نەهات کە ئایەتەکانی خواتان بەسەردا بخوێننەوە و بتانترسێنن لە تووش بوون و گەیشتن بەم ڕۆژە، ئەوانیش لە وەڵامدا: ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ ئەڵێن: بەڵێ هاتن و بۆیان خوێندنەوە و ترساندینیان لەم ڕۆژە و دەلیل و بەڵگەکانی خوایان بۆ ڕوون کردینەوە: ﴿وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بەڵام باوەڕمان نەهێنان و سەرکەیشمان کرد، ڕێگای کوفریان دایە بەرو بڕیاری عەزابیش لەلایەن خواوە دەرچووبوو دەربارەی ئەوانەی کە کافرن، کەواتە چارە نیە،**

قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ

---

﴿قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ﴾ **پێیان ئەگوترێ: بچنە ناو دۆزەخ بە بمێننەوە تێیدا بێبڕانەوە. کەواتە ئای چ خراپترین جێگاو ماوایەکە، جێگاو ماوای ئەوانەی کە خۆیان بە زل ئەزانی، سەریان بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەران دانەئەنەواند.**

**ئەمە تاقمو کۆمەڵەکانی دۆزەخ، ئینجا با بزانین کۆمەڵو تاقمی بەهەشتی چۆن ئەبن؟ ئەوا دەربارەی ئەوانیش ئەفەرموێ:** ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ﴾ **کۆمەڵی لە خواترسەکان، ئەوانەی لە دنیادا خۆیان پاراست لەو شتانەی هۆی ناڕەزایی خوان، ئەمانە ڕەوانە ئەکرێن پۆل پۆلو تاقم تاقم، یەک لە دوای یەک بە گوێرەی جیاوازیان لە ڕادەی شەرافەتو بەرزیان لای خوا.** ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا﴾[1] **ئەڕۆن تا ئەگەنە لای بەهەشت، لەوێدا فەرەحو خۆشی ڕوو ئەداتو ڕێزو قەدرێ ئەگیرێن بە جۆرێ باسی ناکرێ، زمان ناگات بە وەسفو سەنایان** ﴿وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا﴾ **پێش ئەوەی بگەنە پێشەوە قاپیەکانی بەهەشتیان بۆ ئەکرێتەوەو بە ڕێزەوە چاوەڕوانی ئەکرێن، کە گەیشتنە پێشەوە بە خۆشیەوە پێشوازی ئەکرێن لەلایەن خزمەت چیو مەلائیکەتەکان لە قاپیەکاندا** ﴿وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ﴾ **کلیل بە دەستو فەرمانبەرەکان پێیان ئەڵێن: سەلامتان لێ بێ، واتە ڕەحمەتو ئارامو ئاسایش لەلایەن خوا دابارێ بەسەرتاندا ئیتر هەرگیز ناخۆشی نابینن،**

---

[1] وەلامی ﴿إِذَا﴾ نەوتراوە تا پیشان بدات کە ڕێزو قەدرو خۆشی ئەو کۆمەڵە بەختیارە لە ڕادەیەک دایە زمان پیای دا ناگات، وشەی ﴿و﴾ زیاد کرا لەسەر وتەی ﴿وَفُتِحَتۡ﴾ بۆ ئەمەی نەکرێ بە وەلام. هەروەها پیشان بدات کە قاپیەکان لە پێشەوە کراونەتەوە، بە ڕێزەوە چاوەڕوانی ئەکرێن کە ئەوەیش باوی ڕێزگرتنی دۆستانو خۆشەویستانە، بەلام لە باسی دۆزەخیەکاندا ﴿و﴾ نەترا تا بزانرێ ﴿وَفُتِحَتۡ﴾ وەلامەو لە کاتی گەیشتنە بەرەوە قاپی ئەکرێتەوە کە ئەوەیش باوە بۆ بەند کردنی بەند کراوان لە بەندیخانەدا.

طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ
مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴿٧٤﴾ وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ
يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٧٥﴾

**هۆی ئەم نازو ڕێزە ئەوەیە: ﴿طِبْتُمْ﴾ ئێوە پاكو خاوێن بوون لە چڵكو چەپەڵی گوناهو تاوان، بەهەشت پاكەوشوێنی پاكانە، ﴿فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ ئینجاكەواتە بچنە ناویەوە بەنیازی مانەوەی نەبڕاوەی هەتا هەتاییەوە، ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ﴾ ئەوانیش هەموو دەست ئەكەن بە سوپاسو سەنای پەروەردگار، ئەڵێن: هەموو سوپاس بۆ خوایەكی ئەوتۆ كە ئەو بەڵێنەی لە دنیادا دابووی پێمان بەدی هێناو بەڕاستی گێڕا، ﴿وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ﴾ ئەم جێگاوماوایەی پێداین لەهەموو شوێنێ لە بەهەشتی فراواندا بمانەوێ و ئارەزوو بكەین دائەنیشین ﴿فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ ئای چ پاداشتێكی چاكە بەهەشت بۆ ئەوانەی كە لە دنیادا كردەوەی باشیان كردووە، ئینجا باسەكە دوایی ئەهێنێ بە جۆرێ دڵو دەروون پڕ ئەكا لە سامو هەیبەت، بە ڕێكترین شێوە لەگەڵ تاكو تەنیایی خوادا كە هەموو مەبەستی سورەتەكە ئەگەڕێتەوە بۆی، ئەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ مەلائیكەتەكان ئەبینی چواردەوری عەرشیان داوە بە جۆرێ خەریكن بە پەروەردگاریانەوە زیكری ئەكەن بە پاكو بێگەردی لە هەموو لەكەو ناتەواویەك، بە سوپاسەوە، ئەوەیش ئەوپەڕی پۆپەو پلەی هەرە بەرزە كە ئەوانە پێی گەیشتوون، خۆشترین لەزەت ئەوەیە كە ئاوا هەمووكات خەریكن بە سیفەتەكانی خواوە، هەموو بڕیارو كاروبارێ لە نێوانی بەندەكانی خوادا بەجێ ئەهێنرێ، هەموو حەقو ناحەقێ ڕوون ئەكرێتەوە، چاكو خراپ لە یەك جوێ ئەكرێتەوە، خوا پێداوان بەڕێزو نازەوە شاد ئەكرێن بە بەهەشت، بەد بەختو سیاچارەكانیش بە ڕیسوایی و بێئابڕوویی و تانەو تەشەرەوە ڕائەكێشرێن بۆ دۆزەخ ــ خوا پەنامان بدات ــ. ئینجا لەلایەن هەموانەوە سوپاسی پەروەردگاری هەموو عالەم ئەكرێ، لەسەر بڕیارو عەدالەتەكەی، خوا بە ڕەحمی خۆی ڕزگارمان بكات لە ئاگری دۆزەخ.**

**وصلى الله وسلم سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ

## سورەتی ﴿غافر﴾ یان ﴿مؤمن﴾
## مەککەییەو ٨٥ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە سەرەتا بە خواری مەبەستەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ دوان لە هەق و بەتاڵ، ئەدوێ لە باوەڕو بێ باوەڕیی و بانگ کردنی بۆ ڕێگەی خواو سەرکەشی و بێبڕوایی، ستەم و ناڕەوایی لە زەوی دا، سزای خوا دەربارەی سەرکەشان.

ئەم سورەتە یەکەمی ئەو حەوت سورەتەیە کە دەست پێئەکەن بە دوو پیت: ﴿حمٓ﴾ لەم حەوتە سێیەمیان لە پاش ئەو دوو پیتە سێ پیتی تری هەیە: ﴿ع، س، ق﴾ لە بارەی ئەم پیتانەوە لە یەکەم جاری سورەتی ﴿یس﴾دا قسەمان کرد ئەوەی لەوێ گوترا بۆ هەموو سورەتێکە کە بەم پیتانەو وێنەیان دەست پێئەکەن، لەو ١٤ پیتەی کە باس کران. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ﴾ هێنانە خوارەوەی ئەم پەڕاوە ـ کە قورئانە لە لایەن ئەو خواوەیە کە ناوی ﴿الله﴾یە.

ئەمە یەکێکە لەو مەبەستە گرنگانەی کە زۆرجار ئەگوترێتەوەو بە تایبەتی لە سورەتە مەککەییەکاندا، لەکاتی چاندن و دامەزراندنی باوەڕدا، چونکە ئەم قورئانە یەکەم سەرچاوەیە بۆ ئەم ئایین و پەیامە هەتا هەتاییە، کەواتە با هەموو جارێ دڵ بێدار بکرێتەوە بە ڕادەو پلەی هەرە بەرزی تا باشتر گوێڕایەڵی بۆبکرێ، ئینجا خوا گەورە لێرەدا خۆی ئەناسێنێ، خۆی پیشان ئەدات بە هەندێ لە سیفەتەکانی کە گەورەیی و گرنگی قورئانیش نیشان ئەدەن، هەروەها هەموو باس و مەبەستەکانی سورەتەکە، پەیوەندیان هەیە بەم سیفەتانەوە کە لە سەرەتای سورەتەکەوە هاتوون، ئەم سیفەتانە هەست و دڵ و دەروون بێدار ئەکەنەوە، ئومێدو چاوەڕوانی و ترس و سام و چاولەبەری فەراهەم ئەهێنن تێیاندا، لەگەڵ هەست کردن بەمەی کە ڕاکردن و دەرچوون لە دەستی قورەتی خوا ناگونجێ،

ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَٰدِلُ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟

لەبەر زیاد ڕوون بوونەوە باسی مەبەست بەم سیفەتانەو ڕاڤەیان ئەکەین یەك بە یەك ﴿ٱلْعَزِيزِ﴾ هێنانە خوارەوەی ئەم پەڕاوە لە لایەن خوایەکە کە ناوی ﴿الله﴾یە خاوەنی توانا و هێزە، بە جۆرێك زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ کەس و هیچ شت سەرپێچی لێ ناکات، هەموو کاروباری بەڕێوە ئەبات و هیچ کەس ناتوانێ دەست بخاتە کاری ﴿ٱلْعَلِيمِ﴾ ئاگادارە بە هەموو شتێك و هەرچی ئەکات لە زانین و ئاگاداریەوە ئەیکات، هیچ شتێك لە زانین و ئاگاداری ئەو دەرناچێ، کەواتە ئەو قورئانەی کە هێناویەتیە خوارەوە لە توانای هیچ کەسدا نیە، هەرچی لەو قورئانەدا هەیە ڕاست و پاك و بێگەردە لە هەموو لەکەیەك، چونکە کەسێك هێناویەتیە خوارەوە کە زاڵە و زانایە ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ﴾ لێ بووردەوە و داپۆشەری گوناهو تاوانە لەو کەسانەی کە شایانی ئەوەن. ﴿وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ﴾ وەرگری گەڕانەوە و تەوبەی گوناهبارانە، قاپی بۆ خستوونەتە سەر پشت بێ بەرگری. ﴿شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ﴾ تۆڵەی زۆر بەهێز و بەتێنە، دەربارەی ئەو سەرکەشانەی کە ناگەڕێنەوە و داوای لێ بووردن ناکەن ﴿ذِى ٱلطَّوْلِ﴾ زاتێکی وایە نازو نسعمەت ئەدات بە بەندەکانی، بە لوتف و بەزەیی بێ ئەمەی بتوانن هەڵسن بە سوپاسی ئەو هەموو نازو نیعمەتە، پاداشتی چەند چەندانە ئەکات، بەخشایشی فراوانە و نایەتە ژمارە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێ تر نیە بەڕاستی بێجگە لەو، هاوبەش و وێنەی نیە لەو خوایەتیەدا، ﴿إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ پاشەڕۆژو گەڕانەوەی هەمووان تەنها بۆلای ئەوە، کەواتە ڕاکردن لەو خوایەو خۆ پەنادان لە حیساب و پرسیاری نیەو ناگونجێ.

لەم باسە پاك و خاوێنەدا پەیوەندی نێوان خواو بەندەکانی ئاوا ڕوون و ڕەوانە. کەواتە بەندەکان بە وریایی زانین و ئاگاداریەوە ئەزانن کە چۆن بن لەگەڵ خوایاندا، ئەوانن بەچی لێیان ڕازیە، بەچی لێیان ناڕازیە، نەك وەك ئەو هەموو بیروباوەڕە پڕوپووچە کۆنەی کە باو بوو لە پێش هاتنی ئەم قورئانەو لەکاتی هاتنیدا، لەو هەموو ئایینانەدا خەڵکی ژیانیان ئەبردە سەر بە بەندایەتی شتی تر جگە لە خوا، بە هەموو بێ ئارامی و نەفامی و نەزانیەکەوە نەیان ئەزانی چی ئەکەن، چۆن ئەکەن، بۆچی ئەیکەن؟ بۆ کوێ ئەڕۆن؟ ئیسلام هات هەموو

کاروباری هەمووانی ڕوون کردەوە، بێگومان هەرکاتێ ناسینی خوا بەو سیفەتە شیرینانەوە جێگیر ببێ لە هەر دڵێکدا، ئەو دڵە ڕەنگێکی تایبەتی بەسەردا دێت، کردارو خووڕەوشتی ئەو خاوەن دڵە زۆر جیاوازە لەوانەی کە بێبەشن لەو ناسینە، خاوەنی ئەو دڵە خواناسە ئەگەر دووچاری هەڵەو لاریەك بوو ئەگەڕێتەوە، ئامادەیە بۆ بەسەرۆگرتنی هەڵەو لاریەکانی، بە پێچەوانەی دڵە خوانەناسەکان.

ئایینی ئیسلام ئا بەو جۆرە مەردوم پێ ئەگەیەنێو پەروەردەی ئەکات، لە بابەت کارکردنی ئەم سیفەتە شیرینانەوە کە ئێستا لەگەڵی دا ئەژین ڕووداوێك هەیە گێڕانەوەی بە جوان ئەزانم: لە چەرخی خەلیفەی دووەم عومەر -خوای لێ ڕازی بێت- کابرایەك زۆر ئازاو چالاك لە وڵاتی شامدا هەبوو، جار بە جار ئەهات بۆ خزمەتی خەلیفە، ماوەیەك دیار نەبوو، ئەویش هەواڵی پرسی، وتیان: ئەو کابرایە سەری کردۆتە عەرەق خواردنەوە، ئەویش بانگی کردە نووسەرەکەیو سەرەتای ئەم سورەتەی بۆ نووسی، فەرمووی بە دانیشتوەکانی نزا بکەن بۆ ئەو برایەتان کە ڕوو بکاتە خوا، خوایش تەوبەی لێ وەرگرێ. کاتێ نامەکە گەیشت، کابرا خوێندیەوەو چەند جارێ پێیدا چووەوە دەستی کرد بە گریانو ئەیوت: ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ﴾ ترساندومیوبەڵێنی لێ بووردنوتەوبە لێ وەرگرتنی داومێ! ئەم سیفەتانە کاری لێ کردو تەوبەی کرد، هەموو کار ئەکات لە هەرکەس کە بەڕاستی دڵی بۆ بکاتەوە.

پاش ئەوەی ڕادەو پلەی بەرزی قورئانی باسکرد بەمەی کە هێنانە خوارەوەی لە لایەن خوایەکەوەیە کە خاوەنی ئەو سیفەتە جوانانەیە، لەپاش باس کردنی ئەم هەشت سیفەتە کە هەرچۆنێ پەڕاوە گەورەکەی شایەتە لەسەریان. هەروەها ئایەتەکانی بوونەوەریش شایەنن.

ئینجا بڕیاری بێبڕوایی ئەدا بەسەر ئەو کەسانەی کە موجادەلەو چەنەبازی ئەکەن لەم قورئانەو ئایەتەکانی تری خوادا، هەڕەشەی سەختیشیان لێ ئەکات بە تۆڵەی ئەم جیهانەش وەکو هاوسەرو هاوڕێکانیان لە ئوممەتو گەلە پێشووەکان، ئەفەرموێ: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ هیچ کەسێ، بەڵکو هیچ شتێ، موجادەلە ناکات لە ئایەتەکانی خوادا، دژیان نادوێ جگە لەوانەی بێبڕوا بوونو دان بەڕاستی دا نانێن، کەواتە لەناو هەموو دروست کراوەکانی خوادا ئەم کۆمەڵە بەدبەختە جیا بوونەتەوەو لە ڕیزێکیان دژی باقی ئادەمیو جنۆکەو فریشتەکان، بەڵکو دژی هەموو بوونەوەر. کەواتە هەرچەندە زۆرو خاوەن هێزو دەسەڵات بن، هیچ جۆرە نرخێکیان نیە، چونکە پچڕاون لە کەسێ کە کلیلی هەموو هێزو تواناو دەسەڵات لای ئەوە،

فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي ٱلْبِلَـٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۖ وَهَمَّتْ
كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ۖ وَجَـٰدَلُوا۟ بِٱلْبَـٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ
﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ
ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

---

**ئەوانە پاشەڕۆژیان هەر ڕیسوایی‌و بەرباد بوونە ﴿فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي ٱلْبِلَـٰدِ﴾ کەواتە با بە هەڵەتدا نەبات‌و نەت خەڵەتێنێ، مۆڵەت دان بەوانەو بە دیمەن کامەرانی‌و هاتوچۆو گەڕانیان بە وڵاتاندا، بۆ بازرگانی بە خۆشی‌و کامەرانیەوە، چونکە بەم نزیکانە قاریان لێ ئەگیرێ‌و دووچاری تۆڵەی سەختی کردەوەی خۆیان دێن، وەکو ئەو هەموو گەل‌و کۆمەڵانەی کە دژی پێغەمبەرەکانی تر هەڵسان‌و دوایی دووچاری سزای خوای گەورە بوون وەکو ئەفەرموێ:** ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ۖ وَجَـٰدَلُوا۟ بِٱلْبَـٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ﴾ **لە پێش ئەوانەوە گەلەکەی نوح باوەڕیان نەمێنا، نوحیان بە درۆزن دائەنا، هەروەها چەند حیزب‌و کۆمەڵێکی تر لە پاش گەلەکەی نوح ئەوانیش کۆمەڵیان کردو هەڵسان دژی پێغەمبەرەکانیان‌و هەموو یەکێ لەو ئوممەت‌و گەلانە نیازی خراپەو کوشتن‌و برینی پێغەمبەرەکەیان کرد، بۆئەوەی لەناوی بەرن، بە قسەی پڕوپووچ‌و بەتاڵ موجادەلەو دەم درێژییان کرد بۆ نەهێشتن‌و بەرگری ئەو ئایینە ڕاستەی کە ئەو پێغەمبەرانە هێناویانە، ئینجا منیش قارم لێ گرتن‌و بەربادم کردن. کەواتە ئەمە شتێکە هەر لە کۆنەوە وا هاتووە پێغەمبەرێك هاتووە، ئینجا سەرکێشەکانی گەلەکەی لێی هەڵساون، تەنها بە قسەی بە تاڵ‌و پووچ نەوەستاون، بەڵکو ویستوویانە دەست درێژیی بکەنە سەری، لەناوی بەرن، بە قسەی پڕوپووچ جەماوەریان هەڵخەڵەتاند بۆئەوەی شوێنی هەق نەکەون، ئینجا دەستی قودرەت هاتووە داوێتی لێیان لە لێدانێکی سەرسوڕهێنەر، وەکو ئەفەرموێ:** ﴿فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ **دەی ئایا چۆن بوو تۆڵەی من دەربارەیان؟ واتە زۆر سەخت بوو، ئەوە ڕائەبوودن بە لای شوێن‌و ماوایاندا، ئێستاش دروشمی هەرماوەو دەنگ‌و باسیش بەسەرهاتیان ئەگێڕێتەوە، خوای گەورە تەنها بەوە وازیان لێ ناهێنێت، بەڵکو لە ڕۆژی دواییشدا ئەوانە وان لەناو ئاگرداو لێی جۆی نابنەوە. وەکو ئەفەرموێ:** ﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ﴾

هەرچـۆنی لـەم جیهانـەدا تۆڵـە ئەسـێنین لـەو بێبـاوەڕە سەرکەشـانە، هـەروەها لەلایـەن پەروەردگارتەوە بڕیار دەرچووە کە ئەوانە لەناو ئاگردان لە ڕۆژی دوایی دا، بە جۆرێ کە لێی جوێ نابنـەوە.[1] ئا بەو بەربەرەکانێ و جەنگ و ئاژاوە هـەر بـووە لـە نێـوان کـوفرو هـەق و بە تاڵدا، لـەنێوان ئەوانـەی بانگیـان کـردووە بۆلای خـواو ئەوانـەی سـەکێش بوون و بە ناهـەق وڵات و دانیـشتوانیان ژێـر دەسـتە کـردووە، هـەموو کـات لـە هـەموو چـەرخێکدا، لـە هـەموو چینێکدا تاقمێك بە هەموو هێزێکیانەوە هەر چەکێکیان لە دەستدا بووبێ بەکاریان هێناوە بۆ بەرگری ڕاستی و ئەوانەی ئاڵای ڕاستیان بەرزکردووەتەوە.

قورئان ئەو شتە ڕاستەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، پاشەڕۆژی هەردوو کۆمەڵ دیاریی ئەکات. کەواتە ئەو خوا پێداوانەی کە شوێنی پێغەمبەران ـ سەلامیان لێ بێت ـ ئەکەون. ئەوانەی کە ئەیانەوێ ئاڵای ڕاستی بەرزبکەنەوە، ئەو بەختیارانە با دڵنیاو دڵ پڕ لە ئارام بن کە تەنها ئەوان گرەو ئەبەنـەوە لـە هـەردوو جیهانـدا، ئایا چ بەڵگەیـە لـە ڕووداوە ڕاستەکان بـەهێزترە؟ چونکە شایەتێك لە قورئان باوەڕ پێکراوترە؟!

ئینجا زیادە نرخ و ڕێـزی بڕواو بڕواداران دەرئـەخات، بڕواداران دڵخۆش و دڵنیا ئـەکات بەمـەی گـەورەترین تـاقمی مەلائیکە هاوبەشـی ئـەمانن لـە سیفەتی بڕوادا، بەو سیفەتە خـوا وەسف و سـەنای ئـەوان ئـەکات، ئـەو تاقمەبـەرزە باسـی بڕوادارەکانی سـەر زەوی ئەکـەن لای پەروەردگاریان، داوای لێ بووردن و پاراستن لـە ئاگری دۆزەخ و خستن بۆ نـاو بەهەشتیان بۆ ئەکەن لەگەڵ هەموو کەس و کارە موسڵمانەکانیدا وەك ئەفـەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی کە کاروباری عەرشیان بە دەستە، یادو باسی پەروەردگاری خۆیان ئەکەن ـ بەمە کە پاك و بێگەردە لە هەموو تەنگ و لەکەیەك ـ لەکاتێکدا سـەنای ئەکـەن کـە هـەموو سیفەتی گـەورەیی و تـەواویی هەیـە، ئیمـان و باوەڕیـان پـێی هەیـە، گـەردن کەچـن، زەبوونن لەبـەردەمی قودرەت و دەسـەڵاتی دا، داوای لێ بووردنی گوناه ئەکەن بۆ هەموو ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و هەیە،

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست بـەم کافرانـە ئەوانـەی ئـەم ئوممەتەیە، واتـە: هەرچۆنێ ئەوانـەی پێشوو بـەرباد کـران، هەروەها ئەمانیش، چونکە ئەمانیش، چونکە ئەمانیش لەناوئاگرن. ئەمیش ئـەگونجێ لەسـەر ئـەم ڕایـە ﴿أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ عیللەت و هۆی بڕیارەکەیە.

رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾

واته بەشداری خۆیانن لەو سیفەتە گەورەیەدا داوای لێ بووردن بەم جۆرە ئەکەن‌و ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا﴾ ئەی پەروەردگارمان میهرەبانی‌و بەزەیی‌و زانینت فراوانە بۆ هەموو شتێك، هەموو شت جێگەی ئەبێتەوە تیایاندا. ﴿فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ﴾ کەواتە ببورە لە تاوان‌و گوناهی ئەوانەی کە گەڕاونەتەوە بۆ لای تۆ، شوێنی ڕێگای تۆ کەوتوون. واتە ئاگات لە هەموو کردەوەکانیشیان هەیە لەگەڵ گەڕانەوەکەیاندا پشت بەم دوو سیفەتە ئەو داوایەت لێ ئەکەین، ﴿وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾ بیانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ. هەرچەند داوای پێشوو ئەم داوایەش ئەگرێتەوە، بەڵام بەتایبەتی ئەم داوایە ئەکەن لەبەر گەیاندنی سەختی‌و سامناکی سزای ئاگر. ئینجا پلەیەکی تر بەرز ئەبنەوەو ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ﴾ ئەی پەروەردگارمان، وەکو داوای لێ بووردن‌و پاراستنت لێ ئەکەین بۆیان، داوا ئەکەین کە بیانخەرە بەهەشتانی نیشتەجێی هەتا هەتاییەك کە بەڵێنت داوە بەو باوەڕدارانەی کە ئەگەڕێنەوە بۆلای تۆ... بێگومان چوونە بەهەشت ــ بەتەنیا خۆی ــ نازو نیعمەت‌و گەیشتنە بە ئامانج، بەڵام ئەگەر لەگەڵ خزم‌و کەس‌و کاردا بێت، ئەو کاتە نیعمەتەکە گەورەتر ئەبێت، لەبەرئەوە ــ لە ڕەحم‌و بەزەیی خوا بە زیاد بێت ــ کە داوای ئەوەیشیان بۆ بکەن، ئەوانیش ئەڵێن: ﴿وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ﴾ خوایە ئەو بەندەیانەت کە خاوەن بڕوان‌و گەڕاونەتەوە لات، لەگەڵ باو باپیرو حەڵاڵ‌و هاوسەران‌و نەوەو وەچە – صالحە چاك ویستەکانیاندا – بیانخەرە ئەو بەهەشتانەوە. ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ ئەم داوایانەت لێ ئەکەین، چونکە بێگومان ــ تەنها تۆ ــ کەسێکی کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا کە بتەوێ بیکەیت. هەموو کارو فەرمانەکانت بەجێیەو کەسێکی زاڵی کاردروستیت.

وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوۡنَ لَمَقۡتُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ مِن مَّقۡتِكُمۡ أَنفُسَكُمۡ إِذۡ تُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلۡإِيمَٰنِ فَتَكۡفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ ﴿١١﴾

**له پاش ئەوەی كە داوای پاراستنیان بۆ كردن له سزا، ئینجا داوای پاراستنیان ئەكەن له گوناهو خراپەكردن له دنیادا ـ كه هۆی سزای ڕۆژی دواییە ـ ئەڵێن: ﴿وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ﴾ بیانپارێزه له كردنی گوناهو تاوان... هەركەسێك تۆ له دنیادا بیپارێزیت له گوناهو تاوان، بێگومان ئەوه لەو دنیا میهرەبانی پێئەكەیت.[1] ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ هەر ئەوەش گەیشتنه به ئامانجی هەره گەوره. بەڵێ بەڕاستی ئەوەیه گەیشتن به ئامانج و گەیشتن به بەهرەی گەوره.**

**ئینجا لەم كاتەدا كه هەڵگرانی عەرش و ئەوانەی دەوروبەری نزا ئەكەن بەو جۆره نزایه كه باس كرا. نزا ئەكەن بۆ برا بڕوادارەكانیان لەم سەر زەویەدا. لەم كاتەدا ئەبینین بێبڕواكان له ڕۆژی دوایی دا له هەموو لایەكەوه هەڕەشەیان لێ ئەكرێ و ئەترسێرێن و تانەو تەشەریان لێ ئەدرێ و ئەترسێنرێن به خەشمی بەتینی خوا لێیان وەكو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوۡنَ لَمَقۡتُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ مِن مَّقۡتِكُمۡ أَنفُسَكُمۡ إِذۡ تُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلۡإِيمَٰنِ فَتَكۡفُرُونَ﴾ ئەو كەسەی كه بەهۆی كردەوەو به دەستی خۆی دووچاری سزاو ناڕەحەتی ببێت، له كاتی سزاكەدا ئێجگار ڕقی له خۆی هەڵئەستێ، تا سزاكەی بەهێزتر بێت، داخ و ڕەقەكەی بەتین تر ئەبێت، جا بێبڕواكان له كاتی تەنگانەو سزای بەهێزی ڕۆژی دوایی دا كه بیر ئەكەنەوه لەمەی كه بەدەستی خۆیان چیان بەسەر خۆیان هێنا. لەو كاتەدا ڕق و كینەیان له خۆیان**

---

[1] هەندێ ئەفەرموون: مەبەست له وشەی ﴿ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ تۆڵەكەیەتی، بیانپارێزه له تۆڵەی ئەو خراپانەی كەله دنیادا كردوویانه، تۆڵەی ڕۆژی دوایی پێویست ناكات هەر ئاگرو دۆزەخ بێت. كەواته جیاوازه لەگەڵ ئەو داوایەی كەله ﴿وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾دا كرا. واته ئەمەیان گشتیەو پێشووەكەیان تایبەتی.

ئەگاتە ڕادەیەك، لەوانەیە هاوتای سزاکەیان بکات، ئەو کافرانە لەو کاتە سەختەدا ئێجگار سزای دەروونیان بەتین تر ئەکرێت، بەمەی بانگ ئەکرێن‌و پێیان ئەوترێت: خەشم‌و سزای زۆر بەتینی خوا دەربارەی ئێوە، لەو ڕۆژەدا کە بانگ ئەکران بۆ باوەڕهێنان ــ کەچی ئێوە باوەڕتان نەئەهێنا ــ گەورەترو بەهێزترە لە خەشم‌و ڕقی خۆتان لەم کاتی سزایەدا[1]، واتە: کردەوەی خۆتان بوو بەهۆی خەشم‌و سزای زۆر بەتینی خوا لێتان تا دووچاری ئەم ڕۆژە سەختەی کردن. کەواتە بەم بانگ کردنە ئێش‌و ئازاری دەروونیان بەتین تر ئەکرێت.

ئەوەی کە لەم جیهاندا سەرکێشی ئەکات، لەو دنیا سەرچۆڕ ئەکات‌و ئەزانێت کەهیچ پەنایەك نیە جگە لە پەنای خوا نەبێت، لەبەرئەوە هەموو لەوێ ئەکەونە پاڕانەوەو لاڵە، بەڵام هیچ سوودیشی نیە. وەکو لێرەدا ئەوە پیشان ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ﴾ بە زەبوونیەوە ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان تۆ دووجار ئێمەت ئافراندووە:

یەکەم: بێ‌گیان بووین، گیانت کرد بە بەرماندا.

دووەم: دوای ئەوەی مراندتین.

دووجار زیندووت کردووینەتەوە:

یەکەم: گیان بەبەردا کردنی یەکەم لە دنیادا.

دووەم: لە کاتی زیندوو کردنەوەی ڕۆژی دواییدا.[2] دان ئەنێین بە گوناهو تاوانی خۆماندا. ئایا هیچ ڕێگەیەك هەیە بۆ هیچ جۆرە دەرچوونێك، تا لەم ئاگرو سزاو حاڵە سەختە ڕزگارمان بێت؟ واتە ڕزگارمان بکە.

---

[1] هەندێ لەزانایان ئەفەرمون: مەبەست بوغزوسزای کاتی دنیا نیە–کە بانگ ئەکران بۆ باوەڕهێنان – بەڵکو مەبەست هی ڕۆژی دواییە، بۆئەوەی دڵیان پڕ بکرێت لە ترس‌و سام‌و نائومێدیی، لەسەر ئەم ڕایە وشەی ﴿إِذۡ﴾ بۆ (ظرف) نیە بەڵکو بۆ (تعلیل)ە، هۆی خەشمەکە دیاریی.

[2] دوو ڕای تر هەیە لێرەدا، بەڵام ئەوەی کەلە سەرەوە وتراوە باوەڕپێکراوترە، چونکە ڕێکە لەگەڵ ئایەتی ﴿كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ﴾ سورەتی ﴿البقرة﴾ ئایەتی ٢٨.

ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزۡقٗاۚ

ئەم داوایە ئەكەن، بەڵام بە نائومێدیی و سەرگەردانیەوە... لە وەڵامدا ئێجگاری بەردی سارد ئەنرێت بەسەر بەنۆكەی دڵیاندا. پێیان ئەوترێت: ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ﴾ ئا ئەوەی كە ئێوەی تیادان بە هۆی ئەوەوە بوو كە لە دنیادا كاتی كە خوا ـ بە تەنیایی ـ بپەرستراپە، ئێوە بڕواتان نەبوو بەوە. ئەگەر هاوبەشی بۆ دابنرایە باوەڕتان ئەبوو! واتە: بڕواتان نەبوو بە تاك و تەنیایی خوا، باوەڕتان بوو بەمەی كە هاوبەشی هەیە.

ئینجا حوكم و بڕیاریش هەر بۆ خوایە، كەواتە تەنیا ئەو شایانی پەرستنە و بەرز و بڵندە لەوەی كە هاوبەشی بۆ بڕیار بدرێت. گەورەیە، هەر بڕیارێك بدات ئەیباتە سەر. ئینجا لە باسی ئەم دوو سیفەتەوە ئەڕوات بۆ باسی شتێ كە ڕێكە لەگەڵ بەرز و بڵندی خوادا، تەمێی ئیمانداران ئەكات بەمەی كە هاوار و لاڵە تەنها لەو بكەن، هەر ئەو بپەرستن و ئایینەكەی بە خاوێنی ڕابگرن. لەدوای ئەوە بەندەكانی ئەترسێنێت بە هاتنی ڕۆژی دوایی ـ ئەو ڕۆژەی كە بەرزی و بڵندی خوای تیادا ڕوون ئەبێتەوە ـ ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾ خوا كەسێكە كە پیشانتان ئەدات و ئەیخاتە پێش چاوتان ئەو هەموو شتەی كە نیشانە و بەڵگەیەكی ئاشكران لەسەر گەورەیی و توانا و زانین و كاردروستی خۆی، وەكو ئەو هەموو مانگ و خۆر و ئەستێرە و شەو و ڕۆژ و باوباران و هەور و بەفر و تەرزە و دار و دەرخت و گوڵ و سەوزی، هەروەها ئەو شتانەی تر كە نایەتە ژمارە بە ئاسانی. ﴿وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزۡقٗاۚ﴾ خوا كەسێكە كە هۆی ڕزق و ڕۆزی ئەهێنێتە خوارەوە لە ئاسمان و لای سەرەوە بۆ ئێوە، وەكو باران كە بنەڕەتی ژیانە لەسەر زەوی داو هۆی هەموو خواردن و خواردنەوەیەكە، هەروەها وەكو ئەم هەموو تیشكە كەزەوی پێ زیندوو ئەبێتەوە، نەك هەر زەوی، ئەگەر ئەوە نەبوایە ژیان بەم سەر زەویەوە نەئەبوو، ڕەنگە بۆ لەمەوپاش چەند شتێكی تریش ببێت خوا بۆمان دەرخات.

وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴿١٤﴾
رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ
﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿١٦﴾ الْيَوْمَ
تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿١٧﴾

---

**خوای گەورە ئەم هەموو شتەی بۆ فەراهەم هێناوین، بەم جۆرە ڕێنموونی هەمووان ئەکات بۆ ڕێگەی ڕاست، بەڵام: ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾ بیر ناکاتەوەو ئامۆژگاری وەرناگرێت جگە لەو کەسەی کە ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو چاوی دڵی ڕووناکەو پێش هەموو شتێك دەسەڵاتو تواناو گەورەیی ئەو ئەبینێت. ﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ ئینجا ئەمەی بڕواداران ئەکات کە تەنها خوا بپەرستن بە جۆرێك کە ئاینو گەردن کەچیەکەی بۆ پاكو خاوێن بکەن، لە هاوبەشو وێنە، با بێبڕواکانیش پێیان ناخۆش بێت، واتە ئەبێ بڕوادارەکان لەسەر ڕێگەی ڕاستی خۆیان دامەزراوبن، هیچ گوێیان نەبێت لەو بێبڕوانە، ئینجا بە بۆنەی فەرمان دان بە پەرستنی خوا بە تەنیایی، چەند سیفەتێك لە سیفەتەکانی خۆی باس ئەکات کە ئەبێتە هۆی ئەو پەرستنە، ئەفەرموێت: ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ﴾ خوای گەورە پلەو کەماڵی ئێجگار بەرزو بڵندە. خاوەنی عەرشو دەسەڵاتو سەڵتەنەتە بەسەر خوای گەورە شتێکدا. ﴿يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ سورشو فەرمانی خۆی ئەنێرێتە خوارەوە بۆ سەر ئەو بەندەیانەی کە خۆی بیەوێت. ئەو سروشو فەرمانەی وەکو ﴿الرُّوحَ﴾ دڵ زیندوو ئەکاتەوە. ﴿لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾ بۆئەوەی ئەو بەندەیەی کە سروشی هاتووەتە سەر خەڵکی بترسێنێت لە ڕۆژی کۆبوونەوەی هەمووان، گەیشتنیان بە یەك لەو ڕۆژەدا هەموو ئادەمی ئەگەن بە یەك، هەموو ئادەمیو کردەوەکانیان کە لەم جیهانەدا کردوویانە، هەموو ئابەمیو مەلائیکەو جنۆکەو هەموو مەخلوق لەگەڵ پەروەردگاریان ئەگەن بە یەك. کەواتە بە هەر جۆر بگیرێت هەر ڕۆژی گەیشتن بە یەکە... لەو ڕۆژەدا فڕوفێڵو خۆشاردنەوە نیە. هەموو دەرئەکەون، بێ پەناو پەردە، وەکو ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ﴾ ئەوەی سروشتی بۆ هاتووە بۆ ئەوەیە خەڵکی بترسێنێت**

له ڕۆژێ که هەموو تێدا به ئاشکرا دەرئەکەون، هیچ شتێکیان له خوا پەنهان‌و پۆشیده نابێ. نه خۆیان‌و نەکردەوەو نەهیچ بارو حاڵێکیان. بێگومان له هەموو کاتێ دا هیچ شتێك له خوا شاراوه نابێت، بەڵام لەم جیهانەدا بەهۆی بێئاگاییەوە کابرا بە خۆی نازانێت، کە هیچی شاراوه نیه، کاتێ کە ئەو ڕۆژە هات هەموو کەسێك هەست ئەکات کە هەموو شتێك دەرکەوتوو ئاشکرایه، به تەواوی هەموو شتێك ڕوونه.

لەو ڕۆژەدا هەموو سەرکەش‌و ستەمکارێك سەرشۆڕ ئەبێت. هەموو بەندەکان وەك یەك گەردن کەچ ئەبن، ئەو زۆرو دەسەڵاتەی کەله دنیادا بۆ هەندێ هەبوو ـ به دیمەن ـ هیچی لەوێ نامێنێت، هەموو زۆرو دەسەڵاتێك تەنها به دەستی خوایه ـ که تاك‌و تەنیانەو زاڵه بەسەر هەموو شتێکدا ـ. واته لەو دنیا به جوانی ڕوون ئەبێتەوەو به چاو ئەبینرێت که ـ تەنها خوا ـ خاوەنی زۆرو دەسەڵاته، ئەگینا له هەموو کاتێکداو له هەردوو دنیادا شتەکه هەروایه، بەڵام لێره ـ لەدنیادا ـ وەکو به چاو نابینرێت هەموو کەس به دڵ ئەو بڕوایەشی نیه، بەڵکو بەشێك له بەندەکانی خوا هەیەتی ئەوی تری نیەتی‌و دانی پیادا نانێت. بەڵام له ڕۆژی دوایی دا بەچاو ئەبینرێت‌و هیچ گیان لەبەرێکیش نیه دان بەوەدا نەنێت. لەو ڕۆژەدا جم‌و جوڵ نامێنێت. وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ﴾ ئەمڕۆ پاشایەتی‌و دەسەڵات بۆ کێیه؟ کەس نیه وەڵام بداتەوە. خۆی پرسیار ئەکات‌و خۆیشی وەڵام ئەداتەوە ﴿لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾ تەنها بۆ خوایه که تەنیایەو زاڵه بەسەر هەموو شتێکدا. ئەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ ئەمڕۆ هەموو کەسێك به گوێرەی ئەوەی کردوویەتی پاداشتی ئەدرێتەوە. یان تۆڵەی لێ ئەسێنرێت. ئەمڕۆ ستەم نیه، هیچ کەس زیادە تۆڵەی لێ ناسەنرێت‌و پاداشتی کەم ناکرێتەوە بەڵام ـ لوتفی وایه ـ پاداشت به زیادەوە ئەداتەوە کەلای خواروی دە قاتەو بێگومان خوای گەورە پرسیارو موحاسەبەی زووترین کات‌و به چەسپانی تێئەپەڕێنێت، چونکه هیچ شتێك خوا خەریك ناکات له شتێکی تر. کەواتە بە چەسپانی هەرکەس شایانی هەرچی بێت پێی ئەکات، ئینجا خوای گەوره فەرمان ئەدات به پێغەمبەر (ﷺ) که گەلەکەی بترسێنێت بەو ڕۆژە سەختە، به جۆرێك که شێوەیەکی تر له شێوە ناهەموارەکانی ئەو ڕۆژە ئەخاته پێش چاویان.

وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْأَزِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَىْءٍ

---

**ئەفەرموێ: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْأَزِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ۚ ﴾[1] بیانترسێنه له ڕۆژی ڕووداوه نزیکەکە، لەو کاتەی کەلە ترس و سامناکی ئەو ڕۆژەدا دڵ لە جێگای خۆی نامێنێت، بەرز ئەبێتەوە بۆلای گەروو، لەوێدا ئەوەستێت، نە دێتە دەرەوەو نە ئەچێتە شوێنەکەی خۆی. لەکاتێکدا کە پێش ئەخۆنەوە بەسەر ئەو هەموو داخو دوو ئێش و ڕێشەدا. بە جۆرێ باری دڵ و شانیان ئێجگار قورس تر ئەبێت، بەو هەموو باری گرانەوە ئومێدو چاوەڕوانیەکیان نیە لای یەکێکەوە چونکە ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ[2] مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ بۆ ئەو ستەمکارانە نە دۆستێکی دڵ گەرم، نەخزمێك هەیە کە بەزەیی پێیاندا بێتەوە، نە تکاکارێکیان هەیە تکاو لاڵەی وەربگیرێ.**

**لەو ڕۆژەدا ئەوانە هەموو شتێکیان دەرئەخرێ و هەرچیشیان کردبێ ون نابێ، چونکە خوا ئاگاداره بەسەر هەموو شتێکدا تەنانەت: ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾ ئەزانێ و ئاگای هەیە لەو چاوانەی کە بەدزی خەڵکەوە ئەخرێن بۆ شتی ناڕەوا، ئەو خەتەرەو خەیاڵانەش کە وان لە دڵداو ئەیانشارنەوەو دەریان ناخەن. ﴿وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّ ﴾ خواش کە هەموو شت ئەزانێ، ئەو بڕیارو حوکمی خۆی ئەدات بەڕاستی و حوکم و بڕیارەکەی لە زانین و بیستن و بینینەوە دێت، کەواتە هەرچی بکات هەموو ڕاستەو ستەمی تیادا نیە. ﴿وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَىْءٍ ﴾ ئەوانەی کە ئەمان هاواریان لێ ئەکەن و ئەیانپەرستن جگە لە خوا بڕیاری هیچ شتێ نادەن، چونکە ئەوانە زۆربەیان دارو بەردن، ئەوە هەر هیچ و باقی تریشی هیچی بە دەست نیە،**

---

[1] ڕۆژی دوایی لە قورئاندا زیاد لە ٥٠ ناوی هەیە، کە یەکێ لەوانە ﴿يَوْمَ ٱلْأَزِفَةِ ﴾یە واتە: ڕۆژی ڕووداوە نزیکەکە.

[2] شوێنەکە شوێنی ئەوەیە بفەرموێ: ﴿﴾

إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَكَفَرُوا۟ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٢﴾

---

بەلاّم هەر خوا هەموو شتی بە دەستەو هەموو شت ئەزانێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ بەڕاستی تەنها خوا بیسەری بینایە بۆ هەموو شت. دوای ترساندنی ئەو بێبڕوانە کە دەم بازیان ئەکرد لە ئایەتەکانی خوادا، دەم درێژیان ئەکرد پێغەمبەرو ئەو ئایینەی کە هێنای. ترساندنیان بە ڕۆژی دوایی و سزاو ئازارەکەی و خەشمی خوا.

ئینجا ئەخاتەوە پێش چاویان پاشەڕۆژی سەختی ئەوانەی کە لە ئوممەت و گەلە پێشووەکاندا بە وێنەی ئەمان بەربەرکانێیان ئەکرد لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان و ئەو ئایینەی کە بۆمان هێنان. بەڵکو تەمێ و عیبرەتێ وەرگرن و سام ترسێ بکەوێتە دڵیان. ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ﴾ ئایا ئەوانە نەگەڕاون بەسەر زەوی دا، ولاّتانیان نەدیوە تا تەماشا بکەن ئایا چۆن بوو پاشەڕۆژی ئەوانەی کەلە پێش ئەمانەوە بوون؟ وەکو عادو سەموودو ئەوانەی پێشوو کە توناو هێزو ئاسارو بەرهەمیان زۆرترو بەتین تر بوو.

ئەو هەموو شارو خانوو کۆشک و قەلاّی جوان و مەحکەمەیان دروست کردبوو، ئینجا خوای گەورە قارو خەشمی لێ گرتن و بەهۆی تاوان و گوناهیانەوە، بەربادی کردن، هیچ پارێزگەرێکیان نەبوو بەرگری سزای خوایان لێ بکات، واتە بێگومان گەڕاون، بە تایبەتی

قورەیش جیگاو ماوای زۆر لەوانەیان دیوە، چونکە لە ڕێگەکەیاندا بوو. کاتێك ئەچوون بۆ شام‌و یەمەن بۆ کڕین‌و فرۆشتن‌و بازرگانی، کەواتە هەق وایە دڵ لەشتی وا داچڵەکێ‌و بیربکاتەوە، چونکە خوا هەر ئەو خوایەیە، هۆی ئەو سزاو غەزەبەش بۆ ئەوان‌و ئەمانیش هەر یەکە وەکو باش ڕوون ئەبێتەوە کە ئەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَكَفَرُوا فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ إِنَّهُ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ ئەو پاشەڕۆژی سەخت‌و سزاو بەرباد کردنە بە هۆی ئەوەوە بوو کە ئەوانە پێغەمبەرەکانیان بە موعجیزەو بەڵگەی ڕوونەوە هاتنە لایان، کەچی ئەوان هیچ باوەڕیان نەهێنا، سەرکەشیان کرد بەهۆی ئەوەوە خواش قارو خەشمی لێ گرتن، چونکە خوا بەهێزو توانایەو تۆڵەی زۆر بەتینە. بە کورتی خستیە پێش چاو پاشەڕۆژی سەختی تاوانبارانی پێشوو، ئینجا بە درێژیی نموونەیەکی دیاریی‌و بەناوبانگ باس ئەکات کە زۆر لەمان بەهێزو دەسەلات تر بوون‌و خواش بەربادی کردن. ئەو نموونەیەش بریتیە لە فیرعەون‌و هامان‌و کۆمەڵەکەیان کە سەرکەشیان کرد لە حەزرەتی موسا بەسەرهاتی حەزرەتی موسا زۆر دوورو درێژو گرنگە، لە زۆر لە سورەتەکاندا باسی ئەفەرموێ، لە هەموو شوێنێکدا بە گوێرەی پەیوەندی بە مەبەستی ئەو شوێنەوە، لێرەدا زنجیرەیەکی لێ باس ئەکات، لە یەکەم جاری گەیاندنی پێغەمبەرێتیەیەوە دەست پێ ئەکات، بە شەڕە جوێن‌و قسەی بێبڕواکان لەناو ئاگری دۆزەخی ڕۆژی دوایی دا دوایی پێ ئەهێنێ، لەم زنجیرەیەدا چەند شتێکی تایبەتی باس ئەکات کە مەبەستی شوێنەکە پێك دێنێ کە بریتیە لە دڵخۆشی دانەوەی پێغەمبەر (ﷺ)و دڵنیا کردنی یارەکانی بەمەی کە پاشەی ڕۆژی سەرکەوتن‌و بەختەوەری هەر بۆ ئەوانە، هەڕەشەی سەخت ئەکات بە بەرباد بوونی ئەم جیهان‌و سزای ئاگری ئەو جیهان دەربارەی دوژمنەکانی ئیسلام.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ

---

**دەست پێئەكات بەباسی یەكەم جاری گەیاندنی پەیامەكەی و هەڵوێستی فیرعەون و كۆمەڵەكەی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ * إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ﴾ بێگومان موسامان بە پێغەمبەری ڕەوانە كرد بۆ سەر فیرعەون و هامان و قارون بە چەند موعجیزەو بەڵگەیەكی ڕوونی خۆمان لەسەر پێغەمبەرێتیەكەی، ئینجا ئەوانیش باوەڕیان پێنەهێناو وتیان ئەمە جادووبازێكی زۆر درۆزنە.**

**ئینجا باسی هەڵوێستی تریان ئەكات كە ئەوپەڕی سەركەشی و ستەمكاریان دەرئەخات، ئەفـــەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ﴾ ئینجا كاتێ موسا هاتە لایان بەو ئایینە ڕاستەی كەلە لایەن ئێمەوە بۆی بردن هەڵوێستیان ئەمە بوو فەرمانیان دا كە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بە مووسا هەرچی كوڕەكانیان هەیە بیانكوژن و كچەكانیان بهێڵنەوە مەبەستیان لەم كردەوە ناڕەوایە ئەوە بوو:**

**١- كەم كردنەوەی پیاوانی ئەو گەلە داماوە لەبەر سەرشۆڕ كردن و ژێر دەستە كردنیان.**

**٢- بێزاركردنی گەلەكەمووسابەمەی كە بەهۆی ئەوەوە دووچاری ئەو بەڵا ناهەموارە بوون.**

**٣- كەم كردنەوەی پشتیوان بۆ مووسا.**

**٤- هێشتنەوەی كچەكان بە تەنها زیادە سزاو ئازاری دەروونی تێدایە، سوودی كارەكەریشیان هەیە.**

**فیرعەون ئەو ستەمكارە بەد بەختە پێش لە دایك بوونی حەزرەتی مووسا ئەم فەرمانەی دا. ئایا هەر ئەوەو تا ئەو كاتە بەجێ نەهێنراو ئێستا دەست و پێ ئەیانەوێ بەجێی بێنن؟ بەڵام تەنها دەربارەی ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە مووسا، یان ئەمە فەرمانێ تری تازەیە، دەست و پێ ئەیانەوێ بەجێبهێنرێ؟ ئەم دووەمە نزیك ترە، چونكە فەرمانە پێشووەكە بە شێوەی گشتی بوو، بەڵام ئەم دووەمە تەنها بۆ بڕوادارەكانە.**

وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٦﴾

---

ئەو ستەمکارانە ئەوە بڕیاریان بوو، بەڵام خوای گەورە فەرموی بە شێوەی گشتی: ﴿وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ﴾[1] هەرچی پیلانو تەگبیری خراپی بێبڕواکان هەیە دەربارەی پێغەمبەرانو شوێن کەوتووانیان هەموو لە ون بوون دایەو سەریان لە بۆشیەوە دەرئەچێو سەرناگرێ.

ئەوەتا پاشەڕۆژی فیرعەونو کۆمەڵەکەی بەرباد بوونو خنکاندنو سارا بوونەوەی جێگاو ماواکەیان بوو بۆ خەڵکی، هەروەها هاتووە بە درێژایی مێژووی حەقو بەتاڵ، بە مەرجێ هەقیش داواکار ببێ، بە گوێرەی ڕەوشتی پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ داواکارەکان جووڵابنەوە، ئەگەر نا، نابێ ... وا دەرئەکەوێ کە فیرعەون ڕایەکی تایبەتی جیاوازی هەبوو دەربارەی بەرگری ئەو هەقەی کە هاتبوو یەخەی گرتبوونو کۆشکەکەی هێنابووە لەرزە، ئەیویست حەزرەتی موسا بکوژێ، بەڵام لەلایەن کۆمەڵەکەیەوە ناڕەزایی نیشان ئەدرا لەبەرئەوەی ئەیانزانی بەوە چارەسەریو بەرگری ئایینەکەی ناکرێ بە تایبەتی دوای ئەوە کە جادوبازەکانی فیرعەون بڕوایان هێنا. ڕەنگە لە دڵەوە مەترسیان کردبێ لە خوای موسا کە تۆڵەی بسێنێ وەکو وەرئەگیرێ لەم فەرمودەیەوە: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ﴾ فیرعەون وتی لێم گەڕێن با موسا بکوژمو ئەویش هاوار بکاتە خواکەی، وەك بڵێ قیروسیا چی ئەبێ بابێ، هۆی کوشتنەکەشی ئەوە بوو ئەیوت: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ﴾ چونکە مەترسیم هەیە کە سەرتان لێ تێك بدات، ئەم ئایینەی کە هەتانە بیگۆڕێ، یان ئەگەر ئەوەی بۆ نەکرا خراپە بڵاو بکاتەوەو ئاژاوە بنێتەوە لە وڵاتەکەداو شەڕو شۆڕ فەراهەم بێنێت، ئایا چی لەمە سەیر ترە کە فیرعەونی ستەمکاری گومڕای بت پەرست شتی وا بڵێ بە موسای پێغەمبەری گەورە؟! بەڵێ زۆر جێگەی سەرسوڕمانە، بەڵام ئەو جۆرە قسە ناڕەوا هەر گوتراوە هەر ئەیشگوترێ، ئەوەی لەمەو پێش

---

[1] ئمە شوێنە شوێنی ئەوەیە بفەرموێ: ﴿وما كيدهم﴾ بەڵام بەو شێوەی فەرمو لەبەرئەوە بیکات بە جۆرێکی گشتی تا هەموو خوانەناسێکی دوژمن لە ڕێبازی ئەو بگرێتەوە، لەبەرئەوەی سەبەبو هۆشی باس بفەرموێ کە کوفرەکەیە.

گوتراوە بە قەدەر ئەوەی کە ئێستا ئەگوترێ، جێگای سەرسوڕمان نیە، چونکە ئەوانەی لەمەو پێش کاتێ ئەگوتران هەق‌و ناهەق ڕوون نەبوو بۆوە، بەڵام ئەوەی ئێستا پاش ڕوون بوونەوەی تەواویە، پاش ئەوەی کە بینرا ئیسلام هات جڵەوی ئادەمی گرتە دەست‌و بۆ ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ، کەشتی ژیانی زۆر لەسەر خۆو بە ئاسایش‌و بێ‌تاسەو لەنگەرە برد بەڕێوە، ئادەمیزادی فێری هەموو وێڵ‌و ئوسوڵێ کرد، چرای ڕووناکی عەدل‌و دادپەروەری هەڵگیرساندو تەم‌و تاریکی لابردو بەرزترین‌و پاکترین شارستانیەتی پێك هێنا، هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی بێ‌کەم‌و کوڕی پێداو وەری گرت، ئیسلام بەم جۆرە هات.

ئەمەی کە گوترا هەزار یەکێکە نیە لە ڕوون کردنەوەی حەقیقەتەکەی، ئەم ئیسلامە گەورە کە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەیی‌و ڕاستی‌و گونجاوی ڕوون ئەبێتەوە، بە پێچەوانەی هەموو بیرو باوەڕەکانی تر کە لاری‌و نەگونجاویان ئاشکرا ئەبێ لەگەڵ ئەمەدا باسی ئەوە بکرێ کە چارە نیەو جیهان لە گێژاو دەرناچێ بە گەڕانەوەی نەبێ بۆ سایەی ئیسلام ئەگەر ئەم شتە ڕاستە بگوترێ زۆر زۆر ئەبینی لەوانەی کە خۆشیان بە خوێندەوارو تێگەیشتوو ئەزانن لە فیرعەون‌و کرمەڵەکەی زیاتر لوتیان ئەسوڵێتەوە. بە هەموو جۆر دەم درێژیی ئەکەن دەربارەی ئەو کەسەی ئەو قسە ڕاستە ئەکات‌و ڕێگە ڕاستەکە نیشان ئەدات، دەست ئەکرێ بە قسەی پڕو پاگەندەو فاکو فیك بۆ تاوانبار کردنی، مەترسی ئەخەنە ناو کۆڕی خەڵك بەو جۆرەی کە فیرعەونی پێشەوایان وتی‌و قورئان بۆ باس کردین.

ئەمە چ هۆیەکی هەیە جگە لەوەی کە پەردەیەکی ئەستوور هاتووە بەسەر چاوو دڵ‌و دەروون‌و هەموو هەستیان؟ خوا پەنامان بدات لەم کاتەدا ئەم ئایەتە بیر ئەکەوێتەوە: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ﴾ فیرعەون بەو جۆرە ڕای خۆی دەربڕی، ئەی حەزرەتی موسا چی کرد؟ بێ‌گومان ئەمیش وەك هەموو برا پێغەمبەرەکانی ـ دوردیان لەسەر بێ ـ دیارە ئەبێ پەنا بە کەسێ ببات کە تەنها هەر ئەو جێگە پەنایە، هەر قەڵای پەنای ئەوە ڕێگای هیچ کەسێك نیە دەست درێژیی بۆ بکات.

وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ

پەنای بۆ پەروەردگاری خۆی برد وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ موسا وتی: من پەنا ئەبەم بە پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوەش لە هەموو سەرکەشێ کە خۆی بە گەورە ئەزانێ و باوەڕی نیە بە ڕۆژی حیساب و پرسیار.

ئینجا یەکێك لە کەس و کاری فیرعەون ـ کە خوا بۆی کردبوو هەق چووبووە دڵیەوەو بڕوای هێنا بوو، بەلام پێیان نەزانی بوو ـ خۆی پێ نەگیرا لێیان هەڵپەڕی بۆ بەرگری لە حەزرەتی موسا وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ﴾ پیاوێکی بڕوادار لە خزم و کەسەکانی فیرعەون کە بڕواکەی داشاردبوو وتی بەفیرعەون و کۆمەڵەکەی، لەگەڵیان دوا بە جۆرێکی ڕێك و پێك، بو لێزانین و هێزەوە، یەکەم جار خستیە پێش چاویان ناڕەوایی و خراپی بڕیارەکان وتی: ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ﴾ ئایا چۆن ئێوە پیاوێك ئەکوژن لەبەرئەوە ئەڵێ خواو پەروەردگاری من ﴿الله﴾یە؟ واتە ئەمە زۆر ناڕەوایە، لەسەر شتی وا کە زیانی کەسی تیا نیەو دڵی خۆیشی باوەڕی پێی هەیە، پیاوێکی وا ئەکوژن، ئەم پیاوە لە خۆیەوە ئەم قسانە ناکات و بە خۆڕایی ناڵێ ﴿وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ﴾ لە کاتێکدا چەند موعجیزەو بەڵگەی ئاشکرای بۆ هێناون لە لایەن پەروەردگارتانەوە، یەکێ لەوانە ئەوە بوو بە پێش چاوتانەوە دار دەستەکەی ـ کە دار بوو ـ بە ئەژدیهایەکی سامناك و دووبارە وەکو خۆی لێ هاتەوە. یەکێ تر ئەوە بوو کە بە پێش چاویانەوە هەرچی جادوبازەکان کردیان هەڵی لووشی و لە پاشان بووەوە بە دار دەستەکەی. لەبەرئەوە هەموو جادووبازەکان بڕوایان هێنا، هەرچەندە فیرعەون هەڕەشەو تاپاڵی لێ کردن سوودی نەبوو.

وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴿٢٨﴾ يَـٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَـٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ

---

ئینجا جلەوی بۆ بەرەڵا کردن و لەگەڵیان ڕۆیی بۆ ئەمەی بۆیان ڕوون بکاتەوە کە هەر بە گوێرەی ڕاو باوەڕی خۆیشیان ڕێگەی ئەو بڕیارەیان نیە وتی: ﴿وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ﴾ ئەگەر درۆ بکات لە داواو قسەکانیدا ئەوە خۆی زیان ئەکات، چونکە تۆڵەو خراپی درۆکەی لەسەرشانی خۆیەتی، ئێوە زیان ناکەن، ئیتر بۆ ئەبێ بیکوژن ـ واتە ئەمە ئەوپەڕی شتەکەیە فەرز بکەین ـ وەکو ئێوە ئەڵێن، درۆ بکات، ئایا کەی شایانی کوشتنە؟ لەگەڵ ئەوەدا هەڵئەگرێ ڕاستیش بکات، ﴿وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ﴾ ئەگەر ڕاستیش بکات ئەوکاتەهەر هیچ نەبێ دووچاری هەندێ لەو سزایە ئەبن کە هەڕەشەتان لێ ئەکات پێی. ئەم لێکۆڵینەوەیە بەم جۆرە حەکیمانە هیچ ماوە ناهێڵێتەوە بۆ هیچ خاوەن ژیرییەك، هەر ئەبێ گوێڕایەڵی بکات. ئینجا بەڵگەیەکی تری هێنایەوە کە بۆ دووبار دەست ئەدات، بە شێوەیەکی نهێنی هەڕەشە ئەکات لە فیرعەون وتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ﴾ بێگومان خوا یارمەتی و ڕێنموونی کەسێ ناداو ناکات کە زیادە ڕەوی کەرێکی درۆزن بێت. واتە ئەگەر موسا خراپ و درۆزن بوایە، ئەوا خوا یارمەتی نەئەدا، موعجیزەو بەڵگەی ڕوونی بداتێ، یان ئەگەر موسا درۆزن و خراپەکار بێت، درۆ بە دەم خواوە بکات لێی گەڕێن بۆ خوا ئێوەی ناوێت، خۆی تۆڵەی لێ ئەسێنێت و پێویست ناکات بە ئێوە. فەرمودەی ئەو پیاوە بڕوادارە ئەو دووبارە هەڵئەگرێ و لە پەنایشەوە هەڕەشەیە لە فیرعەون، ئینجا ترساندنی بە تۆڵەو سزای خوایەك کە ئەم هەموو نیعمەت و دەسەڵاتەی داونێ، ئەگەر سزای هات هیچ شتێك بەرگریان لێ ناکات، فەرموی: ﴿يَـٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَـٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ﴾ گەلەکەم ئەمڕۆ ئەم دەسەڵات و پادشایەتیەتان هەیە کە بەرز بوونەتەوەو زاڵن لەم خاك و وڵاتەدا، ئەگەر سزای خوامان هاتە سەر ئای کێ هەیە یارمەتیمان بدات و بەرگری ئەو سزایەمان لێ بکات؟ واتە لە خۆتانی مەشێوێنن، خۆتان مەخەنە بەر قارو خەشمی خوا بە کوشتنی ئەم پیاوە. ئەم پیاوە بڕوادارە خۆیشی خستە ڕیزو کۆمەڵی ئەوان خۆی کرد بە هاوڕێی ئەوان بۆئەوەی بە تەرەفدارو لایەنگیری نەزانن، ئامۆژگاریەکی باش وەرگرن.

قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ
إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ وَمَا
ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾

---

ئەو سەرکەشانەی کە بە تەواوی لە پەت بەرەڵا بووبن، باوڕیان وایە لەگەڵ ئامۆژگاری کران ئێجگاری بلێسە ئەسێنن‌و سوورتر ئەبن لەسەر تاوان‌و ستەم‌و لەقسەو بڕیاری خۆیان نایەنە خوارەوەو لەبەرئەوە ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ فیرعەون وتی: من هیچتان پێ‌ناڵێم‌و هیچتان پێ ڕاناگەیەنم جگە لەوەی خۆم ڕام لێیەتی‌و بە چاکی ئەزانم، من ڕێنموونیتان ناکەم بۆ ڕێگای ڕاست نەبێ، واتە هەر ئەوەی من ڕام لێیەتی ڕاست‌و بەجێ‌یە. دیارە سەکەشەکان هەر ڕای خۆیان بەڕاست ئەزانن، ئەگەر وا نەبێ چۆن ئەبن بە سەرکەش‌و ستەمکار؟ بەڵام پیاوە بڕوادارەکە وازی نەهێنا، زانی کە پێویستە لەسەری هەرچی توانای هەیە بەکاری بێنێ، لەبەرئەوە گوێی نەدا بە فیرعەون، بە جۆرێ تر ئامۆژگاری کردن‌و ترساندنی بە پاشەڕۆژی سەختی سەرکەشەکانی گەلە پێشووەکان، بە تۆڵەو سزای ڕۆژی دوایی بەم جۆرەی کە بۆمان باس ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ﴾ ئەوەی بڕوای هێنابوو وتی: گەلەکەم بەڕاستی مەترسیم هەیە کە وێنەی سزای ئەو ڕۆژە سەختانەی کە بەسەر کۆمەڵەکانی پێشوو هات بەسەر ئێوەش بێت، واتە ئەو کۆمەڵانەی کە بەرگری ئایینی خوایان کرد، ئازاری پێغەمبەرەکانیان داو ویستیان دەست درێژیان لێ بکەن، ئینجا خوای گەورەش هەر کۆمەڵی ڕۆژێکی ڕەشی سەختی بەسەر هێنان‌و بەربادی کردن. دوای ئەوە چەند کۆمەڵێکی بەناوبانگی بۆ باس کردن‌و وتی: ﴿مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ مەترسیم هەیە دووچار ببن بە وێنەی تۆڵەو سزای ئەو کوفرو کە گەلی نوح‌و تایفەی عادو سەمود لەسەری بوون‌و هەروەها ئەوانەی تر کە لە پاش ئەوان هاتن‌و لەسەری بەردەوام بوون ﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ﴾ خوا نایەوێ بەبێ تاوان سزای بەندەکانی بدات، وازیش لە هیچ زاڵمێ ناهێنێ با چەند ماوەیەك مۆڵەتی بدات. دوای ئەوە ترساندنی بە سزای ئەم جیهانە،

وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن
يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا
جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ

**ئینجا ترساندنی بە سزای ئەو جیهان وتی:** ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ * يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ﴾ **ئەی گەلەکەم بەڕاستی ئەترسم کەسزای سەختی ڕۆژی دواییتان بەسەر بێت، ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژی بانگ کردن و جاڕدانی مەلائیکە، بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی. ڕۆژی هاوار کردنە بۆ ڕزگار کردن و بە فریادەوە چوون. ڕۆژی بانگ کردنی بەهەشتیە لە دۆزەخی و دۆزەخیەلە بەهەشتی ئەوڕۆژەی کەوا لەهەیبەتاڕائەکەن وبە سەختی ئەتانگرێتەوە و هیچ پەنادەرێکتان نیە لە سزای سەختی خوا.**

﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ﴾ **هەرکەسێ خوا گومڕای بکات ئیتر هیچ ڕێنموونی کەرێ نیە بۆی. واتە فریای خۆتان بکەون. لە ڕێگای خوا لامەدەن و شوێنی کەس مەکەون با خوا گومڕاتان ئەکات. ئینجا ئەو بڕوادارە ئەو هەڵوێستە ناڕەوایە ئەخاتەوە بیریان کە بەرامبەر حەزرەتی یوسف بوویان کە حەزرەتی موسا لە نەوەی ئەوە، بۆئەوەی ئەو هەڵوێستە خراپە لەگەڵ ئەمیشدا دووبارە نەکەونە. هیچ پێویست ناکات هەر ئەو فیرعەون و کۆمەڵەی چەرخی موسا لە چەرخی حەزرەتی یوسفدا بووبن. بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو تاقمەی پێش ئەمانە لە دانیشتوانی وڵاتی میسر. ئەوەیش باوە کە کردەوەی خراپی چین و کۆمەڵی پێشوو ئەدرێ لەناو چاوی چین و کۆمەڵی دوایی، بە جۆرێ کە وەکو دوایینەکان کردبێتیان، لە قورئانیشدا چەندشتی تری وا هەیە وەکو باویشە لە قسەو گفت وگۆی عادەتیدا. جا هەڵئەگرێ بەو جۆرە ئەم ئیماندارەئەمەی پێ فەرموین:** ﴿وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ﴾ **بێ گومان لەمەو پێش یوسف بە پێغەمبەری هات بۆ لاتان بە چەند موعجیزەو بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی کەچی ئێوە هەر گومانتان بوو لەڕاستی ئەو ئایینەی کە بۆی هێنان و دوو دڵبوون لێی، هەتا یوسف نەماو مرد، ئەو کاتە ئەتان وت: ئیتر خوا هیچ پێغەمبەرێکی تر پاش ئەم ڕەوانە ناکات. وا دەرئەکەوێ بە نەمانی یوسف کەوتوونەتە کەیف و خۆشی، وەکو بڵێن: ئۆخەی ڕزگار بووین، ئەوەندە بێزار بوون لەو ئایینی ڕاستەقینە.**

كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ
سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ
مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا

---

ئاینی پەرستنی خوا بە تەنیا، ویستوویانە ئیتر هەرگیز نەیبیستن، جا بە گوێرەی تاوات و حەزەکەیشیانە بە دەم وتویانە: ئیتر خوا پێغەمبەرێکی تر نانێرێ، چونکە ئادەمی زۆرتر بە گوێرەی حەزو ئارەزووی خۆی قسە ئەکات. ئینجا ترساندنی بەمەی لەبەر خراپی و تاوانی زۆریان خوا گومڕایان ئەکات، وتی پێیان: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ﴾ بە وێنەی گومڕا کردن وسەر تێك دانی ئێوە خوا سەرتێك ئەدات لە هەرکەسێ کە زیادە ڕەوی کەرە لە تاوان و کردەوەی خراپداو گومان دارو دوو دڵە لە ڕاستی ئاینی خوادا، واتە ئێوە بە هۆی زیادە ڕەوی و بێگومان بڕواییتان خوا گومڕای کردوون هەروەها هەرکەس وەك ئێوە وابێ، خوا وەك ئێوەی لێ ئەکات.

ئینجا بەرەنگاریەکی بەتین تری کردن بەمەی پێی ڕاگەیاندن کە خەشم و غەزەبی بەتینی خواو بڕوادارەکان هەیە، خوا دڵیان مۆر ئەکات. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی گەیاندی، چونکە وا بەهێزترە، نزیك ترە لە وەرگرتنەوە، فەرموی: ﴿ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ هەموو ئەوانەی کە بەرگری هەق ئەکەن بە بەتاڵ و بەبێ بەڵگەیەك موجادەلەو دەمبازی ئەکەن لە ئاینی خواو ئایەت و ڕابەرە ئاشکراکانی خوادا، زۆر گەورەیە خەشمی زۆر بەتین لەلایەن خواوەو لەلایەن ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، دەربارەی ئەو دەمبازی و موجادەلەی ئەوانە. واتە خواو کرمەڵی بڕواداران گەورەترین خەشمی زۆربەتینیان هەیەدەربارەی ئەوکەسانەکەدەمبازی ئەکەن لەئاین وبەڵگەکانی خوادا. ئەو کەسانەی کە سیفەت و خوویان بەو جۆرە کە باس کرا، خوا قاریان لێ ئەگرێ، دڵیان مۆر

ئەكات، ئیتر هەرگیز خێرو چاكە ڕوو ناكاتە دڵیان وەكو ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ بە وێنەی مۆر كردنی دڵی فیرعەون و كۆمەڵەكەی خوا مۆر ئەنێ بەسەر هەموو دڵێكدا، كە سەركەشی بكات لە فەرمانی خواو خۆی بە گەورەتر بزانێ لەوەی كە سەر داخات بۆ ئایینی خوا، ستەمكارو تاوانبار بێت. واتە بە فیرعەونو كۆمەڵەكەی وت: ئێوە بەهۆی ئەوە سیفەتو خووی خۆتانەوە خوا دڵی مۆر كردوون، هەركەس وەكو ئێوە بێ، خوا وەكو ئێوەی لێ ئەكات. لەگەڵ ئەم هەموو ئامۆژگاریە ڕێكو پێكە حەكیمانەدا فیرعەون هەر دانی نەنا بە هەقدا، بەڵام وتاری ئەو ئیمانداره ئەوەندە بەهێز بوو فیرعەونو كۆمەڵەكەی چارەیان نەما كە خۆیان لێ بێ ئەگا بكەن لەبەرئەوە فیرعەون بۆ خۆی شتێكی فەراهەم هێنا. وا دەرئەكەوێ ویستی بە فێڵێ خۆی سەرفراز بكات لەو كاتەدا، بە دیمەنیش وای نیشاندا كە ئەیەوێ هەقیانەتەكەی بۆ ڕوون بێتەوە، فەرمانی دا بە هامانی وەزیری كە كۆشكو بینایەكی زۆر بەرزی بۆ دروست بكات، بەهۆی ئەوەوە بچێت بۆ ئاسمان، بەڵكو بكات بە خوای موسا ئەگەر قسەكەی ڕاست بوو كە ئەڵێ: خوا هەیەو ئەوی كردووە بە پێغەمبەر ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ * أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا﴾ فیرعەون وتی: ئەی هامان كۆشكێكی زۆر بەرزی دیاریم بۆ دروست بكە بەڵكو پێی بگەمە ڕێگاو قاپی ئاسمانەكان، بەهۆی ئەوەوە تەماشا بكەم بگەڕێم تا ڕێم بكەوێ لە خوای موسا، من گومانم وایە كە درۆ ئەكات لەمەی كە ئەڵێ من پێغەمبەرم. ئایا مەبەستی فیرعەون گاڵتەو لاقرتی بووبێ؟ یاخوپیشاندان بەمەی پیاوێكی بە ئینسافە، ئەویەێ بە شوێنی حەقدا بگەڕێ؟ یان هەر باوەڕی وا بووبێت ئەو خوایەی كە موسا ئەیڵێت لە ئاسمانەو با ئەمیش باش بۆی ڕوون ببێتەوە؟ یان مەبەستی ئەوە بووبێت كە لەو شوێنە بەرزەوە بە ڕەسەدو دووربین تەماشای ئەستێرەكانو بە گوێرەی ئەستێرەگێری كە لەو كاتەدا باوبووە بزانێ هیچ نیشانەو بەڵگەیەك هەیە لەسەر ڕاستی قسەی موسا؟ مەبەستی هەرچی بووبێتو هەرچۆن بووبێ، ئاشكرایە كە لەسەر گومڕاییەكەی زۆر سوورو بەجیز بووە، زۆر كەشخەو شانازی كردووە بەو سەركەشیەی كە لەسەری بووە.

وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى
تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوْمِ
إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾

---

**وەك قورئـان ئەفـەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾[1] ئا بـەو جۆرە كردەوەی خراپی فیرعەون لە پێش چاوی جوان و شیرین كرابوو، ئا بەو جۆرە بەرگری كرابوو لە ڕێگەی ڕاست. واتە ئەو كەسانەی كە ئاوا لوتیان بەرزە لە ئاستی هەق، شەیتان زاڵ ئەبێ بەسەریاندا بە هۆی ئەوەوە. هەموو كردەوە خراپەكانی خۆیان بە چاك سەیر ئەكەن. ئەو كاتە خوا گومڕایان ئەكات و سەریان لێ ئەشێوێنێ، ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ﴾ فێڵ و پیلانی فیرعەون هیچ بەرهەمێكی نەبووە، هیچی لێ پەیدا نەبووە جگە لە كەوتنە ناو چاڵی زیان و خەسارەتمەندییەكی گەورە، ئەوە بوو بە هۆی بەرباد بوونی خۆی و گەلەكەی لەم جیهانەدا و هۆی سزای زۆر سەختی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی.**

**دوای ئەمە پیاوە بڕوادارە بەهێزەكە بێباكانە وتارێكی زۆر بەهێز و پڕ مەغزی ئاڕاستەی گەلەكەی كرد، ئەوەی لەو شوێنەدا پێویست بێ بۆی ڕوون كردنەوە، وەكو ئەم ئایەتانەی دواوە ئەیخاتە پێش چاومان. لە یەكەمجارەوە بە پێچەوانەوە دژی فیرعەون داوای كرد كە شوێنی ئەم بكەون بۆئەوەی ڕێنموونییان بكات بۆ ڕێگەی ڕاست، ڕێگەی بەختەوەری هەردوو جیهان، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ ئەوەی كە بڕوای هێنابوو وتی: گەلەكەم شوێنم بكەون ڕێنموونیتان ئەكەم، ڕێگەی حەق و ڕاستتان نیشان ئەدەم. ﴿يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ﴾ گەلەكەم ژیانی ئەم جیهانە هیچ نیە جگە لە خۆشی و لەزەتێكی كەم كە بە گورجی ئەڕوات. ﴿وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ﴾ بەڕاستی هەر ڕۆژی دوایی قەرارگا و جێگای مانەوەیە بێبڕانەوە**

---

[1] وشەی ﴿وَصُدَّ﴾ بە (بیان فاعیل) خوێنراوەتەوە، ئەو كاتە فاعلەكەی فیرعەونە. واتە بەهۆی ئەو فێڵ و تەڵەكەیانەی كەئەیكردن، بەرگری خەڵكی ئەكرد لەوەی بێنە سەر ڕێگەی ڕاست. لەم بارەوە وەرئەگیرێ كە مەبەستی فیرعەون لەو فەرمانەی كە دای بە (هامان) دا حیلە و فێڵ بووە، بۆ بەرگری قسە ڕاستەكانی بڕوادارەكە و لادانی خەڵكی لێی.

مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَـٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾ ۞ وَيَـٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ

---

**﴿ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ﴾ هەرکەس کردەوەی خراپ بکات هیچ سزای نادرێ مەگەر بە ئەندازەی کردەوەکەی، واتە نیعمەتو بەزەیی خوا لە سزاداندا بە شێوەیەکە جیا لەوەی لە پاداشتدا هەیە. پاداشت زۆر زیاتر لەکردەوەی چاك، بەڵام سزا بەئەندازەی کردەوەی خراپە دەبێ. ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَـٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ هەرکەسێك کردەوەی چاکی کردبێ، نێر بێ یان مێ، بە مەرجێ ئیمانو باوەڕی ڕێكو ڕاستی ببێ. چونکە کردەوەیەکی چاك بێ ئیمانو باوەڕ نرخی نیە، ئەوانە ئەچنە بەهەشتەوە، ڕزقو ڕۆزی ئەدرێت پێیان لەو بەهەشتەدا بێسنوورو دیاریی کردنو بێ هاوکێشی کردەوەکانیان. واتە ڕەحمو بەزەیی خوا لەگەڵ بەندەکانی دا بەو ڕادەیە، هەر تاوانو گوناهێك بکەن کە تۆڵەیان لێ بستێنێ، هەر بە قەدەر وێنەی خراپەکە تۆڵە ئەستێنێ، بەڵام کە چاکە بکەن زیاد لە ئەندازەی کردەوەکەیان پاداشت ئەداتەوە، لای خواروویی یەك بە دە!! دوای ئەوە بە بێزاریەوە وتی: ﴿وَيَـٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾ گەلەکەم ئەوە چیە من بانگی ئێوە ئەکەم بۆ نەجاتو ڕزگاری، ئێوە من بانگ ئەکەن بۆئاگر؟ واتەئایامن تاوانێکم کردووەتائێوە بەو جۆرەن لەگەڵمدا؟ کردەوەکانتان زۆر ناڕەوایە بەرامبەر.**

**گەلەکەی بە سەراحەت بانگیان نەکردووە بۆ ئاگر بەڵام بانگیان بۆ شتێ کردووە کە هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ بانگ کردن بۆ ئاگر، چوون بێگومان ئەوەی بانگیان بۆ ئەکرد سەری لە ئاو ئاگرەوە دەرئەچێ، لەبەرئەوە بە یەك شت نیشانی دان، وتی: ﴿ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ﴾ بانگم ئەکەن بۆ ئاگر بەم جۆرە بانگم ئەکەن بۆ ئەمەی کە کافر بم بە خواو بڕوام پێی نەبێ، بەجۆرێ شایانی نەوبێ.**

وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾

بەم جۆرە کەشتێ بکەم شەریك‌و هاوبەش بۆی کە بەهیچ جۆر زانا نیم پێی‌و ئاگام نیە لە خوایەتیەکەی. واتە باوەڕ بە خوایەتی ئەبێ لە زانین‌و دڵنیاییەوە بێت، ئەوەش بەوە ئەبێ کە بەڵگەو دەلیلی ڕوون‌و بەهێز ببێت لەسەری‌و خوایەتی چەند سیفەت‌و نیشانەیەکی تایبەتی هەیەو ئەمەی ئێوە هیچ شتێ نیە دەلیل‌و بەڵگە بێ لەسەری‌و هیچ سیفەت‌و نیشانەی خوایەتیشی تێدا نیە، بەڵام ﴿وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ﴾ من بانگی ئێوە ئەکەم بۆ لای کەسێ کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ شتێ ناتوانی سەرکەشی لێ بکات، لەگەڵ ئەوەدا زۆر لێ بووردووەو گوناهو تاوان دادەپۆشێ. ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ بەڕاستی ئەوەی کە ئێوە ئەیڵێن کە ئەم بتانە شتیان بە دەستەو پەرستنیان سوودی هەیە، ڕاست نیەو ڕاست‌و هەق ئەمەیە: ئەوەی کە ئێوە من بانگ ئەکەن بۆ لای بۆئەمەی بیپەرستم هیچ کاروبارێکی هیچ کەس‌و هیچ شتی بەدەست نیە. هیچ نرخی نیە لەم دنیاداو لە ڕۆژی دوایی دا، دەخلی بە هیچ شتێکەوە نیە، گەڕانەوەی هەمووان تەنها بۆلای خوایە، کە ناوی ﴿الله﴾یە، ئەوانەی کە زیادە ڕەوی کەرن لە تاوان‌و لە سەرکەشی‌و گومراییدا، ئەوانە هەموو لە ڕۆژی دوایی دا وان لەناو ئاگرداو هیچ لێی جوێ نابێتەوە دوای ئەوە بە پێچ‌و پەنا، بەرەنگاری فیرعەون‌و کۆمەڵە ستەمکارەکەی کرد بەوتارە بەنرخە پڕ سوودەکەدا ئەوەی پێویست بووبێ لەو کاتەدا وتی، دوای ئەوە کۆتایی هێنا بەمەی کە هەموو کاروبارێکی خۆی حەواڵەی خوا کرد، بە هەڕەشەوە پێی وتن کە بیری ئەم قسانەی من ئەکەنەوە ﴿فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ ئینجا لەمەوپاش لە کاتی هاتن‌و بینینی سزادا بیر ئەکەنەوە لەم پەندو ئامۆژگاریەی کە من بۆ ئێوەم وت، من کاری خۆم حەواڵەی خوا ئەکەم، پشت هەر بە ئەو ئەبەستم، داوای یارمەتی لەو ئەکەم‌و پەیوەندی خۆم بە ئێوەوە ئەپچڕم، بێگومان خوا چاوی قودرەتی لە بەندەکانیەتی‌و بینایە پێیان

فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ
عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذۡ
يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ
أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾

﴿فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ﴾ **ئینجا خوایش ئەو ئیمانداره‌ی پاراست له‌ تۆڵه‌و سزای تاوان‌و كرده‌وه‌ خراپه‌كانی ئه‌وان سزای سه‌خت‌و خراپ چوارده‌وری فیرعه‌ون‌و كۆمه‌ڵه‌كه‌ی گرت. واته‌ ئه‌و ئیمانداره‌ به‌ هۆی ئه‌وه‌ی كه‌ به‌ گوێره‌ی توانای پشتگیری هه‌قی كردو به‌رگری ناهه‌قی كرد، له‌به‌ر خواو به‌ پشتیوانی خوا. خوایش ئه‌وی پاراست له‌ تۆڵه‌و سزای هه‌ردوو جیهان‌و تاوان‌و كرده‌وه‌ خراپه‌كانی فیرعه‌ون‌و كۆمه‌ڵه‌كه‌ی. چونكه‌ باوی خوا هه‌روا بووه‌، له‌ناو هه‌موو ئوممه‌ته‌كاندا، ئه‌وانه‌ی كه‌ به‌ گوێره‌ی ئیمانه‌كه‌یان جوڵابنه‌وه‌ خوا ئه‌وانه‌ی ڕزگار كردووه‌، ئه‌وه‌ی ئیمانی بووبێ به‌ڵام بێ‌ده‌نگ له‌ ماڵی خۆی دا دانیشتبێ‌و ده‌ستی گرتبێ به‌سه‌ر كڵاوه‌ شڕه‌كه‌ی دا، ئه‌ویش به‌شدار بووه‌ له‌ سزای تاوانباره‌كاندا.**

**ئه‌و سزا خراپه‌ی كه‌ چوارده‌وری فیرعه‌ون‌و كۆمه‌ڵه‌كه‌ی دا بریتی بوو له‌ خنكان له‌ ده‌ریادا به‌ كافری كه‌ هۆی سزای نه‌بڕاوه‌یه‌ یان** ﴿ٱلنَّارُ﴾ **بریتیه‌ له‌ ئاگر كه‌ پاش خنكاندنیان ئیتر سزا ئه‌درێن پێی. به‌م جۆره‌ له‌ خنكاندنیانه‌وه‌ هه‌تا هاتنی ڕۆژی دوایی** ﴿يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ﴾ **به‌ به‌یانی‌و ئێواره‌ پیشانی ئه‌درێن‌و ئه‌برێنه‌ سه‌ری بۆ ئه‌مه‌ی سزا بچه‌ژن‌و به‌ بینینه‌كه‌ی‌و چاوه‌ڕوانیه‌كه‌ی، كه‌ ئه‌مه‌ش سزایه‌كی زۆر سه‌خته‌، وه‌كو په‌ندو مه‌سه‌له‌ی فارسی ئه‌ڵێ: (در بلا بودن به‌ از بیمي بلا) یان به‌ سوتاندن پێی به‌و جۆره‌ی خوا خۆی ئه‌زانێ. ئه‌م باری دووه‌مه‌ ئاشكراتره‌ به‌ گوێره‌ی باوی به‌كارهێنانی وێنه‌ی ئه‌م ڕسته‌یه‌ وه‌كو ئه‌ڵێ: (عرض الأساری علی السیف) كاتێ كه‌ بكوژرێن پێی هه‌رچۆن ببێ**

مەبەستەکەی هەریەکە کە ئەو کۆمەڵە ئەم ماوەیشە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی هەر لە سزادان، ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر عەزاب پێش قیامەت بۆ ئەوانەی کە کافرن، ئیتر سزاکە تەنها بۆ ڕۆحی بێت، یان بۆ لەشیشی، بەڵگە لەسەر سزای لەشیش بە تایبەتی و لەسەر سزای بڕواداری گوناهبار تەنها حەدیسە. ئەو کۆمەڵە ستەمکارە لەم ماوەیەدا سزاو ئازار ئەچەژن. ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾ لە ڕۆژێکدا ڕۆژی دوایی دێت فەرمان ئەدرێ بە مەلائیکە کە فیرعەون و کۆمەڵەکەی بخەنە ناو بەتین ترین سزا، کە سزای تەواوی دۆزەخە. بێگومان ئەمە بەتین ترە تا ئەو سزای کە لەو ئەدرێن یان مەبەست ئەمەیە بیانخەنە ناو بەتین ترین سزای دۆزەخ لەبەرئەوەی ستەمکارییان بەهێزتر بووە لە دنیادا، ئەم جار بە بۆنەی فیرعەون و شوێن کەوتووەکانی بە شێوەی گشتی باسی شەڕە قسەو دەمە دەمێی هەموو سەرکەش و شوێن کەوتووەکان ئەکات لەناو ئاگردا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ بیر بکەرەوەو باسی ئەو کاتە بکە کە دۆزەخیەکان دەمە دەمێ ئەکەن و بەربەرەکانێی یەکتری ئەکەن بە قسە: ژێر دەستەکان و بێ دەسەڵاتەکان ئەڵێن بە سەرۆکە زۆردارە داگیرکەرەکان: ئێمە لە جیهاندا شوێن کەوتووی ئێوە بووین، کەواتە ئایا ئێوە بەشێ لەم ئاگرەمان لە کۆڵ ئەخەن، بە بەرگری کردنی یان بیخەنە سەرشانی خۆتان؟ واتە ئەمەمان بۆ بکەن، چونکە ئێمە بە قسەی ئێوە خەڵەتاین ئێوە گوتتان ئێمە بۆ ڕێگەی ڕاستتان ئەبەین، لە خراپە ئەتانپارێزن، ئەم ژێر دەستە شوێن کەوتووانە بێ دەسەڵاتیەکەیان نابێتە بەهانە بۆیان و تاوانەکەیان بۆ پەڕۆ ناکات، بەڵکو لەگەڵ زۆردارەکاندا لە ئاگردا ئەسوتێن، چونکە خوای گەورە ڕێزی ئادەمێتی دابوونێ و ڕێزی ئەمەی دابوونێ کە بە سەربەستی خۆیان باوەڕێ هەڵبژێرن. ئەمان وازیان لەمانەهێنا وکوێرانە کەوتنەشوێن ستەمکارو سەرکەشەکان. هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیان وت: نەخێر، بەڵکو لە دڵیشیاندا نەهات کە شتی وا بڵێن، بەڵکو هەر بیریشیان نەئەکردەوە لەوەی کە پێیان ئەگوتن.

قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمْ تَكُ
تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُواْ بَلَىٰ قَالُواْ فَٱدْعُواْ

**کەواتە مافی خۆیانە کە بکەون لە ئاگرداو هیچ عوزرو بەهانەیەکیان لێ وەرنەگیرێ لە وەڵامی ئەو ژێر دەستەو شوێن کەوتووانەدا: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ﴾ خۆ بە زل زان و زۆردارەکان بە دڵ تەنگی و بێزاری لە خۆیان و لەوانیشەوە ئەڵێن: ﴿إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ﴾ هەموومان: ئێمەیش و ئێوەیش واین لەناوی دا، چی بکەین؟ ئەگەر شتێکمان پێ بکرایە بۆ خۆمان ئەمان کرد. هیچ ناکرێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ﴾ بێگومان خوا بڕیاری خۆی داوە لە نێوان بەندەکانی دا، هەرکەسێ شایانی بەهەشت بێ ناردوویەتی بۆ بەهەشت، هەرکەسێ مافی دۆزەخی ببێ ناردوویەتی بۆ دەزەخ، سزای دۆزەخیشی دیاری کردووە، هەرکەسێ بە گوێرەی خۆی دەست نادات بۆ گۆڕان.**

**ئینجا بە جارێ هەموو لایەك هاوار ئەبەنە بەر ئەو مەلائیکەتانە کە کاربەدەستی دۆزەخن بۆ ئەمەی لای خوا لاڵەیەکیان بۆ بکەن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ﴾ ئەوانەی کە وان لە ئاگردا بە کاربەدەست و حەرەسەکانی دۆزەخ ئەڵێن: لاڵەو تکایەکمان بۆ بکەن لە پەروەردگارتان بۆ ئەمەی ڕۆژێك سزامان لەسەر سووك بکات. تەنها ڕۆژێك. بۆ ئەمەی هەناسەیەکی تیا بدەین، بەڵام ئەوانە مەلائیکەن، ئوسوڵ ئەزانن، باوو ڕەوشتی خوا ئەزانن تکای بێ جێ ناکەن.**

**ئەزانن کە ئەمانە خۆیان هەلیان لە دەست خۆیان دەرکرد، لەبەرئەوە عەزاب و سزایان زیاتر ئەکەن بەمەی کردەوەی خۆیانیان بیر ئەخەنەوە بەم جۆرە: ﴿قَالُوٓاْ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ ئەڵێن: ئایا پێغەمبەرەکانتان نەهاتنە لاتان، بە چەندەها موعجیزەو بەڵگەی ئاشکرتوە؟ ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ دۆزەخیەکان ئەڵێن: بەڵێ هاتن، ئینجا مەلائیکەکان بە گاڵتەو ڕیسواکردن و نائومێد کردنەوە ﴿قَالُواْ فَٱدْعُواْ﴾ ئەڵێن: کەواتە خۆتان نزاو لاڵە بکەن ئێمە ناتوانین بێ ئیزن دوعاو داوا بکەین.**

﴿وَمَا دُعَـٰٓؤُا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾
وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَـٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى
ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٥٤﴾﴾

---

**ئینجا بەرهەمی نزاو لاڵەکەیان باس ئەکات ئەفەرموێ: ﴿وَمَا دُعَـٰٓؤُا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ﴾ هیچ شتێك پەیدا نابێت لە دوعاو نزای بێبڕواکان جگە لە زایە بوونو بێنرخیو گوێ پێنەدان[1]. پاش ئەوەی لەباسی فیرعەونو کۆمەڵەکەی بووە، بەو جۆرە هێنانی لەو جیهانەوە هەتا ناو ئاگری نەبڕاوەی دۆزەخ، هەروەها لە پێش ئەوانەوە باسی ئەو کۆمەڵانەی تری کرد کە ئەوانیش پاشەڕۆژیان بەرباد بوون بوو لە جیهانداو ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی دواییدا.**

**پاش ئەوە بڕیاری خۆی دەرئەکات لەسەر ئەو هەموو بەسەرهاتانە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ * يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ بێگومان ئێمە یارمەتی پێغەمبەرەکانمانو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە پێیان ئەدەین لە ژیانی دنیادا، لە ڕۆژێکدا کە شایەتەکان ڕاست ئەبنەوە، بۆ شایەتی دان لەسەر خەڵکی. واتە یارمەتیان ئەدەین لە هەردوو جیهاندا.**

**ئەو شایەتانە بریتین لە پێغەمبەرانو مەلائیکەو ئیمانداران، ئەو ڕۆژەش ڕۆژێکە کە عوزرو بەهانەی کافرەکان هیچ سوودێکیان پێناگەیەنێ لەبەرئەوەی بێ جێگەیە، هەلو کاتی خۆیان لەدەست کردەوە. یان ئیزن نادرێن کە عوزر بهێننەوە، چونکە ڕاست ناکەنو تەنیا نەفرینو لەعنەتی خوایان بۆ هەیەو عەجەب شوێنو ماوای خراپیان هەیە کە دۆزەخە!!**

**یارمەتی دانی خوای گەورە، بۆ پێغەمبەرانو ئیمانداران لە ڕۆژی دوایی دا هیچ قسەو باسێك نیە بۆ هیچ ئیماندارێك، بەڵام یارمەتی دانیان لە دنیادا پێویستی بە ڕوون کردنەوە هەیە، بۆئەوەی ناشارەزای بڕوادار دڵ ئارام ببێ، بێباوەڕیش ڕێگەی دەم درێژیی نەمێنێ**

---

[1] دارشتنەکەی قورئان زۆر سەیرە وای نیشان ئەدات کە زایە کردنو بێسوودیو گوێ پێنەدان چاڵێکەو دوعاو نزای ئەوانی تێبکەوێ، یان زەرفێکەو داینەشارێ.

بڵێن: ئەم بەڵێنە هەموو کات نەهاتووەتە جێ، ئەوەتا پێغەمبەران چەندیان لێ شەهید کران‌و ئیمانداران زۆرو زەبەندە لە ژێر سزاو عەزابدا بەرباد کران. ئەوەتا لە چەند لاوە بە چاو ئەبینین پێشێل ئەکرێن، چەندەها ئەژین بە ئەوپەڕی تەنگی، هەرچەند لە سورەتی ﴿الصافات﴾دا لەم مەبەستە کۆڵینەوە بەگوێرەی پێویست، لە کاتی تەفسیری ئایەتی: ﴿إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ * وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾دا، بەڵام بە جوانی ئەزانم لێرەش‌و لە هەر شوێنێ ئەم باسە بێتە پێشەوە، هەر لێی بکۆڵینەوە:

١- هەرچەند بەڵێنەکە شێوەیەکی گشتیە، بەڵام مەبەستەکە هەموو نیە، بەڵکو زۆربەیە... بە گوێرەی ڕێزمانی هەموو زمانێ شتی وا ڕێك‌و ڕەوایە، بەڵکو لای هەمووان باوە شتێ کە مافی بەشێ بێ لە کۆمەڵ‌و تیرەیەك، ڕەوایە بەکارهێنانی بۆ هەموو کۆمەڵ‌و تیرەکە. لەم بارەوە بەڵگەو شایەتی زۆر هەیە کە نایەتە ژمارە.

٢- مەبەست لە یارمەتی دان تۆڵە سەندنە لە دوژمنەکانیان‌و ئەوانەی دەست درێژیان کردووە لە پێغەمبەران ـ درودی خوایان لەسەر بێت ـ ئیتر لە چەرخی خۆیاندا یان لەپاش خۆیان، هەروەها بۆ بڕواداره ڕاستەقینەکانیش تۆڵەی هەر سەندووەو هەر ئەیشی ستێنێ، ئیتر بە گوێرەی زانین‌و حیکمەتی خۆی، زۆری پێ چووبێ یان کەم. بەڵام کام بڕواداران؟

ئەوانەی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەران ئاڵای ئەوانیان هەڵگرتبێ، خۆیان داڕنیبێ لە هەموو شتێکی تر. ئەگینا شایانی ئەوە نابن خوا شان بە شانی پێغەمبەران بەڵێنی وایان بۆ بدات. بە کورتی ئەوانەی کە جیهادو کۆشش ئەکەن لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەو چەسپاندنی بەرنامەی خواداو ئەو بڕوادارانەی کە وانین، بە پێی ڕێبازو ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) سەرشۆڕی‌و بەڵاو تەنگاوە ئەدا بەسەریانداو لە کۆڵیان ناکاتەوە، تا ئەگەڕێنەوە بۆلای ئایینەکەیان چ جای یارمەتی دانیان وەك ئەم حەدیسە ئەفەرموێ کە ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داود ڕیوایەتی ئەکەن‌و حاکمیش فەرموویەتی حەدیسەکە صەحیحە: (اذا تبايعتم بالنسيئة واخذتم اذناب البقر ورضيتم بالزرع وتركتم الجهاد سلط الله عليكم ذلا لا ينزع عنكم حتى ترجعوا إلى دينه) بەڵکو لەو کاتانەدا نزایشیان لێ وەرناگیرێ، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (والذي نفسي بيده لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر او ليبعثن الله عليكم عذابا ثم تدعونه فلا يستجب لكم) کەواتە نابێ بڕوادارانی ئەمڕۆ کە باشەکەیان ئەوەیە نوێژو ڕۆژوو ئامۆشۆی زۆری مزگەوتی هەیەو ئەندازەیە خۆی لە گوناهیش ئەپارێزێ، بەڵام بە هیچ جۆر هەقی بەسەر شتێکەوە نیە،

ئەمە باشەکەیەتی ئەوی تری خوا پەنا بدات باس ناکریێو زۆربەی هەر بە ــ دفتر نفوس ــموسلّمانە. ئەم بڕوادارانەی ئەمڕۆ کەلە هەموو لایەك ژێر دستەنو بەش خوراوو ڕیسوان، ئەمانە نابێ بگیرێن بە دستەوەو بەمانە ڕەخنە ناگیرێ.

٣- مەبەست لە یارمەتی دان زاڵ کردنە وەکو زۆرتر بەم مانایە بەناوبانگە. بەڵام مەبەست زاڵ کردنی هەموو یەکەیەکە نیە، بەڵکو مەبەست تاقمو کۆمەڵەکەیە، واتە هەموو پێغەمبەرانو ئەوانەی ڕێبازی ئەوانیان گرتووە، ئەوە هەموو تاقمو کۆمەڵێکە وەکو هەموو ئەوانیش کۆمەڵێکە، دەی بێگومان بە شێوەیەکی گشتی لە بەربەرەکانێدا سەرکەوتن بۆ تاقمی پێغەمبەرانە هەرکەس لەو بەربەرەکانێدا تیا چووبێ تەنها خۆیەتی تاقمەکەی هەر زاڵ بووە، پاشەڕۆژی سەکەوتن هەر بۆ ئەو تاقمە بووەو هەر بۆ ئەوانیش ئەبێ بە مەرجێ کۆتایی نەهێنرێ لە تێکۆشان.

٤- زاڵ بوونی پێغەمبەرانو بڕواداران بریتیە لە زاڵبوونی ئایینەکەیانو زاڵبوونی ئایینەکەش بریتیە لەوە کە بە ڕێکی بمێنێتەوەو ئەتوانرێ سەر نقوم بکرێ یان بخرێتەوە بە درۆوە دەی بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ئایینی خوا هات بەو جۆرە دەست بە دەست هەتا دواترین شێوەی کە هاتە سەر گەورەترین ئادەمی کە حەزرەتی محمەدە (ﷺ) بە ڕێکی مایەوەو هەرچەند ناوبەناو ئەشێوێنرا، بەڵام هەر تازە ئەکرایەوە ئەوەی ئایینو فەرمانی خوا بووە هەر دەرئەکەوتەوە تا گەیشتە دواترین شێوەی کە بە قورئان هاتە خوارەوە.

ئەم جارە وەها هات دەست نادات بۆ شاردنەوەو گۆڕاندنو دەست تێخستنی لەگەڵ ئەوەشدا دوژمنەکانی لە کاتی هاتنە خوارەوەیەوە تا ئێستاو لەمەو پاشیش نەوەستاونو ناوەستن بە هەموو هێزو توانایەکیانەوە بە هەموو جۆرێكو بە هەموو دەسەڵاتەوە کە بوویانەو هەیانە لە دەرو لەناو کۆششیان کردو ئەیکەن بۆ ئەمەی بیشێوێننو بەرگری بکەن، کەچی نەکراو نایشکرێ، بەڵکو هەتا بێت پەرە ئەسێنێو هیچ کەس نەیتوانی لە ڕووی ژیریو زانیارییەوە بەندێکی بە ناهەقو ناڕەوا دەیکات، چەند کونگرەی بۆ گیرا لە هەموو لایەکەوە هیچ نرخی نەبوو، ئیتر چ یارمەتیەك لەوە گەورەترە. بەڵێ توانیان بە هەموو فێڵو تەڵەکەیەك بڕوادارەکانیان لێ دور خستەوەو لە ڕێگای خوێندەوارییەوە کارێکی وایان کرد زۆربەی ڕۆڵەی بڕوادارەکان بێ ئاگا بوون لە ئایینو بەرنامە گەورەکەیانو هەر بە هۆی ئەوەوە وازیان هێنا لە پەیڕەوی قورئانەکەیان بەهۆی ئەوەوە چراکەیان کوژایەوەو لە

تاریکیدا دوژمن گرتنی و ژێر دەستی کردن. چونکە دوژمن چاك ئەیزانی بەوە نەبێ هیچیان بۆ ناکرێ بۆنموونە لە ساڵی ١٨٨٢ زاینی گەلادستون سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لە کۆنگرەی گشتی خۆیاندا قورئانێکی گرت بە دەستەوەو وتی: تا ئەم پەڕاوە بەدەستیانەوە بێت ئێمە لە وڵاتی ئەواندا دانامەزرێن. لەپاش ئەوە ئەو تەگبیرەی کرد لە ڕێگەی خوێندەوارییەوە بێ ئاگا بکرێن لە قورئانەکەیان، ئەو تەگبیرە جێبەجێکرا تاوای لێ هات کە لێی هات.

٥- گەورەترین یارمەتی لە دنیادا ئەوەیە کە خوای گەورە دڵی ئەو بەندەی خۆیە بەهێز بکات لەسەر بەرنامەکەی خوا لانەدات و بەهیچ جۆر نەخەڵەتێ و دوژمن نەتوانێ ئەو بڕواو باوەڕەی کەلە هەموو شت بە نرخ ترە لێی بستێنێ.

ئەمەیە گەورەترین یارمەتی، ئەمەیە گەورەترین زاڵبوون بەسەر دوژمندا، کەواتە حەزرەتی ئیبراهیم کاتی خرایە ئاگرەکەوە لە بابەت بیروباوەڕەوە لە پلەی هەرە بەرزی سەرکەوتن و زاڵبووندا بوو، ئەگەر چی بە دیمەن لای نەزان ژێر دەست و زەلیل بوو، زاڵبوون و ڕزگاری لەو ئاگرە بە تەواوی قوڕی دا بەدەمی هەموو دوژمنەکانی داو هەروەها هەرچی برا پێغەمبەرەکانی کە دووچاری سزاو بووبن لە ڕێگەی خوادا، هەروەها هەموو باوەڕدارە ڕاستەقینەکان کەلەسەر ڕێبازی پێغەمبەران ــ درودی خوایان لەسەر بێت ــ ڕۆیشتن، کەواتە بیلالی حەبەشی و یاسرو سومەییە زاڵ و سەرکەوتوو بوون بەسەر ئەو هەموو هێزی کوفرە لەو کاتی تەنگیەدا.

ئینجا شێوەیەك لە یارمەتیەکانی باس ئەفەرموێ دەربارەی حەزرەتی موسا و ئەوانەی کە شوێنی کەوتبوون، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ * هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بێگومان داومانە بە وسا ئەو شتەی کە ڕێگەی خوای پێ دەربکات وەکو ئەو ئایین و شەریعەتە ــ بەرنامەــ بێت لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگە ئاشکرایانەدا. ئەو پەڕاوەی کە تەوراتە لەپاش موسا هێشتمانەوە لەناو ئیسرائیلی یەکاندا بە میراتی لەو موساو دامان پێیان لەبەر ڕێنموونی کردن و ئامۆژگاری کردنی هەموو خاوەن ژیرییەك.

لەپاش ئەوە تەمێی پێغەمبەر (ﷺ) ئەكات، هەروەها یارەكانی و هەموو بڕواداریكی ڕاستەقینە بە ئارام گرتن و خۆگرتن بە چاوەڕوانی هاتنی بەڵێنی خواو بەردەوامی لەسەر پەرستن و یادی خوا. ئەفەرموێ: ﴿فَٱصۡبِرۡ﴾ كاتێ بۆت ڕوون بوویەوە یارمەتی دانی ئێمە بۆ پێغەمبەران و ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەوانن، كەواتە تۆش ئارام بگرەو خۆت ڕاگرە. ئارام بگرە لەسەر بێباوەڕیی بێبڕواكان ئارام بگرە لەسەر سزاو ئەزیەتێ كە دەربارەتان ئەكرێ، ئارام بگرە لەسەر ئەوەی كە خاوەنی ناهەق و بەتاڵ ئەبینی بە كەشخەو خۆشیەوەو بە دیمەن زۆرو دەسەلات لە دەستی ئەودایە. ئارام بگرە لەسەر ئەو بەد خویی و لارە جلەوی خەڵكی و بەدكرداریيان، ئارام بگرە لەسەر بێئارامی دڵ و دەروون لەكاتی تەنگاوەداو پەلە نەكردنی بۆ هاتنی یارمەتی خوا بە زوویی، ئارام بگرە لەسەر زۆر شت كە لەلایەن دۆستەوە پێت ئەگات پێش ئەوەی لە دوژمنەوە بێت. ئارام بگرەو دڵنیابە ﴿إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ﴾ چونكە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستەو دێتە جێ ئیتر هەرچەندی پێ بچێ.

یەكەم چەكێ كە بەكار بێ لە ڕێگەی گەیاندن و چەسپاندنی ئایین و بەرنامەی خوادا ئارام گرتنەو توێشووی ئەو ڕێگە سەختە درێژەیش داوای لێ بوردنە لە خواو یادی خوایە لە هەموو كاتێكداو لەبەرئەوە دوای فەرمان پێدانی بە ئارام گرتن، فەرموی: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ﴾ داوای داپۆشین و لێ بوردن بكە لە كەم و كوڕی و ناتەواویت، وەكو پەلەو كەم ئارامی دڵیان خەریك بوونی دڵ بە بێبڕواكانەوەو وێنەی ئەم جۆرە شتانە كە تاوان و گوناه نین، بەڵام شایانی پلەو پایەی بەرزی پێغەمبەر نین (ﷺ) لەبەرئەوە بە گوناهو ناوبراون. تەسبیح و حەمدو سەنای پەروەردگارت بكە لە ئێوارەو بەیانیدا مەبەست هەموو كات یان مەبەست نوێژ كردنە لەم دوو كاتەدا چونكە لەو كاتەدا ئەم پێنج فەرزە نەبووە، بەڵكو لە ئێوارەو بەیانیدا نوێژ فەرز بووە هەرچۆن بێ مەبەست ئەوەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام بێ لەسەر پەرستن و یادو زیكری خوا، چونكە بەوە پێگەیشت و ئامادەیی پەیدا كردووەو شایانی ئەوە بوو كە فروستادەیی خوا بەجێ بهێنێ كە پلەو پایە لەوەبەنرخ تروبەرزترنیەوەكوهەر ئەوەش خۆراكی ڕۆح و توێشووی ڕێگای فروستادەییەكەی بوو، هەروەهائەم بەرنامەیەبۆهەركەسێ كەخوا بۆی بكات لەسەرڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ)بڕوات.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ
مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾﴾

**دووباره دێتەوە سەر باسی بەربەرەکانێی ئەوانەی کە بەربەرەکانێ ئەکەن لە ئاینو ئایەتەکانی خواداو هۆی بەربەرەکانیان دەرئەخات، ئەم جار تەمێی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکاتەوە بە ئارام گرتنو بەردەوامی لەسەر یادی خواو باسی خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ﴾ بێگومان ئەو کەسانەی موجادەلەو دەمبازی ئەکەن لە ئایەتەکانی خواداو ئەیانەوێ بەڵگەو دەلیلە ڕاستە بەهێزەکانی خوا بەرگری بکەنو بەتاڵیان بکەنەوە بێ ئەمەی بەڵگەو نیشانەیەکیان بۆ هاتبێو بە دەستیانەوە بێ، بەڵکو ئەیانەوێ بەس بە دەمبازیو قسەی پڕوپووچ، ئەوانە هیچ لە دڵیاندا نیەو هیچ مەبەستێکیان نیە جگە لەسەرکەشیو بە دوای گەڕانی گەورەییو سەرۆکی، واتە هۆی بەربەرەکانێو دەمبازیەکیان ئەوەیە. ئەوانە ناگەنە ئەوە بەرگری لە ئایەتەکانی خوا بکەن یان ناگانە ئەو مەبەستی خۆیانە.**

**ئادەمی زۆرجار خۆی ناناسێو خۆی لێ ئەگۆڕێو لە بیری ئەچێ کە شتێکی بچووکی بێهێزەو هەرچی هەیە لە خۆیەوە نیە بەڵکو تەنها لە خواوەیە، بەهۆی ئەوەوە بافیش ئەکاتە خۆیو سنگ دەرئەپەڕێنێو دڵی پڕ ئەبێ لە تەکەبورو بەشداری ئەکات لەگەڵ شەیتاندا لەو سیفەتە پیسەدا کە بوو بەهۆی نەگبەتی شەیتان.**

**ئەو کاتە دەمە قاڵێو چەنەبازی ئەکاتو وای نیشان ئەدا کە قەناعەتی نیەو دڵنیا نیە بۆیە موجادەلە ئەکات. خوای گەورەش کە چاوی قودرەتی لە هەموو شتەو ئاگادارە بەسەر هەموو شتدا بۆی دەرئەخات کە هۆی چەنەبازیەکەی خۆ بەزل زانینەو هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە. ئەو ئادەمیە ئەگەر ئاوا خۆی لە بیر نەچێو خۆی باش بناسێ کە شتێکە وەکو ئەو هەموو شتە زەبوونو داماوە لە بەردەمی توانا و دەسەڵاتی خوادا، بەڵکو هیچ نموونەیەکی نیە لە چاو ئەم هەموو دروست کراوانەدا، ئەگەر هەر ئاوایش تۆزێ خۆی بناسێ لە ڕووی ئایەت خۆی بەشت تەماشا بکاتو سەرشۆڕ ئەکات.**

ئەم سیفەتە پیسە هێجگار خراپە ڕووی کردە هەر دڵێ بێئارامی ئەکات و سەری لێ تێك ئەدات و لە هیچ کوێ جێی نابێتەوە و ئارام ناگرێ و ئەبێتە هۆی ناڕەحەتی خەڵکی و هەموو بە دەستیەوە دائەمێنن. بەسە بۆ خراپی ئەم سیفەتە کە بوو بەهۆی نەفرین و لەعنەتی خوا درەبارەی شەیتان، کەواتە هەقی خۆیەتی خوای گەورە لێرەدا تەمێی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکات بەمەی کە پەنا بگرێ بە خوا لە حاڵی ئەوانە، ئەفەرموێ: ﴿فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ ئینجا تۆیش پەنا ببە بە خوا لە حاڵی ئەوانە چونکە بێگومان هەموو قسەو کردارتان ئەبیستێ و ئەبینێ. ئەمجار کەم نرخی ئادەمی و ئاسانی دروست کردنی دەرئەخات کاتێ بەراورد بکرێ لەگەڵ هەندێ لە دروست کراوەکانی خوادا، ئەفەرموێ: ﴿لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بێگومان دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی گەورەو گرنگرە لە دروست کردنی ئادەمی بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانێ و نەفامە بۆیە دەم دریژیی ئەکات و خۆی بە گەورە تەماشا ئەکات. واتە ئەگەر زانا و فامدار بوایە خۆی بەراورد ئەکرد لەگەڵ ئەم دروست کراوە گەورانەدا ئەو کاتە خۆی ئەناسی و هەر ڕووی نەئەهات خۆی بە شت بزانێ، چونکە ئاسمان و زەوی ئەوەیە لە پێش چاو هەر بەم شێوە سادەش لێیان ورد ببێتەوە بیریان لێ بکاتەوە بەسە بۆ ئەو مەبەستە چ جای بە گوێرەی ئەوەی زانیاری تازە ئەیلێ: ئەم زەویە کە ئێمە لەسەرین بەم هەموو گەورەییەوە یەکێکە لە تابیع و شوێن کەوتووەکانی ئەم خۆرە. قەبارەی خۆر گەورەترە لەم بە یەك ملیۆن جار.

ئەم خۆرە یەکێکە لە سەدملیۆن خۆری تر لە نزیك ترین کاکەشان لەئێمەوە. تا ئەمڕۆ سەد ملیۆن خۆر دەرکەوتووە بۆ زانایان. ئەڵێن هێشتا ئەمە شتێکی زۆر کەمەو بۆ باس ناشێ لە چاو هەموو بوونەوەردا. لەگەڵ ئەمەدا هەر تەنها ئەمەی کە پێی زانراوە، تەنها بیر لێ کردنەوەیشی ژیریی و هۆش سەرگەردان ئەکات، چونکە: ئەڵێن دووری خۆر لەم زەویەوە ٩٣ ملیۆن تیرەی ئەم کاکەشانەی کە ئەم خۆری ئێمە تابعیەتی سەد هەزار ملیۆن ساڵی ڕووناکیە، یەك ساڵی ڕووناکی ٦٠٠ بلیۆن میلە، چونکە خێرایی ڕووناکی لە چرکەیەکدا ١٨٦ هەزار میلە، ئەڵێن نزیکترین کاکەشان لەم کاکەشانی ئێمەوە ٧٥٠ هەزار ساڵی ڕووناکی دوورە. جاوەرە لەمەوەبڕو بۆ کاکەشانێ کە هەر لە تواناداا نیە بیر لێ کردنەوەشمان.

وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا
تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾

خوای گەورە کە ئەفەرموێ: گەورەترە لە دروست کردنی ئادەمی ئەوە بە گوێرەی فامو تێگەیشتنی ناشارەزاکانە ئەگینا بۆ خوا گرانو ناگراں نیەو هەروەکو یەك بە لایەوە سەد هەزار مەجەرەو باڵی مێشوولەیەك، چونکە هەر ئەوەندەی ئەوێ کە مەیلو ئیرادەی خوا رووی تێبکات، ئیتر وەکو یەك هەر بەوە فەراهەم دێن! ﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ﴾ کوێرو چاوساغ یەکسان نینو جیاوازن لە یەك: کوێرە نەخۆی ئەبینێ نە غەیری خۆی لەبەر ئەوە نە شوێنی خۆی ئەناسێو نە شوێنی غەیری خۆی، نازانێ ڕوو لە کوێ بکاتو بۆ کوێ بڕواتو چۆن بڕوا، لە ڕۆیشتندا هەموو کات مەترسی هەیە پێی هەڵکەوێ یان بکەوێتە چاڵ، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوە چاو ساغو بینا خۆیشیو خەڵکیش ئەبینێو شوێنو جێگای خۆیشیو خەڵکیش ئەبینێو ئەزانێ ڕوو لە کوێ بکاتو چۆن بڕواو بۆ کوێ بڕوات، مەترسی پێ هەڵکەوتنو پێی هەڵخزانو کەوتنە ناو چاڵی نیە. هەرچۆنێ ئەم دوانە ئاوا جیاوازن هەروەها ئەوانەی کە ئیمانو باوەڕیان هەیەو کردەوە چاکەکان بەجێ ئەهێنن زۆر جیاوازن لەگەڵ ئەوانەی کە خراپەکارن.

بڕوادارە ڕاستەقینەکان چاوی دڵیان ڕووناکەو هەموو شت لە شوێنی خۆیدا ئەبینن و ئەناسنو ئەزانن لە کوێوە هاتوونو بۆ کوێ ئەڕۆنو بە کردەوە چاکەکانیان سوود ئەگەیەنن بە خۆشیانو بە غەیری خۆیان. بەڵام پێچەوانەی ئەوانە بێبڕوایانن شتێکی زۆر ڕوونە بەبیر کردنەوە لە حاڵو باری ئەم دوو تاقمە شتەکە دەرئەکەوێ، بەڵام بیر کردنەوە زۆر کەمە وەکو ئەفەرموێ: ﴿قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ﴾ زۆر کەم بیر ئەکەونە ئامۆژگاری وەرئەگرن. ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان ڕۆژی دوایی دێت هیچ گومانی نیە لە هاتنی دا. واتە هاتنەکەی شتێکی ڕاستەقینەو ڕاستە، جێگەی دوو دڵیو گومان نیە، چونکە خوا لەسەر زمانی هەروەها پێغەمبەران، هەواڵی داوەو بەڵێنی پێداوە بەڵام زۆربەی ئادەمی باوەڕیان پێی نیە چونکە ژیریان ناتەواوەو هەرچی هەستی پێنەکەن باوەڕیان پێی نیە لەبەرئەوە بە نەفامی دەم درێژیی ئەکەنو سەرشۆڕ ناکەن بۆ هەقو لەو ڕۆژەدا جیاوازی کۆمەڵی بڕوادارو خاوەن کردەوە چاکەکان لەگەڵ خراپەکاندا بە جوانی ڕوون ئەبێتەوە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە.

ڕوو کردنە خواو هاوارو لاڵە بۆ لاکردنی بە شێوەیەکی ڕاست دڵو دەروون پاك ئەکاتەوە لە سەرکەشی و هۆ بەزل زانی کە بنەڕەتە بۆ هەموو خراپەیەك لەبەرئەوە خوای گەورەو خاوەن بەزەیی قاپی ئاچوغ کردووە بۆ بەندەکانی بۆ ئەمەی ڕووی تێ بکەنو هاوارو لاڵەی بۆلا بکەن، بەڵێنی داوە بە وەرگرتنی پەرستنو لاڵەو نزا لەو کەسانەی کە بەڕاستی ڕووی تێئەکەنو لاڵەی لێ ئەکەن، هەڕەشە ئەکات لەوانەی کە سەرکەشی ئەکەنو سەرشۆڕ ناکەن بۆ ئەمەی بە زەلیلیو سەرشۆڕی ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخ، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾[1] خوا ئێوە ئەفەرموێ: داوام لێ بکەنو لاڵەم بۆلای بکەن، منیش بۆتان جێبەجێ ئەکەمو لێتان وەرئەگەرم، بەڵام داواو نزا چەند ئادابی هەیە پێویستە بەجێ‌ی بێنن:

١- ئیخلاصو ڕاستی دڵ.

٢- تەدبیرو ڕاوێژ بۆ خوا نەکرێ.

بەم جۆرە شێوەو بارێکی بۆ دیاریی بکرێ یان کاتو وەختێکی تایبەتی، بەڵکو ئەبێ ئەوپەڕی گەردن کەچیو ئەدەب بەکار بهێنرێ، بزانێ ئەم بەندەیە لەسەریەتی پەنا بباتو لاڵە بکات ئیتر ئەو خوایە خۆی ئەزانێ ئەیکاتو چۆنی ئەکات لەم بابەتەوە خاوەنی (حکم ابن عطاء الله سکندري) چەند شیرین ئەفەرموێ: (فهو ضمن الأجابة فيما يختاره لك لا فيما تختاره لنفسك وفي وقت يريده لا في وقت تريده).

٣- پەلە پەل نەکردن لە خوا. وەك فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (يستجاب لأحدكم مالم يستعجل. او ما لم يعجل)[2].

---

[1] خوا بووە بە زامن بۆ وەرگرتنی نزا لە شتێکدا کە خۆی بۆت هەڵبژێرێ، نەك لەوەی کە تۆ هەڵیبژێری بۆ خۆت، لەکاتێکدا وەری ئەگرێ کە خۆی بیەوێ، نەك لەکاتێکدا کە تۆ ئەتەوێ.

[2] نزا وەرئەگیرێ لە هەرکامتان ئەگەر پەلە پەل نەنێتەوە لە خوا (رياض الصالحين).

٤- باوەڕی وابێ کە هەر ڕوو کردنە خوا بۆ لاڵەو نزا خۆی لوتفێکی خوایە ئیتر وەرگرتنی شتێکی تری زیادەیە.

٥- ئومێدو باوەڕی بەهێز بێت بە وەرگرتنی.

لەگەڵ ئەمەدا چەند مەرجێك هەیە بێ ئەوانە وەرناگیرێ:

أ- خۆپاراستن لە حەرام خۆریو حەرام دڕین.

ب- بەجێ هێنانی فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە بە گوێرەی توانا.

ئەم مەرجانە زۆر بە گرنگی حەدیس باسیان ئەفەرموێ: ئەوانەی کە سەری بەندەیی بۆ خوای خۆیان شۆڕکەنو داواو نزای لێ ئەکەن ئاوا بەڵێنی پێداون. بەلآم ئەوانەی کەوا ناکەنو خۆیان بەزل ئەزانن دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ ئەوانەی کە سەرکەشی ئەکەن لە ڕووکردن لە منو نزاو لاڵە کردن لە من بە ڕیسواییو سەر شۆڕی ئەچنە ناو دۆزەخەوە.

لەپاش ئەمەی باسی ئەوانەی کرد کە خۆیان بە زل ئەزانن بەهۆی ئەوە سەر شۆڕ ناکەن بۆ بەندەیی خوای خۆیان. ئەمجارە ئەیخاتە پێش چاو هەندێ لەنازو نیعمەتەکانی خوا کە گەورەیی خوا دەرئەخاتو لەگەڵ ئەوەدا کە بەدنمەکن چاو لەبەر نین بەوەیشو هێشتا ڕوو ناکەنە خوای ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ﴾ خوا کە ناوی ﴿الله﴾یە کەسێکە کە شەوی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە بۆ ئەمەی ئارامی تێدا بگرن بەم جۆرە هەموو هێزو هەستو ئامێرەکان کە بە ڕۆژ وان لە کارکردندا پشوو بدەن لە شەوی تاریکی فێنکداو ڕۆژی فەراهەم هێناوە بە جۆرێك کە ڕووناکەو شتی تێدا ئەبینرێ: بێگومان ئارامی لە شەودا زۆر پێویستە کە ناچاریە بۆ هەموو زیندوویەك بۆ ئەمەی هەموو هێزو هەستەکان پشوو بدەنو ئیسراحەت بکەن، چونکە توانای ئیش کردنی هەموو کاتیان نیە، تەنها خەو چارەسەرنیە بەڵکو پێویستی هەیە بە تاریکی چونکە خانە زیندووەکانی بەرگەی ئەوە ناگرن هەموو کات ڕووناکی لێیان بداتو گۆڕانی شەوو ڕۆژ بەم جۆرە نیعمەتێکە چەند نیعمەتێکی تری لەناودایە. ئەگەر هەموو کات ڕۆژ بوایە یان هەموو کاتو شەو بوایە ژیان نەئەگونجا.

إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ
رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ
بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴿٦٣﴾

---

زۆربەی خەڵك بیر لەم نیعمەتە گەورە ناكاتەوە بەهۆی ئەوەوە شوكری خوای لەسەر ناكات وەكو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ بێگومان خوا خاوەنی لوتف و چاكەیە بەسەر ئادەمیزادەوە، بەڵام زۆربەی ئادەمی سوپاسی خوا ناكات لەسەر ئەو نیعمەتانە ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ ئا ئەوەی كە شەوو ڕۆژی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە ئەوە ﴿الله﴾یە، پەروەردگاری ئێوەیەو دروست كەری هەموو شتێكە. كەواتە هیچ پەرستراوێكی تر نیە بەڕاستی بێجگە لەو، هیچ كەسێكی تر شایانی ئەوەنیە، فەرمانداروهاوارو لاڵە بۆ لا كراو بێجگە لەو. هەركەس فامو تێگەیشتنی ببێ هیچ چاری نیە ئەبێ دان بنێ بە بوونی خوایەك كە ئەم هەموو شتەی دروست كردووەو پەروەردگاری هەموانە. چونكە ئەمانە بەم جۆرە كە هەن خۆیان دەسەڵاتیان نیە لە بوونی خۆیانداو لە خۆیانەوە بە ڕێكەوتو بێ هیچ، كەس نابێ، چونكە شتی ڕێكەوت ڕژێمی نیەو ڕژێمی ڕێكو ڕاستی بوونەوەریش زۆر ئاشكرایە، كەواتە ئەمە شتێكە خۆی فەرز ئەكات بەسەر ژیرییدا ئیتر ﴿فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ﴾ كەواتە ئایا چۆن ئێوە لادراون لە باوەڕ بەو خوایە بە تاكو تەنیاو لە پەرستنو گوێڕایەڵی بۆی كە بەڕاستی زۆر جێگای سەرسوڕمانە! بەڵام لەگەڵ ئەمەدا شتەكە ئاوا ئاشكرایەو بەڵگەو نیشانەی زۆر ڕۆشنی لەسەرە. كەچی لە هەموو چەرخو كاتێكدا تاقمو كۆمەڵێك هەن دان نانێن بەو هەموو بەڵگەو دەلیلە ڕوونانەدا بەهۆی ئەوە لائەدرێن لەپەرستنی خوای تاكو تەنها وەك ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ﴾ ئەوانەی كە دان نانێن بە بەڵگە ئاشكراكانی خوادا ئابەو جۆرە سەریان لێ ئەشێوێنرێو لائەدرێن لە ڕێگای ڕاست كە ڕێگای خواپەرستیە بە تاكو تەنیا.

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ
وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٦٤) هُوَ
ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٦٥)﴾

دوای نیشاندانی ئەو دوو نیعمەتو بەڵگە ئاشکرایانە کە فەراهەم هێنانی شەوو ڕۆژە ئەم جار هاتە سەر باسی پێك هێنانی زەوی‌و ئاسمان کە بەم جۆرە زەوی کردووە بە قەرارگاو ئاسمانی کردووە بە بان‌و خانوو بۆ ئادەمی، ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ ئەو خوایەی کە ناوی ﴿الله﴾یە کەسێکە کە زەوی بە قەرارگاو شوێنی ژیان‌و مانەوە بۆ ئێوەو ئاسمانی کردووە بە سەریان بەلای سەرتانەوە وەکو گومەز.

ئەم دوو شتەی بە جۆرێ فەراهەم هێناوە ئەبنە هۆی دامەزراندنی مانەوەی ژیانی ئادەمی وەکو لەمەو پاش هەندێکی لێ باس ئەکەین، ئەم جار چەند بەڵگەو نیعمەتی تر نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ شێوەو سورەتی کێشاون ئینجا سورەت‌و شێوەی زۆر جوان‌و شیرین کروون‌و دروستی کردوون لە تەواوترین‌و ڕێك ترین هەیئەت‌و قەدو قامەتداو ڕۆزی داون لەو هەموو خۆراك‌و خواردەمەنیە پاك‌و خاوێنە خۆشە ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾ ئا ئەوەی ئەو هەموو شتە گرنگانەی بۆ ئێوە فەراهەم هێناوەو ئەو هەموو نیعمەتەی داوە بە ئێوە ئەو کەسە خوایەکە کە ناوی ﴿الله﴾یە کە پەروەردگارتانە ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ کەواتە ئەو خوایە پاکەو بێگەردە لە هەموو لەکەیەك‌و لە هەموو شەریك‌و هاوبەشێك‌و پیت‌و فەڕو بەرەکەتی ئێجگار زۆرو فراوانە. ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانە ﴿هُوَ ٱلْحَىُّ﴾ تەنها ئەو خوایە زیندووی ڕاستەقینەیە، چونکە زیندووییەکەی لە زاتی خۆیەوە دێت‌و دەست کردو دروست کراو نیەو یەکەم جارو دواهاتنی نیەو گۆڕانی نیەو بە هۆی ئەوەوە هەر ئەو زیندووە، ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ کەس تر خوا نیە جگە لەوو سیفەتی سیفەتی خوایەتی هەر بۆ ئەوە. ﴿فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ کەواتە بیپەرستن بە جۆرێك ئاینێ گوێڕایەڵی پاك‌و خاوێنی بکەن لە هەموو هاوەڵ‌و هاوبەشێك‌و هەرشتێ ئەکەن تەنها لەبەر فەرمان‌و ڕەزامەندی ئەو

بیکەن، ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ هەموو سوپاس‌و سەنایەك بۆ خوایەك كە پەروەردگاری هەموو جیهانە.

خوای گەورە لەم (٤-٥) ئایەتەدا چەند شتێکی خستە پێش چاو: شەوو ڕۆژو زەوی‌و ئاسمان لەگەڵ سورەت کێشانی ئادەمی‌و ڕۆزی پێدانیان. ئەمانەی نیشان دا بە شێوەی چاکەو بەهرە بەسەر ئادەمیەوەو دووجار سەرنجی ڕاکێشا بۆ ئەمەی کە ئەمانە بکرێن بە نیشانە لەسەر تاك‌و تەنیایی خواو ببنە هۆی پەرستن‌و گوێڕایەڵی تەنیا بۆ ئەو.

بەڕاستی زۆر جێگای خۆیەتی بیر لێ کردنەوەی ئەمانە: بیر کردنەوە لە پەیوەندیان بە یەکەوە، سوودو نرخیان بۆ مرۆڤو ژیانی مرۆڤ، ئینجا ڕوون کردنەوەی بەڵگەییان لەسەر تاك‌و تەنیایی خواو خاوێن کردنی پەرستنەکەی لە هەموو هاوبەش‌و هاوەڵێك. هەر فامدارێك ورد ببێتەوە با بەشێوەیەکی سادەیش بێت دڵنیا ئەبێ کە ئەم بوونەوەرە بە جۆرێ داڕێژراوە ببێتە هۆی فەراهەم هێنان‌و مانەوەو پەرەسەندنی ژیان بە تایبەتی ژیانی مرۆڤ. هەموو شتەکانی پەیوەندییان هەیە پێکەوەو بێ هیچ کامیان کاروباری ژیان بێ‌بوونی ڕۆژ بەم ڕژێمە ڕێکەی کە لەسەریەتی، بێ‌دروست کردنی زەوی بەم جۆرە کە هەموو پێویستی مرۆڤی تێدا شاراوەتەوە لەگەڵ ئاسمان‌و ئەستێرەو مانگ‌و خۆرو هەواو ساردی‌و گەرمی‌و هەموو شتە ئاشکراکانی تر بێ‌یەکێ لەمانە وەبێ کۆبوونەوەو یارمەتی‌و کۆمەکی هەموو ژیان نابێ‌و نامێنێ. ئەم هەمووە ڕژێمێکی ڕێك‌و پێکی نەگۆڕاوی هەیە، کەواتە ئەبێ بە یەك دەسەڵات‌و زانین‌و خواهیشێکیش ئەم ڕژێمە بڕوا ئەگەر نائەشێوێ بە ملی یەکدا، کەواتە ئەبێ گوێڕایەڵی پاك‌و خاوێنی هەر بۆ ئەو تەنیایە بکرێ.

ئەنها بیر کردنەوە بەم شێوە سادە ئاشکرا بەسە بۆ هەموو خاوەن ژیری‌و فامدارێ. بەڵام لەبەرئەوەی ئایینی پاکی ئیسلام زۆر نرخ ئەدات بە بیر کردنەوە بە جۆرێك بە عیبادەتێکی گەورە سەیری ئەکات، لەبەرئەوە با قوڵ تر بیر بکەینەوەو بدوێین لەو شتانەی کە خوای گەورە خستوویەتیە پێش چاومان لێرەدا. با بیر بکەینەوەو بدوێین بە گوێرەی ئەو شتە نهێنیانەی کە لە ڕێگەی زانیاریەوە دەرکەوتوون. ئەگەر خولانەوەکەی لەسەر یەك بار بوایە بە ڕێکی چوار وەرزە نەئەبوو[1]. ئەگەر لە گەردش‌و خولانەوەدا چەسپان تر بوایە لەوەی ئێستەی خانووەکان ئەڕووخان‌و زەوی خۆشی پارە پارە ئەبوو پرژو بڵاو ئەبووەوە لە

---

[1] کتێبی (مع الله في سماء) د. أحمد زکی.

بۆشایی فەزادا. ئەگەر سست تر بوایە لەوەی ئێستا ئادەمی لە سەرماو گەرمادا ئەمردن، بەڵام بەم جۆرە ئێستای ئەگونجێ لەگەڵ ژیان‌و خاوەنی ژیان چ گیانلەبەرو چ گژو گیاو دارو درەخت. ئەگەر زەوی بە دەوری خۆی دا نەخولایەتەوە هەموو دەریاکان خاڵی ئەبوون لە ئاوو ئاویان تێدا نەئەما. ئەگەر پێستی زەوی لەمەی ئێستا قەڵەوتر بوایە بە چەند پێ‌یەك دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ئۆکسجینی هەڵئەمژی ئەو کاتە ژیان بۆ گیاو دارو درەخت نەئەبوو. ئەگەر هەوا زۆر بەرزتر بوایە لەو ڕادەی ئێستای ئەو کاتە ئەو هەموو چەخماخە کە بە ملیۆنەها ئەسوتێن لە هەوای خارجی دا هەموو ئەیاندا لە زەوی ئەو کاتە هەرچی هەڵئەگرێ بۆ سوتان گڕی ئەگرت‌و دائەگیرساو گوزەران نەئەکرا. ئەگەر ڕادەی ئۆکسجین لە هەوادا ٥٠٪ یان زیاتر بوایە لە باتی ٢١٪ ئەو کاتە هەرچی قابیلی سووتان بوایە ئامادە ئەبوو بۆ داگیرسان بە جۆرێ لەوانە ئەبوو بزیسکەیەك کە بیدایە لە درەختی لەناو دارستانێکدا هەموو دارستانەکە ئاگری ئەگرت، ئەگەر ڕادەی ٢١٪ بهاتایە ١٠٪ یان کەم تر ئەو کاتە هەرچەند لەوانە بوو دەقی پێوە بگیرایە بەهۆی ئەوەوە ژیان ئەبوو، بەڵام زۆر لەو شتانەی کە پێویستی شارستانیەتی وەکو ئاگر زۆر کەم دەست ئەکەوت.[1] هەروەها بە هەزارەها شتی ڕێك‌و ڕاست هەیە لە داڕشتنی ئەم بوونەوەرەدا بەهۆی ڕێك‌و پێکی یارمەتی هەموو کاروباری بوونەوەر ئەدا یەکێ لەوانە بگۆڕێ بە بارێکی تردا ژیان بە ڕێك‌و ڕاستی ناڕوا.ئینجا با بێینە سەر باسی سورەت کێشانی مرۆڤ بە جوانترین سورەت‌و شێوەو هەندێ باسی کرداری بێ‌وێنەی خوا بکەین لە ئادەمیدا، ئەگەر هەر بەم شێوە سادەش ورد بینەوە لە دیمەنی ئادەمی، ئەمە شکڵ‌و شێوە جیاوازەی لەناو هەموو گیان لەبەراندا. ئەم قەدو قامەتە ڕێك‌و پێکەی. ئەم تێرو تەواوی ئەندام‌و ئامێرانەی بۆ بەجێ هێنانی خۆیان بە وردی‌و ئاسانی. ئەم هەموو هەست‌و تواناو کردارو بەرهەمە شیرینانەی هەر ئاوا کە نەیەوێ لارە جڵەوی بکات‌و لاڕێ بگرێ. ئەمە چ جای بە وردی وردبببینەوە، بەڵکو ئەگەر بمانەوێ بە وردی بیربکەینەوە لە فەراهەم هێنانی، ڕێکی ئەندامەکانی لەگەڵ کاروفرمانی تایبەتیاندا، ئەگەر بەم جۆرەبمانەوێ ئەبێ بەسەرسامیەوەبوەستین لەبەردەمی هەموو پارچەو ئەندامێکی بچووکدا چ جای گەورە بەڵکو لەبەردەمی خانەیەکدا لە لەشی ئەم دروست کراوەدا.

---

[1] کتێبی (العلم یدعو للإیمان) کریسی موریسون.

﴿ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا۟ شُيُوخًا ۚ

---

هەرشتێ بگرێ با لە نایابیدا گەیشتبێتە ئەوپەڕی پلە هەرکات ئولفەتو دەقی پێوە گیرا سەرلێ سوڕمانی نامێنێ مەگەر بە تایبەتی بیری لێ بکەیتەوە لەبەرئەوە قورئان هەر ناو ئەم شتە نایابانە ئەخاتەوە پێش چاو، سەرنج ڕانەکێشێ بۆ وریا بوونەوە.

دوای پیشان دانی ئەم هەموو بەهرەو بەخشایشە نایابانە کە دڵو دەروونو هەموو هەست پڕ ئەکەن لە باوەڕ بە تاکو تەنیایی خوای گەورە. لەم کاتەدا تەمێی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکات کە ڕایگەیەنێ بە بێبڕواکان کە لە لایەن خواوە بەرگری کراوە لە پەرستنی ئەو شتانەی کە ئەوان ئەیانپەرستن جگە لە خوا، فەرمانم پیا دراوە بە گەردن کەچی بۆ خوایە کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بت پەرستانە: من بێگومان بەرگری کراومو قەدەغە کراوە لێم کە بپەرستم ئەوانەی جگە لە خوا ئێوە ئەیپەرستن کاتێ ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانەم بۆ هات لەسەر تەنیایی خوا لەلایەن پەروەردگارمەوە و فەرمانم پێدراوە بەمەی گەردن کەچ بمو گوێڕایەڵ بم بۆ خوایەك کە ناوی ﴿الله﴾یە، پەروەردگاری هەموو جیهانە.

ئینجا بەڵگەیەکی ئاشکرای تر ئەخاتە پێش چاو کە بریتیە لە ژیانی ئادەمیو ئەو قۆناغانەی کە بڕیویەتیو ئەیبڕێ، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا۟ شُيُوخًا﴾ خوا کەسێکە کە ئێوەی دروست کردووە لە خاك لە پاش ئەوە دروستی کردبوون لە دڵۆپە ئاوێك لەو ئاوەی باوكو دایك. ئینجا ئەو ئاوەی لە منداڵدان کردووە بە خوێنێکی پتر وەکو جگەر، لەپاش ئەوە بە لوتفی لەسکی دایك دەرتان ئەهێنێ لەپاش ئەوە هەندێکتان ئەمێڵێتەوە بۆ ئەمەی بگەن بە ژیریو هێزی تێروتەواوتان، دوای ئەوە بمێننەوە تا ئەگەنە پیری.

وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ ۖ وَلِتَبْلُغُوٓا۟ أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾

---

﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ﴾ هەندێکتان ئەمرێنرێن پێش ئەوە ئەم هەموو قۆناغانە ببڕن یان هەندێکتان ﴿وَلِتَبْلُغُوٓا۟ أَجَلًا مُّسَمًّى﴾ بەم جۆرەی کرد بۆ ئەمەی هەرکامتان بکەن بە ئەجەلو ماوەی دیاریی کراو بۆ ژیانتان کە نەلێی پێش ئەکەون‌و نە لێی دوا ئەکەون... ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بۆ ئەمەی ژیریی‌و فامتان ببێ، بیر بکەنەوە لەم هەموو دەلیل‌و بەڵگە ڕوونانە تا بۆتان دەرکەوێ کەسێ کە ئادەمی لە خاکەوە بێنێ بەم هەموو قۆناغانەدا تا بیکات بەم ئادەمیە ڕێک‌و پێکە کە هەموو ژیریی لە پێك هاتنی هەموو ئەندامێکدا سەرگەردانە، ئەو کەسەی کە ئەمانە ئەکات زۆر ئاسانە بۆی کەلە پاش مردن‌و بوونیان بە خاك هەمیتر لەو خاکە دروستیان بکاتەوە وەکو یەکەم جار.

دوای ئەم هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ﴾ خوا کەسێکە کە زیندوو ئەکاتەوەو ئەمرێنێ بە شێوەیەکی گشتی. زیندوو کردنەوەو مراندن کە نیشان ئەدات، نەك تەنیا بۆ ئادەمی یان هەموو گیانلەبەرێك، بەڵکو هەموو گیانلەبەری تریش ئەگرێتەوە وەکو دارو درەخت‌و ئەو ناوکەو سەوزەیە، بەڕاستی مردن‌و ژیان‌و زیندوو کردنەوەو مراندن بە شێوەیەکی گشتی زۆر جێگەی سەرسوڕمانەو زۆر بەهێزو بەتین ئەدا لە دڵ، لەبەرئەوە قورئان ئەو هەموو جارە باسی ئەفەرموێ، ئینجا نیشان ئەدات نەك تەنها زیندوو کردەنەوەو مراندن، بەڵکو هەموو شتێك بۆ خوا هیچی تێناچێت هەر ئەوەی ئەوێ ویست‌و خواهیش ڕووی تێبکات، ئیتر هیچی تری ناوێ. ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ ئینجا کاتێ خوا بڕیاری هەر شتێکی دا هەر ئەوەی ئەوێ کە بفەرموێ: ببە ئیتر بێ تەفرەو دواکەوتن ئەو شتە ئەبێ.

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَٰبِ وَبِمَآ
أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ﴿٧١﴾

دوای ئەمە فەراهەم هێنانی ئادەمی بەو جۆرە نیشان دا کە زۆر ڕوون و ئاشکرایە دەستی قودرەتی خوا ئەو هەموو قۆناغەی پێ ئەبڕێ و پێی ئەگەیەنێ تا ئەیکات بەو گیانلەبەرە نایابە کە جڵەوی ژیان ئەگرێتە دەست، دوای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانە ئیتر دەمبازێ و دەمە قاڵێی بێبڕواکان زۆر جێگای سەرسوڕمانەو باوەڕ نەهێنان بە قورئان باوەڕ نەهێنانە بەو هەموو پەڕاوو ئایینە پاکانەی کە ئەو پێغەمبەرانە هێنایان بە شێوەیەکی گشتی. لەبەرئەوە بە سەرسوڕهێنەریەوە باسی دەمبازێ و بێبڕوایی بێ باوەڕەکان ئەکات بەو هەموو ئایەت و ئایینەکانەوەو هەڕەشەیەکی زۆر سامناکیان لێ ئەکات لە شێوەیەك لە شێوە ناهەموارەکانی ڕۆژی دواییدا ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ﴾ ئایا تەماشای کەسانێکت نەکرد کە دەمبازێ و موجادەلە ئەکەن لە ئایەت و بەڵگەو نیشانەکانی خوادا؟ ئایا سەرت سوڕنامێنێ لێیان کەوا چۆن ژیریی و فامیان ترازێنراوە لە ڕێگەی ڕاستەوە بۆ ڕێگەی لارو چەوت؟ ئایا چۆن لادراون لە بینینی ئەم بەڵگەو ڕابەرانە؟

﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ ﴾ ئەوانەی کە ئەم دەمبازیە ئەکەن کەسانێکن کە باوەڕیان نیە بەم پەڕاوەی کە قورئانەو بە هەموو ئەو ئایین و پەیامەی کە پێغەمبەرەکانمان پێی ڕەوانە کردووە، واتە ئەمەی ئەم بێبڕوانە زۆر جێگای بێزاری و سەرسوڕمانە، چونکە زۆر بێجێیە.

ئەمانە هەرچەند بە دیمەن بێباوەڕیەکەیان دەربارەی تەنها پەڕاوو پێغەمبەرێکە کە قورئان و حەزرەتی محمدە (ﷺ) بەڵام لە ڕاستی دا بێبڕواییەکەیان ڕوو ئەکاتە هەموو نامەو پێغەمبەرەکانی تریش، چونکە ئەم پێغەمبەرە، نوێنەری هەموو پێغەمبەرەکانی ترە، قورئان پاڵفتەی هەموو نامەکانی پێشووە، بەهۆی ئەوەوە ئەم هەڕەشە سامناکە ئەکات، ﴿فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ لەمەو پاش ئەزانن تۆڵەی ئەم بێباوەڕی و دەمبازیەیان. ﴿ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ﴾ ئەو کاتەی کە کۆت و زنجیر وا لە مل و قاچ و دەستیاندا لەکاتێکدا کە بەسەرو ڕوودا ڕائەکێشرێن

فِي ٱلۡحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ
ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم
بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَمۡرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ
خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾

---

﴿فِي ٱلۡحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ﴾ لەناو ئاوێكدا كە گەیشتووەتە ئەوپەڕی گەرمی. ئینجا لەناو ئاگردا ڕائەكێشرێن و پێ و ئاو دەدرێن، واتە پەنا بە خوا دوای ئەمە بەو شێوە ڕیسوایی و بێئابڕووییە بەڕوودا ڕائەكێشرێن ئینجا ئەبەسترێنەوەو حەبس ئەكرێن هەندێ جار لەناو ئەو ئاوەدا هەندێ جاری تر لەناو ئەو ئاگرە سەختەدا پێی ئەسوتێنرێن و ئەو ئاگرەیان پێ تاو ئەدرێ. واتە بە چەند جۆر عەزاب ئەدرێن، ئینجا لەناو ئەو عەزابە سەختەدا ئێجگار باریان گرانتر ئەكرێ بە تانەو تەشەر پێدان و ڕەزیل كردن و تەنگەتاو كردن وەكو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ﴾ سەرباقی ئەوهەموو سزا سەختە كەوان تێیدا بە تەسەرەوە پێیان ئەگوترێ: ئایا لە كوێن ئەوانەی كەلە دنیادا ئەتانكردن بە شەریكی خواو چاوەڕوانی تكاو نزاتان لێ ئەكردن و بە گوێی پێغەمبەرەكانتان نەئەكرد؟ ئەوانیش بە داخ و حەسرەتەوە وەڵامیان ئەدەنەوە ﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا﴾ ئەڵێن ون بوون لێمان ئاگامان لە یەكتر نیە. ﴿بَل لَّمۡ نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗا﴾ بەڵكو دەركەوت لەمەوپێش نزاو هاوارمان لەشتی پڕوپووچ و شتی بەتاڵ و بێ ئەساس كردووە. ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ ئابەو شێوەیە خوا بێباوەڕان گومڕا ئەكات. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي

ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ * ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئـەو سـزاو عەزابەتان بەهۆی ئەوەوەیە کە لە دنیادا کەشخەتان ئەکردو خۆتـان بە زل دائەنا لە زەوی دا بە ناهەق و خۆتان بە زلتر ئەزانی لەوەی گەردن کەچ بن بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەران، زۆر بە کەیف و ئاهەنگ بوون بەو ناهەقیەی کەلەسەری بوون: بڕۆنە ناو دۆزەخەوە بێبڕانەوە لەو قاپیانەی کە بۆتـان دیاریی کراوە وەکو ئەفەرموێ لە سورەتی ﴿الحجر﴾دا: ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ﴾[1] کەواتـە زۆر خراپـە جێگـاو مـاوای ئەوانەی کـە لـە ئاستی هـەق تەکەبوریان بووەو دانیـان پیـادا نەئەنا. خـوا پـەنا بدات وا دەرئەکەوێ ئـەم هـەموو کۆت و زنجیرو بەڕوودا ڕاکێشان و بەستنەوەو بەند کردن لەناو ئـاوو ئاگردا ــ کە گوترا ــ هـەموو ئەوانە پێشەکی ئـەبن بۆ چوونی نـاو دۆزەخ وەکو لـە سورەتی ﴿الصافات﴾دا باس کرا کە زەقومیـان دەرخـوارد ئـەدرێ و لـەو ئـاوە گەرمـەی کە تێکـەڵی کێم و زوخـی ئـەبێ ئەیکـەن بـە سەری دا، ئینجا ئەبرێن بۆ مەڵبەندی خۆیـان لە دۆزەخدا. لـەم کاتـەدا کە شێوەی زەلیلی و ڕیسوایی و سزای سەختی نەبڕاوەی تاوانبارەکان نیشان ئەدات، ئەوانە کە بە ناهـەق خۆیـان بەزل ئەزانی و دەمبازی و موجادەلەیان ئەکرد لە ئایەتەکانی خوادا.

[1] بۆ دۆزەخ حەوت قاپی هەیە، بۆ هەر قاپیەك بەش و کۆمەڵێکی دابەش کراوی دیاریی کراو هەیە.

فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ (٧٧)
وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا
كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ

---

لەم کاتەدا تەمێی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکاتو وەسێتی بۆ ئەکات بە سەبر کردن لەسەر خۆ بە زل زانیو دەمبازی ئەو بێبڕوانە دڵنیایی بە بەڵێنی خوا. ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ مادام پاشەڕۆژی ئەو بێبڕوایانە ئەوەیە، کەواتە سەبر بکە چونکە بێگومان بەڵێنی خوا بە تۆ هەقو ڕاستەو دێتەجێو ئەو هەڕەشەی کە کردوویەتی لەوانە ئەیهێنێتە دی. جا ئیتر ئەگەر هەندێ لەو هەڕەشەیانەی کە کردوومانە لێیان هێنامانە جێ لەکاتی ژیانی تۆداو پیشانمان دای تا بە چاوی خۆت ببینی، یا ئەگەر مراندمانیتو پیشانمان نەدایت هەرجۆر بێ ئەوانە ڕزگار نابن چونکە هەر بۆ لای ئێمە ئەگەڕێنرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا.

خوای گەورە هەندێ لەو هەڕەشەیانەی هێنایە دی تا پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بە چاوی خۆی بینی وەك کوشتنو بە دیل گرتنی زۆربەی ئەو سەرکەشە بێبڕواو ستەم کارانە لە ڕۆژی بەدردا تاوای لێ هات ئەوەندەی پێنەچوو بە تەواوی هەموو گەردن کەچ بوون بۆ حوکمی خوا لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا. لەگەڵ ئەوەدا بە سافی ئەو بەڵێنەی پێنەدا، بەڵکو لە ئەگەرو نەگەردا هێشتیەوە بەو جۆرەی کە ئایەتەکە نیشانی دا. ئەوەیش حیکمەتێكو مەبەستێکی گرنگی تێدایە: ئەوە تەمێو فێرکردنی پێغەمبەری (ﷺ) تێدایە بەمە کە لە گەیاندنی فەرمانەکەی دا هیچ مەبەستو ئارەزوویەکی خۆی نیە، جگە لە بەجێهێنانی فەرمانی خواو ڕەزامەندی خواو هەموو شتێ لە دڵ دەرکات تەنانەت دڵی نەبەستێ بە ئارەزووی بینینی تۆڵەسەندنی خوا لە دوژمنەکانی ئایینەکەی کە ئەوەیش زۆر زۆر سەختو گرانە لەسەر دڵ، خوای گەورە بەم جۆرە تەمێی کردو تێی گەیاند تا دڵی بە تەواوی ڕووت

بێ لە هەموو شتێك جگە لە خواو پاك‌و خاوێن بێ لە هەموو شتێکی تر با ئەو شتەش بریتی بێت لە زاڵبوون‌و سەرکەوتنی ئایینی خواو تۆڵە سەندن لە دوژمن‌و ڕێگرەکانی ئایینی خوا. ئا ئەوەیە ئەدەبی ڕاستەقینە لە خوا. ئا ئەوەیە ڕووت کردنی دڵ لە هەموو شتێ جگە بە خوا. ئا ئەوەیە پەرستنی خوا بە تاك‌و تەنیا.

خواپێداوەکانی ئەم ئوممەتە هەنگاو بە ڕێبازی پێغەمبەرەکەیاندا ڕۆیشتن‌و ڕێگاکەی ئەویان دایە بەر، دڵ‌و دەروونی خۆیان پاك‌و خاوێن کرد تەنیا بۆ خوا بەهۆی ئەوەوە خواش پارمەتی دان‌و سەری خستن‌و گەیشتن بە پلەی بەرزی ڕەزامەندی خوا. هەرکەس بیەوێ بەشداری ئەوانە بکات لە گەیاندنی ئایینەکەی خواو بانگی خەڵکی بکات بۆ سایەی ئەبێ وەکو ئەوان ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) بگرێت، جگە لەوە چارەو ڕێگەی تۆ نیە، چونکە تەنها ئەوە ڕێگەی خوایەو جگە لە ڕێگەی ڕاستی خوا ڕێگەی ڕاستی تر نیە.

ئینجا هەندێکی تر تەمێ‌ی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکات‌و دڵنەوایشی ئەکات بەمەی کە ئەم فەرمانە تەنها بەو نەسپێرراوە، بەڵکو لە پێش ئەو چەندەها پێغەمبەرانی تر ڕەوانە کراون‌و بەسەرهاتی هەندێکیانی بۆ باس کردووەو هەموو دووچاری سزاو زەحمەت بوون لەلایەن بێبڕواکانەوە، هەرچەند ئەو پێغەمبەرانە ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ هەموویان موعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرێتیان بە دەستەوە بووە، بەڵام بێبڕواکان لەبەر لاری خۆیان گوێیان نەداوە بەو موعجیزەو دەلیلی تر کە خۆیان هەڵیان ئەبژاردوو داوایان ئەکرد، ئەو پێغەمبەرانەش ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ ئاواتیان ئەخواست کە خوا کارێکی وایان بۆ بکات دەلیل‌و نیشانەیەکی وایان بداتێ پەکی بێبڕواکان بخات‌و هیچ ڕێگەی تەك‌و جمیان نەمێڵێ. بەڵام خوا ئەوەی نەکردووە، چونکە هەموو شتێ شوێن‌و کاتی خۆی هەیە بە لای خواوەو خۆی ئەزانێ چی مەسلحەتەو ئەو پێغەمبەرانە سەبریان کرد تا کاتێ سزای خوا هات ئەو کاتە چاکان ڕزگار بوون‌و ناپاکان بەرباد بوون. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّن لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَۗ﴾ بەڕاستی پێغەمبەرانم لە پێش تۆوە ڕەوانە کردووە بازێ لەو پێغەمبەرانەمان بۆ باس کردوویت لەمەو پێش‌و بازێکمان بۆ باس

نەکردوویت، واتە ئەم کارەی بۆ تۆ سپێراوە یەکەم جار نیە، بەڵکو لە پێش تۆوە چەند پێغەمبەری تر ڕەوانە کراون کە سەرگوزەشتەی هەندێکیانمان بۆ باس کردوویتو لە باسی بەسەرهاتی ئەوانەوە دەرەوتووە کە ڕێگەیان گەیاندنی فەرمانی خوا بووە، ئیتر خۆگرتن تا خوا بڕیاری خۆی جێبەجێکردووە ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ هیچ پێغەمبەرێك ڕێگەی نەبووەو نەیتوانیوە هیچ موعجیزەو نیشانەیەك بێنێ بۆ قەومەکەی بە ئیزنو ڕازی خوا نەبێ، چونکە موعجیزە وەکو هەموو شتێ تر تەنها بە دەست خوایە، بەخششێکە لەلایەن خواوە بە گوێرەی زانینو حیکمەتی خۆی، هەر پێغەمبەرێ جۆرە موعجیزەیەکی داوەتێ بەبێ دەسەڵاتو هەڵبژاردنی نە پێغەمبەرەکەو نە کەسی تر.

دڵو دەروونی ئادەمی با پێغەمبەریش بێ، هەموو کات بە سروشت ئاواتە خوازەو ئارەزووی وایە ئەو ڕێگەو ئایینەی کە لەسەریەتی زاڵ ببێو ئەوانەی کە چەلان بەرچەلانی وەستاونو پەکیان بکەوێتو گەردن کەچ بن، بەهۆی ئەوەوە ئارەزوو کراوە کە خوای گەورە کارێکی وابکات بەڵگەونیشانەیەکی واناشکرادەرخات کەماوەنەمێنێ بۆ کەس بەربەرەکانێی بکات یان پەلپی تر بگرێت. بەڵام خوای گەورە بەو جۆرەی نەکرد، بەڵکو ویستی کە بەندە تایبەتیەکانی ڕێگەی ئارامو خۆگری ڕووت بگرن، توێشووی ئەو ڕێگە سەختە درێژەیان هەر ئەوە ئەبێ، ئیشو کاریان تەنها گەیاندنی فەرمانی خوابێت، ئیتر لێ گەڕێن بۆ خواو بیدەنە دەست خوا. هەروەها خوای گەورە ویستی کە ئادەمی تێبگەن لە ڕادەی پێغەمبەرێتی، نزیکی نەکەنەوە لە سنووری خوایەتی، تێبگەن کە پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ بەندەی خوان، خوا بە لوتفو میهرەبانی خۆی جوێی کردوونەتەوەو هەڵی بژاردوون لەناو بەندەکانیداو فەرمانی بۆ دیاریی کردوون، ناتوانن لەوەی خوا بۆی دیاریی کردوون لابدەنو لێی تێپەڕن، هەوڵیان نەداوە کە لەوە تێپەڕنو لابدەن، هەروەها با نەزان بزانێو تێ بگات کە تەفرەدانو دواخستن یان جێبەجێ نەکردنی ئەو موعجیزانەی کە داوایان ئەکرد لە پێغەمبەرەکان میهرەبانیەکی زیادە بوو، چونکە مۆڵەتی تیدابوو ئەوەیش میهرەبانیەکە بە تایبەتی بۆ ئەم ئوممەتە کە خوا ویستی تا جیهان هەیە بمێنێتەوە،

فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِىَ بِٱلْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾

---

چونكه ﴿فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِىَ بِٱلْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ كاتێ كه سزای خوا هات بەهۆی بڕوا نەهێنانەوە بڕیاری ڕاستی و تەواوی دەرئەكرێ و كار لە كارەگا ئەترازێنرێ ئیتر مۆڵەت نامێنێ بۆ گەڕانەوە. بەڵكو ئەوەی لەسەر ڕێگای ڕاستە ڕزگار ئەكرێ و سزای ئەهلی بەتاڵیش ئەدرێ و لەو كاتەدا ئەوانەی كە سەركێشیان بەكارهێناوە و پەلپی موعجیزەی تایبەتی ئەگرن، ئەوانە هەموو تیا ئەچن و زیانبار ئەبن. كەواتە ئەو تەفرەدان و جێبەجێ نەكردنە كە باس كرا هەڵێ بوو خوای گەورە فەراهەمی هێنا بۆ گەڕانەوەی ئەو یاخییانە یان ڕۆڵەو نەوەیان، واتە ئەگەر ئەو پەلپ و بیانووەی كە گرتیان جێبەجێ بكرایە هەر بڕوایان نەئەهێنا بەوێنەی گەلە بێبڕواكانی تر، ئەو كاتە ئەبوایە ئەمانیش وەكو ئەوان لە ڕیشە بهێنرانایە وەكو لە چەند ئایەتێكی تریش دا دەست نیشان ئەكات بۆئەوە، یەكێ لەو ئایەتانە لە سورەتی ﴿الإسراء﴾دایە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾[1] ئەو موعجیزانەی كە بێبڕواكانی ئەم ئوممەتە داوایان ئەكرد لە پێغەمبەر (ﷺ) قورئان لە چەند شوێنێكدا باسی ئەكات، ڕوونترینی ئەو شوێنانە ئەمەیە كەلە سورەتی ﴿الإسراء﴾دا ئەفـــــەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ

---

[1] هیچ شتێ بەرگری ئێمەی نەكرد لە بەجێ نەهێنانی ئەو موعجیزانەی كە بێبڕواكان داوایان ئەكرد مەگەر ئەوە كە وێنەكەمان فەراهەم هێنا بۆ بێبڕواكانی گەلە پێشووەكان، كەچی دوای ئەوە هەر بڕوایان نەهێنا بەهۆی ئەوەوە ئێمەش ئەوانمان لەناو برد، واتە ئەزانین ئەمانیش هەر بڕوایان نەئەهێنا، ئەو كاتە بە گوێرەی یاسای خۆمان ئەمانیشمان لەناو ئەبرد، بەڵام ویستمان وانەبوو ئەوەیان بەسەر بێت، كەواتە نابێ پەلپەكەیان بەجێبێنین.

وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَـٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ﴾[1].

ئینجا سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوونانە کە وان بە پێش چاومانەوە، بەڵام بەهۆی دەق پێوە گرتنەوە بوون بە شتێکی عادەتی، هیچ سەرسوڕمانێ لێیان لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جیاوازیەکیان نیە لە داوا کراوەکانی ئەوان، ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَـٰمَ﴾ خوا کەسێکە کە ئەم ماڵاتو حوشترو ڕەشە بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە ﴿لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا﴾ بۆئەمەی سواری بکەن بە هەندێکیان ﴿مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ هەندێکیشیان بخۆن ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ﴾ بۆ ئێوە هەیە تیایاندا چەند سوودو کەڵکو بەرژەوەندیو دەست کەوت وەك ڕۆنو شیرو ماستو هەموو خوراوەکانی تریشو پێستو موو بەرگنو کورک کە ئەمانە باشترین خۆراكو پۆشاكو فەرشو پێخەفیان لێ فەراهەم دێت. ﴿وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ﴾ ئەو وڵاخو ماڵاتەی دروست کردووە بۆئەمەی بەسەر پشتی ئەو وڵاخە سواریانەوە بگەن بە پێویستیەك کەلە دڵی خۆتاندا هەیە، واتە هەر پێویستیەکتان هەیە کە بە پیادە چنگتان ناکەوێ بەهۆی سەرپشتی ئەو وڵاخانەوە دەستی بخەن، لەو کاتەدا پێویستی زۆری گرنگ هەبووە چنگ نەئەکەوت بە سواری ئەو وڵاخانە نەبێ، هەروەها ئێستایش کە هۆی هاتوچۆو گواستنەوە زۆر زۆرە هەر پێویستی هەیە بەو وڵاخی باریو سواریانە لە ڕێگای تەنگو کەژو کۆسارەکان ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾ لەسەر پشتی ئەو وڵاخانەو لەناو کەشتیدا ئێوە هەڵئەگیرێنو هاتوچۆتان پێئەکرێ.

---

[1] بێبڕواکان وتیان بە پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز بڕوات پێناهێنین تا کانیو چەشمەیەکمان لەم زەویە بۆ هەڵنەقوڵێنی یان باغێکت ببێ لە خورماو ترێو مێو، ئینجا جۆگەو ڕووباری زۆر هەڵقوڵێ لەناوی دا، یا تا خواو مەلائیکە نەهێنی ببنە شایەت بۆت کە ڕاست ئەکەی، یان خانوویەکی لە ئاڵتوونت نەبێ، یان تا بەرز نەبیتەوە بەرەو ئاسمان. ئێمە هەرگیز بڕوا ناهێنین بە گەیشتنو بەرزبوونەوەکەت هەتا نامەو نووسراوێکمان بەسەرا نەهێنیتە خوار کە خۆمان بیخوێنینەوە، واتە نامەیەك لەلایەن خواوە بێت پشتگیری ڕاستی چوونەکەت بکات.

وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ
عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم
مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ
بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾

---

دروست كردنی ئەم ماڵاتو حەیوانانە هەر جۆرێكیان بە شێوەو شكڵو ژێر بار كردنیان بۆ ئادەمی بە ئارەزووی خۆیان بەكاریان بێنن لە ئیشو كارو پێویستی خۆیان لەگەڵ ئەم هەموو سودو كەڵك لێ وەرگرتنەدا لە خۆراكو پۆشاكو كەرەسەی ماڵو دروست كردنیانو گێڕانیان بە سەرچاوەی ئەم هەموو خێرو بەرەكەتە گەورەترین موعجیزەیەو بەڵگەیەكی ڕوونە لەسەر بێسنووری دەسەڵاتو زانینو كاردروستی خوای گەورە. هەروەها فەراهەم هێنانی كەشتی بەجۆرێ كە بگەڕێ بەسەر ئاوا بەبا یان بوخار یان بە ئەتۆم یان بە هەر شتێكی تۆ بێ لە هێزو وزەكانی تر كە خوا دروستی كردوون لەم بوونەوەرەدا لە پێك هێنانی ئەم هەموو شتانە كە بوونەتە هۆی ئەم كارە گرنگە كە ژیان لەسەری ڕاوەستاوە. ئەمانەو وێنەی ئەمانە هەموو بەڵگەو ڕابەری ڕوونن خوا نیشانی داوین وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ خوا بەڵگەو نیشانە ئاشكراكانی خۆیتان نیشان ئەدات، ئایا ئینكاری كام لەو بەڵگەو نیشانانەی خوا ئەكەن؟ واتە شتەكان زۆر ڕوونو ئاشكران، كەواتە زۆر بێجێیە ئینكار كردنو باوەڕ پێنەهێنانیان. بەڵێ زۆر بووەو زۆر هەیە كە ئینكار ئەكاتو دان نانێ بەم شتە ڕوونانەدا لەبەر ئەمە زۆردارێكی داگیر كەرە مەترسی هەیە لە نەمانی زۆرو دەسەڵاتەكەی، چونكە ئەزانێ كە هەقە هات ئەدا لەو هەموو پڕوپووچەی كە بنەڕەتە بۆ دەسەڵاتو زۆرەكەی یان لەبەر ئەمەیە مەزهەبو ئایینێكی داهێناوە ناگونجێ لەگەڵ بیرو باوەڕو بەرنامەی خوادا ئەزانێ كە ئەم هات ئەبێ تەشریفی ئەو بڕوات، كەواتە بە هەموو جۆر هەوڵ ئەداتو دەمبازی ئەكات بۆ پاراستنی عەقیدەو مەزهەبەكەی خۆی، یان هۆی ئینكارییەكەی ئەوەیە ئەوانەی كە بەناو هەڵگری ئاڵای ئایین لایان داوە لە بەرنامەی خواو شتی پڕپووچی زۆریان تێكەڵ كردووەو كاری ناڕەواو ناجۆری زۆریان هەیە، لە داخی ئەوانە خەڵكی یاخی ئەبن لە هەموو ئایینو عەقیدەی ئاسمانی، وەكو كاتی خۆی لە ئەوروپا

ڕووی دا له چەرخەکانی ناوەڕاستدا، هەروەها لەناو جیهانی ئیسلامیشدا دوورکەتنەوە لە قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆی ئەوەوە حەقیقەتی ئاین و بەرنامە بێوێنەکەی خوا شاراوەو نەناسراو بوو، لە شوێنی ئەوە شتی پڕوپووچی زۆرو زەبەندە بڵاو بووەوە کە هەروا بە ئاسانی نایەتە ژمارەو باسەکەی کۆتایی نایەت، بەهۆی ئەوەوە نەفام و نەزان پشتیان کردە ئایینە بەرزەکەیان، چونکە لایان وابوو بەرزی ئیسلام بریتیە لەو پڕوپووچەی کە بڵاو بوونەتەوەو بیستوویانە، ئەگەر ڕاستی ئیسلام ڕوون بوایەتەوە مەبدەئەکانی بەو جۆرە نەئەشارایەوە ئایا چ عەقیدەو مەزهەبێ ڕووی هەیە خۆی دەرخات لە ئاستی عەقیدەو مەبدەئەکانی ئایینی ئیسلام؟!

ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە ترساندنی بێبڕواکان بە پاشەڕۆژی سەخت و تۆڵەو سزای وێنەی ئەمان بەوێنەی گەل و ئوممەتە پێشووەکان، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ﴾ ئایا ئەم بێبڕوایانە نەگەڕاون بە زەوی دا تا تەماشا بکەن و ببینن کە ئایا چۆن بۆ پاشەڕۆژو تۆڵەی ئەوانەی کەلە پێش ئەمانەوە بوون، لە بێبڕواکانی گەلە پێشووەکان ﴿كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِنۡهُمۡ وَأَشَدَّ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەوانەی پێشوو لەمان زۆرتربوون و هێزو بەرهەمیان لەمان بەتین تر بوو ﴿فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ کەچی هیچ سوودی پێنەگەیاندن هەرچی بەرهەموو زانیاری و ئەو شتانەی فەراهەمیان هێنابوو، کەشخەو شانازییان پێوە ئەکردن، بەڵکو ئەوانە بوون بەهۆی نەگبەتی و تیاچوونیان وەکو وەرئەگیرێ لەم فەرمودەوە: ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ﴾ ئینجا کاتێ کە پێغەمبەرەکانیان هاتنە سەریان بەو بەڵگەو دەلیلە ڕوونانەوە گوێیان نەدا پێیان و شادمان بوون بەو زانیاری و پیشەسازیەی کە لایان هەبوو، چونکە زانین و زانیاری بە بێباوەڕ ئەبێتە بەڵایەکی نالەبار چاوی دڵ کوێر ئەکات و سەرکەشی و لارە جڵەوی فەراهەم ئەهێنێ، خاوەنەکەی خۆی ناناسێ و خۆی لێ ئەبێ بە شت و گاڵتەو لاقرتی ئەکات بە هەموو ترسێنەرو ڕێنموونی کەرێ ئەو کاتە دووچاری سزای خوا ئەبن وەکو دەربارەی ئەو بێبڕوایانە بوو وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ چوار دەوری دان تۆڵەو سزای ئەوەی کە ئەوان لاقرتیان پێ ئەکرد، واتە بێبڕواکانی گەلە پێشووەکان کاتێ کەلە تاواندا گەیشتنە ئەوپەڕو گاڵتەو لاقرتیان کرد بە پێغەمبەرەکان و ئەو ئایینەی بۆیان هێنا، کاتی وایان لێ هات سزای خوا هاتە سەریان و دەوریدان

فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ (٨٤) فَلَمۡ يَكُ
يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَاۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡكَٰفِرُونَ (٨٥)

---

**﴿فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ﴾ ئینجاکاتــێ کەســزای بەتینی ئێمەیان بینی تێکەیشتن لە هەڵەو نەزانی خۆیانو پەشیمان بوونەوە لە تاوانو بێبڕوایی خۆیان، وتیان ئەوا باوەڕمان هێنا بە خوا بە تاکو تەنیاو باوەڕمان نیەو دان نانێین بەوەی کە کردمان بەشەریکی خواو بەهۆی ئەوەوە بووین بە بت پەرستو موشریك. بەڵام گەڕانەوەو باوەڕەکەیان لە ڕاستیەوە نەبوو، چونکە لە ناچارییدا بوو لەکاتی نەبوو.**

**﴿فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَاۖ﴾ بەهۆی ئەوەوەباوەڕەکەیان هیچ سوودی پێنەگەیاندن لەو کاتەدا کە سزا سەختەکەی ئێمەیان دی چونکە ﴿سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدۡ خَلَتۡ فِي عِبَادِهِۦۖ﴾ خوا باوو ڕەوشتی وەها تێپەڕی کردبوو لەمەو پێش لەناو بەندەکانیاندا کە ئەو جۆرە باوەڕو گەڕانەوە وەرنەگرێ ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ لەو شوێنەوە لەو کاتەدا بێبڕواکان ڕەنجەڕۆو زەرەرمەند بوون، ئا بەم شێوە بەتینە سورەتەکەی کۆتایی پێهێنا، شێوەی داگیر کردنی سزای بەتینی خوا کە چواردەوری بێبڕواکان ئەدات و ئەوانیش ئەکەونە ترسو لەرزو هاوارو باوەڕ هێنان بە بێئەمەی سوودیشی لێ وەرگرن. خوا پەنامان بدات لە قارو خەشمی خۆی آمین.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾

## سورەتی ﴿فصلت﴾
## مەككەتتەو ٥٤ ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتەش وەك سورەتەكانی تری مەككەیی باسە سەرەكیەكانی باسی خوایەتی خوایە بە تاك‌و تەنیا و باسی زیندوو بوونەوەو ژیانی ڕۆژی دواییە، هەموو باسی وەحی و پەیامەكەی خوایە كە هەموو پێغەمبەرانی پێ ڕەوانە كردووە، لەگەڵ ئەو باسە سەرەكیانەدا باسی شێوەی بانگ كردن بۆ خواو سیفەت‌و ڕەوشتی بانگ كەران‌و هەرچی لەم سورەتەدا ڕوون كردنەوەیە بۆ ئەو كارە گرنگانە. بۆ ڕوون كردنەوەی ئەو مەبەستانە چەند بەڵگەو نیشانەیەكی ئاشكرا ئەهێنێ، بەڵگەی دەروونی‌و بوونەوەریی، ئینجا خەڵكی دەترسێنێ لە باوەڕ نەهێنان‌و سەرنج ڕادەكێشێ بۆ لەناو بردنی بێبڕواكانی گەلە بێبڕواكانی ڕابردوو لە دنیادا، شێوەی سەخت‌و سامناكیان لە ڕۆژی دوایی دا، لەمەو پاش دێنە سەر تەفسیری ئەو ئایەتانەی كە هاتوون لەم بارەیەوەو بە ئیزنی خوای گەورە لەكاتی تەفسیری ئەو ئایەتانەدا ئاماژەو دەست نیشان دەكەین بۆیان‌و لە دوا دوایی سورەتەكەدا سەرنج ڕادەكێشێ بۆ ئەو بەڵگەو نیشانانە كە خوا بەڵێنی داوە نیشاندانیان لە داهاتوودا تا بەهۆی ئەوەوە هەركەس بێ بەش نەبێ لە فام‌و ژیریی دان بنێت بە پەروەردگاری خوادا.

ئینجا بە گرنگی گوێ بگرین لەم سورەتە پیرۆزە ئایەتەكانی بدات بە گوێ‌و ژیریماندا‌و داوا دەكەین لە خوای میهرەبان سوود بەخشمان بكات پێیان لە یەكەم جارەوە دەفەرموێ:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *حمٓ *تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لە چەند سورەتێكدا سەبارەت بەم پیتە پچڕاوانە ڕای زانایانمان باس كرد بە تایبەتی لە سورەتی ﴿یس﴾دا كە ئیرادەی خوا وابوو لە یەكەمجارەوە دەستم كرد بە تەفسیری ئەو سورەتە. هەروەها جارێ لە دڵمدا یەكێ لەو ڕایانە بەهێزترەو باشتر وایە وەك زۆر لەزانایان دەفەرمون بڵێین: (الله اعلم بذلك) لەسەر هەر بار ئەمە وەردەگیرێ بە بەر لێ برینەوەی هەموو كەس ـ بەتایبەتی گەلی عەرەب كەلە یەكەمجارەوە ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچكەدا ـ بەر لێ برینەوەیان بەمەی ئەم قورئانە

پێك هاتووه لەو وتەو پیتانە کە خۆیان و وتەو وتاری لێ پێك دێنن، چەند جار بەریان لێ براپەوە ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە نەهاتایەو وتەی پێغەمبەر بوایە دەبوو ئەمانیش بتوانن وێنەی بڵێن و هەوڵیشیان داو نەیانتوانی کەوا ئەگەر باوەڕنەهێنن ئەبێ دووچاری خەشم و سزای خوا ببن.

ئینجا خیلافی زانایان هەیە لە هۆنینەوەو تەرکیبی ئەو وێنە لەگەڵ وتەی پاش پیتەکاندا، وەك لە چەند شوێنێکدا باسمان کرد بالێرە لەگەڵ جۆرێکیان بڕۆین، بڵێین: ئەو دوو پیتە مبتدایەو ﴿تَنزِيلٌ﴾ لەلایەن خوای لەوێنەی ئەم دوو پیتە هێنراوە خوارەوەیە ﴿مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لەلایەن خوای ڕەحمان و ڕەحیمەوە، ئەم خەبەرە دەست نیشانە بۆئەوەی هێنانە خوارەوەی ئەم کتێبە هاتووە لەبەر بەزەیی و میهرەبانی خوا بە هەمواندا، هەرچەند بۆ هەندێ کەی مایەی سزاو خەشمی خوایە کە پشتی تێدەکەن، بەڵام ئەم کتێبە هاتووە بۆ هەموو چینەکان تا ڕۆژی دوایی، کەواتە ئەگەر بۆ تاقم و چینێ ڕەحمەت نەبێ بۆ چینێ تری پاش ئەوان هەر ئەبێ بە ڕەحمەت ئەوەتا لەسەرەتایشەوە بەو جۆرە هات لە ئەبوجەهل عیکریمە پەیدا بوو، لە وەلید خالید پەیدا بوو، لە عاص عەمر هات، هەروەها... جالەبەرئەوە لەم ئوممەتەدا سزای بنەبڕ کردن نەهات وەکو لە ئوممەتە پێشووەکاندا وا هات... عادو سەمودو حیجرو ئەیکەو لوط.

ئینجائەونامەیە ڕوون تر دەکاتەوەو کارومەبەستی دیاریی دەکات و دەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٞ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾ نامەیەکە ئایەتەکانی جیا کراوەتەوەو بەش بەش کراوە بە بڕیارو ئەحکام و ئامۆژگاری و داستان و چیرۆك و بەڵێن و هەڕەشەو ترساندن، هەق و ناهەقی جیا کردووەتەوە لە یەك، هەروەها هاتووە بەپێی هەموو جۆرە تەبیعەت و ژیریی و بۆچوونی جۆراوجۆری ئادەمی، بە پێی حاڵەت و بەسەرهاتی دەروونی و مەبەست و ئامانجی هەموو گەل و چینێك، ئینجا سووك و ئاسانەو خوێنراوەیەکە بە زمانی عەرەبی بۆ گەل و ئوممەتێك کە دەزانن و لێی تێ دەگەن و ئامادەییان تێدایە بۆ زانین و ناسین، ئەمە بە نەزەر ئەو یەکەم چینە کە گەلی عەرەب بوون، بە نەزەر غەیرە عەرەبەکان ئاسانە بە تەفسیرو تەرجەمە کردن بە هەر زمانێکی تر وەك لە سەرەتاوە ڕۆمی و حەبەشی و فارسی لێیان هات و باوەڕیان پێهێناوە فێربوون وەك عەرەبەکان. سوپاس بۆ خوا لەم چەرخی تازەدا بە هەموو زمانەکانی تەفسیرو تەرجەمە کراو لەبەرئەوە بە فراوانتر ئەهلی وڵاتان ئاشنا بوون بەم قورئانە.

بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ
وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ
يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ

**ماتۆڵ ئەم قورئانە بۆ هەموانە هەتا دنیا دنیایە، خوای میهرەبان هۆی ناسینو زانینی بۆناسان دەکات، ئینجائەم قورئانە هات ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ بە موژدە دەر بە شوێن کەوتووەکانیو ترسێنەری بێبڕواو یاخیەکان. ئەم قورئانە عەزیزە بەم جۆرە هات کە باس کرا ﴿فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ﴾ کەچی زۆربەی خەڵکی پشتی تێکردو ڕووی لێ وەرچەرخاند ﴿فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ کەواتە ئەوانە بیسەر نینو نابیستن بە بیستنێ کە سوودی لێ وەرگرن، بەڵکو نایانەوێ ببیستنو لێی تێبگەن،وەك لە بارەیانەوە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ﴾ ئەو بێبڕوانە وتیان دڵەکانمان لەناو چەند بەربەستو پەردەیەکدایە لە بیستنو وەرگرتنی ئەوەی تۆ بانگمان دەکەیت ئەی محمد، لە گوێچکەماندا کەڕی هەیەو لە نێوان ئێمەو تۆدا پەردەیەك هەیەو هەرگیز بە گوێت ناکەین، کەواتە تۆ کردەوەی خۆت بکەو ئێمەش خەریکی کردەوەی خۆمانینو بۆی هەوڵ ئەدەین کە خۆمان ویستوومانەو ئەمانەوێ. ئەو بێبڕوانە هەڵوێستی بەدیان لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزدا(ﷺ) جۆراو جۆربوو، ئەمەی ئێرە جۆرێکە لە جۆرە بەدەکانیانو ئەویش وازی نەدەهێناو لەسەر فەرمانی خۆی بەردەوام بوو، دیارە شوێن کەوتووەکانیشی لە چەرخی خۆی دا هەر بەو جۆرە بوونو ئەبێ هەموو باوەڕدارە ڕاستەکانی پاش ئەوان تا ڕۆژی دوایی هەروابن، چونکە ئەم پەیامە گەورەترین ئەمانەتی خوایەو خوا فەرزی کردووە بە پێی توانا هەر ئەوە ڕێگەو هەڵوێستیان بێت، ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) وازی نەدەهێناو بە ڕێگە ڕاستەکەی خۆیدا دەڕۆیشتو نەیفەرموو هیچ شتێکم بە دەستە، بەڵکو ئەمەی دەفەرموو کە خوا پێی فەرمو: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ بڵێ من هەر ئادەمیەکم وێنەی ئێوەو من بەندەو دروست کراوی خوامو وەحی کراوە بۆ لام کە خوای ئێوە هەر خوایەکی تاكو تەنیایە ﴿فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ﴾ کەواتە بە ڕێكو ڕاستی بگەڕێنەوە بۆلایو داوای لێ بوردنی لێ بکەنو تەوبە بکەن لەو بێبڕواییو هاوبەش ڕەوادانە کە لەسەری بوون.**

وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْآخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ۞ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ
ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾

---

**ئەوەی ئەیڵێم ترساندنو هەڕەشەیە لێتان کە دەڵێم** ﴿وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ * ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْآخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ﴾ **تێدا چوونو سزای بەتین بۆ هاوبەش ڕەوا دەرەکان کە زەکات نادەنو بێبڕوان بە ڕۆژی دوایی.**

**زەکات هەرچەند لە ساڵی دووەمی کۆچی دا فەرز کرا، بەڵام لە چەرخی مەککەیشدا هەر بەناوبانگ بووە، جا هاوبەش ڕەوا دەران بێبەزەیی بوونو ئەو بێبەزەییە تاوانێکی ئەوەندە گەورەیە بە هاوبەش ڕەوا دەرانیشەوە هەر چاو ئەدا، کەواتە لەگەڵ تاوانبار کردنیان بەو گوناهە کە گەورەترینە تاوانی زەکات نەدانیشیان پێوە دیارە ئەوانە سیفەتێکی بەدی تریان هەبووە کە ئەوە بنەڕەتە بۆ هەموو خراپەکانی تر کە بریتیە لە باوەڕ نەبوون بە ڕۆژی دوایی، خواپەنامان بدات لە هەموو تاوانەکان.** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ **لە بەرامبەردا ئەوانەی بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان بەجێهێنا، بۆیان هەیە پاداشتی نەبڕاوە یان پاداشتێکی بێ منەت، ئینجا ئەوپەڕی بەدیو خراپی هاوبەش ڕەوا دەرانو بێبڕواکانو بێبڕوایی ڕوون دەکاتەوە بەوەی ئەو کەسەی ئەوانە بێبڕوان بە داهێنەری ئەم زەوییو بوونەوەرە بە خۆیانو هەرچی وا لەناویاندا کەوا ئەوپەڕی سپڵەییو نەفامیە باوەڕ نەبوون پێی، جا ئەوا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە شێوە پرسیارێکیان ئاراستە بکات بە بێزاریو سەرسوڕهێنانەوە، ئەفەرموێ:** ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ﴾ **بڵێ پێیان ئایا باوەڕتان نیەو باوەڕ ناهێنن بەو زاتەی کە زەوی دروست کرد لە دوو ڕۆژدا،** ﴿وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا﴾ **بڕیار دەدەن چەند وێنەو هاوبەشێک؟!** ﴿ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ **ئەو زاتەش کە زەوی دروست کرد: داهێنەرو پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.**

وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ
ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾

---

﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا﴾ **گێڕای لەوزەویەدا چەند شاخێکی دامەزراو بەسەریەوە ﴿وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا﴾ پیتو فەڕی تێخست لە هەموو بارو رووبەکەوە کە ژیان پێویستی هەیە، خۆراکەکانی تێدا بڕیاردا بۆ ئادەمیو چ بۆ هەموو گیانلەبەرانو چ بۆ دارو درەختو شینایییەکان ﴿فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ﴾ ئەوانەی هەموو پێك هێنا لەو چوار ڕۆژەدا بە دوو ڕۆژەکەی پێشووەوە ﴿سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ﴾ ئەو خۆراكو پێبژێوانەی بڕیاردا لەبەر داواکەرانو داخوازان کە پێویستیان هەیە پێیانو ژیانیان بەستراوە پێیانەوە، بە جۆرێکی تریش ئەم وتەیە تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەم تەفسیرە لە دڵمدا بەهێزترو دامەزراوترە. بێگومان باوەڕدارو بێبڕواکان دەزانن بەم هەموو چاکەو نیعمەتە گەورانە کە دیارە هیچ کەس نیە لافی ئەوە لێ بدات کە هیچ دەخلی هەبێ لەم هەموو نازو نیعمەتەداو لە خۆیشیەوە پەیدا نابێ، بەڵکو زاتێ بەدی هێناوە کە ئەم بوونو بوونەوەرەی بەدەستە، کەواتە ئەوپەڕی بێ شەرمیو سپڵەییو نەفامیە کە هەر ئەو نەپەرسترێ بەبێ هاوبەشو وێنە.**

**ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ ڕوون کردنەوەی هەندێ شت: بێگومان ئەو ڕۆژانە کە قورئان لە چەند شوێنێکدا باسیان دەفەرموێ ئەم ڕۆژانە نیە کە ئێستا هەنو لەپاش دروست کردنی زەویو ئاسمانەکان بەدی هاتن، کەواتە دەڵێین ئەم هەموو کاروبارە بە یەك جار بەدی نەهاتووەو دواو بەریان هەبووە لەبەر هەر هۆیەك کە خوا دەزانێ، ئەگینا بۆ خوا هیچی تێ ناچێ بێجگە لەوەی ئیرادەی ڕووی تێبکات، کەواتە دەڵێین: مەبەست بەو ڕۆژانە ماوەو کاتێکن بە ئەندازەی شەش ڕۆژ یان دەڵێین ڕۆژانێکە کە هەر خۆی دەزانێو ئێمە هیچ مەبەستێك دیاریی ناکەین کە ئەمە ڕێكو سەلامەت ترە.**

**خۆراكو پێبژێوی ئادەمیو گیانلەبەرو دارو درەختو شینایی جیاوازن لە یەکترو بۆ هەرکام خۆراكو پێبژێوی تایبەتی هەیە ئەگەر بگۆڕێ زیانو نەگوجان ڕوون ئەداتو پەیدا دەبێ، لە ڕێگای زانیاری تازەوە دەرکەوتووە شتەکە وایە، لەگەڵ ئەوەدا ئێمەی ئادەمی لەو هەمووخۆراکەجۆربەجۆرانەدەخۆین کەخوای میهرەبان فەراهەمی هێناوە.ئینجا بیردەکەینەوە**

کەقورئان ناوی ئەوشاخانە دەبابە ﴿رَوَٰسِيَ﴾و لە هەندێ ئایەتدا هۆی بوونەکەیان ئەکات بەمە ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمۡ﴾ با لەنگەرەتان پێ نەکات، واتە ئەگەر ئەم شاخانە نەبوایە زەوی دەکەوتە جوڵان و جونبوش و قەرار نەدەگیرا بەسەر پشتیەوە، بە وێنەی کەشتی ئەگەر بەو شتە قورسانە نەبەسترێتەوە لارەسەنگ ئەبێت و هەڵئەگەڕێتەوە ئەویش ئەوە نیشان ئەدات زەوی دەجولێ و بە بوونی شاخەکان تەوازون پەیدا دەکات و لەخشە ناکات بە ئێمە، ئینجا تەوازنەکەش پەیدا دەبێ لە نێوان بەرزی شاخەکان و نزمی بێخی دەریاکان و دەشتەکان! سبحان الله. ئینجا لە بارەی پەیدا بوونی چەند شتێ گوتراوە هەرکام بۆ چوون و شتێکی نەزەریین و جێگای متمانە نین. بۆ وێنە زەوی پارچەیەك بووە لە خۆرو لەپاش دوومليۆن ساڵ سارد بووەتەوە، ئینجا بە چەند گۆڕان و قۆناغێك وای لێ هات دەست بدات بۆ ژیان و هۆی ژیان، بەڵێ قورئان ئەمەی فەرمووە: ﴿أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ﴾ لە پاشیش خەڵکی چوونە سەر مانگ و بە چاو بینیان مانگ پێك هاتووە هەر لە ماددەی ئەم زەویە و مانگ ئەستێرەیەکە تابیعی ئەم زەویەیە، ئینجا ئێستا دەبینسن بە چاوی خۆیان سەرنجی دەدەن ئەخولێتەوە بە دەوری زەوی دا، زۆر لەو نەزەریاتانە لە کتێبی (مع الله في السماء)دا باس کراوە و لە کۆنیشەوە ئەو گۆترەکارییانە هەر وتراوە و لە فەسەلەفەی یۆنانیەکانەوە هاتووە و تێکەڵی کتێبە ئیسلامیەکان بوون، دەرکەوت بە قەتعی شتێکی ئەفسانە و پڕوپووچن لەبەرئەوە ئەمڕۆ کەس باوەڕی نیە پێیان. جا ئەم نەزەریاتانەش ئەگەر لە داهاتوودا دەرکەوتن شتێکی پڕوپووچن ئەوا ئەوانیش تور ئەدرێن، ئەگەر بەو شێوە دەرنەکەوتن ئەوا ئێمە بە نەزەرییە سەرنجیان ئەدەین و پشتیان پێنابەستین.

لەپاش ئەم قسەو باسانە کە کردمان لە بارەی زەویەوە، ئینجا بەرز ئەبینەوە بەرەو ئاسمان و دەڵێین قورئان ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ﴾ لە پاش ئیرادەی ڕێك کردنی زەوی بەو جۆرەی کە فەرموی، ئینجا نیازو ئیرادەی ڕووی کردە لای ژوورو لەکاتێکدا بەم جۆرو شێوەیە نەبوو، بەڵکو تاریك و دووکەڵ بوو، ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا﴾ بەهۆی ئەوەوە فەرموی بە ئەویش و بە زەویش وەرنە پێشەوە بە خۆشی یان بەزۆر، وەرنە پێشەوە ئەوەی کە بڕیار درا بوو لێتان بەدی بێنن، وا لە ئەزەلدا ئیرادەی وابوو ئەم جۆرو شێوەی ئێستا بەدی بێت، ﴿قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ ئەوانیش گوتیان ئەوا هاتین بە خۆشی و پێخۆش بوونی خۆمان، واتە ژێر بارین و چیمان لێ نیاز کرابێ هەر بەو جۆرە دەبین

فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾

---

﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ﴾ کەواتە دروستی کردن بە حەوت ئاسمان لە دوو ڕۆژداو لە هەرکام لەو حەوت ئاسمانە بەدی هێنا ئەوەی کە پێویستە بۆیان لە مەلائیکەو ئەستێرەو هەرچی تر کە هەر خوا دەیزانێ وەك قتادەو سدی ئەفەرمون. بە نەزەر ئاسمانەوە بەو جۆرەی کردوو بە نەزەر زەویشەوە بەم جۆرەی کرد کە ئەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ﴾ ئاسمانی ئەم دنیا نزیکەمان ڕازاندەوە بە چەند چرایەك، واتە ئەم ئەستێرەو مانگو ڕۆژانە کەلە دوورەوە وەك چراو گڵۆپ وان، پاراستنمانن لەوەی تێك چوونو کەمو کوڕی ڕوویان تێبکات، یان ئەو چرایانەمان دروست کرد لەبەر زینەتو پاراستن لە دەستکاری کردنی شەیاتین.

ئینجا سەرنج ڕادەکێشێ بۆ بیر کردنەوە لەو هەموو شتەی کە باس کرانو بێجگە لە خوا هیچ کەس دەخلی نیە تێیاندا، کەواتە هەرکەس بێبەش نەبێ لە هەموو تێگەیشتنێك دەبێ باوەڕ بهێنێ ئەوە کردەوەی زاتێکە کە دەسەڵاتدارو زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو ئەوپەڕی زانینی هەیە بە هەموو شتێ وەك دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەوەی کەباس کرا بڕیار دراوو داهێنراوی کەسێکە کە ﴿ٱلۡعَزِيزِ﴾و ﴿ٱلۡعَلِيمِ﴾ە.

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ ڕوون کردنەوەی چەند شتێك کە پێویستی هەیە بە ڕوون کردنەوە: ئایا زەوی لە پێش ئاسمان دروست کرا یان ئاسمان ئەوە شتێکە خیلافی تێدا هەیە بە دیمەنی ئایەتەکەی ئێرە زەوی لە پێشەوە دروست کراوەو هەروەها ئایەتی سەرەتای سورەتی ﴿البقرة﴾ کە دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ هەروەها ڕیوایەت لە (حسن)ەوە هاتووە کە خوا قەبارەی زەوی لە پێشەوە دروست کردوو لە زەویەوە دووکەڵ بەرز بووەوەو لە دوکەڵەکە ئاسمانەکانی دروست کرد، ئایەتی ﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾ وای لێ وەرئەگیرێ قەبارەکەی لە پێشەوە دروست کراو ﴿دحو﴾ەکەی لە پاش

ئاسمانەوە بووە، بە هەرحاڵ زانینی ئەوە هیچ زیادە نرخێك نادا بە مەبەستەکەو قسە لێ کردنی هەر ئەوەی تێدایە کە پرسیار دەکرێو با ڕای زانایان بزانرێ.

أ- بێگومان زەوی‌و ئاسمان‌و هەموو شتێ نەبووەو لە نەبوون خوا هەموو شتی هێنایە کایە، کەواتە خوا قسە لەگەڵ کێ‌دەکات‌و فەرمان بە کێ دەکات؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ هیچ کەس‌و هیچ نەبووە بەڵام لە ئەزەل‌و بێ سەرەتا خوا هەموو شتی زانیوەو لە عیلمی ئەزەلی ئەودا وەك ئێستاو مەبەست لەو قسەو فەرمان پێدانە چیرۆکە بۆ دوانەکەوتنی ئیرادە کراوەکانی خوا لە ئیرادەو مەیل کراوەکانی خوا.

ب- ئایا مەبەست بە ﴿دخان﴾ چیە کەلە زمانی عەرەبیدا مەبەست پێی (دووکەڵ)ە؟! لە وەڵامدا دەڵێین چەند ڕایەك هەیە یەکێ لەوانە ئەمەیە مەبەست ئەو وردیلکانەیە کە مادووەی ئاسمانەکانی لێ دروست کراوەو پێی دەڵێن ﴿سدیم﴾.

ت- ڕایەکی تر دەڵێ مەبەست بە ﴿دخان﴾ تاریکیەو تاریکی دەست نیشانە بۆ نەبوون‌و عدم، بەڕاستی دڵ بەمە بەهێزترە، چونکە ئەگەر مەبەست ئەوە بێت دەبێ ئەوانەش هەر نەبووبن‌و لە نەبوون دروست کربن، باش وایە زانینی حەواڵەی خوا بکەین‌و لە پاش ئەوە کە باوەڕمان هەیە هیچ شتێك نەبووە.

لەپاش ئەو هەموو دەلیل‌و بەڵگە ڕوونانە ئیتر دەبێ بێ‌بڕواکان بترسێنرێن لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەگەر ئەو بێ‌بڕوانە ڕوویان وەرگێڕاو باوەڕیان نەهێنا بڵێ پێیان ئەتانترسێنم بە سزایەك وەك هەورە تریشقە بدات بەسەرتانداو لە ڕیشەتان بێنێ بەوێنەی ئەو هەورە تریشقەی دای لە عادو سەموودو لە ڕیشەی هێنان.

ئەم ترساندنە سامناکە زۆر ڕێك‌و بەجێیە لەگەڵ سەرکێشی ئەو نەفامانەی قورەیشدا کە گوێرایەڵ نەبوون‌و هەر عینادیان بەکارهێناو لە دڵیشەوە باوەڕیان هەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستە، بەڵگە لەسەر ئەوە ئەمەیە کە ئیبن‌و ئیسحاق لە محمدی کوڕی کعبی قورزییەوە کە دەفەرموێ: جارێ عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کە یەکێ بوو لە سەرۆکەکانی قورەیش دەبینێ پێغەمبەر (ﷺ) بە تەنیا لە مزگەوتی کەعبەدا دانیشتبوو، عوتبە ڕووی کردە قورەیشیەکان‌و وتی: با بچم چەند شتێك بخەمە پێش چاوی محمد بەڵکو هەندێکی وەرگرێو وازمان لێ بێنێو تەفرەقەی خستووەتە ناومان‌و لە بەرەو کۆمەڵەکەی زیاد دەبن. ئەوانیش گوتیان ابو الولید بڕۆو قسەی لەگەڵ بکە. عوتبەش هەستاو وتی برازاکەم ـ لە نەسەبدا یەك بوون ـ تۆ

خۆت دەزانی تا چ ڕادەیەك ڕێزو قەدرت هەیە لەناو قەومەکەتدا، تۆ کارێکی زۆر گەورەت داهێناوە لەناو ئەم قەومەدا تەفرەقەت تێخستووەو بە نەفام دەرت کردوون‌و باوك‌و باپیرت بە کافر دەرکردوون گوێم لێ بگرە چەند شتێك دەڵێم بیریان لێ بکەرەوە، بەڵکو هەندێکی وەرگری لێم. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی: ابا الولید بڵێ: ئەویش وتی: ئەگەر تۆ مەبەستت ماڵ‌و سامانە ئەوەندەت بۆ کۆئەکەینەوە تا ببیت بە ساماندارترینی هەمووان، ئەگەر بەرزی‌و سەرۆکایەتیت دەوێ ئەتکەین بە پادشای خۆمان. ئەگەر ئەمەی کە بەسەرت هاتووە حاڵەتێکی دەروونیەو خۆت پێناگیرێ ئەوا پزیشکانت بۆ کۆئەکەینەوەو بە هەر پارەو پولێك بێت چارەسەرت دەکەین، چونکە زۆرجار جنۆکە زاڵ دەبن بەسەر خەڵکدا سەری لێ تێك دەدەن لەپاش لێ بوونەوەی لە قسەو باسەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمو دەی گوێم لێ بگرە. ئینجا دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەم سورەتە هەتا گەیشتە ئەم فەرمودەیە: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ ترس کەوتە دڵی‌و دەستی بۆ دەمی نەبارەکی پێغەمبەر (ﷺ) بردو وتی نەکەیت داوات لێ دەکەم لەبەر خاتری خواو ڕەحم‌و خزمایەتی. لە ڕیوایەتێکی تردا کە بەهێزترە گوێی گرت تا گەیشتە ئایەتی سوجدەو سوجدەی بردو فەرموی: یا ابا الولید قسەی من ئەوەتە. ئینجا عوتبە گەڕایەوە بۆ ناو خەڵکەکەو وتی سوێند بە خوا شتێکم لێ بیستووە نە جادووەو نە سیحرەو نەکاهینێتیە، گەلی قوڕەیش قسەیەکتان بۆ دەکەم گوێم لێ بگرن واز لەم پیاوە بێنن با لەگەڵ عەرەبدا خەریك بێ ئەگەر سەرکەوت بەسەریاندا سەرکەوتنەکەی بۆ ئێوەشە، ئەگەر عەرەب سەرکەوتن ئەوا ئێوە ڕزگار ئەبن لێی والله ئەوەی کە ئەو خوێندیەوە پاشەڕۆژێکی گرنگی دەبێ.

ئینجابالێرەدا بوەستین‌و بیرێ بکەینەوە لەو هەڵوێست‌و ڕەوشتە پیرۆزەی پێغەمبەر(ﷺ) کە چۆن بە ئارام‌و دڵنیاییەوە گوێی گرت لە عوتبە، ئینجا باوی نەفامان هەر وا هاتووەو هەر وایشە بە گوێرەی دەروونی خۆیان کێشانەو پێوانە دەکەن، بەو شت‌و مەکەی کە هۆی خەڵەتاندن‌و لادانی خۆیانە، هەر بەوە وا دەزانن ئەوانەی کە هەر چاوەڕوانی دەستی میهرەبانی خوان. ئەوانیش بەوە ئەخەڵەتێن‌و لا دەدەن، بە تیبەت نەیانزانی گەورەترینی دروست کراوەکانی خوا دەسەت نادات بۆ هیچ شتێك بێجگە لە فەرمانبەری.

إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ

**جا ئەبێ هەموو موسڵمانێ پەیڕەوی سەرداریان بکەن‌و هیچ شتێك کاریان تێنەکات‌و خۆگرو دامەزراو بن لەسەر ڕێبازەکەی خواو پێغەمبەرەکەیان (ﷺ). ئینجا ئەم ترساندن‌و هەڕەشە سەختە کە عوتبەی هێنایە لەرزە لە هەمان کاتدا گەردش‌و خولانەوەیەکە بە دڵ‌و دەروون‌و لە ڕیشە هێنان‌و لەناو بردنی یاخیەکان لە پێغەمبەرەکانی ڕابردوو کە ئەفەرموێ: ﴿إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ لەکاتێکدا کە پێغەمبەرەکانیان بۆ هات لە پێش خۆیان‌و لەپاش خۆیان، هەموو هاتن بە یەك بەرنامە کە کورتەکەی ئەمەیە هیچ کەس مەپەرستن بێجگە لە خوای تاك‌و تەنیا، تەنها ئەم وتە بەفەڕە کە هەموو پێغەمبەرانی پێ‌هاتووە‌و بنەڕەت‌و ئەساسە. نەفامان لە هەموو چەرخ‌و چینەکاندا لایان وابوو کە پێغەمبەر نابێ ئادەمی بێت بەڵکو دەبێ فریشتە بێت وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ﴾ ئەگەر پەروەردگارمان بیویستایە مەلائیکەی ئەمێنایە خوارەوە ﴿فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ ماتوڵ مەلائیکەی نەناردووە، کەواتە ئێمە باوەڕمان نیە نەوەی ئێوە پێ‌ڕەوانە کراون، ئەم قسەو بیانووە ناڕاستە بە درێژایی هەموو هەرگوتراوە‌و ڕزگاریان ناکات لە سزای خوا وەك لێرەدا باسی هەڵوێست‌و سزای عادو سەمودمان بۆ دەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ ئەمما عاد خۆیان بە گەورە‌و زل دانا لە وڵاتدا بە ناهەق‌و ناڕەواو خۆیان لێ گۆڕاو وتیان ﴿وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً﴾ ئایا لە ئێمە بەتین ترە لە بارەی هێزو دەسەڵاتەوە، ئایا ئەوانە چین‌و چۆن خۆیان نەناسی ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ﴾ ئایا ئەوانە نەیانئەزانی ئەو خوایەی کە ئەوانی دروست کردووە ئەو بەتین ترە لە بارەی هێزو دەسەڵاتەوە. زۆر مایەی سەرسوڕمانە ئەوانە دەیانزانی خوا ئەوانی دروست کردووە، کەواتە خوا بەهێزترە لەوانیش‌و لە هەموو کەس‌و لە هەموو ئەم بوونەوەرە، هەر هێزو دەسەڵاتێکیان بووبێ خوا پێی داون. خوا پەنامان بدات لە خۆگۆڕان، آمین.**

وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ
ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ
فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾

---

**دەبوو ملی بەندەییان کەچ بکردایەو باوەڕیان بهێنایە بە خواو ئایەتەکانی خوا کەچی وا نەبوون، بەڵکو بەم جۆرە بوون کە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ ئەوانە هەمیشە دانیان نەدەنا بە ئایەتەکانی ئێمەو بەڵگە ڕوونەکانمانو باوەڕیان پێ ی نەبوو. بۆ نموونە عادو سەمود.**

**ئەو نەفامانە لە خۆگۆڕاو بوونو کەشخەو شانازیان دەکرد بە هێزو دەسەڵاتەکەیانەوە، لەم ئایەتانەی داهاتوودا شێوەی سزاکانیان دەخاتە بەرچاو. دەربارەی عاد دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ﴾ ڕەوانەمان کردو دامان بەسەریاندا بایەکی زۆر سارد لە ڕۆژانێکی نەحسو نەگبەت، حەوت شەوو هەشت ڕۆژ، لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ ئەو با سەختەمان دا بەسەریاندا ﴿لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ بۆئەوەی پێیان بچەژێن سزای سەرشۆڕی بەرامبەر بە خۆ بە زل زانیەکەیان لەم ژیانی دنیادا، هەر بەوە وازیان لێ نەهێنرا بەڵکو لە ڕۆژی دوایی دا بەم جۆرە دەبن کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَخْزَىٰ﴾ بەڕاستی ڕۆژی دواییان سەرشۆڕکەری بەتین تر دەبێ. ﴿وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ﴾ لەکاتێکدا یارمەتی نادرێنو ڕزگار ناکرێن لێی خوا پەنامان بدات آمین. ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟﴾ سەمود ڕێنموونیمان کردنو خستنمانە سەر ڕێگەی ڕاست، وا دەرئەکەوێ کە ئەو موعجیزە گەورەیان بینی باوەڕیان هێنابێو لەپاشان هەڵگەڕابنەوە، ﴿ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾ ئینجاخۆیان ئیختیاری کوێرییان کرد بەسەر ڕێنموونی دا، بە کوێرەی دڵ کە زۆر سەخت ترە لە کوێری چاو ﴿فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە هەورە تریشقەو سزای ڕیسوایی داگیری کردن بەهۆی کردەوەی بەدی خۆیان کە بە ئارەزوو هەڵبژاردنی خۆیان بەکاریان هێنا.**

وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ
إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَـٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ

---

ئەو یاخیانە ئەوەیان بەسەرهات بەڵام ﴿وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناو خۆیان پاراست لە هۆی سزای خوا، ئەوانەمان ڕزگار کرد، لە پێش ئەم سێ شەریعەتی دواییەدا شەریعەتی تەورات‌و ئینجیل‌و قورئان فەرز نەکرابووە سەر موسڵمانان جەنگ کردن، بەڵکو ئەوەیان لەسەر بوو کە خۆگرین‌و لانەدەن لە ڕێگە ڕاستەکەی خواو خۆیان جوێ دەکردەوەو دەبوون بە کۆمەڵێکی دیاریی لەو کاتەدا دەستی میهرەبانی خوا دەهاتە کایە بۆ تۆڵە سەندن لە دوژمنان‌و ڕزگار کردنی موسڵمانان.

ئینجا بە شێوەی گشتی بەشێکی زۆر سەخت لە سزای دوایی دەخاتە بەرچاو کە دووچاری دوژمنەکانی خوا دەبن‌و لەپاش سزای باسی تۆڵەی ئەم دنیایان دێتە سەر باسی بەشێك لە تۆڵەی ڕۆژی دواییان‌و ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ باسی ئەو ڕۆژە بکە کە دوژمنەکانی خوا زیندوو دەکرێتەوەو کۆ دەکرێنەوە بۆ لای دۆزەخ‌و بەدەوروبەری دۆزەخدا. ناو بردنیان بە دوژمنی خوا بۆ تاوانبار کردنیانەو هۆی سزادانیان، دوژمنایەتیەکەیان بریتیە لە ڕوو وەرگێڕانیان لە پەرستنی خوا نەك ئەوانە هیچ نرخێکیان ببێ‌و زیان بگەیەنن بە گەورەیی خوا، وەك لە حەدیسدا هاتووە ئەگەر ئەوەڵ‌و ئاخرتان لە خواترس‌و گوێڕایەڵ تر بێت زەڕڕەیە سوود ناگەیەنن بە گەورەیی خوا، بە پێچەوانەوە ئەگەر هەموو بەدترین‌و پیس ترین بن زەڕڕەیە کەم‌و کوڕی ڕوو ناکاتە گەورەیی خوا، ئەو دوژمنانە کۆ ئەکرێنەوە ﴿فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ ئینجا ڕاگیر دەکرێن تا دواو بەریان یەك دەگرن‌و ئینجا بە نۆرە دەست دەکرێ بە تورڕدانیان بۆ ناو ئاگری دۆزەخ دەستە دەستە بە پێی گەورەیی‌و زۆری تاوانەکانیان،﴿حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا﴾ هەتا کاتێ هەمووده‌چنە لای دۆزەخ ﴿شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَـٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ لەو کاتەدا شایەتی دەدا لێیان گوێچکەو چاوەکان‌و پێستەکانیان، ئەوانە دێنە دەم‌و زمان‌و هەرچیان کردبێ لە دنیادا دەیڵێن خوا پەنامان بدات لەوە،

﴿٢٠﴾ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ
أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا
جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾

---

**﴿وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَاۖ﴾ تاوانبارەکـان دەڵـێن بـە پێـستەکانیان بۆچـی شـایەتی دەدەن بە دژمـان، ئیبن‌و عـەباس فـەرموی مەبەسـت پێستی عەورەتیانـە کە زینـاو شـەڕواڵ پیسیان پێکردووە، بەڕاستی فەرمودەکەی زۆر جوانـەو لـە خۆیـەوە ئـەوە نافـەرموێ کە ئـەو ناوبراوە بە (حبر الأمة) زۆر زانی ئوممەت. لە ڕیوایەتدا هـاتووە کە خـوا زمانیان دەبەستێ‌و لـە قسەی دەخـات‌و لـە وەڵامەکانیانـەوە وەردەگـیرێ کـە دەڵـێن: ﴿قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ ئێمـەی هێنایـە قسەو گـوتن ئـەو خوایـەی کـە هـەموو زمانـدارێکی هێنایـە قسە، واتـە دەسەڵاتمان نیە خـوا هێنایـنیە قسە، ئـەو خوایـە کـە هـەموو گۆیایـەکی هێناوەتـە قسە، واتـە هـەموو گیانـدارێکی گۆیـاو قسەکەر، چـەند جار لـەم تەفسیرەدا گوتمـان گیانلەبـەرو بێگیان خوای پەروەردگار دەناسن‌و بە زمانی تایبەتی خۆیان خوا دەپەرستن لەسەر ئەوە بارە ﴿كُلَّ شَيْءٍ﴾ بە گشتی تەفسیر دەکەینـەوە. ﴿وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ هـەر ئـەو خوایـە ئێوەی دروست کـرد لـە یەکـەم جـارەوەو بیـستن‌و دیـتن‌و ئـەو هـەموو هێـزو وزەی پێـدان، کەواتـە چـۆن سەرسوڕبمێنێت لەوەی ئەو ئەندامانەو بهێنێتە زمان؟**

**﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ هەر بۆلای ئەو خوایەش دەگەڕێنـەوە لـە ڕۆژی دواییـداو دووبـارە زینـدوو دەکرێنەوە وەك یەکەمجار، بەڕاستی هەرکەس ژیر بێت سەری سوڕنامێنێ. چونکە بە چاوی خۆی دەبینێ ئێمە لە نەبوون کردنمان بـەم گیانلەبـەرە نایابـە دەی ئـەو کەسـەی کـە دروستی کردوون لە یەکەمجارەوە، دووبارە دروستمان دەکاتەوە. ئینجا فـەرموی: ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ ئێـوە لـە دنیـادا دائەشـاردو مەترسـیتان نـەبوو لـەوەی ئـەو ئەندامانـەتان شـایەتیتان لێ بـدات‌و شـتی وا بـە خەڵکانـدا نـەدەمات، چـونکە بـە گـوێرەی بۆچوونی ئێوە شتی وا نەدەگونجا ﴿وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ بەڵکو گومانتان وابوو بێئاگایەو نازانێ بەزۆربەی ئەوەی ئێوەی کردوتانەو دەیکەن.**

وَذَٰلِكُمۡ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمۡ أَرۡدَىٰكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصۡبِرُواْ
فَٱلنَّارُ مَثۡوًى لَّهُمۡۖ وَإِن يَسۡتَعۡتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلۡمُعۡتَبِينَ ﴿٢٤﴾ وَقَيَّضۡنَا لَهُمۡ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا
بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ

---

﴿وَذَٰلِكُمۡ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمۡ أَرۡدَىٰكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەو بۆچوون و گومانەتان کە بووتان بە پەروەردگارتان خەڵەتاندنی و هەڵی دێران و لایدان لە ڕێگە ڕاستەکەی خوا بە هۆیەوە گەڕان بە زیانبارو بەدبەختی هەتا هەتایی ڕۆژی دوایی، ئەم فەرمودەیە ئەگونجێ قسەو عیتابی ئەندامەکان بێت، هەرچۆن دەست دەدا تانەو تەشەری قورئان بێت بەرامبەر ئەو بێبڕوایانە.

ئینجا کە دووچاری ئەو سزاو بەدبەختیەی ڕۆژی دوایی دێن خۆگر بن لەسەر ئەو سزایە یان نە، هیچ سوودێکیان پێناگەیەنێ و ڕزگارنابن وەك دەفەرموێ: ﴿فَإِن يَصۡبِرُواْ فَٱلنَّارُ مَثۡوًى لَّهُمۡ﴾ ئەگەر ئەوانە خۆگر دەبن و سەبر دەکەن ئەوا ئاگر جێ و شوێنی ئەوانە، ﴿وَإِن يَسۡتَعۡتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلۡمُعۡتَبِينَ﴾ ئەگەر داوای گەڕانەوە دەکەن بۆئەوەی پێیان خۆشە یان ئەگەر داوای ئەوە دەکەن خوای خۆیان ڕازی بکەن بەهەر بار مەبەستەکەیان بۆ جێبەجێناکرێ، چونکە کاتی ئەوەیان لە دەست دەرچوو.

خوای میهرەبان پێی خۆشە بەندەکانی ڕوو بکەنە قاپیەکەی و هەموو هۆی هیدایەت و ڕێنموونی بۆ فەراهەم هێناون بەڵام کاتێ خەڵکی بە ئارەزوو پێخۆش بوونی خۆیان هەر سەرکێشی بەکار دەهێنن شایانی ئەوەن لێیان گەڕێ بۆ شەیتان کە هۆی گومراییان بۆ فەراهەم بێنێ یەکێ لەو هۆیانە ئەمەیە شەیاتین ببن بە کاربەدەست و جێگای ڕازو نیازیان، وەك لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَقَيَّضۡنَا لَهُمۡ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾ بڕیارمان داوە بۆ ئەوانە هاوڕێ و هاوسەر لە جن و لە ئادەمی ئەوانیش دەیڕازێننەوە لە هەموو لایەکەوە کارو کردەوەی بەد. شەیتانەکان بە خەتەرەو ئادەمییەکان بە قسەو کردەوە

وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾

﴿وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ بڕیاری سزادانیان لەسەر دامەزراوو جێگیر دەبێ لە ڕیزی ئەو گەل و ئوممەتانەی کە هاتن و ڕابوردن لە جنۆکەو لە ئادەمی کە دووچاری زیانی ڕاستەقینە دەبوون ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانە ڕەنجەڕۆو زیانبارن بە ئەوپەڕی زیان کە بریتیە لە زیانباریی ڕۆژی دوایی کە تاوانبارەکە لەو ڕۆژەدا خۆیشی و هەموو کەس و کاری لە دەست دەدا، گەورەترین تاوان بەرگری کردنی ئەم نووری خوایە کە قورئانە وەك لێرەدا ئەفەرموێ: دەیگێڕێتەوە لە تاوانبارانەوە کە شەیتانەکان جنۆکەو ئادەمی دەیڕازێنێتەوە بۆیان وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ﴾ بێبڕواکان لە جنۆکەو ئادەمی گوتیان و دەڵێن گوێمەگرن لەم قورئانەو قسەو شتی نارێکی دەربارە بکەن وەك لە کاتی خوێندنەوەکەی دا بیکەنە هۆسەو هەرا تا گوێی لێ نەگیرێ یا بەمەی ئەو داستانی عادو سەموود باس دەکات ئێوە داستانی دەلەسەی ئەسفەندیار بگێڕنەوە بۆ خەڵکی و بەوە خەریکیان بکەن. ئەم جۆرانە هەمووی بەکار هێنراو بە فەرمانی سەرۆکەکان، چونکە باش دەیانزانی ئەم قورئانە فێزو کەشخەیان ناهێڵێ. هانی نەفامەکانیان دەداو دەیان گوت ئەم جۆرە شێوەیان بەکار بێنن ﴿لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ بەڵکو زاڵ بێن و ڕێ بگرن لەم قورئانە. لە نەفامێتی پێشوودا بەو جۆرە دەیان و ویست ڕێ بگرن لەم قورئانە، لەم چەرخەدا چەندەها شتی جۆراو جۆر بەکار دەهێنرێ لەلایەن جوولەکەو صەهیۆنیەتی جیهانی و شوێن کەوتووەکانیان لەناو ڕۆڵەی موسڵمانەکاندا، بەڵام تا بێت خەڵکی تێدەگەن و بەرەبەرە حەقیقەتی ئەم قورئانە دەرئەکەوێ الحمد لله علی ذلك، هەزار هۆسەو لە غوە بەکار بێنن خەڵکی تێئەگەن و هەر گوێ لەم قورئانە دەگرن. ئینجا با هەموو ڕێگرەکان بزانن و گوێبگرن لەم هەڕەشە سەختە ﴿فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئینجا سوێند بە خوا ئەچەژێن بەوانەی باوەڕیان نەهێناوەو باوەڕ ناهێنن، دەچەژێن بەوانە سزای بەتین و تۆڵەیان لێ دەسێنین تۆڵەی بەدترینی کردەوەکانیان.

ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعۡدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُۖ لَهُمۡ فِيهَا دَارُ ٱلۡخُلۡدِ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيۡنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ نَجۡعَلۡهُمَا تَحۡتَ أَقۡدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلۡأَسۡفَلِينَ
﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ

---

﴿ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعۡدَآءِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەیە تۆڵەی دوژمنەكانی خوا ﴿ٱلنَّارُۖ﴾ كە بریتی لە ئاگر ﴿لَهُمۡ فِيهَا دَارُ ٱلۡخُلۡدِ﴾ بۆیان لەناو ئاگرەدا جێ و شوێنی هەمیشەیی و نەبڕاوەیە خوایە پەنامان بدە بە میهرەبانی خۆت آمین.

﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ﴾ سزابێ بۆ ئەوانەی كە سەرپێچی نیشانەو بەڵگەكانی ئێمەیان كردووە. ئەوانەی كە هەڵخەڵەتان بە هاوڕێیەتی قەرینە بەدەكانیان كاتێ بیر لەوە دەكەنەوە ئاواتیان ئەوەیە بیان بینن و پێشێلیان بكەن لەناو ئاگرەكەداو داخی خۆیانیان پێ بڕێژن وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی كە هەڵخەتان بەو دوو شەیتانانە: شەیاتینی جن و شەیتانی ئادەمی، دەڵێن ﴿رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيۡنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ نَجۡعَلۡهُمَا تَحۡتَ أَقۡدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلۡأَسۡفَلِينَ﴾ پەروەردگارا ئەو دوانەمان پیشان بدە تابیانخەینە ژێر پێكانمان بۆئەوەی بكەڕێن و ببن بە چین و تاقمی پەست ترین لەناو ئاگری دۆزەخدا، بەڕاستی داخی ئەوە زۆر سەختە كەلەدنیادا چوونە بن كڵێشەیان خۆیان كرد بە دۆستی گیانی بە گیانیان تا ئاوایان لێ كردن.

پەیوەندی هەڵخەڵەتاندن لە دنیادا سەرەنجام پاشەڕۆژەكەی ئەوەیە كە باسی فەرمو، بەڵام پەیوەندی برایەتی ئیمان و عەقیدە لە دنیادا لەكاتی مردن و ڕۆژی دوایی دا مایەی خێرو خۆشیە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایی دا، لە دنیادا هەركاری خێری لێ پەیدا دەبێ و لە ڕۆژی دواییشدا شادمانی و خۆشی و خۆش ویستنی لێ پەیدا دەبێ وەك لەم ئایەتانەدا دەرئەكەوێ كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ﴾ بەڕاستی ئەوانەی لە دنیادا گوتیان و دەڵێن خوای پەروەردگارمان ﴿الله﴾یە. دیارە ئەمە تەنها وتەیەكی دەمی نیە، بەڵكو ئەوە عەقیدەو بەڵێنیشە بەوە هەر ڕێگەو نامەی خوا دەدەنە بەر ئەوانە

تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ
تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ
أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ
إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾

---

﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾

**مەلائیکە دائەبارن بەسەریاندا بەوەی نیازی پاكو کردەوەی چاك دەخەنە دڵیانو پشت هەر بە خوا ببەستن نەترسن لە هیچ شتێك بێتە ڕێیانو غەم نەخۆن لەوەی لە دەستیان دەردەچێ، مژدە بێت بەو بەهەشتەی کەلە دنیادا بەڵێنتان پێدرا بوو. لە ژیانی دنیادا بەو جۆرەن لەگەڵ ئەو باوەڕ دارانەدا. لەکاتی سەرەمەرگیشدا بەو جۆرە دڵ خۆشیان دەدەنەوەو پێیان دەڵێن ﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ ئێمە دۆستو کاربەدەستی ئێوەین لە ژیانی دنیاو لە ڕۆژی دواییدا ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾ لە بەهەشتدا بۆتان هەیە ئەوەی نەفستان ئارەزووی بکات لە هەر بارێکەوە بۆمان هەیە ئەوەی داوای بکەن ﴿ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ لەکاتێکدا ئەوەتان پێدەبەخشرێ بەرکوڵو میوان دارییەك کە لەڕێوە لەلایەن لێ بوردەی میهرەبانەوە، خوای لێ بوردەی میهرەبان بۆ تۆ هیچی تێناچێ بەشدارمان بکەیت لەوەدا.**

**ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بەم فەرمودەیە کە جۆرو شێوەی بانگ کەرانی ڕێگەی خوا نیشان دەدات کە سەردەستەو پێشەواو پێغەمبەری ئازیزە (ﷺ) یەکەم ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ**

أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾ ئایا شیرین ترینه له بارەی وتەو قسەوە لە کەسێك کە بانگ بکات بۆ لای خواو کردەوەی چاکی کردبێ و بڵێ من لە موسڵمانانم، واتە هیچ کەس لەو کەس وتە چاك ترو ڕاست ترنیە. ئەو وتەو قسە ڕاستە وتەو ڕێگەی هەموو پێغەمبەرانە ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ ئینجا هەرچۆن وتەو قسەکە ڕاستو شیرین ترە هەروەها ئەمە وەرەگیرێ دەبێ بە جۆرو شێوەیەکی شیرین بڵێ و بانگەکە بکات بەم ڕەنگە خەڵکی نەتارێنێ و نەتۆرێنێ و لە هەمان کاتدا لەسەربەرزیو عیززەتی ئیسلامەوە بدوێ نەك بە شێوەی زەلیلیو ژێر دەستەییەوە، ئەو کەسە دەبێ کردەوەی خۆی چاك بێتو لە گوتنو وتەکانیدا، عالمی نەبێت، کە دەربارەیان گوتراوە:(عالم بعلمه لایعملن معذب من قبل عباد الوثن) یان (وعالم بعلمه لایعمل اعماله مردودة لاتقبل).

ئینجا دەبێ بڵێ من یەکێکم لە موسڵمانان، واتە بەناوی ئیسلامەوە بانگو قسەکان بکات، هەرکەس هەر قسەیەکی چاك بکات ئەگەر بەناوی ئەوەوە نەبێت کە ئەم یەکێکە لە موسڵمانانو فەرمودەو فەرمانی ئیسلام بەجێ دێنێ کارەکەی ناڕاستو ناڕەوایەو خوا نایەوێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ بێگومان بانگ کەرانی ڕێگای خوا، بێباوەڕان بە هەموو جۆر دوژمنایەتییان دەکەنو ئەمانیش دەبێ خاوەن بەزەیی بن بەو سەر لێ تێك چووانە، لەبەرئەوە چاوپۆشیش دەکەن لە بەرامبەر خراپەی ئەوان ئەمان چاکە دەکەن،

وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾

بەڵكو دڵیان نەرم ببێ و خۆیان ئەخەنە بەر خەشمو سزای خوا جا لەم بارەیەوە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ﴾ چاکەو خراپە چوون یەك نین چاکە هۆی دڵنەرمیەو نەمانی سەرکێشی لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ بەرگری خراپە بکە بە سیفەتی زۆر شیرین ﴿فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ کە تەماشا دەکەیت دەست بەجێ ئەو کەسەی کەلە بەینی تۆو ئەودا دوژمنایەتی هەبێ دەگۆڕێ بە جۆرێ وەك دۆستێکی دڵ گەرمی لێ دێ ئەمە یاسایەکی گشتی نیە، بەڵکو شتێکی غالبیە.

ئەو کەسەی بانگی خەڵکی دەکات هەر کارو کردەوەیەکی شەرعی بەکاربێنێ بۆ ڕاکێشانی دڵی ئەو دوژمنانە کارێکی چاکە ئەگەر بێبڕواکە دڵی نەرم بوو ئەوە مەبەستی ئەجرەو مەبەستەکە پێك هاتووە، ئەگەر نەرم نەبوو ئەوا ئەم بە ئەجری خۆی دەگات باری ئەو گرانتر دەبێ و خۆی دەخاتە بەر خەشمو سزای خوا، بەڵام ئەوە لە هەموو کەس نایەت بەڵکو لە کەسێك دێت کە دڵێکی گەورەی هەبێ و بتوانێ خۆی بگرێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ ئەو سیفەت و ڕەوشتە شیرینە نادرێ بە هیچ کەس بێجگە لەوانەی کە خۆگرن و سەبریان بووە، نادرێ بە هیچ کەس بێجگە لەوانە کە خاوەنی بەشێکی گەورەن. پێشەواو سەردەستەی ئەو تاقمە بەختەوەرە پێغەمبەری خۆشەویستمانە (ﷺ) کەلە سیرەتی پاکی دا ڕوداوی وابووە مەگەر هەرلەو هاتبێ (ﷺ) و علی آلە واصحابە وازواجە وامهاتنا. بێگومان شەیتانی دوژمنی حەسود هەمیشە لە کەمیندایە بۆ موسڵمانان و بۆئەوەی کەمو کوڕی بخاتە کارەکەو عەرقەلە پەیدا بکات و کەسەکە بێئارام بکات.

وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ
وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ
إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ
وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً

---

**جالێرەدا خوای میهرەبان چارەسەری داناوە بۆ بانگ کەرانی ئەو ڕێگە پاکەو ئەوەش بریتیە لە پەنا بردن بە خوا لە شەڕی ئەو شەیتانەوە فەرموێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ ئەگەر لەلایەن شەیتانەوە خەتەرەو وەسوەسەیەك ڕووی تێکردی بۆ لادانت لەو بارە ڕاستو ڕێکەی کە وای لەسەری بۆ وێنە وەك بێئارامیو خۆنەگری، ئەگەر شتی وا ڕووی تێکردی پەنا بگرە بە خوا بۆ بەرگری ئەو خەتەرەو وەسوەسەی شەیتانە، بەڕاستی هەر ئەوە بیسەرو زانا بۆ چارەسەرکردنی هەموو لادانو خراپەیەك. بەڵێ ڕێگاکە زۆر سەخت و ماندووکەرەو ڕێنموونیو هیدایەتدان بە بێیارمەتی خوا ناکرێ اللهم أهدنا واهدینا آمین.**

**ئینجا دێتە سەر گەردشو خونەوەیەکی تر لە بارەی دەعوەتو بانگ کردنەوە دەست پێدەکات بە گەردشو خولانەوەیەكو بیر کردنەوە لەم بوونەوەرە گەورەدا. لەناو ئەو بێبڕوایانەدا هینی وا هەبوو مانگو ڕۆژی دەپەرست کە لە دروست کراوەکانی خوان، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ﴾ هەندێ لە ئایەتو بەڵگەی ئاشکراکانی خوا بریتیە لە ڕۆژو مانگ ﴿لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ﴾ سوجدە مەبەن نەبۆ خۆرو نە بۆ مانگ ﴿وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ﴾ سوجدە بەرن بەرامبەر ئەو خوایەی کە ئەو مانگو ڕۆژانەی دروست کردووە ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ ئەگەر ئەو دەپەرستن، ئەوانە وەك چەند جارێ گوترا دەبانزانیو باوەڕیان هەبوو بە خوای پەروەردگار بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەم شتانەیان دەپەرست لەگەڵ خوادا چونکە دەستیان نەدەگەیشتە خوا، ئیتر ئەوەندە نەفام بوون بیریان نەدەکردەوە لەمەی ئەم شتانە ماتووڵ دروست کراوی خوان، چۆن دەیانکەی بە هاوبەش بۆ خوا، یا دەیانپەرستن بۆنەوەی ئەوانە نزیکیان بخەنەوە لە خواوە لە نەفامی**

کۆندا بەو شێوە بوون بەڵام لە نەفامی تازەی ماددێتیدا پیس ترو بۆگەن ترن کە داهێنەر بڕیار نادەن، بەڵام چونکە ئەمە نەفامی ترە زیاد لە حەفتا ساڵ بە هەموو زۆرو ئاگرو ئاسنێك ئەو بیرە بۆگەنەیان بۆ نەچەسپێنراو ڕووخا، لەم چەرخەدا باوەڕ نەبوون بە داهێنەر بووە بە لەکەو عەیبێکی گەورە لە ڕوویان نایەت بیڵێن.

ئادەمی ژیرە بێگومان ئەگەنە ڕادەیەك کە ئەم ئیسلامە عەزیزە بگرنە گەردن. قورئان بەو جۆرو شێوە حەکیمانە هەوڵی دا لەگەڵ نەفامەکانی کۆنی عەرەبدا. ئینجا ڕووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر (ﷺ)و ئەفەرموێ: ﴿ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ﴾ ئەگەر ئەو نەفامانە سەرکێشی بەکار دەهێننو خۆیان بە گەورە دەزانن‌و ناکەونە شوێنی تۆ، ئەگەر ئەوانە بەو جۆرەن هیچ پێویستی نیە بەوان‌و ئەوانەی کە لای پەروەردگارتن، واتە بەرزو پایە بەرزن. ئەوانە عیبادەت‌و تەسبیحات ئەو دەکەن بە شەوو بەڕۆژ لەکاتێکدا ماندوو بێتاقەت نابن، ئەوانە مەلائیکەتەکانن یان تاقمێکی بەرزتر کە خوا خۆی دەزانێ.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە سوورو میهرەبان بوو دڵ غەمگین دەبوو بە سەرکێشی‌و باوەڕ نەهێنانی ئەو نەفامانە، خوای میهرەبان بەم جۆرە فەرمودانە دڵنەوایی ئەو دەکات کە غەمبار نەبێ، ئەو هیچ زیانێك ڕووی تێناکات‌و ئەوان زیانبار دەبن ماتوڵ ئەو کەم‌و کوڕی نیە لەو فەرمانەی پێی سپێراوە، هەروەها ئەو خواناسانەی کە ڕێبازی ئەویان داوەتە بەر غەم نەخۆن بە مەرجێ قوسوریان نەکردبێ لە کارەکەی خۆیاندا.

گەردشێکی کرد بە دڵ‌و دەروون لە ئاسمان‌و مانگ‌و خۆردا، ئینجا دێتە خوارەوە بۆ زەوی کە دایکی ئادەمی‌و گیانلەبەرانەو ئەم زەویە دەخاتە کە بە چاوی خۆمان دەیبینین بە مردوویی‌و وشك‌و برین کەچی کاتێ بارانی بەسەردا دەبارێنێ گیانی تێدێتەوەو دەکەوێتە جوڵانەوەو جومبوش.

لە ئایەتی پێشوودا بەندێکی سەرەکی لە بەندەکانی ئایینی خوای بۆ ڕوون کردینەوە، لەپاش ئەوە بەندێکی سەرەکی تر ڕوون دەکاتەوە کە باوەڕکردنە بە زیندوو بوونەوەو حیساب‌و کیتاب ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً﴾ هەندێ لە بەڵگەو نیشانە ئاشکراکانی ئەمەیە دەبینی ئەی کەسێ کە دیتنت هەیە، دەبینی زەوی بەمردوویی وشك‌و برین هیچ شێوەی گیانی ڕواندن‌و سەوزکردنی نییە،

فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡۚ إِنَّ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ
ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾

---

**﴿فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡۚ﴾ کەچی کاتێ ئێمە بارانمان باراند بەسەری دا دەکەوێتە جوڵەو ئاوس‌و خاکەکە بەرز دەکاتەوە، جالێرەدا قورئان سەرنج ڕائەکێشێ بۆ مەبەستە ئاساسییەکە کە زیندوو بوونەوەی مردووانە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓۚ﴾ بەڕاستی ئەو کەسەی کە ئەو زەویە زیندوو دەکاتەوە هەر ئەو زیندوو کەرەوەی مردووەکانە بۆ خوا ئەوە هیچی تێ‌ناچێ ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ چونکە بێ‌گومان دەسەڵات دارو تونایە بەسەر هەموو شتێکدا. با بیرێ بکەینەوە لە دەستەواژەو تەعبیری قورئان کە لەم شوێنانەدا دوو وتە بەکار ئەهێنێ کە یەك مەبەستیان هەیە: ﴿هامدة خَٰشِعَةٗ﴾ کە مەبەست لە هەردوو یەك شتە، بەڵام لێرەدا کە باسی عیبادەتە وتەی ﴿خَٰشِعَةٗ﴾ ڕێك ترە، لەو شوێنە کە ﴿هامدة﴾ بەکاردەهێنرێ شوێنی زیندوو بوونەوەیە کە ﴿هامدة﴾ ڕێك ترە، فسبحان منزل هذا الكتاب.**

**لەکاتێکدا ئەم بەڵگە ئاشکراو ڕوونانە دەخاتە بەرچاو زۆر ڕاست‌و بەجێیە سەرنج ڕاکێشان بۆ ئاگاداری خوا بەسەر بێ‌بڕوایی ئەو نەفامانەو ترساندنیان بە سزای سەختی دۆزەخ وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ﴾ بەڕاستی ئەوانە کە لاری‌و بێ‌بڕوایی بەکار دەهێنن لە ئایەتەکانی ئێمەدا ئەوانە پۆشیدەو شاراوە نین لە ئێمە کەواتە دەبێ تۆڵەیان لێ بسێنین لە ڕۆژی دوایی داو تۆڵەی سەختی ئەویش ئاگری دۆزەخە دەی ﴿أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ ئایا کەسێك تووڕ بدرێتە ناو ئاگر باش ترەو حاڵ‌و باری باشترە یان کەسێك کە لەو ڕۆژەدا دێت بە ئارام‌و بێ‌باکی. حاڵ‌و باری ئەم دوو تاقمە بەو جۆرەیە ﴿ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ﴾ کەواتە بێ‌منەت بن چۆن ئارەزووتانە کردەوە بکەن. ئەم فەرمودەیە لەلایەکەوە هەڕەشەی لێ وەردەگیرێ، لەلایەکی ترەوە سووکی‌و بێ‌نرخی پیشان ئەدات، بڕۆن چی دەکەن بیکەن ﴿إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێ‌گومان خوا بینایە بە هەر کردەوەیەك کە دەیکەن، ئای هاوار بۆ ئەوانە بەڵام بکرێن بۆ تاوان‌و لاری لە ئایەتەکانی خوادا.**

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ﴿٤١﴾ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ
خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو
مَغۡفِرَةٖ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٖ ﴿٤٣﴾ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّٗا لَّقَالُواْ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ءَا۬عۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ
قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۚ

لەپاش ئەو هەڕەشەو ئابڕوو بردنە ئینجا دەست نیشان‌و ئاماژە ئەكات بۆ ئەوەی تاوانەكەیان لە ڕادەیەكدایە گوتن‌و زمان كەم‌و كولە لە گەیاندنی گەورەییەكەیدا، چونكە ئەوانە بە گژی ئەم قورئانەدا چوون كە كتێبی زاتێكی چار نەكراوەو ناهەقی بەتاڵ نزیكی ناكەوێتەوەو نێرراوی خوای لێزانی كاردروستەو سوپاس كراوەو هەر ئەو شایانە بۆ سوپاس گوزاری، چونكە هیچ ڕەخنەیەك ڕووی تێ ناكات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ﴾ بەڕاستی ئەو كەسانەی كە باوەڕیان نەهێناوەو باوەڕیان نیە بەم قورئانە كە ئەوەندە تێرو تەواوە لە ڕێنیشاندان‌و ئامۆژگاری دا وەك نەفسی ڕێنیشاندان‌و ئامۆژگاری بێت وایە، ئەوانەی كە باوەڕیان نیە بەم نامەیە كاتێ بۆیان هاتووە، ﴿وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ * لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ﴾ لەكاتێكدا كتێبی زاتی چارنەكراوەو بەتاڵ‌و ناهەق ڕووی تێناكات بە هیچ بارو لە هیچ لایەكیەوە وە نایاب‌و بێوێنەیەو ﴿تَنزِيلٞ مِّنۡ﴾ نێرراوە خوارەوەی خوایەكی ﴿حَكِيمٍ﴾و ﴿حَمِيدٖ﴾ە. ئینجا بێدەنگ دەبێ لە خەبەرەكە لەبەر گەیاندنی ئەوپەڕی گەورەیی تاوانەكەیان تا ئەو ڕادەی زمان ناتوانێ‌و كولە لە گوتنی، بە گوێرەی عیلمی ڕەوانبێژی با دڵی گوێگر بڕوا بۆ هەر شتێك كە گونجاوە، بێگومان ڕاگەیاندن‌و چەسپاندنی ئەم قورئانە ئێجگار قورس‌و گران بووە، چەند جارێك باس كرا.

كەواتە پێویستە دڵنەوایی پێغەمبەر (ﷺ) بكات بەمەی تەنها تۆ ئەو ئەركە نەخراوەتە سەرشانت بەڵكو خراوەتە سەر هەموو پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ لە بارێكی ترەوە دڵی بەهێزو خۆشنود دەكات بەمەی یەكێكە لە بەرزترین كۆمەڵ‌و پەلێكە لە

درەختێکی گەورەی دامەزراو کە ڕیشەی کوتاوە بە ناو هەموو بوونەوەردا فەرموی: ﴿مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ﴾ لەلایەن خواوە هیچت پێنەگوتراوە بێجگە لەوەی کە گوتراوە بە هەموو پێغەمبەرەکان کە هاتن لە پێش تۆوە. کەواتە یەك وەحیەو یەك پەیامەو یەك دینو عەقیدەیە، لەلایەن خەڵکیشەوە هەر ئەوەت پێگوتراوەو دەربارەت کراوە کە دەربارەی فروستادەو پێغەمبەرەکانی پێش خۆت کراوە لە دوژمنایەتیو پیلان گێڕانو بەربەرەکانێ، کەواتە دامەزراوبە لەسەر کاروفرمانی لەسەر کاروفرمانی خۆت وەك ئەوان دامەزراوو خۆگربوون، پاشەڕۆژی سەرکەوتن بۆ تۆیە هەرچۆنێ بۆ ئەوان بوو، ئەم تەمێ و تەوجیهە بەرنامەیەکی بۆ هەموو باوەڕدارانی شوێن کەوتووی کە ئەرکی بانگ کردنیان بۆلای خوا لە ئەستۆیە. یەکێ لەوانە کە بێژراوە لە لایەن پەروەردگارتەوە بە هەموو دان، یان خاتەمی هەمووان(ﷺ): ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت خاوەنی لێ بوردنە لە تۆو لە هەموو پێغەمبەرانی پێش تۆ لە هەر کەمو کوڕیەك کە بوویانەو بۆ بووتە، خاوەنی تۆڵەو سزایەکی ئێشو ئازار دەرە لە دوژمنەکانتان. والحمدلله على ذلك.

ئینجا چاکەو نیعمەتێکی تر دەخاتە بەرچاوی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەم قورئانەی بە زمانی عەرەبیە، لە هەمان کاتدا بەرپەرچی بیانوویەکی ناڕاستو بێجێی نەفامەکان دەداتەوە کە ئەیانگوت: با ئەم قورئانە بەزمانێکی تر بهاتایە نەك بەعەرەبی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ ۖ أَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ﴾ ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان بهێنایەتە خوارەوەو بمانگێڕایە بە زمانێکی غەیرە عەرەبی ئەو بێباوەڕە سەرکێشاه دەیانگوت با ئایەتەکانی ڕوون بکرایەتەوە بۆمان بە جۆرێك تێبگەیشتینایە ئایا چۆن نەگونجێ قورئان غەیرە عەرەبی بێت ئەوەی کە بانگ دەکرێتو پێی ڕادەگەیەنرێ عەرەبی بێت؟ لە وەڵامو دەم کوت کردنیاندا ئەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ ئەم قورئانە بۆ بڕواداران ڕێنموونیو ڕێگە پیشاندەرەو شیفایە لە هەموو نەخۆشی دەروونی، کەواتە بۆ ئەوانە بەسەو پێویستیان بە هیچی تر نیە

وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٞ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ
(٤٤) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ فَٱخۡتُلِفَ فِيهِۗ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ
بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ (٤٥) مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۗ وَمَا رَبُّكَ
بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ (٤٦)

---

**﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٞ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان نەهێناوە لە گوێچکەکانیاندا کەڕی هەیەو نابیستن‌و قورئان کوێرییە بەسەر چاوەکانیانەوەو چاوی دڵیان نابیایە، بە ڕق‌و دوژمنایەتیەوە سەیری دەکەن، کەواتە ئەم قورئانە زیاتر گومڕاو سەرکێش تریان دەکات ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ﴾ ئەوانەی لە شوێنێکی زۆر دوورەوە بانگ دەکرێن، واتە زۆر دوورن لە تەبیعەت‌و حەقیقەتی ئەم قورئانە، سبحان الله لە هەموو زەمان‌و وڵاتێکدا وێنەی ئەوانە زۆرەو دەردەکەیان کوشندەو چارەسەر نەکراوە.**

**ئینجا وێنەو نموونەیەك لە پێغەمبەران‌و وێنەیە لەسەر کێشان دەخاتە لەرچاوو ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ فَٱخۡتُلِفَ فِيهِۗ﴾ بێ‌گومان شتێکی ئاشکرایە کە ئێمە نامەمان بەخشی بە موسا واتە ئەو تەوراتەی کە دەستکاری نەکرابوو کە نامەیەکی زۆر عەزیم بوو بەس بوو بۆ ملکەچ کردن‌و شوێن کەوتن، کەچی دووبەرەکی تێدا کرا بەم جۆرە هێندێ وەری گرت‌و هێندێ تر دوژمنایەتی‌و سەرکێشی بەکارهێنا بە هۆی ئەوەوە سەرکێشەکان شایستەی ئەوە بوون لەناو ببرێن ﴿وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ﴾ ئەگەر بڕیارێك لەلایەن پەروەردگارتەوە پێش نەکەوتایە لە دواخستنی سزای ئەوانە بۆ ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئەوە نەوایە قەزاوەت دەکرا بەسەر دوژمنە سەرکێشەکانداو لە ڕیشە دەهێنران‌و بڕواداران**

دەمانەوە بە شادمان لەپاش ئەوان، هەروەها بڕیار بەو جۆرە هات لەم دواترین شەریعەت و پەیامەدا ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ ئەوی بێباوەڕە سەرکێشانە لەگەڵ تۆ دەربارەی ئەم قورئانە دەژین لە دوو دڵی و گومانێکی وادا نەبێ ئارام کەرە کە ئەو دوو دڵی و بێئارامیە ژیان تاڵ و ناخۆش دەکا. کەواتە با بەرەڵا بکرێن بە پێی بۆچوونی خۆیان ڕەفتار بکەن. ئەوەی کەژیرەوکردەوەی چاك دەکات ئەوابەسوودی خۆی تەواو دەبێ و بۆ خۆی کار دەکات، بەڵام ئەوەی کە خۆاپە دەکات ئەو بەیانی خۆی تەواو دەبێت و لە ڕاستیدا دژی خۆیەتی وەك ئەفەرموێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ بێگومان خوای تۆ خاوەن زوڵم نیە دەبارەی بەندەکانی، واتە هەرگیز بەبێتاوان سزایان نادات، وتەی ﴿ظلام﴾ سیفەتی موبالەغە نیە بەڵکو پێی دەوترێ: ذل كذا. یان مەبەست ئەوەیە هەر جۆرە زیادە ڕەوی کردن لە تۆڵەی تاوانباراندا زۆر زوڵمێکی گەورەیە کە زوڵم شتێکی زۆر بەدەو خوا قەدەغەی کردووە لەسەر خۆی.

**وصلى الله و سلم على سيدنا و سيد القادة و قائد السادة محمد و على آله و صحبه و كل من تبعهم بإحسان.**